# صحيح ابن خزيمة

## بە كوردی

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

للإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السلمي النيسابوري

بەرگی دووەم

وەرگێڕانی

عباس محمد أمين




پڕۆژەی پیت
بۆ وەرگێرانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

# صحيح ابن خزيمة
## بەکوردی

نووسینی: الإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السُّلمي النّيسابوري
وەرگێڕانــی : عــباس محـمد أمـين
دیزایینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
هەڵەچن و ڕێنووس : بڕیـار هێرۆیی
خـەتی بـەرگ : سـتافـی پیـت
چاپــی یەکـەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ز
٦٥٨ لاپــــەڕە
٢٤ × ١٧ ســــم
بابـەت : ئـایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ١١٣ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ پێ دراوە










# صحيح ابن خزيمة

## بەکوردی




نووسینی

الإمامُ أبو بكرٍ محمدُ بنُ إسحاقَ بْن خزيمةَ السُّلميُّ النّيسابوريُّ

وەرگێڕان

عباس محمد أمين

## بَابُ أَمْرِ الصِّبْيَانِ بِالصَّلَاةِ وَضَرْبِهِمْ عَلَى تَرْكِهَا قَبْلَ الْبُلُوغِ كَيْ يَعْتَادُوا بِهَا

**١٠٠٢**- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلِّمُوا الصَّبِيَّ الصَّلَاةَ ابْنَ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا ابْنَ عَشْرٍ»[١].

## باسی فەرمانکردن بە منداڵ بە ئەنجامدانی نوێژەکان و لێدانیان لەسەر وازهێنان لێی پێش باڵغبوون تا لەگەڵی ڕابێن

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی ڕەبیع دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن لە تەمەنی حەوت ساڵی، لە تەمەنی دە ساڵیش لێیان بدەن لەسەر ئەنجامنەدانی نوێژ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ أَمْرَ الصِّبْيَانِ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْبُلُوغِ عَلَى غَيْرِ الْإِيجَابِ

**١٠٠٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ بِمَجْنُونَةِ بَنِي فُلَانٍ، قَدْ زَنَتْ، أَمَرَ عُمَرُ ﷺ بِرَجْمِهَا، فَرَجَعَهَا عَلِيٌّ، وَقَالَ لِعُمَرَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ: تَرْجُمُ هَذِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: أَوَ مَا تَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنِ الْمَجْنُونِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، قَالَ صَدَقْتَ، فَخَلَّى عَنْهَا»[٢].

## باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە منداڵان پێش باڵغبوون لەسەر پێویست بوون نییە (بەڵکوو چاکە)

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ تێپەڕی بەلای ئافرەتێکی شێت لە نەوەکانی فڵان زینای کردبوو، عومەر ﷺ فەرمانی کرد بە بەردبارانکردنی، عەلی ﷺ گەڕاندیەوە و بە عومەری ﷺ وت: ئایا ئەمە ڕەجم دەکەی؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی نازانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: لەسەر شێتێك عەقڵی لەدەست دابێت، وە لەسەر خەوتوو هەتا هەڵدەستێ، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێ، وتی: ڕاستت کرد، پاشان وازی لێی هێنا.

---

(١) حديث حسن.

(٢) صحيح.



## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الصَّلَاةِ عَلَى الْبُسُطِ
## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى الْحَصِيرِ

**١٠٠٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى حَصِيرٍ[١].

## کۆباسی نوێژ لەسەر ڕاخەرەکان
## باسی نوێژکردن لەسەر حەسیر

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەسیر نوێژی کرد.

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى الْبِسَاطِ إِنْ كَانَ زَمْعَةُ يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِهِ

**١٠٠٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى عَلَى بِسَاطٍ وَقَالَ نَصْرٌ فِي حَدِيثِهِ: صَلَّى ابْنُ عَبَّاسٍ عَلَى بِسَاطٍ، وَقَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى بِسَاطٍ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْقَلْبِ مِنْ زَمْعَةَ[٢].

## باسی نوێژکردن لەسەر حەسیر ئەگەر زەمعە فەرموودەکەی لێ وەربگیرێ

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیر نوێژی کرد، نەصر (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی فەرموودەکە) لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: ئیبنو عەباس ﷺ لەسەر حەسیر نوێژی کرد، وە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەسیر نوێژی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: زەمعەی (کوڕی صاڵح کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی فەرموودەکە) لە دڵدا شتێك هەیە لە بەرانبەری. (واتە: لاوازە و فەرموودەی لێ وەرناگیرێ).

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى الْفِرَاءِ الْمَدْبُوغَةِ

**١٠٠٦-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى الْحَصِيرِ، وَالْفَرْوَةِ الْمَدْبُوغَةِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.




## باسی نوێژکردن لەسەر فەرووی خۆشەکراو

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیر و فەرووی خۆشەکراو نوێژی دەکرد.

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى الْخُمْرَةِ

١٠٠٧- عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ زَوْجَةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ.(١)

## باسی نوێژکردن لەسەر (الْخُمْرَة) ڕاخەر

واتە: مەیمونە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕاخەرێك کە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی دەکرد.

تێبینی:

(الْخُمْرَة): ڕاخەرێکی بچووك بووە لەو سەردەمەدا لە گەڵای دارخورما دروست دەکرا، ناو نراوە بە (الْخُمْرَة) چونکە ڕوخساری نوێژخوێن دەپارێزێ لە خۆڵ.

١٠٠٨- عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ(٢).

واتە: ئوممو کەلسومی کچی ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕاخەرێك کە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی دەکرد.

## بَابُ الصَّلَاةِ فِي النَّعْلَيْنِ وَالْخِيَارِ لِلْمُصَلِّي بَيْنَ الصَّلَاةِ فِيهِمَا وَبَيْنَ خَلْعِهِمَا وَوَضْعِهِمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، كَيْ لَا يُؤْذِيَ بِهِمَا غَيْرَهُ

١٠٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَلْبَسْ نَعْلَيْهِ، أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، وَلَا يُؤْذِ بِهِمَا غَيْرَهُ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## باسی نوێژکردن بە هەردوو پێڵاو، نوێژخوێن سەرپشکە لەوەی نوێژیان پێوە دەکات یان دایاندەکەنێت و لە نێوان هەردوو قاچی دایاندەنێت، بۆ ئەوەی ئازاری کەسی پێ نەدات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با نەعلەکانی لەپێ بکات، یان دایانکەنێت و بیانخاتە نێوان هەردوو قاچی، با ئازاری کەسیان پێ نەدات.

**١٠١٠-** عَنْ أَبِي مسَلَمَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي النَّعْلَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ(١).

واتە: ئەبو مەسلەمە ﷺ دەڵێ: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ بە نەعلەکانییەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ.

**١٠١١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ، وَقَالَ: يَا عَائِشَةُ ارْفَعِي عَنَّا حَصِيرَكِ هَذَا، فَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ يَفْتِنُ النَّاسَ(٢).

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕاخەرێك کە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی دەکرد، وە فەرمووی: ئەی عائیشە ﷺ حەسیرەکە هەڵگرە، بەراستی ترسام لەوەی خەڵکی تووشی فیتنە بن.

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزان لە پاش نوێژی عیشا، داوای کرد لە عائیشە ﷺ لەپێش دەرگاکەی خۆی حەسیرێکی بۆ ڕابخات، دواتر لەگەڵ ئەوانەی لەنێو مزگەوت بوون نوێژی تەراویحی بۆ کردن، بۆ شەوەکەی دیکە خەڵکێکی زۆر ئامادە بوون، ئەویش فەرمانی کرد بە عائیشە ﷺ حەسیرەکە لا ببات، نەوەك ئەو نوێژە ببێتە فەرز و لە توانایاندا نەبێت ئەنجامی بدەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٠١٢- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: لَمْ أَزَلْ أَسْمَعُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى خُمْرَةٍ، وَقَالَ: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ وَيَسْجُدُ عَلَيْهَا[1].

واته: ئیبنو شیهاب دەڵێ: بەردەوام گوێم لێ بوو (دەیانوت): پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕاخەرێك كە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی كرد. دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕاخەرێك كە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی دەكرد و سوژدەی لەسەری دەبرد.

١٠١٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ، لَا يَدَعُهَا فِي سَفَرٍ وَلَا حَضَرٍ[2].

واته: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕاخەرێك كە پێی دەوترا: (الْخُمْرَة) نوێژی دەكرد، نە لە سەفەر دەستبەرداری دەبوو لە شوێنی نیشتەجێبوون.

## بَابُ وَضْعِ الْمُصَلِّي نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ إِذَا خَلَعَهُمَا، إِذَا لَمْ يَكُنْ عَنْ يَسَارِهِ مُصَلٍّ، فَيَكُونُ نَعْلَاهُ عَنْ يَمِينِ الْمُصَلِّي عَنْ يَسَارِهِ

١٠١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ الْفَتْحِ وَاضِعاً نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ[3].

## باسی نوێژخوێن پێڵاوەكانی لەلای چەپی دادەنێت ئەگەر دایكەندن، ئەگەر نوێژخوێنێكی دیكە لەلای چەپیەوە نەبوو، ئەوكات پێڵاوەكانی دەكەوێتە لای ڕاستی نوێژخوێنەكە و لای چەپی خۆی

واته: عەبدوڵای كوڕی سائیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەككە نوێژی كرد پێڵاوەكانی لەلای چەپیەوە دانابوو.

١٠١٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَصَلَّى يَوْمَ الْفَتْحِ فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ[4].

---

(١) المتن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: ئامادە بووم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککە، لە ڕۆژی ئازادکردنیدا نوێژی کرد و پێڵاوەکانی داکەند و لەلای چەپیەوە داینا.

## بَابُ ذِكْرِ الزَّجْرِ عَنْ وَضْعِ الْمُصَلِّي نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ إِذَا كَانَ عَنْ يَسَارِهِ مُصَلٍّ، يَكُونُ النَّعْلَانِ عَنْ يَمِينِ الْمُصَلِّي عَنْ يَسَارِهِ

١٠١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَا يَضَعْ نَعْلَيْهِ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ إِلَّا أَنْ لَا يَكُونَ عَنْ يَسَارِهِ أَحَدٌ، وَلْيَضَعْهُمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ»(١).

## باسی سەرکۆنەکردن لەوەی نوێژخوێن پێڵاوەکانی لەلای چەپی دابنێت ئەگەر نوێژخوێنێك لەلای چەپیەوە بوو، چونکە پێڵاوەکانی دەکەوێتە لای ڕاستی ئەو نوێژخوێنەی کە لەلای چەپێتی

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با پێڵاوەکانی لەلای ڕاستی دانەنێت، بەڵکوو لەلای چەپی داینێت، بەڵام ئەگەر کەسێك لەلای چەپی بوو با پێڵاوەکانی لە نێوان هەردوو پێی دابنێت.

## بَابُ الْمُصَلِّي يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ وَقَدْ أَصَابَهُمَا قَذَرٌ لَا يَعْلَمُ بِهِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا صَلَّى فِي نَعْلٍ وَثَوْبٍ طَاهِرٍ عِنْدَهُ، ثُمَّ بَانَ عِنْدَهُ أَنَّ النَّعْلَ أَوِ الثَّوْبَ كَانَ غَيْرَ طَاهِرٍ، أَنَّ مَا مَضَى مِنْ صَلَاتِهِ جَائِزٌ عَنْهُ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ إِعَادَتُهُ، إِذِ الْمَرْءُ إِنَّمَا أُمِرَ أَنْ يُصَلِّيَ فِي ثَوْبٍ طَاهِرٍ عِنْدَهُ، لَا فِي الْمُغَيَّبِ عِنْدَ اللَّهِ

١٠١٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَخَلَعَ النَّاسُ نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: لِمَ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ فَخَلَعْنَا، فَقَالَ: «إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي، فَأَخْبَرَنِي أَنَّ بِهِمَا خَبَثًا، فَإِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَهُ، فَلْيَنْظُرْ فِيهِمَا خَبَثٌ فَلْيَمْسَحْهُمَا بِالْأَرْضِ، ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهَا» وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى فِي حَدِيثِ أَبِي الْوَلِيدِ فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَرًا، أَوْ أَذًى»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**باسی نوێژخوێن نوێژ دەكات بە پێڵاوەكانی لە كاتێكدا پیسییان بەر كەوتووە و پێی نازانێ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی نوێژخوێن ئەگەر بە پێڵاو و جلوبەرگێكەوە نوێژی كرد بەلای خۆیەوە پاك بوو، پاشان بۆی دەركەوت پێڵاوەكەی، یان جلوبەرگەكەی پاك نەبووە، ئەو نوێژەی كردوویەتی دروستە و پێویست بە دووبارەكردنەوەی ناكات، چونكە نوێژخوێن فەرمانی پێ كراوە نوێژ بكات بە جلێكەوە كە بەڕواڵەت لەلای پاك بێت، نەك ئەوەی خوا لە پەنهان پێی دەزانێ**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ دەكردین، پێڵاوەكانی داكەند، خەڵكەكەیش پێڵاوەكانیان داكەند، كاتێ نوێژەكەی تەواو كرد، فەرمووی: بۆچی پێڵاوەكانتان داكەند؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمان بینی پێڵاوەكانت داكەند، ئێمەیش دامانكەند، فەرمووی: بەڕاستی جبریل هات بۆ لام هەواڵی پێ دام پیسییان پێوەیە، جا ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە هات بۆ مزگەوت با پێڵاوەكانی ئەمدیو ئەودیو بكات و تەماشا بكات ئەگەر پیسییەكیان پێوە بوو با بیسڕێت، پاشان نوێژیان پێوە بكات.

## بَابُ الْمُصَلِّي يَشُكُّ فِي الْحَدَثِ، وَالْأَمْرِ بِالْمُضِيِّ فِي صَلَاتِهِ وَتَرْكِ الِانْصِرَافِ عَنِ الصَّلَاةِ إِذَا خُيِّلَ إِلَيْهِ أَنَّهُ قَدْ أَحْدَثَ فِيهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنْ يَقِينَ الطَّهَارَةِ لَا يَزُولُ إِلَّا بِيَقِينِ حَدَثٍ وَأَنَّ الصَّلَاةَ لَا تَفْسُدُ بِالشَّكِّ فِي الْحَدَثِ حَتَّى يَسْتَيْقِنَ الْمُصَلِّي بِالْحَدَثِ

**١٠١٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الشَّيْءَ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «لَا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً»(١).

**باسی نوێژخوێن گومانی هەبێ لەوەی دەستنوێژی شكاوە، فەرمانكردن بەبەردەوامبوون لەسەر نوێژەكەی ئەگەر هات بە خەیاڵیدا دەستنوێژی شكاوە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی دڵنیابوون لەسەر دەستنوێژ لاناچێ مەگەر بەدڵنیابوون لە شكاندنی، تا نوێژخوێن دڵنیا دەبێ كە دەستنوێژی شكاوە، ئینجا واز دێنێ لە نوێژ**

---

(١) حدیث صحیح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی پیاوێك لەنێو نوێژەکەیدا هەست بە شتێك بکات، فەرمووی: با واز لە نوێژەکەی نەهێنێ تا گوێی لە دەنگی دەبێت، یان بە لووتی بۆنی دەکات.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِانْصِرَافِ مِنَ الصَّلَاةِ إِذَا أَحْدَثَ الْمُصَلِّي فِيهَا وَوَضْعِ الْيَدِ عَلَى الْأَنْفِ كَيْ يَتَوَهَّمَ النَّاسُ أَنَّهُ رَاعِفٌ لَا مُحْدِثٌ حَدَثًا مِنْ دُبُرٍ

**١٠١٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلَى أَنْفِهِ وَلْيَنْصَرِفْ»(١).

**باسی فەرمانکردن بە وازهێنان لە نوێژ ئەگەر نوێژخوێن دەستنوێژی شکا، هەروەها دەستیشی بخاتە سەر لووتی تا خەڵکی وا گومان ببەن لووتی خوێنی لێ بەربووە، نەك دەستنوێژی شکاوە و لە دواوە بای لێ دەرچووە**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی شکا لەنێو نوێژدا، با دەستی لەسەر لووتی دابنێت و نوێژەکەی بەجێ بهێڵێت.

## السَّهْوُ فِي الصَّلَاةِ

## بَابُ ذِكْرِ الْمُصَلِّي يَشُكُّ فِي صَلَاتِهِ وَالْأَمْرِ بِأَنْ يَسْجُدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى، قَدْ يَحْسَبُ كَثِيرٌ مِمَّنْ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْمُفَسَّرِ وَالْمُجْمَلِ، وَلَا يَفْهَمُ الْمُخْتَصَرَ وَالْمُتَقَصَّى مِنَ الْأَخْبَارِ، أَنَّ الشَّاكَّ فِي صَلَاتِهِ جَائِزٌ لَهُ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ صَلَاتِهِ عَلَى الشَّكِّ بَعْدَ أَنْ يَسْجُدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ

**١٠٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ وَهُوَ فِي صَلَاتِهِ فَيُلْبِسُ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ حَتَّى لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى، فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ، وَهُوَ جَالِسٌ» وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى ثَلَاثًا، أَوْ أَرْبَعًا، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ، وَهُوَ جَالِسٌ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## سەهووکردن لە نوێژدا

**باسی نوێژخوێن ئەگەر لە نوێژەکەیدا کەوتە گومانەوە، فەرمانی پێکراوە دوو سوژدەی سەهوو ببات، بەباسکردنی فەرموودەیەکی کورتکراوە نەك درێژ، جا زۆربەی ئەوانەی فەرموودەی (الْمُفَسَّر) شیکراوە و (الْمُجْمَل) ناڕوون لە یەکدی جیاناکەنەوە، وە تێناگەن لە فەرموودەی کورتکراوە و درێژ، پێیان وایە: ئەو کەسەی لە نوێژەکەیدا دەکەوێتە گومانەوە دروستە بۆی نوێژەکە تەواو بکات لەسەر ئەو گومانە دوای ئەوەی دوو سوژدەی سەهوو دەبات**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەیتان دێت بۆ لای هەر یەکێکتان ئەو لەنێو نوێژەکەیدایە بۆ ئەوەی لێی تێك بدات، هەتا نەزانێ چەند ڕکات نوێژی کردووە، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئەوەی بینی با بە دانیشتنەوە دوو سوژدەی (سەهوو) ببات. وە ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تا پیاو وای لێ بێت نەزانێت سێ ڕکات نوێژی کردووە، یان چوار، با بە دانیشتنەوە (لە تەحیاتدا) دوو سوژدەی (سەهوو) ببات.

**١٠٢١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷛، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا سَهَا فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»(١).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە سەهووی کرد و نەیزانی چەند ڕکات نوێژی کردووە، با بە دانیشتنەوە (لە تەحیاتدا) دوو سوژدەی سەهوو ببات.**

**١٠٢٢-** وَفِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ وَمُعَاوِيَةَ ﷠، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ شَكَّ فِي صَلَاتِهِ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»(٢).

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) حديث عبدالله بن جعفر سيأتي ذكره عند حديث (١٠٣٣)، أما حديث معاوية فأخرجه: أحمد ١٠٠/٤، والبخاري في تأريخ الكبير ٢٦٣/١، والنسائي (٣٣/٣)، وفي الكبرى له (٥٩٤) (١١٨٣)، والطبراني في الكبير ١٩ (٧٧٢) و (٧٧٣) و (٧٧٤) و (٧٧٦) و (٧٧٧) و (٧٧٨)، والدارقطني (٣٧٥/١) .

واتە: وە لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی جەعفەر و موعاویەدا رضي الله عنهما هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك گومانی هەبوو لە نوێژەکەیدا با بە دانیشتنەوە (لە تەحیاتدا) دوو سوژدەی سەهوو ببات.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى فِي الْمُصَلِّي شَكَّ فِي صَلَاتِهِ وَالْأَمْرِ بِالْبِنَاءِ عَلَى الْأَقَلِّ مِمَّا يَشُكُّ فِيهِ الْمُصَلِّي، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ الشَّاكَّ فِي صَلَاتِهِ بِسَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَمَا يَبْنِي عَلَى الْأَقَلِّ، فَيُتَمِّمُ صَلَاتَهُ عَلَى يَقِينٍ إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهُ تَحَرٍّ

**١٠٢٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُلْغِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى الْيَقِينِ، فَإِنِ اسْتَيْقَنَ التَّمَامَ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَتْ صَلَاتُهُ تَامَّةً كَانَتِ الرَّكْعَةُ نَافِلَةً وَالسَّجْدَتَانِ، وَإِنْ كَانَتْ نَاقِصَةً كَانَتِ الرَّكْعَةُ تَمَامًا لِصَلَاتِهِ وَالسَّجْدَتَانِ تُرْغِمَانِ أَنْفَ الشَّيْطَانِ»[١].

## باسی فەرموودەیەکی تێرو تەواو سەبارەت بە نوێژخوێنێك بکەوێتە گومانەوە لە نوێژەکەی، فەرمانی پێکراوە لەسەر کەمترین ڕکات بونیادی نوێژەکەی بنێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەو کەسەی گومانی هەیە لە نوێژەکەی دوو سوژدەی سەهوو ببات دوای ئەوەی بونیات لەسەر کەمترین ڕکات دەنێ، ئەو ڕکاتەش دەبێتە تەواوکەری نوێژەکەی

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە کەوتە گومانەوە لەنێو نوێژەکەی با گومان وەلا بنێت و بونیاد لەسەر دڵنیایی بنێت، ئەگەر دڵنیا بوو بە تەواوی با بە دانیشتنەوە دوو سوژدە ببات، جا ئەگەر نوێژەکەی تەواو بوو یەك ڕکاتەکەی بۆ دەبێتە سوننەت، وە دوو سوجدەکەیش دەبنە سوننەت، وە ئەگەر نوێژەکەی ناتەواو بوو، ئەوە ڕکاتەکە دەبێتە تەواوکەری نوێژەکەی، دوو سوژدەکەیش لووتی شەیتانی پێ دەشکێت.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ هَاتَيْنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ يَسْجُدُهُمَا الشَّاكُّ فِي صَلَاتِهِ، إِذَا بَنَى عَلَى الْيَقِينِ فَيَسْجُدُهُمَا قَبْلَ السَّلَامِ لَا بَعْدَ السَّلَامِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ فِي جَمِيعِ الْأَحْوَالِ تَكُونَانِ بَعْدَ السَّلَامِ

١٠٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى وَاحِدَةً أَمِ اثْنَتَيْنِ أَمْ ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيُتِمَّ مَا شَكَّ فِيهِ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِنْ كَانَتْ صَلَاتُهُ نَاقِصَةً فَقَدْ أَتَمَّهَا، وَالسَّجْدَتَانِ تَرْغِيمٌ لِلشَّيْطَانِ، وَإِنْ كَانَ أَتَمَّ صَلَاتَهُ فَالرَّكْعَةُ وَالسَّجْدَتَانِ لَهُ نَافِلَةٌ»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە دەربارەی ئەو دوو سوژدەیەی کە ئەو کەسەی گومانی لە نوێژەکەی هەیە دەیبات، ئەگەر دڵنیا بووەوە پێش سەلامدانەوە سوژدە دەبات نەك لەدوای سەلامدانەوە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە دوو سوژدە سەهووەکە لە هەموو کاتەکاندا لە دوای سەلامدانەوەیە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بەگومان بوو نەیزانی چەند ڕکات نوێژی کردووە یەك یان دوو، یان سێ، یان چوار ڕکات، با ئەوەی بە گومانە لێی تەواوی بکات، پاشان بە دانیشتنەوە دوو سوژدە ببات، ئەگەر نوێژەکەی کەموکوڕی تێدابوو ئەوە تەواوی کردووە، دوو سوژدەکەش لووتی شەیتانی پێ دەشکێنێ و زەلیلی دەکات، ئەگەر نوێژەکەیشی تەواو بوو، ئەوە ڕکاتە زیادەکە و دوو سوژدەکە دەبنە سوننەت بۆی.

١٠٢٥- قَالَ أَبُو مُوسَى، وَالدَّوْرَقِيُّ، وَيُونُسُ: إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَا يَدْرِي ثَلَاثًا صَلَّى أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيُصَلِّ رَكْعَةً، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ السَّلَامِ[٢].

واتە: ئەبو موسا و دەوڕەقی و یونس (کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەن بە سەنەدی خۆیان هێناویانە) دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە گومانی هەبوو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

له نوێژەكەی نەیزانی سێ ڕكاتی كردووه یان چوار ڕكات، ئەوه با ڕكاتێكی دیكه بكات، وه دوو سوژدەیش ببات پێش سەلامدانەوه.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَحْسِينِ رُكُوعِ هَذِهِ الرَّكْعَةِ وَسُجُودِهَا الَّتِي يُصَلِّيهَا لِتَمَامِ صَلَاتِهِ أَوْ نَافِلَتِهِ

**١٠٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى، ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَةً يُحْسِنُ رُكُوعَهَا وَسُجُودَهَا، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ»[1].

## - باسی فەرمانكردن بەوەی ڕكووع و سوژدەی ئەو ڕكاتە بەچاكی ببات كە ئەنجامی دەدات بۆ تەواوكردنی نوێژە فەرزەكەی، یان نوێژە سوننەتەكەی

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوه، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەكێك له ئێوه نوێژی كرد و نەیزانی چەند ڕكات نوێژی كردووه، سێ یان چوار، ئەوه با یەك ڕكات نوێژ بكات ڕكووع و سوژده به چاكی ببات، هەروەها دوو سوژدەش ببات (سوژدەی سەهوو).

**١٠٢٧-** حَدَّثَنَا حَاتَمُ بْنُ إِسْمَاعِيل عَنْ عَاصِمِ بْنِ مُحَمَّد عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: بَيْنَا الْحَجَّاجُ يَخْطُبُ وَابْنُ عُمَرَ ﵄ شَاهِدٌ وَمَعَهُ ابْنَانِ لَهُ، أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِهِ، وَالْآخَرُ عَنْ شِمَالِهِ، إِذْ قَالَ الْحَجَّاجُ: ابْنُ الزُّبَيْرِ نَكَّسَ كِتَابَ اللَّهِ نَكَّسَ اللَّهُ قَلْبَهُ قَالَ: وَابْنُ عُمَرَ مُسْتَقْبِلُهُ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنَّ ذَاكَ لَيْسَ بِيَدِكَ وَلَا بِيَدِهِ، قَالَ: فَسَكَتَ الْحَجَّاجُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ عَلَّمَنَا وَكُلَّ مُسْلِمٍ وَإِيَّاكَ أَيُّهَا الشَّيْخُ أَنْ تَعْقِلَ، فَجَعَلَ ابْنُ عُمَرَ يَضْحَكُ، فَحَكَاهُ عَنْ عَاصِمٍ عَنْ حَبِيبٍ قَالَ: ثُمَّ وَثَبَ فَأَجْلَسَهُ ابْنَاهُ، فَقَالَ: دَعُونِي فَإِنِّي تَرَكْتُ الَّتِي فِيهَا الْفَضْلُ أَنْ أَقُولَ لَهُ: كَذَبْتَ[2].

واتە: حاتەمی كوڕی ئیسماعیل بۆی باس كردین له عاصمی كوڕی موحەممەد له حەبیبی كوڕی ئەبو سابت دەڵێ: له كاتێكدا حەجاج وتاری دەدا بۆ خەڵك ئیبنو عومەریش ﵄ لەگەڵ هەردوو كوڕەكەی دانیشتبوون، یەكێكیان لەلای ڕاستی بوو ئەوی دیكەیان

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) في إسناده مقال، حبيب بن أبي ثابت كثير التدليس والإرسال كما في التقريب (١٠٨٤)، أخرجه ابن أبي شيبة (٢٠٦٤٨)، هذا الحديث لم يذكره ابن حجر في الإتحاف، ولم يستدركه عليه المحققون، انظر اتحاف المهرة (٤٧٩/١٨).

لەلای چەپی، لەپڕ حەجاج وتی: ئیبنو زوبەیر کتێبی خوای دانەواند خوا دڵی بڕوخێنێ، وتی: ئیبنو عومەریش ﷺ بەرەو ڕووی بوو، ئیبنو عومەر ﷺ وتی: ئەوە نە بەدەستی تۆیە و نە بەدەستی ئەوە، وتی: حەجاج بێدەنگ بوو، پاشان وتی: بەڕاستی خوا فێری کردووین، وە هەموو موسوڵمانێك و تۆیش ئەی بەساڵاچوو عاقڵ بیت، ئیبنو عومەریش ﷺ پێدەکەنی، حاتەم لە عاصمەوە گێڕاویەتەوە لە حەبیبەوە وتی: پاشان هەستا پەلاماریدا کوڕەکانی دایانیشاند، وتی: وازم لێ بینن، چونکە من نەمتوانی ئەوەی چاکە بیکەم (واتە: لە کاتی خۆیدا وەڵامی حەجاج بدەمەوە) دەبوو من بموتایە درۆت کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْمُصَلِّي يَشُكُّ فِي صَلَاتِهِ وَلَهُ تَحَرٍّ، وَالْأَمْرِ بِالْبِنَاءِ عَلَى التَّحَرِّي إِذَا كَانَ قَلْبُهُ إِلَى أَحَدِ الْعَدَدَيْنِ أَمْيَلَ، وَكَانَ أَكْثَرُ ظَنِّهِ أَنَّهُ قَدْ صَلَّى مَا الْقَلْبُ إِلَيْهِ أَمْيَلُ

١٠٢٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَزَادَ فِي الصَّلَاةِ أَوْ نَقَصَ مِنْهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: مَا ذَاكَ؟ فَذَكَرْنَا لَهُ الَّذِي صَنَعَ، فَثَنَى رِجْلَهُ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: «إِنَّهُ لَوْ حَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ أَنْبَأْتُكُمْ، وَلَكِنِّي بَشَرٌ، أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي، وَأَيُّكُمْ مَا شَكَّ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحْرَى ذَلِكَ لِلصَّوَابِ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُسَلِّمْ، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ إِذَا بَنَى عَلَى التَّحَرِّي سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ السَّلَامِ، وَهَكَذَا أَقُولُ وَإِذَا بَنَى عَلَى الْأَقَلِّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ قَبْلَ السَّلَامِ، عَلَى خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، وَلَا يَجُوزُ عَلَى أَصْلِي دَفْعُ أَحَدِ الْخَبَرَيْنِ بِالْآخَرِ، بَلْ يَجِبُ اسْتِعْمَالُ كُلِّ خَبَرٍ فِي مَوْضِعِهِ. وَالتَّحَرِّي هُوَ أَنْ يَكُونَ قَلْبُ الْمُصَلِّي إِلَى أَحَدِ الْعَدَدَيْنِ أَمْيَلَ، وَالْبِنَاءُ عَلَى الْأَقَلِّ مَسْأَلَةٌ غَيْرُ مَسْأَلَةِ التَّحَرِّي، فَيَجِبُ اسْتِعْمَالُ كِلَا الْخَبَرَيْنِ فِيمَا رُوِيَ فِيهِ.

## باسی ئەگەر نوێژخوێن گومانی هەبوو لە نوێژەکەیدا، بۆی هەیە بگەڕێت (التَّحَرِّي)، وە فەرمان کردن بە بونیادنان لەسەر گەڕان ئەگەر دڵی بۆ لای یەکێك لەو دوو ژمارە چوو، وە زۆربەی گومانەکەی بۆ لای ئەوە بوو ئەو نوێژی کردووە و دڵی مەیلی ئەوەی کرد

---

(١) صحيح.



واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین، لە نوێژێکیدا زیادی کرد، یان کەمی کردەوە، پاشان ڕووی تێکردین، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا شتێك ڕوویداوە لە نوێژدا؟ فەرمووی: چی بووە؟ باسی ئەوەمان بۆی کرد کە ڕوویدا، دواتر قاچی جووت کرد و ڕووی کردە قیبلە و دوو سوژدەی برد، پاشان لای کردەوە لێمان و فەرمووی: ئەگەر شتێك ڕووی بدایە لەنێو نوێژدا ئاگادارم دەکردنەوە، بەڵام منیش مرۆڤم شتم بیرم دەچێتەوە، وەك چۆن ئێوە بیرتان دەچێت، جا ئەگەر بیرم چوو یادم بخەنەوە، وە هەر یەکێك لە ئێوە گومانی هەبوو لە نوێژەکەیدا با بگەڕێت بە دوای ڕاستییدا، لەسەر ئەوە نوێژەکەی تەواو بکات، پاشان سەلام بداتەوە و دوو سوژدە ببات.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەدا ئەگەر نوێژەکەی بونیادنا لەسەر (التَّحَرِّي) گەڕان، (کە بریتییە لەوەی نوێژخوێن دڵی زیاتر بۆ لای یەکێك لەو دوو ژمارە بچێت، وەکوو ئەوەی گومان بکات ئایا سێ ڕکاتی کردووە یان چوار، دواتر دڵی زیاتر بۆ ئەوە بچێت کە چواری کردووە)، ئەوە دوو سوژدەی سەهوو دەبات لە دوای سەلامدانەوە، وە (الْبِنَاءُ عَلَى الأَقَلِّ) ئەگەر بونیادینا لەسەر کەمترین ڕکات، ئەوە دوو سوژدەی سەهوو دەبات پێش سەلامدانەوە، لەسەر فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ، نابێت هیچ کام لە دوو فەرموودەکە بدەی لە یەکدی، (یەکێکیان وەربگرین و ئەوی دیکەیان فەرامۆش بکەین)، بەڵکوو پێویستە کار بە هەردوو فەرموودەکە بکەین لە جێگای خۆیدا، (التَّحَرِّي) گەڕان، بریتییە لەوەی نوێژخوێن دڵی زیاتر بۆ لای یەکێك لەو دوو ژمارە بچێت، وە (الْبِنَاءُ عَلَى الأَقَلِّ) بونیادنان لەسەر کەمترین ڕکات، وەکوو باسی (التَّحَرِّي) گەڕان نییە، بۆیە پێویستە هەردوو فەرموودەکە کاری پێ بکرێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْقِيَامِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْجُلُوسِ سَاهِيًا، وَالْمُضِيِّ فِي الصَّلَاةِ إِذَا اسْتَوَى الْمُصَلِّي قَائِمًا، وَإِيجَابِ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ عَلَى فَاعِلِهِ

١٠٢٩- عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةً نَظُنُّ أَنَّهَا الْعَصْرَ فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّانية قَامَ وَلَمْ يَجْلِسْ، فَلَمَّا كَانَ قَبْلَ التَّسْلِيمِ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَهُوَ جَالِسٌ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی هەستانەوە لە دووەم ڕکات پێش دانیشتن، بەسەهوو، وە بەردەوامبوون لە نوێژ ئەگەر نوێژخوێن هەستایەوە، وە پێویستبوونی دوو سوژدەی سەهوو لەسەر بکەرەکەی

واتە: ئیبنو بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژێکی پێکردین گومانمان وایە عەسر بوو، کاتێ گەیشتە ڕکاتی دووەم هەستایەوە و دانەنیشت، پێش سەلامدانەوە دوو سوژدەی سەهووی برد بە دانیشتنەوە.

**١٠٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةً مِنَ الصَّلَوَاتِ، فَقَامَ مِنَ اثْنَتَيْنِ فَسُبِّحَ بِهِ، فَمَضَى حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ وَلَمْ يَبْقَ إِلَّا التَّسْلِيمُ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ[1].

واتە: عەبدوڵای کوڕی بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژێك لە نوێژەکانی کرد، لە دووەم ڕکات هەستایەوە، (سبحان الله)ی بۆ کرا، بەردەوام بوو هەتا لە نوێژەکەی بۆیەوە، هیچ نەمایەوە جگە لە سەلامدانەوە، بە دانیشتنەوە دوو سوژدەی برد پێش سەلامدانەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا قَامَ مِنَ الثِّنْتَيْنِ فَاسْتَوَى قَائِمًا، ثُمَّ ذُكِّرَ بِتَسْبِيحٍ أَنَّهُ نَاسٍ لِلْجُلُوسِ، أَنَّ عَلَيْهِ الْمُضِيَّ فِي صَلَاتِهِ، تَرْكَ الرُّكُوعِ إِلَى الْجُلُوسِ، وَعَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ قَبْلَ السَّلَامِ

**١٠٣١-** عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[2].

## باسی ڕوونکردنەوەی ئەوە کە نوێژخوێن ئەگەر لە دووەم ڕکات هەستایەوە، پاشان بە (سبحان الله) بیریان خستەوە کە ئەو دانیشتنی بیر چووە، پێویستە لەسەری بەردەوام بێت لەسەر نوێژەکەی، هەروەها دوو سوژدەی سەهووی لەسەر پێویست دەبێت، پێش سەلام دانەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





واتە: ئیبنو بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین، باسی فەرموودەکەی کرد بە تێروتەسەلی.

**١٠٣٢-** عَنْ قَيسٍ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّهُ نَهَضَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَسَبَّحُوا بِهِ، فَاسْتَتَمَّ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ حِينَ انْصَرَفَ، ثُمَّ قَالَ: أَكُنْتُمْ تَرَوْنِي أَجْلِسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ[١].

واتە: قەیس دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ لە دووەم ڕکات هەستایەوە، (سبحان الله)یان بۆی کرد، نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان دوو سوژدەی سەهووی برد کاتێ کە لێ بۆیەوە، پاشان وتی: ئایا چاوەڕوان بوون دانیشمەوە، من بەو شێوەم کرد وەکوو چۆن پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کردی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِسَجْدَتَيِ السَّهْوِ إِذَا نَسِيَ الْمُصَلِّي شَيْئًا مِنْ صَلَاتِهِ

**١٠٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَسِيَ شَيْئاً مِنْ صَلَاتِهِ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە دوو سوژدەی سەهوو ئەگەر نوێژخوێن شتێکی بیر چوو لە نوێژەکەی

واتە: عەبدوڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شتێکی بیرچوو لەنێو نوێژەکەی با بەدانیشتەوە دوو سوژدە ببات.

## بَابُ التَّسْلِيمِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ سَاهِيًا فِي الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ أَوِ الْعِشَاءِ وَإِبَاحَةِ الْبِنَاءِ عَلَى مَا قَدْ صَلَّى الْمُصَلِّي قَبْلَ تَسْلِيمِهِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ سَاهِيًا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السَّلَامَ سَاهِيًا قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ لَا تُفْسِدُ الصَّلَاةَ

---

(١) ظاهر إسناده صحيح، ولم يتبين لي الوهم الذي أشار إليه المصنف.

(٢) إسناده ضعيف.




**١٠٣٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى، فَسَهَا، فَسَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ: «مَا قَصُرَتِ الصَّلَاةُ وَمَا نَسِيتُ، فَقَالَ: أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟» فَقَامَ فَصَلَّى ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[1].

## باسی سەلامدانەوە بە سەهوو لە دووەم ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆ، یان عەسر یان عیشا، ڕێگەیش دراوە نوێژخوێن بونیادی نوێژەکەی بنێت لەسەر ئەو دوو ڕکاتەی کردوویەتی پێش سەلامدانەوەی، بەسەهوو، بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەلامدانەوەی سەهوو پێش تەواوبوونی نوێژ، نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە

واتە: ئیبنو عومر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد و سەهووی کرد، لە دووەم ڕکاتدا سەلامی دایەوە، (ذُو الْيَدَيْنِ) پێی وت: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە یان بیرت چوو؟ فەرمووی: نە نوێژ کورتکراوەتەوە و نە بیرم چوو، ئینجا فەرمووی: ئایا ئەوەی (ذُو الْيَدَيْنِ) دەیڵێ تەواوە؟ (وتیان: بەڵێ)، ئینجا هەستا نوێژی کرد، پاشان دوو سوژدەی سەهووی برد.

## بَابُ إِيجَابِ سَجْدَتَي السَّهْوِ عَلَى الْمُسْلِمِ قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ سَاهِياً، وَالدَّلِيلِ أَنَّ هَاتَيْنِ السَّجْدَتَيْنِ إِنَّمَا يَسْجُدُهُمَا الْمُصَلِّي بَعْدَ السَّلَامِ لَا قَبْلُ

**١٠٣٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلَاتَيِ الْعَشِيِّ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَأَتَى خَشَبَةً مَعْرُوضَةً فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ بِيَدَيْهِ عَلَيْهَا، كَأَنَّهُ غَضْبَانُ قَالَ: وَخَرَجَتِ السَّرَعَانُ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالُوا: قَصُرَتِ الصَّلَاةُ، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، فَهَابَاهُ أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ فِي يَدَيْهِ طُولٌ، فَكَانَ يُسَمَّى ذَا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتِ الصَّلَاةُ؟ فَقَالَ:لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تَقْصُرِ الصَّلَاةُ، فَقَالَ: أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟ قَالُوا: نَعَمْ قَالَ: فَجَاءَ فَصَلَّى مَا كَانَ تَرَكَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ قَالَ: فَكَانَ رُبَّمَا قَالُوا لَهُ: ثُمَّ سَلَّمَ، فَيَقُولُ: نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی دوو سوژدەی سەهوو پێویست (واجب) دەبێت لەسەر مسوڵمان پێش ئەوەی لەو نوێژە ببێتەوە کە سەهووی تێدا کردووە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەم دوو سوژدەیەی نوێژخوێن دوای سەلامدانەوە سوژدە دەبات نەك پێش سەلامدانەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك نوێژی (نیوەڕۆ یان عەسری) بۆ کردین، دوو ڕکاتی کرد پاشان سەلامی دایەوە، پاشان چووە سەر تەختەیەکی ڕاخراو لەنێو مزگەوت دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا، وەکوو ئەوەی تورە بووبێت، وتی: خەڵکی بەپەلە لە دەرگای مزگەوتەوە دەرچوو، وتیان: نوێژ کورتکراوەتەوە، ئەبو بەکرو عومەریش ﷺ لەنێو خەڵکەکەدا بوون جورئەتیان نەکرد قسەی لەگەڵدا بکەن، وە لەنێو خەڵکەکەدا پیاوێکیان تێدابوو دەستەکانی درێژبوون، دەوترا: (ذُو الْيَدَيْنِ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا نوێژەکەت بیرچوو، یان نوێژ کورت کراوەتەوە؟ فەرمووی: نوێژم بیرنەچوو کورتیش نەکراوەتەوە، بە خەڵکەکەی فەرموو: ئایا قسەکەی (ذُو الْيَدَيْنِ) تەواوە؟ وتیان: بەڵێ، پاشان ئەو بەشەی نەیکردبوو کردی، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان تەکبیری کرد و سوژدەی برد وەکوو سوژدەکەی دیکەی یان درێژتر لەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان تەکبیری کرد و سوژدەی برد وەکوو ئەو سوژدەیە یان درێژتر لەئەو، پاشان سەری بەرز کردەوە و تەکبیری کرد، وتی: جا بە (موحەممەد)یان وت: پاشان سەلامی دایەوە؟ ئەویش وتی: هەواڵم پێگەیشت لە عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ وتی: پاشان سەلامی دایەوە.

**١٠٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَهُ يَعْنِي أَنَّهُ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ يَوْمَ جَاءَهُ ذُو الْيَدَيْنِ بَعْدَ التَّسْلِيمِ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، واتە: پێغەمبەر ﷺ دوو سوژدەی سەهووی برد لە دوای سەلامدانەوە ئەو ڕۆژەی (ذُو الْيَدَيْنِ) هات بۆ خزمەتی.

---

(١) صحيح.




**١٠٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعَصْرَ فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: أَقُصِرَتِ الصَّلَاةُ يَا رَسُولَ اللَّه ﷺ أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ»، فَقَالَ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: «أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟» فَقَالُوا: نَعَمْ، فَأَتَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلَاةِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ التَّسْلِيمِ[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین لە دووەم ڕکاتی نوێژی عەسر سەلامی دایەوە، (ذُو الْيَدَيْنِ) هەستا وتی: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان بیرت چوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کام لەوانە نەبووە، وتی: یەکێك لەوانە بوو ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە فەرمووی: ئایا (ذُو الْيَدَيْنِ) ڕاست دەکات، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی مابۆیەوە لە نوێژەکە تەواوی کرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو سوژدەی سەهووی برد لە دوای سەلامدانەوە.**

**١٠٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ فَذَكَرَ الْقِصَّةَ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَأَبُو هُرَيْرَةَ يُخْبِرُ أَنَّهُ شَهِدَ هَذِهِ الصَّلَاةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الَّتِي فِيهَا هَذِهِ الْقِصَّةُ، فَكَيْفَ تَكُونُ قِصَّةُ ذِي الْيَدَيْنِ هَذِهِ قَبْلَ نَهْيِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ؟ وَابْنُ مَسْعُودٍ يُخْبِرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْلَمَهُ عِنْدَ رُجُوعِهِ مِنْ أَرْضِ الْحَبَشَةِ لَمَّا سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ مِمَّا أَحْدَثَ اللَّهُ أَنْ لَا يَتَكَلَّمُوا فِي الصَّلَاةِ، وَرُجُوعُ ابْنِ مَسْعُودَ مِنْ أَرْضِ الْحَبَشَةِ كَانَ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، إِذِ ابْنُ مَسْعُودٍ قَدْ كَانَ شَهِدَ بَدْرًا، وَادَّعَى أَنَّهُ قَتَلَ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ يَوْمَئِذٍ، قَدْ أَمْلَيْتُ هَذِهِ الْقِصَّةَ فِي كِتَابِ الْجِهَادِ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ إِنَّمَا قَدِمَ الْمَدِينَةَ بَعْدَ بَدْرٍ بِسِنِينَ، قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ بِخَيْبَرَ، وَقَدِ اسْتَخْلَفَ عَلَى الْمَدِينَةِ سِبَاعَ بْنَ عُرْفُطَةَ الْغِفَارِيَّ.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ کردن، دواتر باسی ڕووداوەکەی کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ هەواڵیداوە ئەو ئامادەی ئەو نوێژە بووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کە ئەو ڕووداوەی تێدا بوو، ئیدی چۆن دەبێت ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْن) پێش ئەوە بێت کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد قسە لەنێو نوێژدا بکرێت؟ وە ئیبنو مەسعود ﷺ هەواڵیداوە کاتێ گەڕایەوە لە زەوی حەبەشە و سڵاوی لە پێغەمبەر ﷺ کرد (لەنێو نوێژدا) پێی فەرموو: بێگومان ئەوەی خوا دایناوە ئەوەیە لە نوێژدا قسە نەکەن، جا گەڕانەوەی ئیبنو مەسعود ﷺ لە زەوی حەبەشە پێش جەنگی بەدر بوو، چونکە ئیبنو مەسعود ﷺ بەشداری جەنگی بەدری کرد، وە بانگەشەی ئەوەی کرد ئەو ئەبو جەهلی کوڕی هیشامی لەو ڕۆژەدا کوشت، ئەم باسەم لە کتێبی جیهاد بە تێروتەسەلی باس کردووە، ئەبو هورەیرەیش ﷺ چەند ساڵێك دوای بەدر هات بۆ مەدینە، پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو، سیباعی کوڕی عورفوتە غفاری کردبووە جێنشینی خۆی لە مەدینە.

**١٠٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ بِخَيْبَرَ، وَقَدِ اسْتُخْلِفَ عَلَى الْمَدِينَةِ سِبَاعُ بْنُ عُرْفُطَةَ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: صَحِبْتُ النَّبِيَّ ﷺ ثَلَاثَ سَنَوَاتٍ. وَأَبُو هُرَيْرَةَ إِنَّمَا صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ بِخَيْبَرَ وَبَعْدَهُ، وَهُوَ يُخْبِرُ أَنَّهُ شَهِدَ هَذِهِ الصَّلَاةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَنْ يَزْعُمُ أَنَّ خَبَرَ ابْنَ مَسْعُودٍ نَاسِخٌ لِقِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ لَوْ تَدَبَّرَ الْعِلْمَ وَتَرَكَ الْعِنَادَ وَلَمْ يُكَابِرْ عَقْلُهُ عَلِمَ اسْتِحَالَةَ هَذِهِ الدَّعْوَى، إِذْ مُحَالٌ أَنْ يَكُونَ الْمُتَأَخِّرُ مَنْسُوخًا، وَالْمُتَقَدِّمُ نَاسِخًا، وَقِصَّةُ ذِي الْيَدَيْنِ بَعْدَ نَهْيِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ بِسِنِينَ، فَكَيْفَ يَكُونُ الْمُتَأَخِّرُ مَنْسُوخًا وَالْمُتَقَدِّمُ نَاسِخًا، عَلَى أَنَّ قِصَّةَ ذِي الْيَدَيْنِ لَيْسَ مِنْ نَهْيِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ بِسَبِيلٍ، وَلَيْسَ هَذَا مِنْ ذَلِكَ الْجِنْسِ، إِذِ الْكَلَامُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْعَمْدِ مِنَ الْمُصَلِّي مُبَاحٌ، وَالْمُصَلِّيَ عَالِمٌ مُسْتَيْقِنٌ أَنَّهُ فِي الصَّلَاةِ فَنُسِخَ ذَلِكَ، وَزُجِرُوا أَنْ يَتَعَمَّدُوا الْكَلَامَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى مَا كَانَ قَدْ أُبِيحَ لَهُمْ قَبْلُ، لَا أَنَّهُ كَانَ أُبِيحَ لَهُمْ أَنْ يَتَكَلَّمُوا فِي الصَّلَاةِ سَاهِينَ نَاسِينَ لَا يَعْلَمُونَ أَنَّهُمْ فِي الصَّلَاةِ فَنُسِخَ ذَلِكَ وَهَلْ يَجُوزُ لِلْمُرَكَّبُ فِيهِ الْعَقْلُ، يَفْهَمُ أَدْنَى شَيْءٍ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ يَقُولَ: زَجَرَ اللَّهُ الْمَرْءَ إِذَا لَمْ يَعْلَمْ أَنَّهُ فِي الصَّلَاةِ أَنْ يَتَكَلَّمَ، أَوْ يَقُولُ نَهَى اللَّهُ الْمَرْءَ أَنْ يَتَكَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ وَهُوَ لَا يَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ زَجَرَ عَنِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ، وَإِنَّمَا يَجِبُ عَلَى الْمَرْءِ أَنْ لَا يَتَكَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ بَعْدَ عِلْمِهِ أَنَّ الْكَلَامَ فِي الصَّلَاةِ مَحْظُورٌ غَيْرُ مُبَاحٍ. وَمُعَاوِيَةُ بْنُ الْحَكَمِ السُّلَمِيُّ إِنَّمَا تَكَلَّمَ وَهُوَ لَا يَعْلَمُ أَنَّ الْكَلَامَ فِي الصَّلَاةِ مَحْظُورٌ، فَقَالَ فِي الصَّلَاةِ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ لَمَّا شَمَّتَ الْعَاطِسَ، وَرَمَاهُ الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، وَاثُكْلَ أُمِّيَاهُ، مَا لَكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ،




فَلَمَّا تَكَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ بِهَذَا الْكَلَامِ، وَهُوَ لا يَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْكَلَامَ مَحْظُورٌ فِي الصَّلَاةِ عَلَّمَهُ ﷺ أَنَّ كَلَامَ النَّاسِ فِي الصَّلَاةِ مَحْظُورٌ غَيْرُ جَائِزٍ، وَلَمْ يَأْمُرْهُ ﷺ بِإِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلَاةِ الَّتِي تَكَلَّمَ فِيهَا بِهَذَا الْكَلَامِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ إِنَّمَا تَكَلَّمَ عَلَى أَنَّهُ فِي غَيْرِ الصَّلَاةِ، وَعَلَى أَنَّهُ قَدْ أَدَّى فَرْضَ الصَّلَاةِ بِكَمَالِهِ، وَذُو الْيَدَيْنِ كَلَّمَ النَّبِيَّ ﷺ، وَهُوَ غَيْرُ عَالِمٍ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ الْفَرْضِ إِذْ جَائِزٌ عِنْدَهُ أَنْ يَكُونَ الْفَرْضُ قَدْ رُدَّ إِلَى الْفَرْضِ الْأَوَّلِ إِلَى رَكْعَتَيْنِ، كَمَا كَانَ فِي الِابْتِدَاءِ أَلَا تَسْمَعُهُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَأَجَابَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِأَنَّهُ لَمْ يَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ، وَهُوَ عِنْدَ نَفْسِهِ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ غَيْرُ مُسْتَيْقِنٍ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ تِلْكَ الصَّلَاةِ فَاسْتَثْبَتَ أَصْحَابَهُ، وَقَالَ لَهُمْ: أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَنَ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ رَكْعَتَانِ مِنْ تِلْكَ الصَّلَاةِ قَضَاهُمَا فَلَمْ يَتَكَلَّمْ ﷺ فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ بَعْدَ عِلْمِهِ وَيَقِينِهِ بِأَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ تِلْكَ الصَّلَاةِ، فَأَمَّا أَصْحَابُهُ الَّذِينَ أَجَابُوهُ وَقَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ مَسْأَلَتِهِ إِيَّاهُمْ: أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَهَذَا كَانَ الْجَوَابُ الْمَفْرُوضُ عَلَيْهِمْ أَنْ يُجِيبُوهُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَإِنْ كَانُوا فِي الصَّلَاةِ عَالِمِينَ مُسْتَيْقِنِينَ أَنَّهُمْ فِي نَفْسِ فَرْضِ الصَّلَاةِ إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَرَّقَ بَيْنَ نَبِيِّهِ الْمُصْطَفَى وَبَيْنَ غَيْرِهِ مِنْ أُمَّتِهِ بِكَرَمِهِ لَهُ وَفَضْلِهِ بِأَنْ أَوْجَبَ عَلَى الْمُصَلِّينَ أَنْ يُجِيبُوهُ وَإِنْ كَانُوا فِي الصَّلَاةِ فِي قَوْلِهِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفال، وَقَدْ قَالَ الْمُصْطَفَى ﷺ لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَلِأَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى لَمَّا دَعَا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى الِانْفِرَادِ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَلَمْ يُجِبْهُ حَتَّى فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ: أَلَمْ تَسْمَعْ فِيمَا أُنْزِلَ عَلَيَّ أَوْ نَحْوَ هَذِهِ اللَّفْظَةِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفال، قَدْ خَرَّجْتُ هَذَيْنِ الْخَبَرَيْنِ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ، فَبَيْنَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ فِي كَلَامِهِمُ الَّذِي تَكَلَّمُوا بِهِ يَوْمَ ذِي الْيَدَيْنِ، وَكَلَامُ ذِي الْيَدَيْنِ عَلَى الصِّفَةِ الَّتِي تَكَلَّمَ بِهَا، وَبَيْنَ مَنْ بَعْدَهُمْ فَرْقٌ فِي بَعْضِ الْأَحْكَامِ، أَمَّا كَلَامُ ذِي الْيَدَيْنِ فِي الِابْتِدَاءِ فَغَيْرُ جَائِزٍ لِمَنْ كَانَ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِمِثْلِ كَلَامِ ذِي الْيَدَيْنِ، إِذْ كُلُّ مُصَلٍّ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا سَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ يَعْلَمُ وَيَسْتَيْقِنُ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ رَكْعَتَانِ مِنْ صَلَاتِهِ إِذِ الْوَحْيُ مُنْقَطِعٌ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ، وَمُحَالٌ أَنْ يُنْتَقَصَ مِنَ الْفَرْضِ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَكُلُّ مُتَكَلِّمٍ يَعْلَمُ أَنَّ فَرْضَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ أَرْبَعًا، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى الِانْفِرَادِ، إِذَا تَكَلَّمَ بَعْدَ مَا قَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَبَقِيَتْ عَلَيْهِ رَكْعَتَانِ عَالِمٌ مُسْتَيْقِنٌ بِأَنَّ كَلَامَهُ ذَلِكَ مَحْظُورٌ عَلَيْهِ، مَنْهِيٌّ عَنْهُ، وَأَنَّهُ مُتَكَلِّمٌ قَبْلَ إِتْمَامِهِ فَرْضَ الصَّلَاةِ، وَلَمْ يَكُنْ ذُو الْيَدَيْنِ لَمَّا سَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ عَالِمًا، وَلَا مُسْتَيْقِنًا بِأَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ الصَّلَاةِ، وَلَا كَانَ عَالِمًا أَنَّ الْكَلَامَ مَحْظُورٌ عَلَيْهِ، إِذْ كَانَ جَائِزٌ عِنْدَهُ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ أَنْ يَكُونَ فَرْضُ تِلْكَ الصَّلَاةِ قَدْ رُدَّ إِلَى الْفَرْضِ الْأَوَّلِ إِلَى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ فِي

الِابْتِدَاءِ، وَقَوْلُهُ فِي مُخَاطَبَتِهِ النَّبِيَّ ﷺ دَالٌّ عَلَى هَذَا، أَلَا تَسْمَعُهُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ؟ وَقَدْ بَيَّنْتُ الْعِلَّةَ الَّتِي لَهَا تَكَلَّمَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لِذِي الْيَدَيْنِ: لَمْ أَنْسَ، وَلَمْ تَقْصُرْ، وَأَعْلَمْتُ أَنَّ الْوَاجِبَ الْمُفْتَرَضَ عَلَيْهِمْ كَانَ أَنْ يُجِيبُوا النَّبِيَّ ﷺ وَإِنْ كَانُوا فِي الصَّلَاةِ، وَهَذَا الْفَرْضُ الْيَوْمَ سَاقِطٌ غَيْرُ جَائِزٍ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُجِيبَ أَحَدًا، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ - بِنُطْقٍ، فَكُلُّ مَنْ تَكَلَّمَ بَعْدَ انْقِطَاعِ الْوَحْيِ فَقَالَ لِمُصَلٍّ قَدْ سَلَّمَ مِنْ رَكْعَتَيْنِ أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَوَاجِبٌ عَلَيْهِ إِعَادَةُ تِلْكَ الصَّلَاةِ إِذَا كَانَ عَالِمًا أَنَّ فَرْضَ تِلْكَ الصَّلَاةِ أَرْبَعٌ لَا رَكْعَتَانِ، وَكَذَاكَ يَجِبُ عَلَى كُلِّ مَنْ تَكَلَّمَ وَهُوَ مُسْتَيْقِنٌ بِأَنَّهُ لَمْ يُؤَدِّ فَرْضَ تِلْكَ الصَّلَاةِ بِكَمَالِهِ، فَتَكَلَّمَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ مِنْهَا فِي رَكْعَتَيْنِ، أَوْ بَعْدَمَا سَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَكَذَاكَ يَجِبُ عَلَى كُلِّ مَنْ أَجَابَ إِنْسَانًا وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ إِعَادَةُ تِلْكَ الصَّلَاةِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَجْعَلْ لِبَشَرٍ أَنْ يُجِيبَ فِي الصَّلَاةِ أَحَدًا فِي الصَّلَاةِ غَيْرَ النَّبِيِّ ﷺ، الَّذِي خَصَّهُ اللَّهُ بِهَا، وَهَذِهِ مَسْأَلَةٌ طَوِيلَةٌ، قَدْ خَرَّجْتُهَا بِطُولِهَا مَعَ ذِكْرِ احْتِجَاجِ بَعْضِ مَنِ اعْتَرَضَ عَلَى أَصْحَابِنَا فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ، وَأُبَيِّنُ قُبْحَ مَا احْتَجُّوا عَلَى أَصْحَابِنَا فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ مِنَ الْمُحَالِ وَمَا يُشْبِهُ الْهَذَيَانَ، إِنْ وَفَّقَنَا اللَّهُ[1].

**واتە: واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو، سیباعی کوڕی عورفوتە کرابوو بە جێنشینی لە مەدینە.**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سێ ساڵ هاوەڵی پێغەمبەرم ﷺ کرد. وە ئەبو هورەیرە ﷺ لە خەیبەر و دوای خەیبەریش هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ کرد، ئەو هەواڵی داوە ئامادەی ئەو نوێژە بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، جا هەر کەسێك گومان ببات فەرموودەکەی ئیبنو مەسعود ﷺ هەڵوەشێنەرەوەی ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْن)ە، ئەگەر سەرنجی زانست بدات و واز لە کەللەڕەقی بهێنێ و فیز و تەکەبور نەکات بەسەر عەقڵیدا، بێگومان لەمە تێدەگات، چونکە ئەستەمە حوکمی ئەو ڕووداوەی دواکەوتووە نەسخکراو بێت و ئەوەیشی لە پێشتر بوو نەسخکەرەوە بێت، وە ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْن) چەند ساڵێك لە دوای قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ بوو لە قسەکردن لەنێو نوێژ، ئیدی چۆن دەبێت ئەوەی دواکەوتووە حوکمەکەی نەسخکراو بێت و ئەویشی لە پێشتر بووە نەسخکەرەوە بێت، لەگەڵ ئەوەدا ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْن) لە قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە قسەکردن لەنێو نوێژدا، ئەمە لەو شێوازە نییە، چونکە قسەکردن لەنێو نوێژ بە ئەنقەست لەلایەن

---

(١) صحيح.

نوێژخوێنەوە شتێکی ڕێگەپێدراو بوو، نوێژخوێن لە کاتی قسەکردنی دەیزانی لەنێو نوێژدایە، ئەوە نەسخ کرایەوە، وە سەرزەنشکردن لەوەی بە ئەنقەست قسە بکەن لەنێو نوێژدا وەك پێشتر ڕێگایان پێدرابوو، نەك بەو مانایەی ئەوان ڕێگەیان پێدرابوو لە نوێژدا بە سەهوو قسە بکەن و نەزانن لە نوێژدان، ئەوە نەسخ کرابێتەوە، ئایا دروستە کەسێك عەقڵی پێدرابێت و کەمترین تێگەیشتنی لە زانست پێبەخشرا بێت بڵێ: خوا سەرزەنشتی کردووە لەوەی بەندە قسە بکات کاتێ کە نەزانێ لە نوێژدایە، یان بڵێ: خوا قەدەغەی کردووە لە بەندە لەنێو نوێژدا قسە بکات، لە کاتێکدا ئەو نازانێت خوا سەرزەنشتی کردووە لەنێو نوێژ قسە بکرێ، بەڵکوو پێویستە لەسەر بەندە قسە نەکات لە نوێژدا، دوای ئەوەی زانی قسەکردن لەنێو نوێژ قەدەغەیە و ڕێگەپێدراو نییە، موعاویەی کوڕی حەکەمی سوللەمی لە کاتێکدا قسەی کرد ئەو نەیدەزانی قسەکردن لەنێو نوێژ قەدەغەیە، لەنێو نوێژ لە پشت پێغەمبەر ﷺ قسەی کرد کاتێك کەسێك پژمی، خەڵکەکە تەماشایان کرد بە تەماشاکردنێکی سەرزەنشتانە، وتی: لەنێو چووم دایکم ونی کردم، چییە وا تەماشام دەکەن؟ کاتێ بەم شێوەیە قسەی کرد لەنێو نوێژ، ئەو نەیدەزانی قسەکردن لەنێو نوێژ قەدەغەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فێری کرد قسەکردنی مرۆڤ لەنێو نوێژ قەدەغەیە و نادروستە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ نەکرد ئەو نوێژە دووبارە بکاتەوە کە قسەی تێدا کرد، پێغەمبەریش ﷺ لە بەسەرهاتەکەی (ذُو الْيَدَيْن) بەو شێوە قسەی کرد کە لە نوێژدا نییە، وای زانی نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام داوە، وە (ذُو الْيَدَيْن)یش کە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد نەیزانی بەشێك لە نوێژە فەرزەکەی لەسەر ماوە، چونکە بەلایەوە دروست بوو نوێژ وەکوو جاری یەکەم بگەڕێتەوە بۆ دوو ڕکات، وەکوو چۆن سەرەتا دوو ڕکات بوو، ئایا نەتبیستووە بە پێغەمبەری ﷺ دەوت: (ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە یان بیرت چوو)؟ پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە بەوەی نە بیری چووە و نە کورتکراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ دڵنیا نەبوو بەشێك لە نوێژەکەی لەسەر ماوە، بۆیە پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد، پێی وتن: (ئایا بەو شێوەیە کە (ذُو الْيَدَيْن) دەیڵێ)؟ کاتێ دڵنیا بوو دوو ڕکاتی ماوە قەزای کردنەوە، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی زانی دوو ڕکاتی ماوە هیچ قسەی نەکرد، بەڵام هاوەڵەکانی کە وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە دوای ئەوەی پرسیاری لێ کردن: (ئایا بەو شێوەیە کە (ذُو الْيَدَيْن) دەیڵێ)؟ وتیان: بەڵێ، ئەوە پێویستە لەسەریان وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە ئەگەرچی دەزانن و دڵنیان لەنێو نوێژدان، چونکە خوا ﷻ

جیاوازی کردووە لە نێوان پێغەمبەرەکەی ﷺ و نێوان ئوممەتەکەی بە فەزڵ و شکۆی خۆی فەرزی کردووە لەسەر نوێژخوێنان وەڵامی بدەنەوە ئەگەرچی لە نوێژیشدا بن، لە فەرمایشتیدا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بدەنەوە کاتێك کە بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئایینەی) کە زیندووتان دەکاتەوە. پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەریەکە لە ئوبەی کوڕی کەعب و ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللای ﷺ بانگ کرد بەجیا جیا، کە هەر یەکێکیان لە نوێژدا بوو، وەڵامی نەدایەوە تا نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئایا ئەو ئایەتەت نەتبیستووە کە بۆم دابەزی: -یان هاوشێوەی ئەو دەستەواژەی فەرموو-: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئەم دوو فەرموودەم لە جێگایەکی دیکەدا باس کردووە، جا لە نێوان وتەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە قسەیان کرد لە ڕۆژی (ذُو الْيَدَيْن)، وە وتەی (ذُو الْيَدَيْن) لەسەر ئەو شێوەی قسەی کرد و لە نێوان دوای ئەوان جیاوازی هەیە لە هەندێ حوکمەکان، بەڵام وتەکەی (ذُو الْيَدَيْن) دروست نییە بۆ هیچ کەس لەدوای پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پێش نوێژەکەی بەکاری بهێنێت، چونکە هەموو نوێژخوێنێك دوای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سەلامی دایەوە لە دووەم ڕکاتی نیوەڕۆ یان عەسر دەزانێت و دڵنیایە دوو ڕکاتی دیکەی ماوە، بۆیە لەدوای پێغەمبەر ﷺ وەحی پچڕاوە و مەحاڵە فەرز کەم بکرێتەوە دوای پێغەمبەر ﷺ، هەموو قسەکەرێك دەزانێ هەر یەك فەرزی نیوەڕۆ و عەسر بەتەنها چوار ڕکاتە، ئەگەر دوای دوو ڕکات قسەی کرد، دوو ڕکاتیشی مابوو، چاك دەزانێت و دڵنیایە ئەو قسەی کە کردی حەرامە لەسەری و قەدەغەی لێکراوە، وە ئەو قسەی کردووە پێش تەواوبوونی نوێژە فەرزەکە، بەڵام کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە (ذُو الْيَدَيْن) نەیزانی و دڵنیا نەبوو هەندێ نوێژی فەرزی لەسەر ماوە، وە نەیشیزانی قسەکردن قەدەغەیە لەسەری، ئەوکاتە دروست بوو بەلایەوە ئەو نوێژە فەرزە وەکوو یەکەم جار ببێت بە دوو ڕکات، وەکوو چۆن لە سەرەتا بوو، وتەکەیش لە دواندنی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەمە، ئایا نەتبیستووە بە پێغەمبەری ﷺ دەوت: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە یان بیرت چوو؟ بێگومان هۆکاری قسەکردنی پێغەمبەرم ﷺ ڕوون کردەوە، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە (ذُو الْيَدَيْن)ی فەرموو: (نە بیرم چوو نە کورتکرایەوە)، وە ئەوەیشم باس کرد پێویستە و فەرزە لەسەریان وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە ئەگەرچی لەنێو نوێژیش بن، ئەم فەرزە

ئەمڕۆ لەسەر موسوڵمانان هەڵگیراوە (چونکە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردووە) بۆیە دروست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك لەنێو نوێژ وەڵامی کەسێکی دیکە بداتەوە بە قسەکردن، جا هەر کەسێك لە دوای پچڕاندنی وەحی بە پێشنوێژێك بڵێ کە دوو ڕکات نوێژی کردبێت: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە یان بیرت چوو؟ ئەوە پێویستە لەسەری نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەگەر زانی ئەو نوێژە فەرزە چوار ڕکاتە نەك دوو ڕکات، بەهەمان شێوە هەر کەسێك قسە بکات و دڵنیا بێت نوێژە فەرزەکەی تەواو نەکردووە پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، هەروەها هەر کەسێك لەنێو نوێژەکەی وەڵامی کەسێکی دیکە بداتەوە پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، چونکە خوا ڕێگەی نەداوە بە هیچ کەس لەنێو نوێژ وەڵامی کەسی دیکە بداتەوە جگە لە پێغەمبەر ﷺ کە خوا خۆی تایبەتی کردووە بەوە، ئەمە باسێکی درێژە، بەدرێژی تەخریجم کردووە لەگەڵ باسی بەڵگەهێنانەوەی هەندێ لەوانەی پێچەوانەی هاوەڵەکانی ئێمە بوون لەم مەسەلەیەدا، هەروەها ناشرینی ئەو بەڵگانەیان ڕوون دەکەمەوە کە کردوویانەتە بەڵگە لەسەر هاوەڵەکانمان لەم مەسەلەیەدا، کە شتێکی مەحاڵە و لە قسەی ناماقوڵ دەچێت و کەس لێی تێ ناگات، ئەگەر خوا تەوفیقمان بدات.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ، أَدْرَجَ لَفْظَهُ الزُّهْرِيُّ فِي مَتْنِ الْحَدِيثِ فَتَوَهَّمَ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ وَلَمْ يَكْتُبْ مِنَ الْحَدِيثِ إِلَّا نُتَفًا أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ تِلْكَ اللَّفْظَةَ الَّتِي قَالَهَا الزُّهْرِيُّ فِي آخِرِ الْخَبَرِ، وَتَوَهَّمَ أَيْضًا أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ الَّذِي زَادَ فِيهِ الزُّهْرِيُّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ خِلَافُ الْأَخْبَارِ الثَّابِتَةِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ يَوْمَ ذِي الْيَدَيْنِ بَعْدَمَا أَتَمَّ صَلَاتَهُ

١٠٤٠- عَنِ الزُّهْرِي عَنْ سَعِيدِ بنِ الْمُسَيَّبِ وَأَبِي سَلَمَةَ وَعُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الشِّمَالَيْنِ، مِنْ خُزَاعَةَ حَلِيفٌ لِبَنِي زُهْرَةَ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: كُلُّ لَمْ يَكُنْ فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: «أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟» قَالُوا: نَعَمْ، فَأَتَمَّ مَا بَقِيَ مِنْ صَلَاتِهِ، وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَي السَّهْوِ حِينَ يَقَّنَهُ النَّاسُ[١].

---

(١) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك گێردراوەتەوە دەربارەی ڕوداوەکەی (ذُو الْيَدَيْنِ)، زوهری دەستەواژەی خۆی خستۆتە نێو بنچینەی فەرموودەکە، جا ئەو کەسەی کە زۆر شارەزا نییە لە زانست و فەرموودەکانی نەنووسیوە چەند دانەیەکی کەم نەبێت، پێی وایە ئەوەی زوهری وتویەتی لە کۆتایی فەرموودەکە: (وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ حِينَ يَقَّنَهُ النَّاسُ) قسەی ئەبو هورەیرەیە، هەروەها پێی وایە ئەم فەرموودەیە کە زوهری ئەو دەستەواژەی تێدا زیاد کردووە پێچەوانەی فەرموودە جێگیرەکانە کە بریتیە لەوەی: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (ذُو الْيَدَيْنِ) دوای ئەوەی نوێژی تەواو کردبوو، سوژدەی برد**

واتە: زوهری دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەبو سەلەمە و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە لە دووەم ڕکات، (ذُو الشِّمَالَيْنِ) کە پیاوێك بوو لە هۆزی خوزاعە هاوپەیمانی نەوەکانی زوهرە پێی وت: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە یان بیرت چوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هیچ کام لەوانە نەبووە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە خەڵکەکە کرد و فەرمووی: ئایا (ذُو الْيَدَيْنِ) ڕاستی کرد؟ وتیان: بەڵێ، پاشان ئەوەی مابوو لە نوێژەکەی تەواوی کرد، دوو سوژدە سەهووەکەی نەبرد کاتێ خەڵك دڵنیایان کردەوە.

**١٠٤١-** عَنِ الزُّهْرِي عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَعُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بِهَذِهِ الْقِصَّةِ وَلَمْ يَذْكُرْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، وَانْتَهَى حَدِيثُهُ عِنْدَ قَوْلِهِ: فَأَتَمَّ مَا بَقِيَ مِنْ صَلَاتِهِ[1].

واتە: زوهری دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبە هەمان ڕووداو، باسی ئەبو هورەیرەی ﷺ نەکرد، فەرموودەکەیشی بەمە کۆتایی پێهێنا: ئەوەی مابوو لە نوێژەکەی تەواوی کرد.

**١٠٤٢-** عَنِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي بنِ المُسَيَّبِ وَأَبُو سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَن وَأَبُو بَكْر بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامِ وَعُبَيْدُ اللهِ بْنِ عَبْدِ الله بْنِ عُتْبَة، أن أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ أَوِ الْعَصْرَ، فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ مِنْ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَ لَهُ ذُو الشِّمَالَيْنِ ابْنُ عَبْدِ

---

(١) إسناده صحيح.




عَمْرِو بْنِ نَضْلَةَ الْخُزَاعِيُّ، وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي زُهْرَةَ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ»، قَالَ ذُو الشِّمَالَيْنِ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: «أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ»، قَالُوا: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَتَمَّ الصَّلَاةَ، وَلَمْ يُحَدِّثْنِي أَحَدٌ مِنْهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ فِي تِلْكَ الصَّلَاةِ وَذَلِكَ فِيمَا نَرَى - وَاللَّهُ أَعْلَمُ - مِنْ أَجْلِ أَنَّ النَّاسَ يَقَّنُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى اسْتَيْقَنَ[1].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیبنو موسەیب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان و ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبە هەواڵیان پێ دام، ئەبو هوڕەیڕە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری بۆ کردین لە دووەمین ڕکاتی یەکێکیان سەلامی دایەوە، (ذُو الشِّمَالَيْنِ)ی کوڕی عەبدی عەمری کوڕی نەزلەی خوزاعی ﷺ هاوپەیمانی نەوەکانی زەهرە پێی وت: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان بیرت چوو ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە بیرم چوو نە کورتکراوەتەوە، (ذُو الشِّمَالَيْنِ) وتی: شتێکی لەو شێوە ڕووی دا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئایا (ذُو الْيَدَيْنِ) ڕاستی دەڵێ؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژەکەی تەواو کرد. (ئیبنو شیهابی زوهری) دەڵێ: هیچ یەکێك لە ئەوان بۆیان باس نەکردم پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نوێژەدا بە دانیشتنەوە دوو سوژدەی سەهووی بردبێت، ئەویش لەبەر ئەوە بووە بە بۆچوونی ئێمە -خوا زاناترە- خەڵکەکە پێغەمبەری خوایان ﷺ دڵنیا کردەوە لە دوو ڕکاتەکە تا دڵنیا بوو.**

**١٠٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ أَوِ الْعَصْرَ[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری بۆ کردین.**

**١٠٤٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ عَنْ رَجُلٍ سَهَا فِي صَلَاتِهِ، فَتَكَلَّمَ، فَقَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَأَبُو سَلَمَةَ، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: ثُمَّ ذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِهِمْ فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ[3].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

**واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەمر دەڵێ: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی پیاوێك لە نوێژەکەیدا بە سەهوو قسە بکات؟ وتی: سەعیدی کوڕی موسەیب هەواڵی پێداوم، هەروەها ئەبو سەلەمە و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵایش، ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: پاشان وەك فەرموودەکەیانی باس کرد لە ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْنِ).**

**١٠٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَسْجُدْ يَوْمَ ذِي الْيَدَيْنِ(١).

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی (ذُو الْيَدَيْنِ) سوژدەی سەهووی نەبرد.**

**١٠٤٦-** وَحَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَأَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ(٢).

**واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.**

**١٠٤٧-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي(٣).

**واتە: ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەسەمە ﷺ دەڵێ: پێمگەیشتوە (واتە: ئەم فەرموودەی پێگەیشتوە).**

**١٠٤٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ بِهَذَا الْخَبَرِ(٤).

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەسەمە ﷺ هەواڵی پێداوە ئەو پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم فەرموودەی فەرموو.**

**١٠٤٩-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَهَا فِي صَلَاتِهِ(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٤) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٥) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

واتە: ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەیدا سەهووی کرد.

١٠٥٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ مِثْلَ ذَلِكَ[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان بەهەمان شێوە گێڕایانەوە.

١٠٥١- عَنْ صَالِحٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي هَذَا الْخَبَرَ، سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ[٢].

واتە: صاڵح دەڵێ: ئیبنو شیهاب دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەیب لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بۆ باس کردم.

## بَابُ ذِكْرِ التَّسْلِيمِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ سَاهِيًا وَالدَّلِيلِ عَلَى الْفَرْقِ بَيْنَ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ سَاهِيًا وَبَيْنَ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ عَامِدًا، إِذْ مُخَالِفُونَا مِنَ الْعِرَاقِيِّينَ يُتَابِعُونَا عَلَى الْفَرْقِ بَيْنَ السَّلَامِ قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ عَامِدًا وَبَيْنَ السَّلَامِ سَاهِيًا، فَيُوجِبُونَ عَلَى الْمُسَلِّمِ عَامِدًا إِعَادَةَ الصَّلَاةِ، وَيُبِيحُونَ لِلْمُسَلِّمِ نَاسِيًا فِي الصَّلَاةِ إِتْمَامَ الصَّلَاةِ وَالْبِنَاءَ عَلَى مَا قَدْ صَلَّى قَبْلَ السَّلَامِ

١٠٥٢- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حُدَيْجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى يَوْمًا فَسَلَّمَ وَانْصَرَفَ وَقَدْ بَقِيَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةٌ[٣].

**باسی سەلامدانەوە لە دووەم ڕکاتی نوێژی ئێوارە، بەسەهوو، بەڵگەش لەسەر جیاوازی لە نێوان ئەوەی کەسێك بەسەهوو قسە لەنێو نوێژەکەی بکات، کەسێکیش بەئەنقەست قسە لەنێو نوێژەکەیدا بکات، جا ئەوانەی پێچەوانەمانن لە عێراقییەکان لەمەدا شوێنمان دەکەون، لە جیاوازی لە نێوان سەلامدانەوە پێش تەواوبوونی نوێژ بەئەنقەست، وە لە نێوان سەلامدانەوە**

---

(١) هذا الحديث معلول بالإضطراب.

(٢) انظر التعليق السابق.

(٣) صحيح.

**بەسەهوو، ئەو کەسەی بەئەنقەست سەلامی داوەتەوە پێویستی دەکەن لەسەری نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەو کەسەی بەسەهوو سەلامی داوەتەوە لە نوێژەکەیدا، نوێژەکەی تەواو بکات و بونیاد لەسەر ئەو نوێژە بنێت کە پێش سەلامدانەوە کردوویەتی**

واتە: موعاویەی کوڕی حودەیج ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی کرد، پاشان سەلامی دایەوە و ڕۆیشت، نوێژەکە یەك ڕکاتی مابوو.

**١٠٥٣-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حُدَيْجٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَهَا فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ سَهَوْتَ فَسَلَّمْتَ فِي رَكْعَتَيْنِ، فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ أَتَمَّ تِلْكَ الرَّكْعَةَ وَسَأَلْتِ النَّاسُ عَنِ الرَّجُلِ الَّذِي قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ سَهَوْتَ، فَقِيلَ لِي: تَعْرِفُهُ؟ قُلْتُ: لَا، إِلَّا أَنْ أَرَاهُ، فَمَرَّ بِي رَجُلٌ فَقُلْتُ: هُوَ هَذَا قَالُوا: هَذَا طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ الْقِصَّةُ غَيْرُ قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ؛ لِأَنَّ الْمُعْلِمَ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُ سَهَا فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَمُخْبِرُ النَّبِيِّ ﷺ فِي تِلْكَ الْقِصَّةِ ذُو الْيَدَيْنِ، وَالسَّهْوُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ إِنَّمَا كَانَ فِي الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، وَفِي هَذِهِ الْقِصَّةِ إِنَّمَا كَانَ السَّهْوُ فِي الْمَغْرِبِ لَا فِي الظُّهْرِ، وَلَا فِي الْعَصْرِ. وَقِصَّةُ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قِصَّةُ الْخِرْبَاقِ، قِصَّةٌ ثَالِثَةٌ؛ لِأَنَّ التَّسْلِيمَ فِي خَبَرِ عِمْرَانَ مِنَ الرَّكْعَةِ الثَّالِثَةِ، وَفِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ، وَفِي خَبَرِ عِمْرَانَ دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ حُجْرَتَهُ، ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْحُجْرَةِ، وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى خَشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَكُلُّ هَذِهِ أَدِلَّةٌ أَنَّ هَذِهِ الْقِصَصَ هِيَ ثَلَاثُ قِصَصٍ: سَهَا النَّبِيُّ ﷺ مَرَّةً فَسَلَّمَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ، وَسَهَا مَرَّةً أُخْرَى فَسَلَّمَ فِي ثَلَاثِ رَكَعَاتٍ، وَسَهَا مَرَّةً ثَالِثَةً فَسَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ، فَتَكَلَّمَ فِي الْمَرَّاتِ الثَّلَاثِ، ثُمَّ أَتَمَّ صَلَاتَهُ.

واتە: موعاویەی کوڕی حودەیج ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد لە دووەم ڕکاتی (ئێوارە) سەلامی دایەوە پاشان ڕۆیشت، پیاوێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ سەهووت کرد لە دووەم ڕکات سەلامت دایەوە، فەرمانی کرد بە بیلال ﷺ قامەتی کرد بۆ نوێژ، پاشان ئەو ڕکاتەی تەواو کرد، خەڵك پرسیاریان کرد دەربارەی ئەو پیاوەی کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سەهووت کرد، پێم وترا: دەیناسیت، وتم:

---

(١) صحيح.

نەخێر مەگەر ببینم، دواتر پیاوێك بەلامدا تێپەڕ بوو وتم: ئەوە خۆیەتی، وتیان: ئەوە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵایە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم ڕووداوە جیایە لە ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْنِ)ە، چونکە ئەو کەسەی لەم ڕووداوەدا پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردەوە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺ بوو، وە ئەوەیشی پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردەوە لە ڕوداوەکەی دیکە (ذُو الْيَدَيْنِ) بوو، سەهووکردنەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووداوەکەی (ذُو الْيَدَيْنِ) لە نوێژی نیوەڕۆ یان عەسردا بوو، بەڵام لەم ڕووداوەدا سەهووەکە لە نوێژی ئێوارەدا بوو نەك نیوەڕۆ یان عەسر، وە ڕووداوی سێیەم ئەوەیە کە عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە لە ڕووداوەکەی خیرباق، چونکە سەلامدانەوە لە فەرموودەکەی عیمڕان لە ڕکاتی سێیەمدا بوو، لە ڕووداوی (ذُو الْيَدَيْنِ)یش لە ڕکاتی دووەمدا بوو، لە فەرموودەکەی عیمڕان ﷺ هاتووە پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەکەیەوە و پاشان لە ژوورەکەی دەرچوو، لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە پێغەمبەر ﷺ چووە سەر تەختەیەکی ڕاخراو لەنێو مزگەوت، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم ڕووداوانە سێ ڕووداون، پێغەمبەر ﷺ جارێك لە دووەم ڕکات سەهووی کرد، جارێکی دیکەش لە سێیەم ڕکات، جاری سێیەمیش لە دووەم ڕکاتی نوێژی ئێوارە، لە هەرسێ جارەکەدا قسەی کرد، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْجُلُوسِ فِي الثَّالِثَةِ، وَالتَّسْلِيمِ مِنْهَا سَاهِيًا فِي الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ أَوِ الْعِشَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى إِغْفَالِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُسْلِمَ سَاهِيًا فِي الثَّالِثَةِ إِذَا تَكَلَّمَ بَعْدَ السَّلَامِ وَهُوَ غَيْرُ ذَاكِرٍ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ صَلَاتِهِ أَنَّ عَلَيْهِ إِعَادَةَ الصَّلَاةِ، وَهَذَا الْقَوْلُ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ

**١٠٥٤-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثِ رَكَعَاتٍ مِنَ الْعَصْرِ، ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ الْحُجْرَةَ، فَقَامَ الْخِرْبَاقُ رَجُلٌ بَسِيطُ الْيَدَيْنِ، فَنَادَاهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ؟ فَخَرَجَ مُغْضَبًا يَجُرُّ إِزَارَهُ، فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ، فَصَلَّى تِلْكَ الصَّلَاةَ الَّتِي كَانَ تَرَكَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ[١].

---

(١) صحيح.

**باسی دانیشتن لە سێیەم ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر یان عیشا و سەلامدانەوە بەسەهوو، بەڵگەش لەسەر بێئاگایی ئەوەی کە پێی وایە ئەو کەسەی لە سێیەم ڕکات سەلام بداتەوە بەسەهوو، ئەگەر دوای سەلامدانەوە قسەی کرد نەیزانی هەندێ لە نوێژەکەی ماوە پێویستە لەسەری نوێژەکە دووبارەی بکاتەوە، ئەم وتەیە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ**

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێیەم ڕکاتی نوێژی عەسر سەلامی دایەوە، پاشان هەستا و چووە ژوورەکەی، خیرباق هەستا -پیاوێك بوو هەردوو دەستی درێژ بوو- بانگی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ کورتکرایەوە؟ ئەویش بە توڕەییەوە دەرچوو (ئیزار) پارچە قوماشەکەی بەشی خوارەوەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، پرسیاری کرد و هەواڵی پێدرا، دواتر ئەو بەشەی نوێژەکەی کە مابوو تەواو کرد، پاشان دوو سوژدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە.

**بَابُ ذِكْرِ الْمُصَلِّي يُصَلِّي خَمْسَ رَكَعَاتٍ سَاهِيًا وَالْأَمْرِ بِسَجْدَتَيِ السَّهْوِ إِذَا صَلَّى خَمْسًا مِنْ غَيْرِ أَنْ يُضِيفَ إِلَيْهَا سَادِسَةً، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ مِنَ الْعِرَاقِيِّينَ أَنَّهُ إِنْ كَانَ جَلَسَ فِي الرَّابِعَةِ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ أَضَافَ إِلَى الْخَامِسَةِ سَادِسَةً، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ جَلَسَ فِي الرَّابِعَةِ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ فَعَلَيْهِ إِعَادَةُ الصَّلَاةِ، زَعَمُوا، وَهَذَا الْقَوْلُ رَأْيٌ مِنْهُمْ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا بِاتِّبَاعِهِمَا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَخْلُو فِي الرَّابِعَةِ مِنْ أَنْ يَكُونَ جَلَسَ فِيهَا أَوْ لَمْ يَجْلِسْ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ، فَإِنْ كَانَ جَلَسَ فِيهَا مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ فَلَمْ يُضِفْ إِلَى الْخَامِسَةِ سَادِسَةً كَمَا زَعَمُوا، وَإِنْ كَانَ لَمْ يَجْلِسْ فِي الرَّابِعَةِ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ فَلَمْ يُعِدْ صَلَاتَهُ مِنْ أَوَّلِهَا، فَقَوْلُهُمْ عَلَى كُلِّ حَالٍ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَمْ يَسْتَدِلُّوا لِمُخَالَفَتِهِمْ سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ الثَّابِتَةَ بِسُنَّةٍ تُخَالِفُهَا، لَا بِرِوَايَةٍ صَحِيحَةٍ وَلَا وَاهِيَةٍ، وَهَذَا مُحَرَّمٌ عَلَى كُلِّ عَالِمٍ أَنْ يُخَالِفَ سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ بِرَأْيِ نَفْسِهِ أَوْ بِرَأْيِ مَنْ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ**

١٠٥٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَمْسًا، فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: «لَا» قُلْنَا صَلَّيْتَ بِنَا كَذَا وَكَذَا قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ»، ثُمَّ تَحَوَّلَ ﷺ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[1].

---

(١) صحيح.

باسی نوێژخوێن پێنج ڕکات نوێژ بکات بەسەهوو، وە فەرمانکردن بە دوو سوژدەی سەهوو ئەگەر پێنج ڕکات نوێژی کرد، بەبێ ئەوەی شەشەم بداتە پاڵی، بەڵگەش لەسەر پێچەوانەی وتەی هەندێ لەوانەی پێیان وایە لە خەڵکی عێراق: ئەگەر لە چوارەم ڕکات بە ئەندازەی تەحیات دانیشت ئەوە ڕکاتی شەشەم بۆ پێنجەم زیاد دەکات، پاشان دوو سوژدەی سەهوو دەبات، وە ئەگەر لە ڕکاتی چوارەم بە ئەندازەی تەحیات دانەنیشت ئەوە پێویستە لەسەری نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، ئەم قسەیە بۆچوونێکی خۆیانە و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کە خوا ﷻ فەرمانی بە شوێنکەوتنی کردووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەدەر نییە لەوەی یان لە ڕکاتی چوارەم دانیشتووە بە ئەندازەی تەحیات، یان دانەنیشتووە، ئەگەر لە ڕکاتی چوارەم بە ئەندازەی تەحیات دانیشتبێ، ئەوە ڕکاتی شەشەمی زیاد نەکرد بۆ پێنجەم، وەك گومانیان بردووە، وە ئەگەر لە ڕکاتی چوارەم بە ئەندازەی تەحیات دانەنیشتبێ ئەوە نوێژەکەی لە سەرەتاوە دووبارە نەکردەوە، جا بە هەر حاڵ وتەکەیان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، بە پێچەوانەکردنیان لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نە شوێنی سوننەتێکی دیکە کەوتوون پێچەوانەی بێت، نە گێڕانەوەیەکی ڕاست و نە لاوازیش، ئەوەش حەرامە بۆ هەموو زانایەك پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکات بە بۆچوونێکی خۆی، یان بۆچوونی کەسێ لەدوای پێغەمبەر ﷺ

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج ڕکاتی نوێژی بۆ کردین، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا شتێك لە نوێژدا ڕوویداوە؟ فەرمووی: نەخێر، وتمان: ئەوەندە و ئەوەندە نوێژت بۆ کردین، فەرمووی: بەڕاستی من مرۆڤم بیرم دەچێت وەك چۆن ئێوە بیرتان دەچێت، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە سەهووی کرد با دوو سوژدە ببات، پاشان ڕووی کردە قیبلە و دوو سوژدەی سەهووی برد.

١٠٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟» قَالُوا: صَلَّيْتَ خَمْسًا قَالَ: فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا سَلَّمَ[١].

---

(١) صحيح.

واتە: عەبدوڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێنج ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: چی بووە؟ وتیان: پێنج ڕکات نوێژت کرد، وتی: دوو سوژدەی برد دوای ئەوەی کە سەلامی دابۆیەوە.

**١٠٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷛: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «لَا»، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[١].

واتە: عەبدوڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێنج ڕکات نوێژی کرد، پێی وترا: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: نەخێر، پاشان دوو سوژدەی برد.

## بَابُ ذِكْرِ السُّنَّةِ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ الْكَلَامِ سَاهِيًا ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُسَلِّمَ مِنَ الصَّلَاةِ إِذَا كَانَ قَدْ سَهَا فِي صَلَاتِهِ فَتَكَلَّمَ بَعْدَ السَّلَامِ سَاهِيًا، أَنَّهُ لَا يَسْجُدُ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَهَذَا الْقَوْلُ خِلَافُ الثَّابِتِ مِنْ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ

**١٠٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷛: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ السَّلَامِ وَالْكَلَامِ.[٢]

## باسی سوننەت وایە دوای قسەکردن بەسەهوو لەنێو نوێژدا دوو سوژدەی سەهوو ببات، دژی وتەی ئەو کەسەی گومان دەبات ئەوەی سەلام دەداتەوە لە نوێژ ئەگەر لە نوێژەکەی سەهووی کرد و دوای سەلامدانەوەش بەسەهوو قسەی کرد، ئەوە دوو سوژدەی سەهوو نابات، ئەم وتەیە پێچەوانەی سوننەتی چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

واتە: عەبدوڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سوژدی سەهووی برد، دوای سەلامدانەوە و قسەکردن.

**١٠٥٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷛: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ الْكَلَامِ[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنْ كَانَ أَرَادَ ابْنُ مَسْعُودٍ بِقَوْلِهِ بَعْدَ الْكَلَامِ قَوْلَهُ لَمَّا صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقَالَ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟»، فَهَذَا الْكَلَامُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى مَعْنَى كَلَامِهِ فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ، وَإِنْ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

كَانَ أَرَادَ الْكَلَامَ الَّذِي فِي الْخَبَرِ الْآخَرِ لَمَّا صَلَّى فَزَادَ أَوْ نَقَصَ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ؛ فَإِنَّ هَذِهِ لَفْظَةٌ قَدِ اخْتَلَفَ الرُّوَاةُ فِي الْوَقْتِ الَّذِي تَكَلَّمَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَأَمَّا الْأَعْمَشُ فِي خَبَرِهِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، وَأَبُو بَكْرٍ النَّهْشَلِيُّ فِي خَبَرِهِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، ذَكَرَ أَنَّ هَذَا الْكَلَامَ كَانَ مِنْهُ قَبْلَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَأَمَّا مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، وَالْحَسَنُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ فَإِنَّهُمَا ذَكَرَا فِي خَبَرِهِمَا عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ هَذَا الْكَلَامَ كَانَ مِنْهُ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ فَلَمْ يَثْبُتْ بِخَبَرٍ لَا مُخَالِفَ لَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَكَلَّمَ وَهُوَ عَالِمٌ ذَاكِرٌ بِأَنَّ عَلَيْهِ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَقَدْ ثَبَتَ أَنَّهُ ﷺ تَكَلَّمَ سَاهِيًا بَعْدَ السَّلَامِ وَهُوَ لَا يَعْلَمُ أَنَّهُ قَدْ سَهَا سَهْوًا يَجِبُ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ كَلَامِهِ سَاهِيًا.

**واتە: عەبدوڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سوژدی سەهووی برد، دوای قسەکردن.**

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر ئیبنو مەسعود ﷛ لە وتەکەیدا کە وتی: دوای قسەکردن. مەبەستی وتەکەی بێت: کاتێ پێنج ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، کابرا وتی: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: چی بووە؟ ئەم قسەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەسەر مانای قسەکەیەتی لە ڕووداوی (ذو الْيَدَيْن)، وە ئەگەر مەبەستی ئەو قسەکردنە بێت کە لە فەرموودەکەی دیکەدا هاتووە: کاتێ نوێژی کرد زیادی کرد یان کەم، پێی وترا، ئەویش فەرمووی: بەڵکوو من مرۆڤم بیرم دەچێت وەکوو چۆن ئێوە بیرتان دەچێت، بەڕاستی ئەم دەستەواژەیە گێڕەرەوەکان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ تیایدا قسەی کردووە، بەڵام ئەعمەش لە فەرموودەکەی لە ئیبڕاهیم لە عەلقەمە لە عەبدوڵاوە ﷛، هەروەها ئەبو بەکری نەهشی لە فەرموودەکەی لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەد لە باوکی لە عەبدوڵاوە ﷛، باسی ئەوەی کردووە ئەو قسەکردنە پێش دوو سوژدە سەهووەکە بوو، بەڵام مەنصوری کوڕی موعتەمەر و حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵا ئەوان باسیان کردووە لە فەرموودەکەیاندا لە ئیبڕاهیم لە عەلقەمە لە عەبدوڵاوە ﷛ ئەو قسەکردنە لەدوای دوو سوژدە سەهووەکە بوو، جێگیر نەبوو بە فەرموودەیەك پێچەوانەی نەبێت پێغەمبەر ﷺ قسەی کردبێت و زانیبێتی دوو سوژدەی سەهوو لەسەریەتی، بەڵام جێگیر بووە پێغەمبەر ﷺ لەدوای سەلامدانەوە قسەی کرد، وە نەیدەزانی لە نوێژەکەیدا سەهووی کردووە پێویستە لەسەری دوو




سوژدەی سەهوو ببات، پاشان دوو سوژدەی سەهووی برد دوای ئەوەی بەسەهوو قسەی کرد.

## بَابُ السَّلَامِ بَعْدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ إِذَا سَجَدَهُمَا الْمُصَلِّي بَعْدَ السَّلَامِ

**١٠٦٠-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ فِي سَجْدَتَيِ الْوَهْمِ[١].

## باسی سەلامدانەوە دوای دوو سوژدە سەهووەکە، ئەگەر نوێژخوێن دوای سەلامدانەوەی لە نوێژ دوو سوژدەکەی برد

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد لە دوو سوژدە سەهووەکەدا.

**١٠٦١-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا عَلْقَمَةُ الظُّهْرَ فَصَلَّى خَمْسَاً، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ الْقَوْمُ يَا أَبَا شِبْلٍ، قَدْ صَلَّيْتَ خَمْسًا قَالَ كَلَّا مَا فَعَلْتُ، قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَكُنْتُ فِي نَاحِيَةِ الْقَوْمِ وَأَنَا غُلَامٌ، فَقُلْتُ: بَلَى، قَدْ صَلَّيْتَ خَمْسًا قَالَ لِي: وَأَنْتَ أَيْضًا يَا أَعْوَرُ تَقُولُ ذَلِكَ، قُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقْبَلَ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﵁: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَمْسَاً، فَلَمَّا انْفَتَلَ تَوَسْوَسَ الْقَوْمُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكُمْ»؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ زِيدَ فِي الصَّلَاةِ قَالَ: «لَا»، قَالُوا: فَإِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَمْسَاً، فَانْفَتَلَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ».[٢]

واتە: ئیبراهیمی کوڕی سوەید دەڵێ: عەلقەمە نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، پێنج ڕکاتی کرد، کاتێك سەلامی دایەوە، خەڵکەکە وتیان: ئەی باوکی شیبل، پێنج ڕکات نوێژت کرد، وتی: نەخێر نەمکرد، وتیان: بەڵێ، وتی: من منداڵێك بووم لەلایەکی خەڵکەکەوە بووم، وتم: بەڵێ، پێنج ڕکات نوێژت کرد، پێمی وت: تۆش ئەی کوێر ئاوا دەڵێی، وتم: بەڵێ، ڕووی کردە قیبلە دوو سوژدەی سەهووی برد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان وتی: عەبدوڵا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج ڕکاتی بۆ کردین، کاتێ تەواو بوو خەڵکە لەنێو خۆیاندا مقۆ مقۆیان بوو، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: نەخێر، وتیان: بێگومان تۆ پێنج ڕکاتت کرد، دواتر دوو سوژدەی سەهووی برد، پاشان سەلامی دایەوە پاشان فەرمووی: بێگومان منیش مرۆڤم، بیرم دەچێت وەکوو چۆن ئێوە بیرتان دەچێت.

## بَابُ التَّشَهُّدِ بَعْدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ إِذَا سَجَدَهُمَا الْمُصَلِّي بَعْدَ السَّلَامِ

**١٠٦٢**- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَشَهَّدَ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَسَلَّمَ[(١)].

## باسی تەحیات خوێندن دوای دوو سوژدە سەهووەکە، ئەگەر نوێژخوێن دوای سەلامدانەوە سوژدەی برد

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دوو سوژدە سەهووەکەدا تەحیاتی خوێند و سەلامی دایەوە.

## بَابُ ذِكْرِ تَسْمِيَةِ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ الْمُرْغِمَتَيْنِ، إِذْ هُمَا تُرْغِمَانِ الشَّيْطَانَ

**١٠٦٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمَّى سَجْدَتَيِ السَّهْوِ الْمُرْغِمَتَيْنِ[(٢)].

## باسی ناونانی دوو سوژدە سەهووەکە بە لووتشکێنەر، چونکە شەیتان سەرشۆڕ دەکەن

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوو سوژدە سەهووەکەی ناو ناوە: لووتشکێنەر و سەرشۆڕکەر (ی شەیتان).

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَسْبُوقَ بِرَكْعَةٍ أَوْ ثَلَاثٍ لَا تَجِبُ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ بِجُلُوسِهِ فِي الْأُولَى وَالثَّالِثَةِ اقْتِدَاءً بِإِمَامِهِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُدْرِكَ وِتْرًا مِنْ صَلَاةِ الْإِمَامِ تَجِبُ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ، وَهَاتَانِ السَّجْدَتَانِ لَوْ يَسْجُدُهُمَا الْمُصَلِّي كَانَتَا سَجْدَتَيِ الْعَمْدِ لَا السَّهْوِ، لِأَنَّ الْمُدْرِكَ وِتْرًا مِنْ صَلَاةِ الْإِمَامِ**

---

(١) إسناده قوي.

(٢) إسناده ضعيف.

**يَتَعَمَّدُ لِلْجُلُوسِ فِي الْأُولَى وَالثَّالِثَةِ، إِذْ هُوَ مَأْمُورٌ بِالِاقْتِدَاءِ بِإِمَامِهِ، جَالِسٌ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي أُمِرَ بِالْجُلُوسِ فِيهِ، فَكَيْفَ يَكُونُ سَاهِيًا مَنْ فَعَلَ مَا عَلَيْهِ فِعْلُهُ وَتَعَمَّدَ لِلْفِعْلِ؟ وَإِذَا بَطَلَ أَنْ يَكُونَ سَاهِيًا، اسْتَحَالَ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ بِإِخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا أَوْ فَأَتِمُّوا**

**١٠٦٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ وَهْبٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، فَسُئِلَ: هَلْ أَمَّ النَّبِيَّ ﷺ أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ غَيْرَ أَبِي بَكْرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَا: ثُمَّ رَكِبْنَا فَأَدْرَكْنَا النَّاسَ، قَدْ تَقَدَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَقَدْ صَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، وَهُوَ فِي الثَّانِيةِ، فَذَهَبْتُ أُوذِنُهُ فَنَهَانِي، فَصَلَّيْنَا الرَّكْعَةَ الَّتِي أَدْرَكْنَا الَّتِي سَبَقَتْنَا، وَقَضَيْنَا الَّتِي سَبَقَنَا[1].

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك بگات بە نوێژی بە کۆمەڵ ڕکاتێك، یان سێ ڕکاتی لە دەست چوو بێت دوو سوژدەی سەهووی لەسەر پێویست نابێ بەهۆی دانیشتنی لە یەکەم و سێیەم، چونکە پەیڕەوی پێشنوێژەکەی کردووە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێکی تاك لە نوێژی پێشنوێژ، دوو سوژدەی سەهووی لەسەر پێویست دەبێت، ئەگەر نوێژخوێن ئەو دوو سوژدە ببات ئەوە سوژدەی ئەنقەستی بردووە نەك سەهوو، چونکە ئەو کەسەی دەگات بە ڕکاتێکی تاك لە نوێژی پێشنوێژ، دەبێ بەئەنقەست لە یەکەم ڕکات و سێیەم ڕکات سوژدە ببات، چونکە ئەو فەرمانی پێکراوە پەیڕەوی پێشنوێژەکەی بکات، لەو جێگایە دانیشتووە کە فەرمانی پێکراوە تێیدا دابنیشێ، ئیدی چۆن بە کەسێك دەوترێ سەهووی کردووە کە بەئەنقەست بە ئەرکی سەرشانی هەڵنەستاوە؟ جا ئەگەر سەهووکردنی بەتاڵ بێت و بوونی نەبێت، ئەوە مەحاڵە دوو سوژدەی سەهووی لەسەر پێویست بێ، بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا أَوْ فَأَتِمُّوا) واتە: ئەگەر هاتن بۆ نوێژ ئەوە پێویستە لەسەرتان نەرمونیان و لەسەرخۆ بن، ئەوەی پێی گەیشتن نوێژەکەتان بکەن، ئەوەیشی لەدەستتان چوو بوو ئەنجامی بدەن، یان تەواوی بکەن

---

(١) صحيح.

واتە: عەمری كوڕی وەهب دەڵێ: ئێمە لەلای موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ بووین پرسیاری لێكرا: ئایا جگە لە ئەبو بەكر ﷺ كەسێكی دیكە لەم ئوممەتە پێشنوێژی بۆ پێغەمبەر ﷺ كردووە، وتی: بەڵێ، ئێمە لە سەفەرێكدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، بە درێژی باسی فەرموودەكەی كرد، وتیان: پاشان سوار بووین و بە خەڵكەكە گەیشتن، عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف پێشكەوتبوو، یەك ڕكات نوێژی بۆ كردبوون، لە ڕكاتی دووەمدا بوو، منیش ڕۆیشتم ئاگاداری بكەمەوە ڕێگری لێكردم، ئەو ڕكاتەمان كرد كە پێی گەیشتین، دواتر ڕكاتەكەی دیكەشمان تەواو كرد.

١٠٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا ثُوِّبَ لِلصَّلَاةِ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا؛ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا كَانَ يَعْمَدُ إِلَى الصَّلَاةِ، فَهُوَ فِي صَلَاةٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قامەت كرا بۆ نوێژ پەلە مەكەن لە كاتی هاتنتاندا، بەڵكوو بە هێمنی و لەسەرخۆیی بچن بۆ نوێژ، ئەوەی پێی گەیشتن بیكەن، ئەوەیشی لەدەستتان چوو تەواوی بكەن، چونكە هەر یەكێك لە ئێوە ئەگەر بچێت بۆ نوێژ ئەوە لە نوێژدایە.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ الْوِتْرِ وَمَا فِيهِ مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ ذِكْرِ الْأَخْبَارِ الْمَنْصُوصَةِ وَالدَّالَّةِ عَلَى أَنَّ الْوِتْرَ لَيْسَ بِفَرْضٍ لَا عَلَى مَا زَعَمَ مَنْ لَمْ يَفْهَمِ الْعَدَدَ، وَلَا فَرَّقَ بَيْنَ الْفَرْضِ وَبَيْنَ الْفَضِيلَةِ، فَزَعَمَ أَنَّ الْوِتْرَ فَرِيضَةٌ، فَلَمَّا سُئِلَ عَنْ عَدَدِ الْفَرْضِ مِنَ الصَّلَاةِ زَعَمَ أَنَّ الْفَرْضَ مِنَ الصَّلَاةِ خَمْسٌ، فَقِيلَ لَهُ: وَالْوِتْرُ، فَقَالَ: فَرِيضَةٌ، فَقَالَ السَّائِلُ: أَنْتَ لَا تُحْسِنُ الْعَدَدَ

١٠٦٦- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ أَمْلَيْتُ فِي أَوَّلِ الْكِتَابِ خَبَرَ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ فِي مَسْأَلَةِ الْأَعْرَابِيِّ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْإِسْلَامِ، وَجَوَابَ النَّبِيِّ ﷺ إِيَّاهُ، فَقَالَ: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ»، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: «لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»، فَأَعْلَمَ النَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ أَنَّ مَا زَادَ مِنَ الصَّلَاةِ عَلَى الْخَمْسِ فَهُوَ تَطَوُّعٌ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## کۆباسی ویتر و ئەوەشی تیایدایە لە سوننەتەکان

**باسی ئەو فەرموودانەی بەڵگەن لەسەر ئەوەی ویتر فەرز نییە، نەك لەسەر ئەوەی گومانی وایە و لە ژمارە تێنەگەیشتووە، وە جیاوازی نەکردووە لە نێوان فەرز و سوننەت، گومانی وایە ویتر فەرزە، بەڵام کاتێ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ژمارەی نوێژە فەرزەکان پێی وایە نوێژە فەرزەکان پێنجن، پێی وترا: ئەی ویتر، وتی: فەرزە، پرسیارکەر وتی: تۆ چاك لە ژمارە نازانی**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە سەرەتای ئەم پەرتووکە فەرموودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵام ﷺ هێنا لەوەی کابرای دەشتەکی پرسیاری کرد سەبارەت بە ئیسلام و پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە، فەرمووی: پێنج نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا، وتی: ئایا جگە لەوە هیچی دیکەم لەسەرە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر نوێژی زیادە بکەیت، پێغەمبەر ﷺ زانیاری پێ دا ئەوەی لە پێنج نوێژەکە زیاتر بێت ئەوە سوننەتە.

**١٠٦٧-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: إِنَّ الْوِتْرَ لَيْسَ بِحَتْمٍ، وَلَا كَصَلَاتِكُمُ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْتَرَ، ثُمَّ قَالَ: يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا؛ فَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ(١).

واتە: عاصمی کوڕی زەمرە دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: ویتر نە واجبە و نە وەکوو نوێژە فەرزەکانیشتانە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری کرد، پاشان فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورئان ویتر بکەن، چونکە بەڕاستی خوا ویترە و ویتری خۆش دەوێت.

**١٠٦٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ النَّجَّارِيِّ، أَنَّهُ سَأَلَ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ ﷺ عَنِ الْوِتْرِ، قَالَ: أَمْرٌ حَسَنٌ جَمِيلٌ عَمِلَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمُسْلِمُونَ مِنْ بَعْدِهِ، وَلَيْسَ بِوَاجِبٍ(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ خَرَّجْتُ فِي كِتَابِ «الْكَبِيرِ» أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي إِعْلَامِهِ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِ وَعَلَى أُمَّتِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَدَلَّتْ تِلْكَ الْأَخْبَارُ عَلَى أَنَّ الْمُوجِبَ لِلْوِتْرِ فَرْضًا عَلَى الْعِبَادِ مُوجِبٌ عَلَيْهِمْ سِتَّ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، وَهَذِهِ الْمَقَالَةُ خِلَافُ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ، وَخِلَافُ مَا يَفْهَمُهُ الْمُسْلِمُونَ، عَالِمُهُمْ وَجَاهِلُهُمْ وَخِلَافُ مَا تَفْهَمُهُ النِّسَاءُ فِي الْخُدُورِ وَالصِّبْيَانُ فِي الْكَتَاتِيبِ، وَالْعَبِيدُ وَالْإِمَاءُ، إِذْ جَمِيعُهُمْ يَعْلَمُونَ أَنَّ الْفَرْضَ مِنَ الصَّلَاةِ خَمْسٌ لَا سِتٌّ.

---

(١) إسناده حسن من أجل عاصم بن ضمرة السلولي.

(٢) إسناده حسن.

واتە: عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو عەمرەی نەجاری دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە عوبادەی كوڕی صامت ﷺ كرد دەربارەی ویتر، وتی: كارێكی چاك و جوانە پێغەمبەر ﷺ كردوویەتی، هەروەها موسوڵمانانیش لەدوای ئەو كردویانە، واجب نییە.

ئەبو بەكر دەڵێ: لە پەڕتووكی (الْكَبِيرُ) فەرموودەكانی پێغەمبەرم ﷺ هێناوە لە ئاگاداركردنەوەی ئوممەتەكەی كە بێگومان خوا پێنج نوێژی فەرز كردووە لەسەری و لەسەر ئوممەتەكەی لە شەو و ڕۆژێكدا، ئەو فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو كەسەی ویتر فەڕز دەكات لەسەر بەندەكان شەش نوێژی لەسەریان فەڕز كردووە لە شەو و ڕۆژێكدا، ئەم قسەیە پێچەوانەی فەرموودەكانی پێغەمبەرە ﷺ، پێچەوانەی تێگەیشتنی موسوڵمانانە، بە زانا و نەزانەكانیانەوە، وە پێچەوانەی تێگەیشتنی ئەو ئافرەتانەیە كە خۆیان دەرناخەن و ئەو منداڵە بچووكانەش كە لە شوێنێكی بچووكدا دەخوێنن، هەروەها كۆیلە و كەنیزەكەكانیش، چونكە هەموویان دەزانن نوێژە فەڕزەكان پێنجن نەك شەش.

**١٠٦٩-** عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا حَنِيفَةَ، أَوْ سُئِلَ أَبُو حَنِيفَةَ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: فَرِيضَةٌ، فَقُلْتُ -أَوْ فَقِيلَ لَهُ-: فَكَمِ الْفَرْضُ؟ قَالَ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ. فَقِيلَ لَهُ: فَمَا تَقُولُ فِي الْوِتْرِ؟ قَالَ: فَرِيضَةٌ، فَقُلْتُ -أَوْ فَقِيلَ لَهُ-: أَنْتَ لَا تُحْسِنُ الْحِسَابَ(١).

واتە: عەبدولواریسی كوڕی سەعید دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو حەنیفە كرد، یان پرسیاری لێكرا دەربارەی ویتر، وتی: فەڕزە، وتم: یان پێی وترا: نوێژی فەڕز چەندە؟ وتی: پێنج فەڕزە، وترا: ئەی چی دەڵێی سەبارەت بە ویتر؟ وتی: فەڕزە، وتم: یان پێی وترا: تۆ نازانی ژمارە بژمێری.

## باب ذكر دليل بأن الوتر ليس بفرض

**١٠٧٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ وَالْوِتْرَ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْقَابِلَةِ اجْتَمَعْنَا فِي الْمَسْجِدِ وَرَجَوْنَا أَنْ يَخْرُجَ إِلَيْنَا، فَلَمْ نَزَلْ فِي الْمَسْجِدِ حَتَّى

---

(١) لم نقف عليه، هذا السند لم يذكره ابن حجر في الإتحاف، وإنما ذكر سنداً آخر عن أيوب، عن سليمان، عن حماد قال: سألت أبا حنيفة، فذكره. انظر: اتحاف المهرة ٤٣٧/٦ (٦٧٧٠).

أَصْبَحْنَا، فَدَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْنَا لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجَوْنَا أَنْ تَخْرُجَ إِلَيْنَا فَتُصَلِّيَ بِنَا، فَقَالَ: «كَرِهْتُ أَنْ يُكْتَبَ عَلَيْكُمُ الْوِتْرُ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژی ویتر فەرز نییە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزان هەشت ڕکات نوێژی بۆ کردین، وە ویتریش، کاتێ شەوەکەی دیکە هاتەوە لە مزگەوت کۆبووینەوە، ئومێدمان کرد بگەڕێتەوە بۆ ناومان، لە مزگەوت ماینەوە هەتا بەیانیمان کردەوە، پاشان چووینە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێیمان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، لە مزگەوت کۆبووینەوە و ئومێدمان کرد نوێژمان بۆ بکەیت، فەرمووی: من ترسام لەوەی ویترتان لەسەر بنووسرێ (واتە: فەرز بکرێ).

## بَابُ التَّرْغِيبِ فِي الْوِتْرِ وَاسْتِحْبَابِهِ إِذِ اللَّهُ يُحِبُّهُ

**١٠٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ»[٢].

## باسی هاندان لەسەر نویژی ویتر و بەچاکدانانی، چونکە خوا پێی خۆشە

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا تاکە و تاکیشی خۆشدەوێ (لە پەرستشکردن، بەتایبەتی نوێژی ویتر).

## بَابُ ذِكْرِ الْأَخْبَارِ الْمَنْصُوصَةِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الْوِتْرَ رَكْعَةٌ

**١٠٧٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِرَكْعَةٍ»[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ئەو فەرموودانەی هاتوون لە پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی ویتر یەك ڕكاتە

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە، كاتێ ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت، ئەوە یەك ڕكات ویتر بكە.

**١٠٧٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ، أُطِيلُ فِيهِمَا الْقِرَاءَةَ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ(١).

واتە: ئەنەسی كوڕی سیرین دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم رضي الله عنهما وت: ئایا پێت چۆنە دوو ڕكاتەكەی پێش نوێژی بەیانی قوڕئانی زۆر تێدا بخوێنم؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕكات دوو ڕكات شەونوێژی دەكرد، یەك ڕكات ویتریشی دەكرد.

**١٠٧٤-** عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمَخْزُومِيِّ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَسَأَلَهُ عَنِ الْوِتْرِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَفْصِلَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي أَخْشَى أَنْ يَقُولَ النَّاسُ: إِنَّهَا الْبُتَيْرَاءُ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَسُنَّةَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ تُرِيدُ؟ هَذِهِ سُنَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ(٢).

واتە: موتەلیبی كوڕی عەبدوڵای مەخزومی دەڵێ: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما یەك ڕكات ویتری دەكرد، پیاوێك هات بۆ لای پرسیاری لێكرد دەربارەی ویتر، فەرمانی پێكرد نوێژەكەی جیابكاتەوە، (واتە: یەك ڕكات ویتر بە تەنها بكات) پیاوەكە وتی: من لەوە دەترسم خەڵك بڵێن: ئەو یەك ڕكاتە بڕاوەیە و ڕكاتی دیكەی لەگەڵ نییە، ئیبنو عومەر وتی: ئایا سوننەتی پێغەمبەرت ﷺ دەوێ؟ ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

تێبینی: (الْبُتَيْرَاءُ): ناوێكە بچووككراوەی (البَتر)ە، واتە: برین، بۆیە بە یەك ڕكات وتراوە: (الْبُتَيْرَاءُ)، چونكە بڕاوەتەوە و جووت نییە.

**١٠٧٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، ثُمَّ نَزَلَ، فَصَلَّى عَشْرَ رَكَعَاتٍ، وَأَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ صَلَّى بِنَا الصُّبْحَ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وشترەکەی یەخدا، پاشان دابەزی دە ڕکات نوێژی کرد، یەك ڕکات ویتریشی کرد، دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان یەك ڕکات ویتری کرد، پاشان دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کرد، پاشان نوێژی بەیانی بۆ کردین.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوِتْرِ بِخَمْسِ رَكَعَاتٍ، وَصِفَةِ الْجُلُوسِ فِي الْوِتْرِ إِذَا أَوْتَرَ بِخَمْسِ رَكَعَاتٍ، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ

١٠٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً كَانَ يُوتِرُ بِخَمْسِ سَجَدَاتٍ - يَعْنِي رَكَعَاتٍ - لَا يُسَلِّمُ فِيهِنَّ، فَيَجْلِسُ فِي الْآخِرَةِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ[١].

## باسی ڕێگە دراوە بە پێنج ڕکات ویتر، هەروەها چۆنیەتی دانیشتن لە نوێژی ویتر کاتێ پێنج ڕکات ویتری کرد، ئەمەش لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەیان پێدراوە

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا سیازدە ڕکات نوێژی دەکرد، پێنج ڕکات ویتری دەکرد لە هیچ کام لەو پێنج ڕکاتە سەلامی نەدەدایەوە، دواتر لە کۆتا ڕکات دادەنیشت، پاشان سەلامی دەدایەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَجْلِسُ إِلَّا فِي الْخَامِسَةِ إِذَا أَوْتَرَ بِخَمْسٍ

١٠٧٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِخَمْسٍ، لَا يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْخُمُسِ إِلَّا فِي الْخَامِسَةِ[٢].

## باسی فەرموودەیەکی ڕوونکەرەوە سەبارەت بەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ پێنج ڕکات ویتری بکردایە دانەدەنیشت لە پێنجەم ڕکات نەبێ

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە شەودا سێزدە ڕکات نوێژی دەکرد، پێنج ڕکاتی لێ دەکردن بە ویتر لە هیچ کام لەو پێنج ڕکاتە دانەدەنیشت جگە لە پێنجەم ڕکات نەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوِتْرِ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ أَوْ بِتِسْعٍ وَصِفَةِ الْجُلُوسِ إِذَا أَوْتَرَ بِسَبْعٍ أَوْ بِتِسْعٍ

**١٠٧٨-** عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَأَتَى الْمَدِينَةَ لِيَبِيعَ بِها عَقَاراً، فَيَجْعَلَهُ فِي السِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ، وَيُجَاهِدُ الرُومَ حَتَى يَمُوت، فَلَقِيَ رَهْطاً مِنَ قَوْمِهِ أَرَادُوا ذَلِكَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَلَيْسَ لَكُمْ فِيَّ أُسْوَةٌ؟» وَنَهَاهُمْ عَنْ ذَلِكَ، فَأَشْهَدَ عَلَى مُرَاجَعَةِ امْرَأَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْنَا فَأَخْبَرَ أَنَّهُ لَقِيَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، فَسَأَلَهُ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: أَلَا أُنَبِّئُكَ بِأَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: عَائِشَةُ ائْتِهَا، فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ارْجِعْ إِلَيَّ فَأَخْبِرْنِي بِرَدِّهَا عَلَيْكَ، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ: مَا أَنَا بِقَارِبِهَا إِنِّي نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ فِي هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شَيْئًا، فَأَبَتْ فِيهِمَا إِلَّا مُضِيًّا، فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ مَعِي فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَحَكِيمٌ؟ فَعَرَفَتْهُ، قَالَ: نَعَمْ، أَوْ قَالَ: بَلَى قَالَتَ: مَنْ هَذَا مَعَكَ؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ قَالَتْ: مَنْ هِشَامٍ؟ قَالَ: ابْنُ عَامِرٍ قَالَ: فَتَرَحَّمَتْ عَلَيْهِ، وَقَالَتْ: نِعْمَ الْمَرْؤ كَانَ عَامِرٌ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كُنَّا نَعُدُّ لَهُ سِوَاكَهُ، وَطَهُورَهُ فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ لِمَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ، وَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، لَا يَجْلِسُ فِيهِنَّ إِلَّا عِنْدَ الثَّامِنَةِ، فَيَجْلِسُ وَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَدْعُو - زَادَ هَارُونُ فِي حَدِيثِهِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ - ثُمَّ يَنْهَضُ، وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّي التَّاسِعَةَ، فَيَقْعُدُ فَيَحْمَدُ رَبَّهُ وَيُصَلِّي عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا فَيُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَيَّ وَقَالَ بُنْدَارٌ وَهَارُونُ جَمِيعًا: فَلَمَّا أَسَنَّ وَأَخَذَ اللَّحْمَ، أَوْتَرَ بِسَبْعٍ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَمَا يُسَلِّمُ، فَتِلْكَ تِسْعُ رَكَعَاتٍ يَا بُنَيَّ[1].

## باسی ڕێگەدان بە ئەنجامدانی حەوت ڕکات یان نۆ ڕکات ویتر و چۆنیەتی دانیشتن ئەگەر حەوت یان نۆ ڕکات ویتر بکات

واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە، (کە یەکێك بوو لە شوێنکەوتووان) ئینجا ژنەکەی تەڵاقدا و هاتە مەدینە بۆ ئەوەی زەوییەکی لەوێ هەبوو بیفرۆشێ تا بیکاتە چەك و تفاق و ئەسپ بۆ جیهادکردنی ڕۆمەکان هەتا دەمرێ، جا گەیشت بەکۆمەڵێك لە قەومەکەی (ئەنصارەکان)، ئەوانیش لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکوو ئەو ویستبوویان ئەوە بکەن، (بچن بۆ جیهاد و خێزانەکەیان تەڵاق بدەن) پێغەمبەر ﷺ

---

(١) صحيح.

پێی فەرموون: مەگەر بۆ ئێوە لە مندا چاولێکەری نییە؟! (مەگەر جیهاد ناکەم و ژن و منداڵیشم هەیە؟!) وە قەدەغەی ئەوەی لێکردن، پاشان خێزانەکەی گەڕاندەوە و دواتر هاتەوە بۆ لامان بۆی گێڕاینەوە کە بە عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما گەیشت پرسیاری لێکرد دەربارەی ویتر، ئەویش وتی: ئایا پێت ڕابگەیەنم بە شارەزاترینی سەر زەوی بە ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: بەڵێ، وتی: عائیشەیە رضي الله عنها، بڕۆ بۆ لای پرسیاری لێ بکە، پاشان بگەڕێرەوە بۆ لام هەواڵم بدەرێ بەوەی وەڵامتی دایەوە، دواتر هاتم بۆ لای حەکیمی کوڕی ئەفلەح، داوام لێکرد لەگەڵمدا بێت بۆ لای عائیشە رضي الله عنها، وتی: من نزیکی ناکەومەوە، چونکە من داوام لێکرد نزیك هیچ کام لەو دوو کۆمەڵە نەبێتەوە (کۆمەڵی عەلی و کۆمەڵی موعاویە رضي الله عنهما)، بەڵام ئەو گوێی پێ نەدام و بە قسەی نەکردم هەر ڕۆیشت (لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە دژی عەلی رضي الله عنه بوون، تا جەنگی جەمەل بەرپا بوو)، ئەو جەختی کردەوە کە هەر نەیەت، منیش سوێندم لەسەر خوارد کە هەر دەبێ لەگەڵم بێت، بۆیە لەگەڵم هات و ڕۆیشتین بۆ لای مۆڵەتمان لێ وەرگرت، وتی: حەکیمە، ناسییەوە، وتی: بەڵێ، وتی: ئەوە کێیە لەگەڵت؟ وتی: سەعدی کوڕی هیشامە، وتی: کام هیشام؟ وتم: کوڕی عامر، وتی: نزای بۆ کرد، وتی: عامر پیاوێکی چاك بوو، وتم: ئەی دایکی بڕواداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئێمە سیواك و ئاوی دەستنوێژمان بۆی ئامادە دەکرد، هەر کاتێك خوا ویستی لەسەری بووایە خەبەری بکاتەوە، بەخەبەر دەبوویەوە، دواتر سیواکی دەکرد و دەستنوێژی دەگرت و هەشت ڕکات نوێژی دەکرد دانەدەنیشت لە هەشتەمین ڕکاتدا نەبێت، ئینجا دادەنیشت یادی خوای دەکرد و دەپاڕایەوە - هاڕون کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکان لەم شوێنەدا ئەوەی زیاد کردووە- پاشان هەڵدەستا و سەلامی نەئەدایەوە پاشان نۆیەم ڕکاتی دەکرد، ئینجا دادەنیشت و ستاییشی پەروەردگاری دەکرد و صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدا. پاشان سەلامی دەدایەوە سەلامدانەوەیەك دەمانبیست، پاشان دوو ڕکات نوێژی دەکرد بەدانیشتنەوە، ئەوە دەبوو بە یازدە ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، (بوندار و هاڕون هەردووکیان وتیان): کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەساڵاچوو گۆشتی گرت، حەوت ڕکات ویتری دەکردو، دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە دوای سەلامدانەوە، جا هەمووی بوو بە نۆ ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم.




**١٠٧٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوتِرُ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ، فَلَمَّا أَسَنَّ وَثَقُلَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، يُقْرَأُ فِيهِنَّ بِالرَّحْمَنِ وَالْوَاقِعَةِ قَالَ أَنَسٌ ﷺ: وَنَحْنُ نَقْرَأُ بِالسُّوَرِ الْقِصَارِ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ۝١﴾ الزلزلة، وَ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَنَحْوِهِمَا[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نۆ ڕکات ویتری دەکرد، کاتێك کەوتە ساڵەوە و قورس بوو، حەوت ڕکاتی دەکرد، دوو ڕکاتیشی بە دانیشتنەوە دەکرد، سوڕەتی (الرَّحْمَن) و (الْوَاقِعَة) تیایاندا دەخوێند، ئەنەس ﷺ وتی: ئێمەیش سوڕەتە کورتەکانمان دەخوێند: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ۝١﴾، و ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾، وێنەی ئەو دوو سوڕەتە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوِتْرِ أَوَّلَ اللَّيْلِ إِنْ أَحَبَّ الْمُصَلِّي أَوْ وَسَطَهُ أَوْ آخِرَهُ، إِذِ اللَّيْلُ بَعْدَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ كُلُّهُ وَقْتُ الْوِتْرِ

**١٠٨٠-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مِنْ أَوَّلِهِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ[2].

## باسی ڕێگە دراوە بە ویتر لە سەرەتای شەو و ئەگەر نوێژخوێن پێی خۆش بوو، یان نێوەڕاستی یان کۆتاییەکەی، چونکە شەو لەدوای عیشا تا بەرەبەیان هەمووی کاتی ویترە

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کاتەکانی شەو ویتری کردووە، لە سەرەتای شەو و نێوەڕاستی و کۆتاییەکەیشی.

**١٠٨١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ، آخِرَ اللَّيْلِ أَوْ أَوَّلَهُ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ وَرُبَّمَا أَوْتَرَ مِنْ آخِرِهِ، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً[3].

---

(١) عمارة بن زاذان فيه مقال، وله مناكير، وقد تفرد بزيارة ذكر السورتين أخرجه البيهقي ٣٣/٣ انظر إتحاف المهرة ٥٤٨/١ (٦٩٦)، والإسناد الأول لم نقف عليه في الإتحاف.

(٢) إسناده حسن.

(٣) هذا الحديث هو جزء من حديث مطوّل تقدم تخريجه عند الحديث (٢٥٩).

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەیس دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد خێزانی پێغەمبەر ﷺ: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەو، یان لە سەرەتای چۆن ویتری دەکرد؟ وتی: لە هەموو ئەو کاتانەدا دەیکرد، زۆر جار لە سەرەتای شەو ویتری دەکرد، زۆرجاریش لە کۆتایی شەو دەیکرد، وتم: سوپاس و ستاییش بۆ خوا کارئاسانی تێدا کردووە.

### بَابُ الْأَمْرِ بِالْوِتْرِ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى وَمُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

١٠٨٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْراً»[١].

**باسی فەرمانکردن بە ویتر لە کۆتایی شەو بەباسکردنی فەرموودەیەکی کورت نەک تێروتەسەل، وە بە دەستەواژەی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەک (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون**

واتە: ئینو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کۆتا نوێژتان لە شەودا با ویتر بێت.

### بَابُ ذِكْرِ الْوَصِيَّةِ بِالْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ بِلَفْظِ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، قَدْ يَسْبِقُ عِلْمِي إِلَى وَهْمِ مَنْ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْخَبَرِ الْمُخْتَصَرِ وَالْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى، وَلَا يَسْتَدِلُّ بِالْمُفَسَّرِ مِنَ الْأَخْبَارِ عَلَى الْمُجْمَلِ مِنْهَا، أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِأَنْ يَجْعَلَ آخِرَ صَلَاةِ اللَّيْلِ وِتْرًا يُضَادُّ أَمْرَهُ وَوَصِيَّتَهُ بِالْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ

١٠٨٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: أَوْصَانِي حَبِيبِي بِثَلَاثٍ، لَا أَدَعُهُنَّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَبَداً، أَوْصَانِي بِصَلَاةِ الضُّحَى، وَبِالْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ، وَبِصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ[٢].

**باسی وەسیەتکردن بە نوێژی ویتر پێش خەو بە دەستەواژەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەک (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، بێگومان زانیومە ئەوەی ناتوانێ فەرموودەی کورتکراو فەرموودەی درێژەپێدراو لە یەکدی جیابکاتەوە، ناتوانێ فەرموودەی شیکراو و ڕوون لە فەرموودەی کورت و**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



**ناڕوون جیابکاتەوە، وا دەزانێ فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی ویتری لە کۆتایی شەونوێژ دانا پێچەوانەی فەرمان و وەسیەتەکەیەتی بە ویترکردن پێش خەوتن**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت هەرگیز وازیان لێ ناهێنم ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت: وەسیەتی بۆ کردم بە نوێژی چێشتەنگاو، هەروەها بە بەردەوامبوون لەسەر نوێژی ویتر پێش خەو، وە بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَتَيْنِ الْمُجْمَلَتَيْنِ اللَّتَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا فِي الْبَابَيْنِ الْمُقَدَّمَيْنِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِالْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ أَخْذًا بِالْوَثِيقَةِ وَالْحَزْمِ، تَخَوُّفًا أَنْ لَا يَسْتَيْقِظَ الْمَرْءُ آخِرَ اللَّيْلِ فَيُوتِرَ آخِرَهُ. وَأَنَّهُ إِنَّمَا أَمَرَ بِالْوِتْرِ آخِرَ اللَّيْلِ مَنْ قَوِيَ عَلَى قِيَامِ آخِرِ اللَّيْلِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوِتْرَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ أَفْضَلُ لِمَنْ قَوِيَ عَلَى الْقِيَامِ آخِرَ اللَّيْلِ**

**١٠٨٤-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: مَتَى تُوتِرُ؟ قَالَ: أُوتِرُ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ، فَقَالَ لِعُمَرَ: مَتَى تُوتِرُ؟ قَالَ: أَنَامُ، ثُمَّ أُوتِرُ قَالَ: فَقَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: أَخَذْتَ بِالْحَزْمِ، أَوْ بِالْوَثِيقَةِ، وَقَالَ لِعُمَرَ: أَخَذْتَ بِالْقُوَّةِ[١].

**باسی فەرموودەیەك شیكەرەوەی ئەو دوو دەستەواژە كورت و ناڕوونەیە كە باسم كردن لە دوو بەشەكەی پێشوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە ویتر پێش خەوتن ئەوە دەستی بە بەڵگە و توندوتۆڵییەوە گرتووە نەبا لە كۆتایی شەو بەخەبەر نەیەتەوە ویترەكەی بكات، وە فەرمانكردنی بە ویتر لە كۆتایی شەو بۆ ئەو كەسەیە هێز و توانای تێدا بێت لەسەر شەونوێژكردن، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ویتر لە كۆتایی شەو چاكترە بۆ ئەو كەسەی توانای تێدایە لە كۆتایی شەو هەستێت بۆ شەونوێژ**

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەكری ﷺ فەرموو: كەی ویتر دەكەی؟ وتی: پێش ئەوەی بخەوم ویتر دەكەم، بە عومەری ﷺ فەرموو: كەی ویتر دەكەی؟ وتی: دەخەوم، ئینجا (هەڵدەستمەوە) ویترەكە دەكەم، وتی: بە ئەبو بەكری

---

(١) إسناده معلول بالإرسال.




ﷺ فەرموو: دەستت گرتووە بە لایەنی توندوتۆڵی و زەمانەتەوە، بە عومەریشی ﷺ فەرموو: دەستت گرتووە بە لایەنی هێز و تواناوە (کە عەزیمەت و سووربوونە لەسەر شەونوێژ).

**١٠٨٥**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: «مَتَى تُوتِرُ؟» قَالَ: أُوتِرُ ثُمَّ أَنَامُ قَالَ: «بِالْحَزْمِ أَخَذْتَ»، وَسَأَلَ عُمَرَ، فَقَالَ: «مَتَى تُوتِرُ؟»، فَقَالَ: أَنَامُ ثُمَّ أَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ فَأُوتِرُ قَالَ: «فِعْلِي فَعَلْتَ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکری ﷺ فەرموو: کەی ویتر دەکەی؟ وتی: پێش ئەوە بخەوم ویتر دەکەم، فەرمووی: دەستت گرتووە بە لایەنی توندوتۆڵییەوە، پرسیاریشی لە عومەر ﷺ کرد فەرمووی: کەی ویتر دەکەی؟ وتی: دەخەوم ئینجا شەو هەڵدەستم ویتر ئەکەم، فەرمووی: من چیم کردووە تۆش ئەوەت کردووە.

**١٠٨٦**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ خَافَ مِنْكُمْ أَنْ لَا يَسْتَيْقِظَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَلْيُوتِرْ مِنْ أَوَّلِهِ، وَلْيَرْقُدْ، وَمَنْ طَمِعَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَيْقِظَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ مِنْ آخِرِهِ؛ فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَحْضُورَةٌ، فَذَلِكَ أَفْضَلُ»[2].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ئێوە ترسا لەوەی لە کۆتایی شەودا بەخەبەر نەیەتەوە (بۆ شەونوێژ)، با لە سەرەتای شەو ویتر بکات و بخەوێت، هەر کەسێکیش لە ئێوە ویستی لە کۆتایی شەودا هەستێت (بۆ شەونوێژ)، با لە کۆتایی شەودا ویتر بکات، چونکە نوێژکردن لە کۆتایی شەودا فریشتەکان ئامادەی دەبن، بێگومان ئەوەش چاکترە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِمُبَادَرَةِ طُلُوعِ الْفَجْرِ بِالْوِتْرِ إِذِ الْوِتْرُ وَقْتُهُ اللَّيْلُ، لَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَلَا بَعْضَ النَّهَارِ أَيْضًا.

**١٠٨٧**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «بَادِرُوا الصُّبْحَ بِالْوِتْرِ»[3].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## باسی فەرمانکردن بە پەلەکردن بە ئەنجامدانی نوێژی ویتر پێش شەبەق، چونکە کاتی ویتر شەوە، نەك شەو و ڕۆژ، هەروەها نەك بەشێکی ڕۆژ

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی ویتر پێش نوێژی بەیانی.

١٠٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَادِرُوا الصُّبْحَ بِالْوِتْرِ».

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی ویتر پێش نوێژی بەیانی.

١٠٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا». عَنْ أَبِي نَضْرَةَ الْعَوْقِيِّ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُمْ أَنَّهُمْ سَأَلُوا النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: «أَوْتِرُوا قَبْلَ الصُّبْحِ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی ویتر بکەن پێش ئەوەی بەیانی بکەنەوە. ئەبو نەزرەی عەوقی دەگێڕێتەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ هەواڵی پێ داون، ئەوان پرسیاریان کردبوو لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ویتر، فەرمووبووی: نوێژی ویتر بکەن پێش بەرەبەیان.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْوِتْرِ رَاكِبًا فِي السَّفَرِ وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْوِتْرَ لَيْسَتْ بِفَرِيضَةٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ عَلَى رَاحِلَتِهِ فِي الْحَالَةِ الَّتِي كَانَ يُوتِرُ عَلَيْهَا

١٠٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ[٢].

## باسی مۆڵەتدراوە لە گەشتدا بەسواری (وشتر یان ئەسپ یان هەر وڵاخێکی دیکە کە بۆ سواربوون دەشێ) ویتر بکرێ، بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی ویتر فەرز نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوێژی فەرزی لەسەر وشترەکەی نەدەکرد، بەڵام لە ویتردا دەیکرد

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر وشترەکەی دەکرد ڕووی لە هەر شوێنێك بووایە، وە ویتریشی لەسەری دەکرد، بەڵام نوێژی فەرزی لەسەری نەدەکرد.

## بَابُ النَّائِمِ عَنِ الْوِتْرِ أَوِ النَّاسِي لَهُ يُصْبِحُ قَبْلَ أَنْ يُوتِرَ

**١٠٩١-** عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَجْعَلْ آخِرَ صَلَاتِهِ وِتْرًا؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِذَلِكَ، فَإِذَا كَانَ الْفَجْرُ فَقَدْ ذَهَبَتْ كُلُّ صَلَاةِ اللَّيْلِ وَالْوِتْرُ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْوِتْرُ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

## باسی ئەو کەسەی بەسەر ویتردا بخەوێ یان بیری بچێ پێش ئەوەی نوێژی ویتر بکات بەیانی بەسەردا بێ

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ دەیوت: هەر کەسێك شەونوێژ دەکات با لە کۆتا نوێژیدا ویتر بکات، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە کردووە، جا ئەگەر شەبەقی دا ئەوە شەونوێژ و ویتر نامێنێ، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ویتر پێش بەرەبەیانە.

١٠٩٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَهُ الصُّبْحُ وَلَمْ يُوتِرْ، فَلَا وِتْرَ لَهُ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەرەبەیانی بەسەردا بێت و ویتری نەکردبێ، ئەوە بۆی نییە ویتر بکات.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ فِي وِتْرِ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ الْفَجْرِ مُجْمَلٍ غَيْرَ مُفَسَّرٍ أَوْهَمَ بَعْضَ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ وَلَمْ يَكْتُبْ مِنَ الْعِلْمِ مَا يُسْتَدَلُّ بِالْخَبَرِ الْمُفَسَّرِ عَلَى الْخَبَرِ الْمُجْمَلِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوْتَرَ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الثَّانِي

**١٠٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَدَ الْعَبَّاسَ ذَوْدًا مِنَ الْإِبِلِ، فَبَعَثَنِي إِلَيْهِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَكَانَ فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَوَسَّدْتُ

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

الْوِسَادَةَ الَّتِي تَوَسَّدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَنَامَ غَيْرَ كَبِيرٍ أَوْ غَيْرَ كَثِيرٍ، ثُمَّ قَامَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَتَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، وَأَقَلَّ هِرَاقَةَ الْمَاءِ، ثُمَّ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، وَأَخْلَفَ بِيَدِهِ فَأَخَذَ بِأُذُنِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَجَعَلَ يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَتْ مَيْمُونَةُ حَائِضًا، فَقَامَتْ فَتَوَضَّأَتْ، ثُمَّ قَعَدَتْ خَلْفَهُ تَذْكُرُ اللَّهَ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «أَشَيْطَانُكِ أَقَامَكِ؟» قَالَتْ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَلِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: «إِي وَالَّذِي بَعَثَنِي بِالْحَقِّ وَلِي، غَيْرَ أَنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ، فَأَسْلَمَ»، فَلَمَّا انْفَجَرَ الْفَجْرُ قَامَ فَأَوْتَرَ بِرَكْعَةٍ، ثُمَّ رَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ حَتَّى أَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ[1].

**باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە دەربارەی ویترکردنی پێغەمبەر ﷺ دوای بەرەبەیان فەرموودەکە (مُجْمَل) کورت و ناڕوونە (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون نییە، جا هەندێ لەوانەی کە قووڵ نەبوونەتەوە لەنێو زانستی فەرموودە و هیچی وایان لە زانست نەنووسیوە بەڵگە ناهێنێتەوە بە فەرموودەی (المُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون لەسەر فەرموودەی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون، بۆیە پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ دوای دەرچوونی بەرەبەیانی دووەم نوێژی ویتری کردووە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانیدا بە عەباس رضي الله عنه کۆمەڵە وشترێکی پێ بدات، ئەویش دوای نوێژی عیشا منی نارد بۆ لای، ئەو لە ماڵی مەیمونەی کچی حاریس بوو، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت سەرم لەسەر ئەو سەرینە دانا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەری دانابوو، خەوت ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو، پاشان هەستا، دەستنوێژی گرت بەچاکترین شێوە، ئاوێکی کەمی بەکار هێنا، دواتر نوێژی دابەست، منیش هەستام و دەستنوێژم گرت، لەلای چەپیەوە ڕاوەستام، دەستی لە پشتەوە هێنا و گوێچکەمی گرت لەلای ڕاستی خۆی وەستاندمی، لە هەموو دوو ڕکاتێك سەلامی دەدایەوە، مەیمونەش لە حەیزدا بوو، هەستاو دەستنوێژی گرت، پاشان لە پشتیەوە دانیشت یادی خوای دەکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: شەیتانەکەت هەڵیساندیت؟ وتی: باوك و دایکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منیش شەیتانم هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ سوێند بەوەی منی

---

(١) إسناده ضعيف.

بەحەق ناردووە منیش هەمە، ئەوە نەبێت خوا سەری خستم بەسەریدا موسوڵمان بوو، کاتێ بەرەبەیان بۆیەوە هەستا یەك ڕکات ویتری کرد، پاشان دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کرد، ئینجا ڕاکشا لەسەر لای ڕاستی هەتا بیلال ﷺ هات بۆ لای ئاگاداری کردەوە بۆ نوێژ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَوْتَرَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ الَّتِي بَاتَ ابْنُ عَبَّاسٍ فِيهَا عِنْدَهُ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الَّذِي يَكُونُ بَعْدَ طُلُوعِهِ لَيْلٌ لَا نَهَارٌ، لَا بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الثَّانِي الَّذِي يَكُونُ بَعْدَ طُلُوعِهِ نَهَارٌ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَرْكَعْ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ عِنْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الْوِتْرِ، بَلْ أَمْسَكَ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الْوِتْرِ حَتَّى أَضَاءَ الْفَجْرُ الثَّانِي الَّذِي يَكُونُ بَعْدَ إِضَاءَةِ نَهَارٍ وَلَا لَيْلٌ

**١٠٩٤**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقْتُ إِلَى خَالَتِي، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقَامَ يُصَلِّي فِيهِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَلَبِثَ يَسِيرًا حَتَّى إِذَا عَلِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنِّي أُرِيدُ أَنْ أُصَلِّيَ بِصَلَاتِهِ فَأَخَذَ بِنَاصِيَتِي فَجَرَّنِي حَتَّى جَعَلَنِي عَلَى يَمِينِهِ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا كَانَ عَلَيْهِ مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى، رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا طَلَعَ الْفَجْرُ الْأَوَّلُ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى تِسْعَ رَكَعَاتٍ، يُسَلِّمُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَأَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ وَهِيَ التَّاسِعَةُ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمْسَكَ حَتَّى أَضَاءَ الْفَجْرُ جِدًّا، ثُمَّ قَامَ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَضَعَ جَنْبَهُ فَنَامَ، ثُمَّ جَاءَ بِلَالٌ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي خَبَرِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَوْتَرَ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الْأَوَّلِ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الثَّانِي، وَالْفَجْرُ هُمَا فَجْرَانِ، فَالْأَوَّلُ طُلُوعُهُ بِلَيْلٍ، وَالْآخَرُ هُوَ الَّذِي يَكُونُ بَعْدَ طُلُوعِهِ نَهَارٌ، وَقَدْ أَمْلَيْتُ فِي الْمَسْأَلَةِ الَّتِي كُنْتُ أَمْلَيْتُهَا عَلَى بَعْضِ مَنِ اعْتَرَضَ عَلَى أَصْحَابِنَا أَنَّ الْوِتْرَ بِرَكْعَةٍ غَيْرُ جَائِزٍ، الْأَخْبَارُ الَّتِي رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْوِتْرِ بِثَلَاثٍ، وَبَيَّنْتُ عِلَلَهَا فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَسْتُ أَحْفَظُ خَبَرًا ثَابِتًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْقُنُوتِ فِي الْوِتْرِ، وَقَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي تِلْكَ الْمَسْأَلَةِ عِلَّةَ خَبَرِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي ذِكْرِ الْقُنُوتِ فِي الْوِتْرِ، وَبَيَّنْتُ أَسَانِيدَهَا وَأَعْلَمْتُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ أَنَّ ذِكْرَ الْقُنُوتِ فِي خَبَرِ أُبَيٍّ غَيْرُ صَحِيحٍ عَلَى أَنَّ الْخَبَرَ عَنْ أُبَيٍّ أَيْضًا غَيْرُ ثَابِتٍ فِي

---

(١) إسناده ضعيف.

الْوِتْرِ بِثَلَاثٍ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ، عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَلَّمَهُ دُعَاءً يَقُولُهُ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو شەوەی کە ئیبنو عەباس لەلای پێغەمبەر ﷺ خەوت نوێژی ویتری کرد، دوای دەرچوونی ئەو بەرەبەیانەی کە دوای دەرچوونی هێشتا هەر شەوە نەك ڕۆژ، نە لە دوای بەرەبەیانی دووەم کە لە دوایەوە دەرچوونی ڕۆژ دێت، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دوای تەواوکردنی ویترەکەی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی نەکرد، بەڵکوو دوای ویترەکە چاوەڕوانی کرد هەتا بەرەبەیانی دووەم ڕوون بوویەوە، کە لە دوایەوە ڕۆشنایی ڕۆژ دێ و، شەو نامێنێ**

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای پورم، -باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا چوو بۆ مزگەوت، ئینجا نوێژی دابەست منیش لەلای چەپی وەستام، ماوەیەکی کەم ڕاوەستا تا پێغەمبەری خوا ﷺ زانی منیش دەمەوێ وەکوو ئەو نوێژ بکەم، دواتر نێوچاوانمی گرت و ڕایکێشام تا لەلای ڕاستی خۆی دابنام، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات دوو ڕکات شەونوێژی کرد، کاتێ بەرەبەیانی یەکەم دەرکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نۆ ڕکاتی کرد، لە هەموو دوو ڕکاتێکدا سەلامی دەدایەوە، یەك ڕکات ویتریشی کرد ئەویش نۆیەم ڕکات بوو، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی گرتەوە لە نوێژکردن هەتا بەرەبەیان ڕوون بوویەوە، پاشان هەستا و دوو ڕکات سوننەتی نوێژی بەیانی کرد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر تەنیشتی ڕاکشا و خەوت، پاشان بیلال رضي الله عنه هات- دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد-.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی سەعیدی کوڕی جوبەیر رضي الله عنه بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوای دەرکەوتنی بەرەبەیانی یەکەم پێش دەرکەوتنی بەرەبەیانی دووەم ویتری کرد، وە بەرەبەیان دوو بەرەبەیانە، یەکەمینیان: لە شەودا دەردەکەوێ، ئەوی دیکەیان: دوای دەرکەوتنی دنیا ڕووناك دەبێتەوە، بێگومان لەو جێگایەدا باسم کردووە وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەوانەی کە پێچەوانەی هاوەڵەکانمان بوون،




پێیان وایە یەك ڕکات ویتر دروست نییە، ئەو فەرموودانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە کە ویتر سێ ڕکاتە، لەو جێگایەدا هۆکارەکەیم ڕوون کردۆتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەیەکی جێگیرم نەبینیوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە خوێندنی قونوت لە ویتردا، بێگومان من لەو مەسەلەیەدا عیللە و کەموکوڕی فەرموودەکەی ئوبەی کوڕی کەعبم ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕوونکردۆتەوە کە باسی قونوتخوێندن دەکات لە ویتر، وە سەنەدەکانیم ڕوون کردۆتەوە و لەو جێگایەدا ڕامگەیاندووە کە باسکردنی قونوت لە فەرموودەکەی ئوبەی ﷺ ڕاست و دروست نییە، بەهەمان شێوە فەرموودەکەی ئوبەی دەربارەی سێ ڕکات ویتر جێگیر نییە، بێگومان گێڕدراوەتەوە لە یەزیدی کوڕی ئەبو مەریەم لە ئەبو حەوراء لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ نزا و پاڕانەوەیەکی فێر کردووە لە قونوتی ویتردا بیخوێنێ.

**١٠٩٥-** عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ[١].

واتە: حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێرکردم لە قونوتی ویتردا بیخوێنم: (خوایە ڕێنماییم بکەیت لەگەڵ ئەوانەی ڕێنماییت کردوون، وە پارێزراو و لەشساغم بکەیت لەگەڵ پارێزراواندا، وە پشتیوانیم بکە لەگەڵ پشتیوانی لێکراواندا، وە لەوەی پێت بەخشیوم بەرەکەت و خێری زۆری تێبکە و لە خراپەی ئەوەی تەقدیرت کردووە بۆم بمپارێزە، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەر بڕیاری تۆدا، ئەوەی تۆ پشتیوانی بکەیت زەلیل و زەبوون نابێ، گەورەیت و دەسەڵاتت دیارە پەروەردگارمان.

**١٠٩٦-** عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ ﷺ: عَلَامَ تَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: كَانَ يُعَلِّمُنَا هَذَا الدُّعَاءَ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ»، بِمِثْلِ حَدِيثِ وَكِيعٍ فِي الدُّعَاءِ، وَلَمْ يَذْكُرِ الْقُنُوتَ، وَلَا الْوِتْرَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو حەوراء دەڵێ: پرسیارم لە حەسەنی کوڕی عەلی ﵄ کرد: چ شتێکی پێغەمبەری خوات ﷺ بیر دێتەوە؟ وتی: ئەم نزایەی فێر دەکردین: خوایە ڕێنمایيم بکەیت لەگەڵ ئەوانەی ڕێنماییت کردوون. هاو شێوەی فەرموودەکەی وەکیع لە پاڕانەوە، (فەرموودەی ١٠٩٥) نە باسی قونوتی کرد نە باسی ویتر.

تێبینی: پێشەوا ئەبو بەکری کوڕی خوزەیمە، پێی وایە پێغەمبەر ﷺ قونوتی نەخوێندووە لە نوێژی ویتر، وە لێرەدا گفتوگۆیەکی زانستی وردی کردووە سەبارەت بەو بابەتە، بە تێروتەسەلی سەنەدی فەرموودەکانی هێناوە و قسەی لەسەر کردوون، خوێنەری ئاسایی ناتوانێت لێی تێبگات بۆیە نەمانهێناوە (وەرگێڕ).

**١٠٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَقْنُتُ إِلَّا أَنْ يَدْعُوَ لِقَوْمٍ أو يدعو عَلَى قَوْمٍ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى قَوْمٍ أَوْ يَدْعُوَ لِقَوْمٍ، قَنَتَ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ الثَّانيية مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قونوتی نەدەخوێند، مەگەر نزای بۆ قەومێك بکردایە، یان لەسەر قەومێك، جا ئەگەر بیویستایە نزا لە قەومێك بکات، یان نزا بۆ قەومێك بکات، قونوتی دەخوێند، کاتێ هەڵدەستایەوە لە ڕکاتی دووەمی نوێژی بەیانی.

**١٠٩٨-** عَنِ الْبَرَاءِ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: قَنَتَ فِي الْفَجْرِ[٢].

واتە: بەڕاء ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا قونوتی دەخوێند.

**١٠٩٩-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْنُتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالصُّبْحِ, وَعَنِ الْبَرَاءَ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْنُتُ فِي الصُّبحِ وَالمَغْرِبِ فَهَذَا هُوَ الصَّحِيحُ، وَأَعْلَى خَبَرٍ يُحْفَظُ فِي القُنُوتِ فِي الوَتْرِ، عَن أَبِي بْنِ كَعْبٍ فِي عَهْدِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ مَوْقُوفاً أَنَّهُمْ كَانُوا يَقْنُتُونَ بَعْدَ النِّصْفِ يَعْنِي مِنْ رَمَضَان[٣].

---

(١) حديث أبي هريرة تقدم تخريجه عند الحديث (٦١٩)، وأما حديث البراء بن عازب فلم نقف عليه، وأما حديث عبدالرحمن بن أبي ليلى فقد أخرجه ابن أبي شيبة (٧٠٠٨).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی ئێوارە و بەیانیدا قونوتی دەخوێند. وە بە سەنەدێکی دیکە هاتووە لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی و ئێوارەدا قونوتی دەخوێند، ئەمەیانە ڕاست و دروستترە، دواتر درێژەی پێداوە و دەڵێ: بەرزترین فەرموودە پارێزراو بێت دەربارەی قونوت لە ویتردا، ئەو فەرموودەیە کە گێردراوەتەوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ﷺ بە مەوقوفی هاتووە (دەڵێ): ئەوان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لە نیوەی مانگی ڕەمەزان بەولاوە قونوتیان دەخوێند.

**١١٠٠-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ الْقَارِيَّ، وَكَانَ فِي عَهْدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَرْقَمِ ﷺ عَلَى بَيْتِ الْمَالِ، أَنَّ عُمَرَ، خَرَجَ لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ فَخَرَجَ مَعَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدٍ الْقَارِيُّ، فَطَافَ بِالْمَسْجِدِ وَأَهْلُ الْمَسْجِدِ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ، فَيُصَلِّي بِصَلَاتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ إِنِّي أَظُنُّ لَوْ جَمَعْنَا هَؤُلَاءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، ثُمَّ عَزَمَ عُمَرُ عَلَى ذَلِكَ، وَأَمَرَ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَنْ يَقُومَ لَهُمْ فِي رَمَضَانَ، فَخَرَجَ عُمَرُ عَلَيْهِمْ، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ قَارِئِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ: نِعْمَ الْبِدْعَةُ هِيَ، وَالَّتِي تَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي تَقُومُونَ، - يُرِيدُ آخِرَ اللَّيْلِ - فَكَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ أَوَّلَهُ، وَكَانُوا يَلْعَنُونَ الْكَفَرَةَ فِي النِّصْفِ: اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ وَيُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، وَلَا يُؤْمِنُونَ بِوَعْدِكَ، وَخَالِفْ بَيْنَ كَلِمَتِهِمْ، وَأَلْقِ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ، وَأَلْقِ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ، إِلَهَ الْحَقِّ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَيَدْعُو لِلْمُسْلِمِينَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ خَيْرٍ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ لِلْمُؤْمِنِينَ قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ إِذَا فَرَغَ مِنْ لَعْنَةِ الْكَفَرَةِ، وَصَلَاتِهِ عَلَى النَّبِيِّ، وَاسْتِغْفَارِهِ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، وَمَسْأَلَتِهِ: اللَّهُمَّ إِيَّاكَ نَعْبُدُ، وَلَكَ نُصَلِّي وَنَسْجُدُ، وَإِلَيْكَ نَسْعَى وَنَحْفِدُ، وَنَرْجُو رَحْمَتَكَ رَبَّنَا، وَنَخَافُ عَذَابَكَ الْجِدَّ، إِنَّ عَذَابَكَ لِمَنْ عَادَيْتَ مُلْحِقٌ، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَهْوِي سَاجِدًا[1].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاری لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی ئەڕقەم ﷺ لەسەر خەزێنەی موسوڵمانان بوون، عومەر شەوێك لە ڕەمەزان دەرچوو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاریش لەگەڵی دەرچوو، بەدەوری مزگەوت و خەڵکەکەیدا سوڕایەوە بینی هەر کۆمەڵە و لە جێگایەکە و هەر یەکە بۆ خۆی نوێژ دەکات، کەسی وایش هەیە

---

(١) صحيح.

نوێژ دەكات كۆمەڵێكیش لە پشتیەوە نوێژ دەكەن، عومەر ﷺ وتی: سوێند بە خوا من پێم وایە ئەو خەڵكە لەسەر یەك پێشنوێژ كۆبكەینەوە چاكترە، پاشان عومەر ﷺ سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو كارە بكات، فەرمانی كرد بە ئوبەی كوڕی كەعب لە ڕەمەزاندا پێشنوێژییان بۆ بكات، دواتر عومەر هات بۆ لایان بینی خەڵكەكە نوێژ دەكەن لە پشت یەك قورئانخوێنەوە، عومەر ﷺ وتی: چاكترین داهێنان ئەمەیە، ئەوەیشی كە دەخەون و بە شەونوێژ ئەنجامی دەدەن چاكترە، خەڵكەكە سەرەتای شەونوێژەكەیان دەكرد، لە نیوەی ڕەمەزان نزایان دەكرد: خوایە ئەو بێباوەڕانە بكوژە كە ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی پەیامەكەت دەكەن و پێغەمبەرانت بە درۆ دەزانن و بڕوایان بە پەیمان و بەڵێنت نییە، جیاوازی بخە نێوانیان و ترس بخەرە دڵیان و سزای خۆتیان بەسەردا بسەپێنە، ئەی پەرستراوی حەق، پاشان صەڵاواتی دەدا لەسەر پێغەمبەر ﷺو نزای خێری بۆ موسوڵمانان دەكرد ئەوەندەی لە توانایدا بووایە، پاشان داوای لێخۆشبوونی بۆ بڕواداران دەكرد، وتی: كاتێ تەواو بووایە لە نەفرینی بێباوەڕان و صەڵاواتدانی لەسەر پێغەمبەر ﷺو داوای لێخۆشبوونی بۆ باوەڕدارانی پیاوان و ئافرەتان، دەیوت: خوایە تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها نوێژ بۆ تۆ دەكەین و سوژدە بۆ تۆ دەبەین، وە بەپەلە بۆ لای تۆ دێین، ئومێدی ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ دەكەین پەروەردگارمان، لە سزای حەقت دەترسین، بێگومان سزای تۆ بۆ ئەوانەی دژایەتییان دەكەیت پێیان دەگات، پاشان تەكبیری دەكرد و دەچووە سوژدە.

## بَابُ الزَّجْرِ أَنْ يُوتِرَ الْمُصَلِّي فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ مَرَّتَيْنِ إِذِ الْمُوتِرُ مَرَّتَيْنِ تَصِيرُ صَلَاتُهُ بِاللَّيْلِ شَفْعًا لَا وِتْرًا

**١١٠١-** عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ ﷺ قَالَ: زَارَنَا أَبِي فِي يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمْسَى عِنْدَنَا وَأَفْطَرَ، وَقَامَ بِنَا تِلْكَ اللَّيْلَةِ، وَأَوْتَرَ بِنَا، ثُمَّ انْحَدَرَ إِلَى مَسْجِدِهِ، فَصَلَّى بِأَصْحَابِهِ حَتَّى بَقِيَ الْوِتْرُ، ثُمَّ قَدَّمَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: أَوْتِرْ بِأَصْحَابِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ»[1].

---

(١) إسناده حسن.

**باسی سەرزەنشتكردن لەوەی نوێژخوێن لە یەك شەودا دوو جار ویتر بكات، چونكە ویتركەر بە ویتری دووەم نوێژەكەی دەبێتەوە بە جووت نەك بە ویتر**

واتە: قەیسی كوڕی تەلق ﷺ دەڵێ: باوكم لە ڕۆژێكی مانگی ڕەمەزان سەردانی كردین، ئێوارە لەلامان مایەوە و بەربانگی كردەوە، ئەو شەوە نوێژی بۆ كردین و ویتریشی بۆ كردین، پاشان لێژ بوویەوە بۆ مزگەوتەكەی، ئینجا نوێژی بە هاوەڵەكانی كرد هەتا ویتر مایەوە، پاشان یەكێك لە هاوەڵانی پێشخست و وتی: ویتر بە هاوەڵەكانت بكە، چونكە من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە شەوێكدا دوو ویتر نییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ بَعْدَ الْوِتْرِ

**١١٠٢-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ يُوتِرُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَرَكَعَ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ[١].

**باسی مۆڵەتدان بە نوێژكردن دوای ویتر**

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پرسیارم كرد لە عائیشە ﷺ دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: سێزدە ڕكات نوێژی دەكرد، هەشت ڕكاتی دەكرد، پاشان ویتری دەكرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕكات نوێژی دەكرد، (بە دانیشتنەوە قورئانی دەخوێند) كاتێ بیویستایە بچێتە ڕكووع هەڵدەستایەوە ڕكووعی دەبرد، وە لە نێوان بانگ و قامەتیش دوو ڕكاتی دەكرد.

**١١٠٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: زُرْتُ خَالَتِي مَيْمُونَةَ فَوَافَقْتُ لَيْلَةَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَحَرٍ طَوِيلٍ، فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ، ثُمَّ جِئْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَلَمَّا عَلِمَ أَنِّي أُرِيدُ الصَّلَاةَ مَعَهُ أَخَذَ بِيَدِي فَحَوَّلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَأَوْتَرَ بِتِسْعٍ أَوْ سَبْعٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَوَضَعَ جَنْبَهُ حَتَّى سَمِعْتُ ضَفِيزَهُ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَانْطَلَقَ، فَصَلَّى[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَاتَانِ الرَّكْعَتَانِ اللَّتَانِ ذَكَرَهُمَا ابْنُ عَبَّاسٍ فِي هَذَا الْخَبَرِ يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْوِتْرِ، كَمَا أَخْبَرَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها، وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ بِهِمَا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ اللَّتَيْنِ كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ.

**واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: سەردانی پورم مەیمونەم کرد، جا ئەو شەوە وا ڕێك کەوت نۆرەی پورم بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەلای بێت، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەوێکی درێژدا هەستا، بە چاکی دەستنوێژی گرت، پاشان هەستا نوێژی دەکرد، منیش هەستام دەستنوێژم گرت، پاشان هاتم لە تەنیشتیەوە ڕاوەستام، کاتێ زانی دەمەوێ نوێژ بکەم دەستمی گرت و منی برد بۆ لای ڕاستی، نۆ یان حەوت ڕکاتی بە ویترەوە کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر لەسەر تەنیشتی ڕاکشا هەتا گوێم لە پرخەی بوو، پاشان قامەت بۆ نوێژ کرا، دواتر نوێژی کرد.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو دوو ڕکاتەی کە ئیبنو عەباس رضي الله عنهما باسی کرد لەم فەرموودەدا، پێدەچێ مەبەستی ئەو دوو ڕکاتە بوو بێت کە پێغەمبەر ﷺ دوای ویتر ئەنجامی دەدا، وەکوو چۆن دایکمان عائیشەش رضي الله عنها هەواڵیدا، وە پێدەچێ مەبەستی ئەو دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی بێت.**

## بَابُ ذِكْرِ الْقِرَاءَةِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْوِتْرِ

**١١٠٤-** عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ الْأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رضي الله عنها عَنْ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى الْعِشَاءَ تَجَوَّزَ بِرَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَنَامُ وَعِنْدَ رَأْسِهِ طَهُورُهُ وَسِوَاكُهُ، فَيَقُومُ فَيَتَسَوَّكُ، وَيَتَوَضَّأُ، وَيُصَلِّي، وَيَتَجَوَّزُ بِرَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي ثَمَانِ رَكَعَاتٍ يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ، وَيُوتِرُ بِالتَّاسِعَةِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَلَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَخَذَ اللَّحْمَ، جَعَلَ الثَّمَانِ سِتًّا، وَيُوتِرُ بِالسَّابِعَةِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، يُقْرَأُ فِيهِمَا بِـ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَ ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ۝١﴾ الزلزلة[1].

---

**(١) إسناده ضعيف.**

## باسی قورئان خوێندن لەو دوو ڕکاتە سوننەتەی کە پێغەمبەر ﷺ دوای ویتر دەیخوێند

واتە: سەعدی کوڕی هیشامی ئەنصاڕی دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری کرد لە عائیشە رضي الله عنها دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ، لە شەودا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژی عیشای بکردایە دوو ڕکاتی کورتی دەکرد، پاشان دەخەوت ئاوی دەستنوێژ و سیواکەکەی لە لای سەری دادەنا، دواتر هەڵدەستاو سیواکی دەکرد و دەستنوێژی دەگرت و نوێژی دەکرد، وە دوو ڕکاتی بەکورتی دەکرد، پاشان هەڵدەستا هەشت ڕکاتی دەکرد وەکوو یەك قورئانی دەخوێند تیایاندا، پاشان نۆیەم ڕکاتی دەکرد بە ویتر، وە بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەساڵاچوو گۆشتی گرت، هەشت ڕکاتەکەی کرد بە شەش و لە حەوتەمیندا ویتری دەخوێند، وە بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد، لەو دوو ڕکاتەدا: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ١﴾ ی تیایاندا دەخوێند.

**١١٠٥-** عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوتِرُ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ، فَلَمَّا أَسَنَّ وَثَقُلَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، يَقْرَأُ بِ الرَّحْمَنِ، وَالْوَاقِعَةِ قَالَ أَنَسٌ رضي الله عنه: وَنَحْنُ نَقْرَأُ بِالسُّوَرِ الْقِصَارِ: ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ١﴾ الزلزلة، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾ الكافرون، وَنَحْوِهِمَا[1].

واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نۆ ڕکاتی بە ویترەوە دەکرد، کاتێ کەوتە تەمەنەوەو (لاشەی) قورس بوو، حەوت ڕکاتی کرد، دوو ڕکاتیشی بە دانیشتنەوە کرد، سوڕەتی (الرَّحْمَن) و (الْوَاقِعَة) تیایاندا دەخوێند، ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: ئێمەش سوڕەتە کورتەکان دەخوێنین: ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ١﴾، وە: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾، وێنەی ئەو دوو سوڕەتە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّلَاةَ بَعْدَ الْوِتْرِ مُبَاحَةٌ لِجَمِيعِ مَنْ يُرِيدُ الصَّلَاةَ بَعْدَهُ، وَأَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْوِتْرِ لَمْ يَكُونَا خَاصَّةً لِلنَّبِيِّ ﷺ دُونَ أُمَّتِهِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَنَا بِالرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْوِتْرِ، أَمْرَ نَدْبٍ وَفَضِيلَةٍ، لَا أَمْرَ إِيجَابٍ وَفَرِيضَةٍ

**١١٠٦-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا السَّفَرَ جَهْدٌ وَثِقَلٌ، فَإِذَا أَوْتَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ، وَإِلَّا كَانَتَا لَهُ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژ لە دوای ویتر ڕێگەپێدراوە بۆ هەر کەسێك بیەوێ لە دوایەوە نوێژ بکات، وە ئەو دوو ڕکاتەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دەدان لە دوای ویتر تایبەت نەبوو بە پێغەمبەر ﷺ جیا لە ئوممەتەکەی، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووین لە دوای ویتر دوو ڕکات نوێژ بکەین، ئەو فەرمانە فەرمانێکە بۆ سوننەت و بە پەسند دانان، نەك بۆ فەڕز بوون

واتە: سەوبان ﷺ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، فەرمووی: بەڕاستی ئەم گەشتە گرانی و قورساییە، جا ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی ویتری تەواو کرد با دوو ڕکات بکات، ئەگەر بەخەبەر هاتەوە ئەوە چاکە، ئەگەرنا ئەو دوو ڕکاتە بەسە بۆی.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ وَمَا فِيهَا مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ فَضْلِ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ إِذْ هُمَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعًا

**١١٠٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعاً»، وَقَالَ الصَّنْعَانِيُّ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: هُمَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعًا. وَفِي حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: «رَكْعَتَا الْفَجْرِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعًا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی و ئەو سوننەتانەشی تیایدایە

### باسی پێگەو گەورەیی دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی، که له هەموو دنیا چاکترە

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی لەلام چاکترە لە هەموو دونیا، ئیبام صەنعانی دەربارەی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەڵێ: ئەو دوو ڕکاتە لە هەموو دونیا چاکترە، هەروەها لە فەرموودەی یەحیای کوڕی سەعید (ی قەتتاندا) هاتوە، (مەبەستی ئەوەیە بەجیا بەسەنەدی خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو ڕکات (سوننەتی) پێش نوێژی بەیانی لە هەموو دونیا خۆشەویستترە لەلام.

### بَابُ الْمُسَارَعَةِ إِلَى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ

١١٠٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِلَى شَيْءٍ مِنَ الْخَيْرِ أَسْرَعُ مِنْهُ إِلَى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَلَا إِلَى غَنِيمَةٍ(١).

### باسی پەلەکردن بۆ ئەنجامدانی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی، وەك شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە پەلە بکات لە هیچ شتێکی خێردا، ئەوەندەی پەلەکردنی بۆ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی، وە نە بۆ هیچ دەستکەوت و غەنیمەتێك بە دەستی هێنا بێت.

### بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ إِنَّمَا أَرَادَتْ بِقَوْلِهَا: الْخَيْرُ النَّوَافِلَ دُونَ خَيْرِ الْفَرِيضَةِ، إِذِ اسْمُ الْخَيْرِ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْفَرِيضَةِ وَالنَّافِلَةِ جَمِيعًا

١١٠٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ مُعَاهَدَةً عَلَى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی عائیشە ﵂ مەبەستی لە وتەکەی (الْخَيْرُ) سوننەتەکانە نەك فەرزەکان، چونکە ناوی (الْخَيْرُ) هەندێك جار بۆ فەرز و سوننەت بەکار دێت

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە هیچ نوێژێکی سوننەتدا ئەوەندەی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی پەیوەست نەبووە پێیەوە.

### بَابُ الْأَمْرِ بِالرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ أَمْرَ نَدْبٍ وَاسْتِحْبَابٍ لَا أَمْرَ فَرِيضَةٍ وَإِيجَابٍ

**١١١٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كُنْتُ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ أَعْرَابِيٍّ لَيْلَةً، فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَيْفَ صَلَاةُ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ ﷺ: «مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيتَ الصُّبْحَ فَاسْجُدْ سَجْدَةً، وَاسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ»[١].

### باسی فەرمانکردن بە دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی فەرمانێکە بۆ سوننەت و بە پەسند دانان نەك بۆ فەرز بوون

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: شەوێك من لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺو پیاوێکی دەشتنشین بووم، کابرای دەشتنشین وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، شەونوێژ چۆنە؟ فەرمووی: دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت لەدەست بچێت ئەوە یەك ڕکات ویتر بکە، وە دوو ڕکاتیش بکە پێش نوێژی بەیانی.

### بَابُ وَقْتِ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

**١١١١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ إِذَا أَضَاءَ الْفَجْرُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی کاتی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: حەفصەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ دام، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد کاتێ بەرەبەیان ڕووناك ببووایەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَخْفِيفِ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ، إِذِ اتِّبَاعُ السُّنَّةِ أَفْضَلُ مِنَ الِابْتِدَاعِ عَلَى مَا يَأْمُرُ الْقُصَّاصُ مِنْ تَطْوِيلِ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ

**١١١٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ، أُطِيلُ فِيهِمَا الْقِرَاءَةَ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ(١).

## باسی چاکتر وایە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی بە کورتی بکرێ (قورئانی کەم تێدا بخوێنرێ) وەك شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، چونکە پەیڕەوکردنی سوننەت باشترە لە بیدعەت، نە وەك چیرۆك گێڕەرەوەکان (کە بێ بەڵگە قسە دەکەن) فەرمان دەکەن دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی درێژ بکرێتەوە

واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت: هەواڵم بدەرێ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی قورئانی زۆر تێدا بخوێنم؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد وەك ئەوەی قامەت لەنێو گوێیدا بێت. (واتە: پەلەی دەکرد لە ئەنجامدانی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی وەك کەسێك گوێی لە قامەتی نوێژی بەیانی بێت، ئەویش ئەوە دەخوازێ قورئانی کەمی تێدا دەخوێند).

**١١١٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَيُخَفِّفُهُمَا حَتَّى إِنِّي لَأَقُولَ: قَرَأَ فِيهِمَا بِأُمِّ الْكِتَابِ؟(٢)

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد ئەوەندە کورتی دەکردەوە هەتا من دەموت: ئایا سوڕەتی فاتیحەی تیایاندا خوێندووە؟

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ قِرَاءَةِ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ وَ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ

١١١٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، لَا يَدَعُهُمَا قَالَتْ: وَكَانَ يَقُولُ: نِعْمَتِ السُّورَتَانِ يُقْرَأُ بِهِمَا فِي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾الإخلاص، ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾الكافرون[1].

## باسی چاکتر وایە لە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ بخوێنرێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکرد، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی عەسر، هەرگیز دەستبەرداریان نەدەبوو،، وتی: دەیفەرموو: چاکترینی ئەو دوو سورەتەی لە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا بخوێنرێن: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْقِرَاءَةِ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِنْهُمَا بِآيَةٍ وَاحِدَةٍ سِوَى فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ لَا يُجْزِئُ أَنْ يَقْرَأَ فِي رَكْعَةٍ وَاحِدَةٍ مِنَ التَّطَوُّعِ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلَاثِ آيَاتٍ سِوَى الْفَاتِحَةِ

١١١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَكْثَرُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ ﴾البقرة، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، وَفِي الْأُخْرَى: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾آل عمران، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾آل عمران[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**باسی ڕێگەدراوە قورئان لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانیدا بخوێنرێ، لە هەر ڕکاتێکیاندا یەك ئایەت بخوێنرێ جگە لە سوڕەتی فاتیحە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە دروست نییە لە هەر ڕکاتێکی نوێژی سوننەت کەمتر لە سێ ئایەت بخوێنرێ جگە لە سوڕەتی فاتیحە**

واتە: ئیبنو عەباس ﭭ دەڵێ: زۆرترین ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا دەیخوێند: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ ﴿١٣٦﴾ ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە، وە لە ڕکاتەکەی دیکەدا: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ ﴿٦٤﴾ ﴾، تا فەرمایشتی: ﴿ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَقَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ إِذَا فَاتَتَا قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ

**١١١٦-** عَنْ قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو ﭬ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الصُّبْحَ، وَلَمْ يَكُنْ رَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيْهِ.

عَنْ قَيْسٍ ﭬ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الصُّبْحَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا هَاتَانِ الرَّكْعَتَانِ؟» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَكْعَتَا الْفَجْرِ لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُهُمَا، فَهُمَا هَاتَانِ، قَالَ: فَسَكَتَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ[١].

**باسی مۆڵەتدان بەوەی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی بکات دوای نوێژی بەیانی و پێش دەرچوونی خۆر، ئەگەر پێش نوێژی بەیانی لەدەستی چوو**

واتە: قەیسی کوڕی عەمر ﭬ دەگێڕێتەوە، ئەو نوێژی بەیانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی نەکرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە، هەستا دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانی کرد، پێغەمبەری خوایش ﷺ تەماشای دەکرد، نکووڵی ئەوەی لێ نەکرد.

---

(١) صحيح.




(بە هەمان شێوە بە سەنەدێکی دیکە گێڕدراوەتەوە) لە قەیسەوە ﵁، ئەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی کرد، پاشان هەستا دوو ڕکات نوێژی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دوو ڕکاتە چی بوو کردت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی بوو نەم کردبوو، ئەوە ئەو دوو ڕکاتەیە، وتی: پێغەمبەر ﷺ لێی بێدەنگ بوو.

## بَابُ قَضَاءِ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ إِذَا نَسِيَهُمَا الْمَرْءُ

١١١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَسِيَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فَلْيُصَلِّهِمَا إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ»[١].

## باسی گێڕانەوەی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئەگەر کەسێك بیری چوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی بیر چوو، با کاتێ خۆر کەوت ئەنجامیان بدات.

## بَابُ قَضَاءِ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ إِذَا نَامَ الْمَرْءُ عَنْهُمَا فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ إِلَّا بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

١١١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَعْرَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَأْخُذْ كُلُّ إِنْسَانٍ بِرَأْسِ رَاحِلَتِهِ؛ فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ، فَفَعَلْنَا، فَدَعَا بِالْمَاءِ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى سَجْدَتَيْنِ حِينَ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، وَصَلَّى الْغَدَاةَ»[٢].

## باسی گێڕانەوەی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی، ئەگەر بەندە بەسەریاندا خەوت بە ئاگانەهاتەوە، تا دوای خۆرهەڵهاتن

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەودا دابەزین بە مەبەستی پشوودان بەخەبەر نەهاتینەوە تا خۆرهەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

با هەر کەسەو ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت، چونکە ئەم جێگایەی ئێمە بۆی دابەزین شەیتانی تێدایە، ئێمەش ئەوەمان کرد، دواتر داوای کرد ئاوی بۆ بهێنرێ و دەستنوێژی گرت، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان قامەت بۆ نوێژ کرا و نوێژی بەیانی کرد.

## بَابُ الدُّعَاءِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

**١١١٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي الْعَبَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَتَيْتُهُ مُمْسِيًا، وَهُوَ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِكَ تَهْدِي بِهَا قَلْبِي، وَتَجْمَعُ بِهَا شَمْلِي، وَتَلُمُّ بِهَا شَعْثِي، وَتَرُدُّ بِهَا الْغَيَّ، وَتُصْلِحُ بِهَا دِينِي، وَتَحْفَظُ بِهَا غَائِبِي، وَتَرْفَعُ بِهَا شَاهِدِي، وَتُزَكِّي بِهَا عَمَلِي، وَتُبَيِّضَ بِهَا وَجْهِي، وَتُلْهِمُنِي بِهَا رُشْدِي، وَتَعْصِمُنِي بِهَا مِنْ كُلِّ سُوءٍ، اللَّهُمَّ أَعْطِنِي إِيمَانًا صَادِقًا، وَيَقِينًا لَيْسَ بَعْدَهُ كُفْرٌ، وَرَحْمَةً أَنَالُ بِهَا شَرَفَ كَرَامَتِكَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْفَوْزَ عِنْدَ الْقَضَاءِ، وَنُزُلَ الشُّهَدَاءِ، وَعَيْشَ السُّعَدَاءِ، وَمُرَافَقَةَ الْأَنْبِيَاءِ، وَالنَّصْرَ عَلَى الْأَعْدَاءِ، اللَّهُمَّ أُنْزِلُ بِكَ حَاجَتِي، وَإِنْ قَصُرَ رَأْيِي، وَضَعُفَ عَمَلِي، وَافْتَقَرْتُ إِلَى رَحْمَتِكَ، فَأَسْأَلُكَ يَا قَاضِيَ الْأُمُورِ، وَيَا شَافِيَ الصُّدُورِ، كَمَا تُجِيرُ بَيْنَ الْبُحُورِ أَنْ تُجِيرَنِي مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ، وَمِنْ دَعْوَةِ الثُّبُورِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقُبُورِ، اللَّهُمَّ مَا قَصُرَ عَنْهُ رَأْيِي، وَضَعُفَ عَنْهُ عَمَلِي، وَلَمْ تَبْلُغْهُ نِيَّتِي مِنْ خَيْرٍ وَعَدْتَهُ أَحَدًا مِنْ عِبَادِكَ، أَوْ خَيْرٍ أَنْتَ مُعْطِيهِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَإِنِّي أَرْغَبُ إِلَيْكَ فِيهِ، وَأَسْأَلُكَ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنَا هُدَاةً مُهْتَدِينَ غَيْرَ ضَالِّينَ وَلَا مُضِلِّينَ، حَرْبًا لِأَعْدَائِكَ، سِلْمًا لِأَوْلِيَائِكَ، نُحِبُّ بِحُبِّكَ النَّاسَ، وَنُعَادِي بِعَدَاوَتِكَ مَنْ خَالَفَكَ، اللَّهُمَّ هَذَا الدُّعَاءُ وَعَلَيْكَ الِاسْتِجَابَةُ أَوِ الْإِجَابَةُ - شَكَّ ابْنُ خَلَفٍ - وَهَذَا الْجَهْدُ وَعَلَيْكَ التُّكْلَانُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، اللَّهُمَّ ذَا الْحَبْلِ الشَّدِيدِ، وَالْأَمْرِ الرَّشِيدِ، أَسْأَلُكَ الْأَمْنَ يَوْمَ الْوَعِيدِ، وَالْجَنَّةَ يَوْمَ الْخُلُودِ مَعَ الْمُقَرَّبِينَ الشُّهُودِ، الرُّكَّعِ السُّجُودِ، الْمُوفِينَ بِالْعُهُودِ، إِنَّكَ رَحِيمٌ وَدُودٌ، وَأَنْتَ تَفْعَلُ مَا تُرِيدُ، سُبْحَانَ الَّذِي تَعَطَّفَ الْعِزَّ وَقَالَ بِهِ، سُبْحَانَ الَّذِي لَبِسَ الْمَجْدَ وَتَكَرَّمَ بِهِ، سُبْحَانَ الَّذِي لَا يَنْبَغِي التَّسْبِيحُ إِلَّا لَهُ، سُبْحَانَ الَّذِي أَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ فَعَلِمَهُ، سُبْحَانَ ذِي الْفَضْلِ وَالنِّعَمِ، سُبْحَانَ ذِي الْقُدْرَةِ وَالْكَرَمِ، اللَّهُمَّ اجْعَلْ لِي نُورًا فِي قَلْبِي، وَنُورًا فِي قَبْرِي، وَنُورًا فِي سَمْعِي، وَنُورًا فِي بَصَرِي، وَنُورًا فِي شَعْرِي، وَنُورًا فِي بَشَرِي وَنُورًا فِي لَحْمِي، وَنُورًا فِي دَمِي، وَنُورًا فِي عِظَامِي، وَنُورًا بَيْنَ يَدَيَّ، وَنُورًا مِنْ خَلْفِي، وَنُورًا عَنْ يَمِينِي، وَنُورًا عَنْ شِمَالِي، وَنُورًا مِنْ فَوْقِي، وَنُورًا مِنْ تَحْتِي، اللَّهُمَّ زِدْنِي نُورًا، وَأَعْطِنِي نُورًا، وَاجْعَلْ لِي نُورًا»[١].

---

(١) إسناده ضعيف.

## باسی پاڕانەوە و نزاکردن دوای دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: عەباس ﵁ ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سەر لە ئێوارە، ئەو لە ماڵی مەیمونەی کچی حاریس بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ شەو هەستا شەونوێژی کرد، کاتێ دوو ڕکاتەکەی بەرەبەیانی کرد، فەرمووی: خوایە من داوای بەزەییت لێدەکەم، ڕێنمایی دڵمی پێ بکەیت، کاروبارمی پێ کۆبکەیتەوە، وە پەرتەوازەیمی پێ ڕێکبخەیتەوە، گومڕایی پێ ڕەت بکەیتەوە، ئایینەکەیشمی پێ چاك بکەی، ئەوەیشی لێم پەنهانە (لە باوەڕو ڕەوشت کە تۆ پێی ڕازیت) پێ بپارێزی، وە کردەوە ئاشکراکانیشم (کە چاکن) پێ بپارێزی، کردەوەکانیشمی پێ پاڵفتە بکەیت، ڕوخساریشمی پێ سپی بکەیت، بشمپارێزی پێی لە هەموو خراپەیەك، خوایە باوەڕێکی ڕاستگۆیانەم پێ ببەخشیت، دڵنیاییەکیش بێباوەڕبوون بە دوایدا نەیەت، وە ڕەحمەت و میهرەبانییەك پلە وپایەم لە دنیادا بەرز بکەیتەوە، خوایە من داوات لێ دەکەم سەرفراز و سەرکەوتووم بکەیت لە کاتی دادوەری و بڕیار، پلەوپایەی شەهیدەکانم پێ ببەخشیت و ژیانی خۆشبەختانیش، هەروەها هاوەڵی پێغەمبەرانیش، وە سەرکەوتنیش بەسەر دوژمناندا، خوایە داوات لێ دەکەم کەموکوڕی دنیا و دواڕۆژم بۆ پڕ بکەیتەوە، ئەگەرچی دەستەوسانیش بم لە هەستکردن بە چاکترین و شیاوترینیان، وە کردەوەکانیشم لاواز و ناتەواو بن لەوەی بگەن بە پلەی تەواو، بەڕاستی پێویستم بە ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ هەیە، ئەی دادوەر و ڕێکخەری کاروبارەکان، ئەی شیفادەری دڵەکان، وەکوو چۆن دەریاکان لەیەکدی جیا دەکەیتەوە ناهێڵی یەکێکیان تێکەڵ بە ئەوی دیکە بێت بمپارێزی لە سزای دۆزەخ و لە فیتنەی لەناوچوون و لە فیتنەی نێو گۆڕ، خوایە هەرچەند کەمتەرخەم بم لە هەوڵ و کۆشش و کردەوەکانیشم لاواز و ناتەواو بن لەوەی بگەن بە پلەی تەواو، نییەتیشم نەگاتە ئاستی ئەو خێرەی تۆ پەیمانت پێداوە بە کەسێك لە بەندەکانت، یان خێر و چاکەیەك تۆ دەیبەخشی بە یەکێك لە دروستکراوەکانت، خوایە من داوای ئەو خێر و چاکەیەت لێ دەکەم، ئەی پەروەردگاری جیهانیان من داوای میهرەبانیت لێ دەکەم، خوایە بمانگێڕە بە هیداتدراو و هیدایەتدەر نەك گومڕا و گومڕاکەر، شەڕی دوژمنانت بکەین و ببین بە مایەی سەلامەتی بۆ دۆستەکانت، تۆ کێت خۆش بوێ

ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ، وە دژایەتی هەر کەس دەکەین دژایەتیت بکات، خوایە ئەوە من پاڕامەوە، وەڵامدانەوەیشی لەسەر تۆیە (بە فەزڵ و چاکەی خۆت نەك واجب بێت)، ئەوەندە لە هێز و تواناماندایە و تەنها پشت بە تۆ دەبەستم، هیچ گۆڕان و هێز و توانایەك نییە جگە لە هێز و توانای خوا، خوایە ئەی خاوەن قوڕئانی پیرۆز و ئایینی ڕاست و فەرمانی دروست، داوای ئارامی و ئاسایشت لێ دەکەم لە ڕۆژی بەدیهاتنی هەڕەشەکان، هەروەها بەهەشتی هەمیشەیی لەگەڵ نزیککراوان (لە بارەگای تۆ) ئەوانەی ڕکووع و سوژدەیان زۆر بردووە، ئەوانەی بە وەفا بوون بەرانبەر پەیمانەکانیان، بەڕاستی تۆ بە بەزەیی و دڵسۆزی، تۆ هەر شتێکت بوێ دەیکەی، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی خاوەن پۆشاکی عیزەتە و خۆشی دەوێ و تایبەتی کردووە بە خۆی، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی پۆشاکی گەورەیی و مەزنی پۆشیوە و بە فەزڵی خۆی بەخشیویەتی بە بەندەکانی، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە کەس بەڕەهایی بە پاك و بێگەرد دانانرێ جگە لە ئەو، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی هەموو شتەکانی ژماردووە و زانایە پێیان، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە خاوەن شکۆ و ناز و نیعمەتەکانە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی خاوەن هێز و توانا و بەخشندەییە، خوایە ڕووناکی بخەیتە نێو دڵم، ڕووناکی بخەیتە نێو گۆڕەکەم، ڕووناکی بخەیتە نێو گوێم، ڕووناکی بخەیتە نێو چاوەکانم، ڕووناکی بخەیتە نێو قژم، ڕووناکی بخەیتە نێو پێستم، ڕووناکی بخەیتە نێو گۆشتم، ڕووناکی بخەیتە نێو خوێنم، ڕووناکی بخەیتە نێو ئێسکەکانم، ڕووناکی بخەیتە پێشم، ڕووناکی بخەیتە پشتەوەم، ڕووناکی بخەیتە لای ڕاستم، ڕووناکی بخەیتە لای چەپم، ڕووناکی بخەیتە سەرەوەم، ڕووناکی بخەیتە ژێرەوەم، خوایە ڕووناکیم بۆ زیاد بکە و ڕووناکیم پێ ببەخشە، ڕووناکیم بۆ دانێ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاضْطِجَاعِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

**١١٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ»، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ: أَمَا يَكْفِي أَحَدَنَا مَمْشَاهُ إِلَى الْمَسْجِدِ حَتَّى يَضْطَجِعَ قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ تُنْكِرُ مِمَّا يَقُولُ شَيْئًا قَالَ: لَا، وَلَكِنَّهُ اجْتَرَأَ، وَجَبُنَّا، فَبَلَغَ ذَلِكَ أَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَالَ: مَا ذَنْبِي إِنْ كُنْتُ حَفِظْتُ وَنَسُوا[١].

---

(١) هذا حديث معلول.

## باسی ئەوە کە چاکتر وایە دوای دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی (کەسەکە) ڕاکشێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی کرد با بەلای ڕاستیدا ڕاکشێت، مەڕوانی کوڕی حەکەم پێی وت: ئایا ڕۆیشتنی ئێمە بۆ مزگەوت بەس نییە لەجیاتی ئەوەی ڕابکشێت؟ وتی: ئەو هەواڵە گەیشتە ئیبنو عومەر ﷺ، وتی: ئەبو هورەیرە زۆری وت، بە ئیبنو عومەر وترا: ئایا نکوولی شتێك دەکەیت لەوەی ئەبو هورەیرە دەیڵێ؟ وتی: نەخێر، بەڵام ئەو لە گێڕانەوەدا بە جورئەتەوە فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، ئێمەش لە فەرموودەگێڕانەوە دەترسین، ئەو قسەیە گەیشتە ئەبو هورەیرە، وتی: گوناهی من چییە کە شتێکم لە بیرە ئەوان بیریان چووە.

**١١٢١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: زُرْتُ خَالَتِي، فَوَافَقْتُ لَيْلَةَ النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى سَمِعْتُ ضَفِيزَهُ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَخَرَجَ فَصَلَّى[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: سەردانی پورم مەیمونەم کرد، جا ئەو شەوە وا ڕێککەوت نۆرەی پورم بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەلای بێت، -پاشان باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر لەسەر تەنیشتی ڕاکشا هەتا گوێم لە پرخەی بوو، پاشان قامەت بۆ نوێژ کرا، دواتر چووەدەر نوێژی بەیانی کرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الِاضْطِجَاعِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِالِاضْطِجَاعِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ أَمْرَ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ لَا أَمْرَ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ، وَالرُّخْصَةِ فِي الْحَدِيثِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

**١١٢٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِي، وَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً اضْطَجَعَ حَتَّى يَقُومَ لِلصَّلَاةِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەت دراوە لە وازهێنانی ڕاکشان دوای دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانی، بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بە ڕاکشان دوای دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی فەرمانێکە بۆ سوننەت و ڕێنیشاندان نەک بۆ فەرز بوون، مۆڵەت دراوە بە قسەکردن دوای دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، ئەگەر من بەخەبەر بووایەم قسەی لەگەڵم دەکرد، ئەگەریش خەوتبووایەم ڕادەکشا تا هەڵدەستا بۆ نوێژی بەیانی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بَعْدَ الْإِقَامَةِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُمَا تُصَلِّيَانِ وَالْإِمَامُ يُصَلِّي الْفَرِيضَةَ

١١٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا صَلَاةَ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»(١).

## باسی قەدەغەکردن لەوەی بەندە دوای قامەت دوو ڕکاتە (سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی بکات، بەپێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە دروستە ئەو دوو ڕکاتە بکرێن با ئیمامیش نوێژی فەرزی دەست پێ کردبێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قامەت بۆ نوێژ کرا هیچ نوێژێك نییە جگە لە نوێژی فەرز.

١١٢٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَقُمْتُ أُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَجَذَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: «أَتُصَلِّي الْغَدَاةَ أَرْبَعاً»(٢).

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: قامەت بۆ نوێژی بەیانی کرا منیش هەستام دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژ بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایکێشام و فەرمووی: ئایا چوار ڕکات نوێژی بەیانی دەکەیت!

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده مقال.

**١١٢٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاتَهُ قَالَ: «يَا فُلَانُ، أَيَّتُهُمَا صَلَاتُكَ الَّتِي صَلَّيْتَ مَعَنَا أَوِ الَّتِي صَلَّيْتَ لِنَفْسِكَ»(١).

**واته: عەبدوڵای كوڕی سەرجیس ﵁ دەڵێ: پیاوێك هات لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا بوو، دوو ڕكات نوێژی كرد، كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكەی تەواو كرد، فەرمووی: ئەی فڵانە كەس كامەیان نوێژە فەرزەكەت بوو، ئەو نوێژەی كە لەگەڵ ئێمە كردت، یان ئەو نوێژەی بۆ خۆت كردت.**

**١١٢٦-** عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَرَأَى نَاسًا يُصَلُّونَ رَكْعَتَيْنِ بِالْعَجَلَةِ، فَقَالَ: «أَصَلَاتَانِ مَعاً؟! فَنَهَى أَنْ يُصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ»(٢).

**واته: ئەنەس ﵁ دەڵێ: كاتی قامەت بۆ نوێژی بەیانی كرا، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو، خەڵكانێكی بینی بەپەلە دوو ڕكات نوێژیان كرد، فەرمووی: ئایا دوو نوێژ پێكەوە؟! قەدەغەی كرد كاتێك قامەت كرا بۆ نوێژ، نوێژی سوننەت لە مزگەوت بكرێ.**

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بِاللَّيْلِ

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرِ نَسْخِ فَرْضِ قِيَامِ اللَّيْلِ بَعْدَمَا كَانَ فَرْضًا وَاجِبًا

**١١٢٧-** عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَهُوَ إِلَى عَائِشَةَ ﵂ فَاسْتَأْذَنَّا فَأُدْخِلْنَا عَلَيْهَا، فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ نَبِّئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ - تَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤﴾ القلم، قَالَ: بَلَى قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ الْقُرْآنَ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، نَبِّئِينِي عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ هَذِهِ السُّورَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١﴾ المزمل، قَالَ: فَقُلْتُ: بَلَى قَالَتْ: فَإِنَّ اللَّهَ فَرَضَ الْقِيَامَ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَوْلًا، حَتَّى انْتَفَخَتْ أَقْدَامُهُمْ، وَأَمْسَكَ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا فِي السَّمَاءِ، ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ التَّخْفِيفَ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده معلول بالإرسال.




فَرِيضَةٍ، ثُمَّ ذَكَرُوا الْحَدِيثَ، وَفِي آخِرِ الْحَدِيثِ قَالَ: فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَأَخْبَرْتُهُ بِحَدِيثِهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ[١].

## کۆباسی نوێژی زیادە لە شەودا (واتە: لە شەونوێژ)

## باسی فەرموودەیەك کە حوکمی فەرزبوونی شەونوێژی نەسخ کردۆتەوە، دوای ئەوەی فەرز بوو

واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەڵێ: هاتم بۆ لای حەکیمی کوڕی ئەفلەح هەردووکمان پێکەوە چووین بۆ لای دایکمان عائیشە ﵂، داوای مۆڵەتمان کرد، مۆڵەتمان پێدرا بۆ ژوورەوە، وتمان: ئەی دایکی ئیمانداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی خورەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا قورئانت نەخوێندووە؟ -مەبەستی فەرمایشتی خوا بوو کە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤﴾، وتی: بەڵێ، وتی: خورەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو، وتم: ئەی دایکی ئیمانداران هەواڵم بدەرێ لەبارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا تۆ ئەم سورەتەت نەخوێندوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١﴾؟ وتی: وتم: بەڵێ، وتی: بێگومان خوا ﷻ شەونوێژی فەرز کرد لە سەرەتای ئەم سورەتە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ساڵێك هەستان هەتا قاچیان ئاوسا، خوا ﷻ کۆتایی سورەتەکەی لە ئاسمان دواخست بۆ ماوەی دوازدە مانگ، پاشان خوا ﷻ ئاسانکاری دابەزاند لە کۆتایی ئەم سورەتە، جا شەونوێژ بوو بە سوننەت دوای ئەوەی کە فەرز بوو، -پاشان باسی فەرموودەکەیان کرد- وە لە کۆتایی فەرموودەکە وتی: هاتمەوە بۆ لای ئیبنو عەباس باسەکەیم بۆی گێڕایەوە، وتی: ڕاست دەکات.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْفَرْضَ قَدْ يُنْسَخُ فَيُجْعَلُ الْفَرْضُ تَطَوُّعًا، وَجَائِزٌ أَنْ يُنْسَخَ التَّطَوُّعُ ثَانِيًا فَيُفْرَضَ الْفَرْضُ الْأَوَّلُ كَمَا كَانَ فِي الِابْتِدَاءِ فَرْضًا

١١٢٨- عَنْ عُرْوَةَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلَاتِهِ، فَأَصْبَحَ نَاسٌ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الثَّالِثَةُ كَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى، فَصَلَّوْا بِصَلَاتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ، عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ

---

(١) صحيح.

يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يُنَادُونَ الصَّلَاةَ، فَكَمُنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى خَرَجَ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاةَ الْفَجْرِ، قَامَ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ، فَتَشَهَّدَ فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمْ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژی فەرز هەندێ جار حوکمەکەی نەسخ دەبێتەوەو دەبێ بە سوننەت، دروستیشە حوکمی نوێژی سوننەت دووەم جار هەڵبوەشێتەوە فەرزی یەکەم فەرز ببێتەوە، وەکو چۆن سەرەتا فەرز بوو

وڵاتە: عوروە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﵂ وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەی شەودا دەرچوو لەنێو مزگەوت نوێژی کرد، خەڵکانێکیش لە پشتیەوە وەکوو ئەو نوێژیان کرد، کاتێ ڕۆژ بوویەوە خەڵکی بۆ یەکدی باسیان دەکرد، کاتێك شەوی سێیەم هات خەڵکێکی زۆر لە مزگەوت ئامادە بوون، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو نوێژی کرد خەڵکەکەیش لە پشتیەوە وەکوو ئەو نوێژیان کرد، جا لە شەوی چوارەم خەڵکەکە زۆر بوون هەتا لە مزگەوت جێیان نەدەبوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چیدی نەهاتە دەرەوە بۆ نێویان، خەڵکیش بانگیان دەکرد: کاتی نوێژە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتە دەرەوە بۆ لایان تا بۆ نوێژی بەیانی دەرچوو، ئینجا هاتە دەرەوە، کاتێ نوێژی بەیانی تەواو کرد ڕووی کردە خەڵکەکەو شایەتمانی هێنا، پاشان سوپاس و ستایشی خوای کرد، ئینجا فەرمووی: دوای ئەوە، بێگومان بێئاگا نەبووم لە دۆخی ئەمشەوتان، بەڵام لەوە ترسام شەونوێژتان لەسەر فەرز بێت و نەتوانن پێی هەستن.

## بَابُ كَرَاهَةِ تَرْكِ صَلَاةِ اللَّيْلِ بَعْدَمَا كَانَ الْمَرْءُ قَدِ اعْتَادَهُ

**١١٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَكُنْ مِثْلَ فُلَانٍ، كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی ناپەسندی وازهێنان لە شەونوێژ بۆ کەسێك کە پێوەی ڕاهاتوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر، وەکوو فڵانە کەس مەبە شەو هەڵدەستا بۆ نوێژ دوایی وازی لە شەونوێژ هێنا.

## بَابُ كَرَاهَةِ تَرْكِ قِيَامِ اللَّيْلِ وَإِنْ كَانَ تَطَوُّعًا لَا فَرْضًا

**١١٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﭬ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ فُلَانًا نَامَ الْبَارِحَةَ عَنِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَاكَ شَيْطَانٌ بَالَ فِي أُذُنِهِ، أَوْ فِي أُذُنَيْهِ»[١].

### باسی ناپەسەندی و کەڕاهەتی وازهێنان لە شەونوێژ، ئەگەرچی سوننەتە و فەڕز نییە

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﭬ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: فڵانە کەس دوێنێ شەو خەوت هیچ نوێژی نەکرد (جگە لە نوێژی بەیانی)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە شەیتان میزی کردووە بە گوێی، یان بە هەردوو گوێیدا.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ قِيَامِ اللَّيْلِ يَحِلُّ عُقَدَ الشَّيْطَانِ الَّتِي يَعْقِدُهَا عَلَى النَّائِمِ فَيُصْبِحُ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ بِحَلِّ عُقَدِ الشَّيْطَانِ عَنْ نَفْسِهِ

**١١٣١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ ثَلَاثَ عُقَدٍ إِذَا هُوَ نَامَ، كُلُّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ عَلَيْهِ يَقُولُ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، وَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَتَانِ، فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی چاکتر وایە مرۆڤ شەونوێژ بکات، چونکە دەبێتە هۆی کردنەوەی ئەو گرێیانەی کە شەیتان گرێی داوە لەسەری، جا بەیانی دەکاتەوە بەچالاکی دەروونێکی پاکەوە، بەهۆی کردنەوەی گرێیەکانی شەیتان لە دەروونیدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە دەخەوێت شەیتان سێ گرێ لەپشت سەری دەدات، بۆ هەر گرێیەك دەڵێت: شەوێکی درێژت لەسەر بێت بخەوە، جا ئەگەر خەبەری بۆیەوە و یادی خوای کرد، ئەوە گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت دوو گرێیان دەکرێنەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد هەموو گرێیەکان دەکرێنەوە، ئیدی بەیانی دەکاتەوە بەنەفسێکی پاك و چالاك، ئەگەر وا نەبوو بەدەروون پیسی و تەمبەڵی بەیانی دەکاتەوە.

### بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ رَكْعَتَيْنِ مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ بَعْدَ ذِكْرِ اللَّهِ وَالْوُضُوءِ تَحِلَّانِ الْعُقَدَ كُلَّهَا الَّتِي يَعْقِدُهَا الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ النَّائِمِ

**١١٣٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا نَامَ عَقَدَ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ ثَلَاثَ عُقَدٍ، فَإِنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَذَكَرَ اللَّهَ، حُلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ تَوَضَّأَ حُلَّتْ عُقْدَتَانِ فَإِنْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، حُلَّتِ الْعُقَدُ كُلُّهَا، فَحُلُّوا عُقَدَ الشَّيْطَانِ، وَلَوْ بِرَكْعَتَيْنِ»[١].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دوو ڕکات شەونوێژ دوای یادی خواو دەستنوێژ، هەموو ئەو گرێیانە دەکەنەوە کە شەیتان گرێی داوە لە پشتەسەری کەسی خەوتوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە کاتێك خەوت شەیتان سێ گرێ دەدات لەسەری، ئەگەر شەو لەخەو هەستاو یادی خوای کرد، گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت دوو گرێی دەکرێتەوە، ئەگەر دوو ڕکات نوێژی کرد، هەموو گرێیەکانی دەکرێنەوە، جا گرێیەکانی شەیتان بکەنەوە ئەگەرچی بە دوو ڕکاتیش بێت.

---

(١) ظاهر إسناده الصحة، لولا المخالفة في وقفه، لم نقف عليه من هذا الطريق مرفوعاً.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّيْطَانَ يَعْقِدُ عَلَى قَافِيَةِ النِّسَاءِ كَعَقْدِهِ عَلَى قَافِيَةِ الرِّجَالِ بِاللَّيْلِ، وَأَنَّ الْمَرْأَةَ تَحِلُّ عَنْ نَفْسِهَا عُقَدَ الشَّيْطَانِ بِذِكْرِ اللَّهِ وَالْوُضُوءِ وَالصَّلَاةِ كَالرَّجُلِ سَوَاءً

**١١٣٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ ذَكَرٍ وَلَا أُنْثَى إِلَّا عَلَى رَأْسِهِ جَرِيرٌ مَعْقُودٌ حِينَ يَرْقُدُ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا قَامَ فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شەیتان لە شەودا گرێ دەدات لە پشتەسەری ئافرەتان وەکو پیاوان، ئافرەت دەتوانێ گرێیەکانی شەیتان لە خۆیدا بکاتەوە بەهەمان شێوەی پیاو، بە زیکری خواو دەستنوێژو نوێژکردن

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ نێر و مێیەك نییە مەگەر کاتێك دەخەوێ گرێیەك بە پەت دەدرێت لە سەری، کاتێك لەخەو هەستا و زیکری خوای کرد، ئەوە گرێیەکیان دەکرێتەوە، کاتێ هەستاو دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد گرێیەکان دەکرێنەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ عَلَى أَنَّ صَلَاةَ اللَّيْلِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ؟

**١١٣٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ أَيُّ صَلَاةٍ أَفْضَلُ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ؟ وَأَيُّ الصِّيَامِ أَفْضَلُ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ؟ فَقَالَ: «أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ الصَّلَاةُ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، وَأَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ»(٢).

### باسی ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی شەونوێژ چاکترین نوێژە دوای نوێژە فەرزەکان؟

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ چ نوێژێك دوای نوێژە فەرزەکان چاکترینە؟ وە چ ڕۆژوویەك دوای مانگی ڕەمەزان چاکترینە؟ فەرمووی: چاکترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان شەونوێژە، وە چاکترین ڕۆژوو دوای مانگی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ڕەمەزان (ڕۆژەکانی) مانگی موحەڕەمە (کە دەکەوێتە نێو ئەو مانگانەی جەنگ و کوشتار تیایدا قەدەغە کراوە).

## بَابُ التَّحْرِيضِ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ إِذْ هُوَ دَأْبُ الصَّالِحِينَ وَقُرْبَةٌ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَتَكْفِيرُ السَّيِّئَاتِ وَمَنْهَاةٌ عَنِ الْإِثْمِ

**١١٣٥-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ، وَمُكَفِّرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ عَنِ الْإِثْمِ»[١].

## باسی هاندان لەسەر شەونوێژ، چونکە ئەوە پیشەی پیاوچاکانەو نزیکبوونەوەیە لە خوا، هۆکاری سڕینەوەی گوناهەکانە و ڕێگرە لە خراپەکردن

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەیوەست بن بە شەونوێژەوە، چونکە ئەوە پیشەی پیاوچاکانی پێش ئێوەیە، وە نزیکتان دەکاتەوە لە پەروەردگارتان، وە سڕینەرەوەی گوناهەکانە و ڕێگری دەکات لە گوناهو خراپە.

## بَابُ قِيَامِ اللَّيْلِ وَإِنْ كَانَ الْمَرْءُ وَجِعًا مَرِيضًا إِذَا قَدَرَ عَلَى الْقِيَامِ مَعَ الْوَجَعِ وَالْمَرَضِ

**١١٣٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ شَيْئًا، فَلَمَّا أَصْبَحَ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنَّ أَثَرَ الْوَجَعِ عَلَيْكَ لَبَيِّنٌ قَالَ: «أَمَا إِنِّي عَلَى مَا تَرَوْنَ بِحَمْدِ اللَّهِ قَدْ قَرَأْتُ الْبَارِحَةَ السَّبْعَ الطِّوَالَ»[٢].

## باسی شەونوێژکردنی مرۆڤ لەگەڵ هەبوونی ئازارو نەخۆشی، ئەگەر توانی با شەونوێژ بکات

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نەخۆش کەوت کاتێك بەیانی کردەوە، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەواری ئازارت پێوە دیارە، فەرمووی: سوپاس بۆ خوا من بەو حاڵەشەوە کە دەیبینن دوێنێ شەو حەوت سوڕەتە درێژەکەم خوێند.

---

(١) هذا الحديث منكر من منكرات معاوية بن صالح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَلَاةِ اللَّيْلِ قَاعِدًا إِذَا مَرِضَ الْمَرْءُ أَوْ كَسِلَ

**١١٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُوسَى، قَالَتْ لِي عَائِشَةُ ﵂: لَا تَدَعْ قِيَامَ اللَّيْلِ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يَذَرُهُ، وَكَانَ إِذَا مَرِضَ أَوْ كَسِلَ صَلَّى قَاعِدًا[١].

## باسی چاکتر وایە بۆ مرۆڤ ئەگەر نەخۆش کەوت، یاخود ماندوو بوو بە دانیشتنەوە شەونوێژ بکات

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو موسا، دەڵێ: عائیشە ﵂ پێی وتم: واز مەهێنە شەونوێژ مەبە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەرداری نەدەبوو، کاتێ نەخۆش بووایە یان ماندوو بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد.

**١١٣٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ ﵁، عَنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُنَّ، أَنَّهُنَّ حَدَّثْنَهُ أَنَّ اللَّهَ ﷻ دَلَّ نَبِيَّهُ ﷺ عَلَى دَلِيلٍ، فَقَالَ لَهُنَّ: أَدْلِلْنَنِي عَلَى مَا دَلَّ اللَّهُ عَلَيْهِ نَبِيَّهُ ﷺ، فَقُلْنَ: إِنَّ اللَّهَ دَلَّ نَبِيَّهُ ﷺ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ[٢].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەیس ﵁ دەگێڕێتەوە، لە دایکانی ئیمانداراننەوە ئەوان بۆیان باس کرد خوا ﷻ ڕێی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ نیشان داوە لەسەر ڕێگایەك، پێی وتن: ڕێم نیشان بدەن لەسەر ئەوەی خوا ڕێی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ نیشان داوە، وتیان: خوا ڕێی نیشان پێغەمبەرەکەی ﷺ داوە لەسەر شەونوێژ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ إِيقَاظِ الْمَرْءِ لِصَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٣٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيَّ وَعَلَى فَاطِمَةَ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ لَنَا: «قُومَا فَصَلِّيَا»، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ فَلَمَّا مَضَى هَوِيٌّ مِنَ اللَّيْلِ رَجَعَ، فَلَمْ يَسْمَعْ لَنَا حِسًّا، فَقَالَ: «قُومَا فَصَلِّيَا»، قَالَ: فَقُمْتُ، وَأَنَا أَعْرُكُ عَيْنِيَّ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه ﷺ، وَاللَّهِ مَا نُصَلِّي إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ إِذَا شَاءَ يَبْعَثُنَا بَعَثَنَا، فَوَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

يَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: مَا نُصَلِّي إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا؟ ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤﴾ الكهف[1].

## باسی چاکتر وایە مسوڵمان لە خەو هەڵبستێنرێ بۆ شەونوێژ

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەو هاتە ژوورەوە بۆ لای من و فاتیمە ﷺ، پێیانی وت: هەستن نوێژ بکەن، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی خۆی، کاتێ بەشێکی شەو تێپەر بوو گەڕایەوە، گوێی لە هیچ جوڵەیەکی ئێمە نەبوو، فەرمووی: هەستن نوێژ بکەن، وتی: هەستام و خەریك بوو چاوم دەسڕی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە خوا نوێژ ناکەین ئەوە نەبێت خوا بۆمانی نووسیوە، بێگومان گیانی ئێمە بە دەستی خوایە ئەگەر بیویستایە بەخەرمان بکاتەوە هەڵدەستاین، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و دەیدا لە ڕانی خۆی و دەیفەرموو: نوێژ ناکەین ئەوە نەبێت خوا بۆمانی نووسیوە؟! ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤﴾، واتە: بەڵام هەمیشە ئادەمی لە هەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات.

**١١٤٠-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَلَا تُصَلُّونَ؟» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ فَإِنْ شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قُلْتُ ذَلِكَ، وَلَمْ يُرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُدْبِرٌ يَضْرِبُ فَخِذَهُ، وَيَقُولُ: ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤﴾ الكهف[2].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە دەرگای ماڵی خۆی و فاتیمەی ﷺ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژ ناکەن؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بێگومان گیانی ئێمە بە دەستی خوایە، ئەگەر بیویستایە بەخەبەرمان بکاتەوە هەڵدەستاین، کاتێ ئەو قسەم کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، نەگەڕایەوە بۆ لام، پاشان گوێم لێ بوو دەیدا لە ڕانی خۆی و دەیفەرموو: ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤﴾، واتە: بەڵام هەمیشە ئادەمی لە هەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## بَابُ ذِكْرِ أَقَلِّ مَا يُجْزِئُ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي قِيَامِ اللَّيْلِ

**١١٤١-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ بِالْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»[١].

## باسی کەمترین قورئانخوێندن کە دروستە لە شەونوێژدا بخوێنرێ

واتە: ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ئایەت لە سورەتی بەقەرە بخوێنێت لە شەوێکدا بەسن بۆی.

## بَابُ ذِكْرِ فَضِيلَةِ قِرَاءَةِ مِائَةِ آيَةٍ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ، إِذْ قَارِئُ مِائَةِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ لَا يُكْتَبُ مِنَ الْغَافِلِينَ

**١١٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ مِائَةَ آيَةٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، أَوْ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ» وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الْكَلَامِ أَرْبَعَةٌ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ»[٢].

## باسی فەزڵی خوێندنی سەد ئایەت لە شەونوێژدا، چونکە ئەو کەسەی سەد ئایەت لە شەودا بخوێنێ لە بێئاگایان نانووسرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزگاری لە نوێژە فەرزەکان بکات، هەرگیز لە پەڕاوی بێئاگایان نانووسرێ، وە هەر کەسێك سەد ئایەت بخوێنێت لە شەودا، هەرگیز لە پەڕاوی بێئاگایان نانووسرێ، یان ناوی لە پەڕاوی ئەوانە دەنووسرێ کە بەردەوامن لەسەر پەرستش. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین وتە چوارن: (سُبْحَانَ اللَّهِ) و (الْحَمْدُ لِلَّهِ) و (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ قِرَاءَةِ مِائَتَيْ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ إِذْ قَارِئُهَا يُكْتَبُ مِنَ الْقَانِتِينَ الْمُخْلِصِينَ

**١١٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى فِي لَيْلَةٍ بِمِائَةِ آيَةٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ صَلَّى فِي لَيْلَةٍ بِمِائَتَيْ آيَةٍ فَإِنَّهُ يُكْتَبُ مِنَ الْقَانِتِينَ الْمُخْلِصِينَ»[١].

## باسی فەزڵ و ڕێزی خوێندنی دوو سەد ئایەت لە شەوێکدا، چونکە خوێنەرەکەی لە پەڕاوی پەرستشکارە دڵسۆزەکان دەنووسرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە شەوێکدا شەونوێژ بکات و سەد ئایەتی تێدا بخوێنێ، هەرگیز لە پەڕاوی بێئاگایان نانووسرێ، وە هەر کەسێك لە شەوێکدا شەونوێژ بکات و دوو سەد ئایەتی تێدا بخوێنێ ئەوە لە پەڕاوی ئەوانە دەنووسرێ کە بەردەوامن لەسەر پەرستش و دڵسۆزن.

## بَابُ فَضْلِ قِرَاءَةِ أَلْفِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ أَبَا سَوِيَّةٍ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

**١١٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطِرِينَ»[٢].

## باسی فەزڵ و ڕێزی خوێندنی هەزار ئایەت لە شەوێکدا، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم ئەبو سەویە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دادپەروەرە یان لەکەدارە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دە ئایەت بخوێنێ لە شەونوێژدا هەرگیز لە پەڕاوی بێئاگایان نانووسرێ، وە هەر کەسێك سەد ئایەت بخوێنێ لە شەونوێژدا ناوی لە پەڕاوی ئەوانە دەنووسرێ کە بەردەوامن لەسەر پەرستش، وە هەر کەسێك هەزار ئایەت بخوێنێ لە شەونوێژدا ناوی لە پەڕاوی ئەوانە دەنووسرێ کە پاداشتیان زۆرە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ اللَّيْلِ وَقَبْلَ السُّدُسِ الْآخِرِ

**١١٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَ اللَّيْلِ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا»[١].

## باسی فەزڵ و ڕێزی شەونوێژ پێش شەشیەکی کۆتایی شەو

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین نوێژ لە لای خوا نوێژی داووده (عليه السلام)، تا نیوەی شەو دەخەوت، سێیەکی شەویش هەڵدەستا شەونوێژی دەکرد، شەشیەکیشی دەخەوت، وە خۆشەویسترین ڕۆژوو لە لای خوا ڕۆژی داوود بوو (عليه السلام)، ڕۆژێك ڕۆژووی دەگرت و ڕۆژێك نەیدەگرت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الدُّعَاءِ فِي نِصْفِ اللَّيْلِ الْآخِرِ رَجَاءَ الْإِجَابَةِ

**١١٤٦-** عَنِ الْأَغَرِّ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُمْهِلُ حَتَّى يَذْهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ فَيَنْزِلُ، فَيَقُولُ: هَلْ مِنْ سَائِلٍ؟ هَلْ مِنْ تَائِبٍ؟ هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ مِنْ ذَنْبٍ؟»، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[٢].

## باسی چاکتر وایە لە نیوەشەودا نزاو پاڕانەوە بکرێ بە ئومێدی قبووڵبوون

واتە: ئەغەر دەڵێ: شایەتی ئەدەم ئەبو هوڕەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﷺ ئەوان شایەتییان دا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا مۆڵەت دەدات تاکو یەك لەسەر سێی یەکەمی شەو دەڕوات، ئینجا دادەبەزێت و دەفەرمووێ: ئایا داواکەرێك هەیە؟ ئایا تەوبەکارێك هەیە؟ ئایا کەسێك هەیە داوای لێخۆشبوون بکات لە گوناه؟ پیاوێك پێی وت: تا بەرەبەیان دەبێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١١٤٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَنْبَسَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ نَازِلٌ بِعُكَاظَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَهَلْ مِنْ دَعْوَةٍ أَقْرَبُ مِنْ أُخْرَى، أَوْ سَاعَةٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِنَّ أَقْرَبَ مَا يَكُونُ الرَّبُّ مِنَ الْعَبْدِ جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللَّهَ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ»(١).

**واتە:** عەمری کوڕی عەنبەسە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دابەزیبووە بازاڕی (عُكَاظَ) -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پاڕانەوەیەك یان ساتێك هەیە لەویتر نزیکتر بێت لە وەرگرتن؟ فەرمووی: بەڵێ، بێگومان نزیکترین کاتی پەروەردگار لە بەندەکەیەوە نیوەی شەوی کۆتاییە، ئەگەر توانیت لەو کەسانە بیت کە لەو کاتەدا یادی خوا دەکەن لەوانە بە.

## بَابُ فَضْلِ إِيقَاظِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ وَالْمَرْأَةِ زَوْجَهَا لِصَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ رَجُلًا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى، وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ، رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ، وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ»(٢).

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو پیاوەی ژنەکەی لە خەو هەڵدەستێنێ، وە ئەو ژنەش پیاوەکەی هەڵدەستێنێ بۆ شەونوێژ

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا ﷻ لەو پیاوەی لە شەودا هەڵدەستێت و شەونوێژ دەکات و ژنەکەیشی هەڵدەستێنێت، ئەگەر هەڵنەسا ئاو بپرژێنێت بە ڕوخساریدا، وە ڕەحمەتی خوا ﷻ لەو ئافرەتەی لە شەودا هەڵدەستێت و شەونوێژ دەکات و مێردەکەیشی هەڵدەستێنێت، ئەگەر هەڵنەسا ئاو بپرژێنێت بە ڕوخساریدا (بە مەرجێ ئاوپرژاندنەکە نەبێتە هۆی کێشە و تووڕەبوون لە نێوانیاندا).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ التَّسَوُّكِ عِنْدَ الْقِيَامِ لِصَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٤٩-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِلتَّهَجُّدِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ. وَقَالَ هَارُونُ، وَأَبُو حَصِينٍ: إِذَا قَامَ يَتَهَجَّدُ[١].

### باسی سیواك كردن لە كاتی هەستان بۆ شەونوێژ

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك هەستابووایە بۆ شەونوێژ سیواكی وەردەدا لە دەمی.

## بَابُ افْتِتَاحِ صَلَاةِ اللَّيْلِ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ

**١١٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَتِحْ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[٢].

### باسی دەستپێكردنی شەونوێژ بە دوو ڕكاتی كورت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ یەكێك لە ئێوە هەستا بۆ شەونوێژ با نوێژەكەی دەست پێ بكات بە دوو ڕكاتی كورت و پوخت.

## بَابُ التَّحْمِيدِ وَالثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ وَالدُّعَاءِ عِنْدَ افْتِتَاحِ صَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٥١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ مَلِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَوَعِيدُكَ حَقٌّ، وَعَذَابُ الْقَبْرِ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالْقُبُورُ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، اللَّهُمَّ بِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ. وَزَادَ عَبْدُ الْكَرِيمِ: لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»(١).

## باسی سوپاس و ستاییشكردنی خوا ﷻ لە كاتی دەستپێكردن بە شەونوێژ

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێك لە شەودا هەستایە و شەونوێژی بكردایە دەیفەرموو: خوایە سوپاس و ستاییش بۆ تۆ، تۆ ڕووناكی ئاسمانەكان و زەویت و ئەوەیشی لەنێویاندایە، ستاییش بۆ تۆ، تۆ ڕاگری ئاسمانەكان و زەویت و ئەوەیشی لەنێویاندایە، ستاییش بۆ تۆ، تۆ پاشای ئاسمانەكان و زەویت و ئەوەیشی لەنێویاندایە، ستاییش بۆ تۆ، تۆ حەق و ڕاستیت، گەیشتن بە تۆ ڕاستە، هەڕەشەكانت ڕاستن، سزای نێو گۆڕ ڕاستە و بەهەشت ڕاستە و ئاگریش ڕاستە، ڕۆژی دواییش ڕاستە، گۆڕەكانیش ڕاستن (واتە: مردنیش حەقە)، موحەممەدیش ڕاستە، خوایە بڕوام بە تۆ هێنا و ملكەچ و تەسلیمی تۆ بووم و پشتم بە تۆ بەست و تەنها بۆ لای تۆ گەڕامەوە، بەیارمەتی تۆ دژایەتی ناحەزانی ئیسلام دەكەم و حوكم و بڕیار بۆ لای تۆ دەگێڕمەوە، تۆش لێم خۆش بە لە ڕابردوو و داهاتوو و ئەوەی بەشاراوەیی و ئەوەی بەئاشكرا كردوومە، تۆ یەكەم و كۆتاییت (واتە: لەپێش زاتی تۆ كەس نەبووە، لە كۆتاییشدا تەنها زاتی تۆ دەمێنیتەوە)، هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە تۆ، وە لە غەیری تۆ هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە، عەبدولكەریم زیادی كردووە تیایدا: هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە تۆ، هیچ هێزێك نییە تەنها بە خوا نەبێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يَحْمَدُ بِهَذَا التَّحْمِيدِ وَيَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ لِافْتِتَاحِ صَلَاةِ اللَّيْلِ بَعْدَ التَّكْبِيرِ لَا قَبْلُ

**١١٥٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ لِلتَّهَجُّدِ قَالَ بَعْدَمَا يُكَبِّرُ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قِيَامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ

---

(١) صحيح.

أَنَبْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، وَإِلَيْكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی دابەستنی شەونوێژ و دوای (الله أكبر)، ئەم ستاییشکردنەی دەخوێند نەك لەپێشەوە

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك شەو هەستایە بۆ شەونوێژ دوای (الله أكبر) دەیفەرموو: خوایە سوپاس و ستاییش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویت، ستاییش بۆ تۆ، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت، ستاییش بۆ تۆ، تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەیشی لەنێویاندایە، تۆ حەق و ڕاستیت، فەرمایشتەکانت ڕاستن، بەڵێن و پەیمانەکانت ڕاستن، گەیشتن بە تۆ ڕاستە، بەهەشت ڕاستە و ئاگریش ڕاستە، ڕۆژی دواییش ڕاستە، خوایە ملکەچ و تەسلیمی تۆ بووم و بڕوام بە تۆ هێنا و پشتم بە تۆ بەست و تەنها بۆ لای تۆ گەڕامەوە، بەیارمەتی تۆ دژایەتی ناحەزانی ئیسلام دەکەم و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، خوایە لێم خۆش بە لە ڕابردوو و داهاتوو و ئەوەی بە شاراوەیی و ئەوەی بەئاشکرا کردوومە، تۆ پەرستراوی منی، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ مَسْأَلَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ الْهِدَايَةَ لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ عِنْدَ افْتِتَاحِ صَلَاةِ اللَّيْلِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى جَهْلِ مَنْ زَعَمَ مِنَ الْمُرْجِئَةِ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ لِلْعَاطِسِ أَنْ يَرُدَّ عَلَى الْمُشَمِّتِ فَيَقُولَ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ الَّذِي قَدْ أَكْرَمَهُ اللَّهُ بِالنُّبُوةِ قَدْ سَأَلَ اللَّهَ الْهِدَايَةَ لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ وَهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَسْأَلَ الْمُسْلِمُ الْهِدَايَةَ

**١١٥٣-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْتَتِحُ صَلَاتَهُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَتْ: كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ افْتَتَحَ صَلَاتَهُ قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّ جَبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، فَإِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاکتر وایە بەندە داوای هیدایەت لە خوا بکات، لەوەی جیاوازی تێدایە لە حەق، لە کاتی دەستپێکردنی شەونوێژ، بەڵگەش لەسەر نەفامی ئەو کەسەی لە مورجیئەکان وا گومان دەبات دروست نییە بۆ پژمەکەر وەڵامی ئەو کەسە بداتەوە کە دەڵێت: (یرحمك الله)، بڵێت: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ)، پێغەمبەر ﷺ کە خوا ڕێزداری کرد بە پێغەمبەرایەتی داوای هیدایەتی لە خوا دەکرد، لەوەی جیاوازی هەیە تیایدا لە حەق، ئەوان وا گومان دەبەن دروست نییە مسوڵمان داوای ڕێنمایی و هیدایەت بکات**

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف رضي الله عنهما دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە رضي الله عنها دایکی بڕواداران: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ شەونوێژ بە چ شتێك نوێژی دەست پێ دەکرد؟ وتی: کاتێ هەستابایە بۆ شەونوێژ نوێژەکەی دەست پێ دەکرد و دەیفەرموو: خوایە پەروەردگاری جبریل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای غەیب و پەنهان و ئاشکرا، تۆ حوکم و دادگەری دەکەی لە نێوان بەندەکانت لەوەی جیاوازییان هەیە تیایدا، هیدایەتم بدە لەوەی جیاوازی تێدایە بۆ لای حەق، تۆ هیدایەت دەدەی بە ویستی خۆت بۆ ڕێگای ڕاست.

## بَابُ فَضْلِ طُولِ الْقِيَامِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ وَغَيْرِهِ

**١١٥٤-** عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ: ذَاتَ لَيْلَةٍ - وَقَالُوا: فَأَطَالَ حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ، قِيلَ: وَمَا هَمَمْتُ؟ قَالَ: هَمَمْتُ أَنْ أَجْلِسَ وَأَدَعَهُ(١).

**باسی فەزڵ و گەورەیی درێژکردنەوەی ڕاوەستان لە شەونوێژ و نوێژەکانی دیکەدا**

واتە: ئەبو وائیل دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد، -لە فەرموودەکەی سەوری هاتووە، یەکێك لە شەوەکان- وتیان: ئەوەندە درێژی کردەوە تا شتێکی خراپ بە خەیاڵمدا هات، وترا: چی بە خەیاڵتدا هات؟ وتی: بە خەیاڵمدا هات دابنیشم وازی لێ بهێنم و نوێژەکە بەتەنیا بکەم.

---

(١) صحيح.

**١١٥٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «طُولُ الْقُنُوتِ»[1].

**واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ نوێژێك چاكترینە؟ فەرمووی: نوێژێك وەستانی زۆری تێدا بێت (واتە: بەڕاوەستانەوە قوڕئانی زۆر تێدا بخوێنرێ).**

## بَابُ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٥٦-** عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ ﵁، وَهُوَ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ جِئْتُ مِنَ الْكُوفَةِ، وَتَرَكْتُ بِهَا رَجُلًا يُمْلِي الْمَصَاحِفَ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِهِ قَالَ: فَغَضِبَ عُمَرُ، وَانْتَفَخَ حَتَّى كَادَ يَمْلَأُ مَا بَيْنَ شُعْبَتَيِ الرَّحْلِ، فَقَالَ: مَنْ هُوَ وَيْحَكَ؟ قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ قَالَ: فَمَا زَالَ يُسَرَّى عَنْهُ الْغَضَبُ وَيُطْفَأُ حَتَّى عَادَ إِلَى حَالِهِ الَّتِي كَانَ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: وَيْحَكَ، مَا أَعْلَمُ بَقِيَ أَحَدٌ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ، وَسَأُحَدِّثُكَ عَنْ ذَلِكَ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَزَالُ يَسْمُرُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ اللَّيْلَةَ كَذَلِكَ فِي الْأَمْرِ مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّهُ سَمَرَ عِنْدَهُ ذَاتَ لَيْلَةٍ، وَأَنَا مَعَهُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي، وَخَرَجْنَا مَعَهُ فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْمَعُ قِرَاءَتَهُ، فَلَمَّا كِدْنَا أَنْ نَعْرِفَ الرَّجُلَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَطْبًا كَمَا أُنْزِلَ فَلْيَقْرَأْهُ عَلَى قِرَاءَةِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ»، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ الرَّجُلُ يَدْعُو فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَلْ تُعْطَهْ»، مَرَّتَيْنِ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَأَغْدُوَنَّ إِلَيْهِ فَلَأُبَشِّرَنَّهُ قَالَ: فَغَدَوْتُ إِلَيْهِ لِأُبَشِّرَهُ، فَوَجَدْتُ أَبَا بَكْرٍ قَدْ سَبَقَنِي إِلَيْهِ، فَبَشَّرَهُ، وَلَا وَاللَّهِ مَا سَابَقْتُهُ إِلَى خَيْرٍ قَطُّ إِلَّا سَبَقَنِي[2].

## باسی قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە شەونوێژدا

**واتە: عەلقەمە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عومەر ﵁، ئەو لە عەرەفە بوو، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە كوفەوە هاتووم، پیاوێكم بەجێهێشت تیایدا موصحەفی قورئانی بەلەبەر دەنووسی، وتی: عومەر ﵁ ئەوەندە توڕە بوو دەموچاوی ئاوسا تا خەریك بوو لەسەر كۆپانی وشترەكە بكەوێتە خوارەوە، وتی: هاوار بۆ تۆ ئەو كەسە كێ بوو؟ وتی: عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﵁، وتی: بەردەوام خەم و خەفەتی لەسەر**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




لادەچوو دەکوژایەوە تا گەڕایەوە بۆ باری ئاسایی خۆی، پاشان وتی: هاوار بۆ تۆ کەسێك نابینم مابێتەوە شیاوتر بێت بەو کارە لەو، ئێستا ئەوەت بۆ باس دەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە دوای عیشا لەلای ئەبو بەکر ﷺ دەمایەوە، بەهەمان شێوە بۆ کاروبارێکیش لە کاروبارەکانی موسوڵمانان، جا شەوێك لەلای مایەوە منیش لەگەڵی بووم، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو ڕێی دەکرد، ئێمەش لەگەڵی دەرچووین پیاوێکمان بینی لەنێو مزگەوت ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لە قورئانخوێندنەکەی دەگرت، کاتێ نزیك بووینەوە ئەو پیاوەمان ناسییەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك پێی خۆشە قورئان بە پاراوی بخوێنێ وەکوو چۆن دابەزیوە با لەسەر قیرائەتی ئیبنو ئوممو عەبد بیخوێنێ، وتی: پاشان پیاوەکە دانیشت، ئینجا نزای کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: داوا بکە پێت دەدرێ، دوو جار، وتی: عومەر ﷺ وتی: وتم: سوێند بە خوا بەیانی زوو دەچم بۆ لای مژدەی پێدەدەم، کە ڕۆیشتم بینیم ئەبو بەکر پێشم کەوتبوو مژدەی پێدابوو، سوێند بە خوا هەرگیز پێشبڕکێی چاکەم لەگەڵی نەکردووە مەگەر پێشم کەوتووە.

**١١٥٧-** عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: مَا صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ فِي بَعْضِ حُجَرِهِ فَيَسْمَعُ مَنْ كَانَ خَارِجًا[١].

**واتە: کوڕەیب مەولای ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەباس ﷺ کرد وتم: شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ وتی: لە هەندێك لە ژوورەکانیدا قورئانی دەخوێند، هەر کەسێك لە دەرەوە بووایە گوێی لە دەنگی دەبوو.**

## بَابُ التَّرْتِيلِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٥٨-** عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ: أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ عَنْ قِرَاءَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَصَلَاتِهِ، فَقَالَتْ: وَمَا لَكُمْ وَصَلَاتُهُ؟ كَانَ يُصَلِّي، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى، ثُمَّ يُصَلِّي قَدْرَ مَا نَامَ، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى حَتَّى يُصْبِحَ، وَنَعَتَتْ لَهُ قِرَاءَتَهُ، فَإِذَا هِيَ تَنْعِتُ قِرَاءَةً مُفَسَّرَةً حَرْفًا حَرْفًا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی قورئان خوێندن بە هێواشی و لەسەرخۆیی لە شەونوێژدا

واتە: یەعلای کوڕی مەملەك دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری کرد لە ئوممو سەلەمە ﵂ دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا؟ وتی: ئێوە لە کوێ و نوێژی ئەو لە کوێ؟ ئەو نوێژی دەکرد، پاشان بە ئەندازەی نوێژەکەی دەخەوت، پاشان نوێژی دەکرد بە ئەندازەی خەوتنەکەی، پاشان بە ئەندازەی نوێژەکەی دەخەوت تا ڕۆژ دەبۆیەوە، قورئان خوێندنەکەی وەسف کرد پیت بە پیت بە هێواشی دەیخوێند (واتە: لە قورئانخوێندنەکەی پەلەی نەبوو).

## بَابُ إِبَاحَةِ الْجَهْرِ بِبَعْضِ الْقِرَاءَةِ وَالْمُخَافَتَةِ بِبَعْضِهَا فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

**١١٥٩-** عَنْ أَبِي خَالِدٍ الوَالِبِي، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ رَفَعَ صَوْتَهُ طَوْرًا وَخَفَضَهُ طَوْرًا، وَكَانَ يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[١].

## باسی ڕێگە دراوە لە شەونوێژدا هەندێ لە قورئانخوێندنەکەی بەدەنگی بەرز بخوێنێ هەندێکیشی بەدەنگی نزم

واتە: ئەبو خالیدی والیبی دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﵁، ئەو کاتێك هەستابووایە بۆ شەونوێژ جارێك دەنگی بەرز دەکردەوە جارێك نزم، وە باسی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد.

**١١٦٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ، أَكَانَ يُجْهَرُ أَمْ يُسِرُّ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا جَهَرَ وَرُبَّمَا أَسَرَّ. فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً[٢].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەیس دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری کردووە لە عائیشە ﵂: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا چۆن قورئانی دەخوێند، ئایا بە دەنگی بەرز

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

دەیخوێند یان بەدەنگی نزم؟ وتی: هەموو ئەوانەی دەکرد، هەندێ جار بەدەنگی بەرز هەندێ جاریش بە دەنگی نزم، وتم: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کارئاسانی تێدا کردووە.

**بَابُ ذِكْرِ صِفَةِ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ وَاسْتِحْبَابِ تَرْكِ رَفْعِ الصَّوْتِ الشَّدِيدِ بِهَا، وَالْمُخَافَتَةِ بِهَا، وَابْتِغَاءِ جَهْرٍ بَيْنَ الْجَهْرِ الشَّدِيدِ وَبَيْنَ الْمُخَافَتَةِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، وَهَذِهِ الْآيَةُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ أَنَّ اسْمَ الشَّيْءِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ أَجْزَائِهِ، إِذِ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا قَدْ أَوْقَعَ اسْمَ الصَّلَاةِ عَلَى الْقِرَاءَةِ فِيهَا، وَالْقِرَاءَةُ فِي الصَّلَاةِ جُزْءٌ مِنْ أَجْزَائِهَا لَا كُلُّهَا، وَإِنَّمَا أَعْلَمْتُ هَذَا لِيُعْلَمَ أَنَّ اسْمَ الْإِيمَانِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ شُعَبِهِ**

١١٦١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِأَبِي بَكْرٍ وَهُوَ يُصَلِّي يَخْفِضُ مِنْ صَوْتِهِ، وَمَرَّ بِعُمَرَ يُصَلِّي رَافِعًا صَوْتَهُ قَالَ: فَلَمَّا اجْتَمَعَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: يَا أَبَا بَكْرٍ مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي تَخْفِضُ مِنْ صَوْتِكِ، قَالَ: قَدْ أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ، وَمَرَرْتُ بِكَ يَا عُمَرُ وَأَنْتَ تَرْفَعُ صَوْتَكَ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ احْتَسَبْتُ بِهِ أُوقِظُ الْوَسْنَانَ، وَاحْتَسِبُ بِهِ قَالَ: فَقَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: «ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا»، وَقَالَ لِعُمَرَ: «اخْفِضْ مِنْ صَوْتِكَ»[1].

**باسی چۆنیەتی قورئان خوێندن لە شەونوێژ، وە چاکتر وایە دەنگ زۆر بەرز نەکرێتەوە تیایدا و زۆریش بەنهێنی نەبێ، وە بە دەنگێك قورئان بخوێنێ نە زۆر بەرز بێ و نە زۆر نهێنی بێ، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾، واتە: لە نوێژەکانتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە و بەنهێنیش مەیکە لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە، ئەم ئایەتە لەو شێوازەیە کە پێشتر باسم کرد هەندێ جار ناوی شتێك بەکار دەهێنرێ، بەڵام مەبەست پێی بەشێك لە بەشەکانییەتی، چونکە خوا ﷻ ناوی نوێژی هێناوە لە بری قورئانخوێندن تیایدا، قورئان خوێندنیش لەنێو نوێژ بەشێکە لە نوێژ نەك هەمووی، بۆیە ئەمەم باس کرد تا بزانرێ هەندێ جار ناوی ئیمان بەکاردێت لە جیاتی هەندێ لە لقەکانی**

---

(١) إسناده معلول بالإرسال.



واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای ئەبو بەکردا ﷺ نوێژی دەکرد بە دەنگی نزم، وە تێپەڕی بەلای عومەردا ﷺ نوێژی دەکرد بەدەنگی بەرز. وتی: کاتێ هەردووکیان لەلای پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە، بە ئەبو بەکری ﷺ فەرموو: ئەی ئەبو بەکر تێپەڕیم بە لاتدا نوێژت دەکرد بەدەنگی نزم. وتی: بێگومان ئەوەی لێی پاڕامەوە بیستی، فەرمووی: ئەی عومەر ﷺ تێپەڕیم بەلاتدا دەنگت بەرز دەکردەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو خەوتووە بەخەبەری دەهێنمەوە کە لە خەوێکی قوڵدا نییە، وە ئومێدی پاداشتیشی لێ دەکەم، وتی: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکری ﷺ فەرموو: تۆزێك دەنگت بەرز بکەرەوە، بە عومەریشی ﷺ فەرموو: تۆزێ دەنگت نزم بکەرەوە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا تَأَذَّى بِالْجَهْرِ بَعْضُ الْمُصَلِّينَ غَيْرَ الْجَاهِرِ بِهَا

**١١٦٢**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: اعْتَكَفَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ لَهُ، وَقَالَا: فَكَشَفَ السُّتُورَ، وَقَالَ: «أَلَا إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ فَلَا يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَلَا يَرْفَعَنَّ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ الْقِرَاءَةَ أَوْ فِي الصَّلَاةِ»[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لە قورئانخوێندن بەدەنگی بەرز لەنێو نوێژدا، ئەگەر دەنگ بەرزکردنەوەی ئازاری هەندێ لەو مسوڵمانانەیدا کە دەنگ بەرز ناکەنەوە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئیعتیکافی کرد لەنێو مزگەوت، گوێی لە هاوەڵەکان بوو بەدەنگی بەرز قورئانیان دەخوێند، ئەو لەنێو دەوارەکەیدا بوو، پەردەکەی لادا و فەرمووی: بێگومان هەمووتان موناجاتی پەروەردگارتان دەکەن، با هەندێکتان ئازاری هەندێکی دیکە نەدات، وە با هەندێکتان دەنگ بەسەر ئەوی دیکەدا بەرز نەکاتەوە بە قورئان خوێندن، یان لە نوێژدا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ قِرَاءَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالزُّمَرِ كُلَّ لَيْلَةٍ « اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ إِنْ كَانَ أَبُو لُبَابَةَ هَذَا يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِهِ فَإِنِّي لَا أَعْرِفُهُ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

**١١٦٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يُفْطِرَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ، وَكَانَ يَقْرَأُ كُلَّ لَيْلَةٍ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالزُّمَرَ[1].

## باسی چاکتر وایە بەندە لە هەموو شەوێکدا سورەتی (الإسراء) و (الزُّمَرِ) بخوێنێ، وەك شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەبو لوبابە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دروست بێت فەرموودەی لێ وەربگێرێ، بێگومان من نازانم دادپەروەرە، یان لەکەدارە

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو تا دەمانگوت چیدی نایەوێ بەڕۆژوو نەبێت، ئەوەندەش بەڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانگوت چیتدی نایەوێ بەڕۆژوو بێت، هەموو شەوێکیش سورەتی (الإسراء) و (الزُّمَرِ)ی دەخوێند.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ قَدْ يَحْسِبُ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّهُ خِلَافُ بَعْضِ أَخْبَارِ عَائِشَةَ فِي عَدَدِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ

**١١٦٤-** عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً[2].

## باسی ژمارەی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، هەندێ جار ئەوەی زۆر قووڵ نەبۆتەوە لە زانست، وا دەزانێ ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەکانی عائیشەیە ﵂ دەربارەی ژمارەی شەونوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سیازدە ڕکات شەونوێژی دەکرد.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

**١١٦٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بَعْدَ الْعَتَمَةِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژی عیشا سێزدە ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الَّذِي قَدْ يُخَيِّلُ إِلَى بَعْضِ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّهُ خِلَافُ خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ هَذَا الَّذِي ذَكَرْتُهُ

**١١٦٦-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂: كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه ﷺ أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ، وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»[٢].

## باسی فەرموودەیەك كە هەندێ جار بە خەیاڵی كەسێكدا دێت كە شارەزا نییە لە زانستی شەرعی، وا دەزانێ پێچەوانەی فەرموودەكەی ئیبنو عەباسە ﵄ كە باسم كرد

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد: نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو لە ڕەمەزاندا؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد، چوار ڕکاتی دەکرد پرسیار مەکە لە جوانی درێژییان، پاشان چوار ڕکاتی دیکەی دەکرد پرسیار مەکە لە جوانی درێژییان، پاشان سێ ڕکاتی دەکرد، عائیشە ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی ویتر بکەی دەخەوێت؟ فەرمووی: ئەی عائیشە ﵂ چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێت.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ ثَالِثٍ أَخَالُهُ يَسْبِقُ إِلَى قَلْبِ بَعْضِ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّهُ يُضَادُّ الْخَبَرَيْنِ اللَّذَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا قَبْلُ فِي الْبَابَيْنِ الْمُتَقَدِّمَيْنِ

**١١٦٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ فِيهِنَّ الْوِتْرُ[1].

## باسی فەرموودەی سێیەم دەربارەی ئەو کەسەی قووڵ نەبۆتەوە لە زانستی شەرعی، وا دەزانێ پێچەوانەی ئەو دوو فەرموودەیە کە لە دوو بەشەکەی پێشەوە باسم کردن

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەواندا نۆ ڕکاتی دەکرد ویتریشیان تێدا بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الْأَخْبَارَ الثَّلَاثَةَ الَّتِي ذَكَرْتُهَا لَيْسَتْ بِمُتَضَادَّةٍ وَلَا مُتَهَاتِرَةٍ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً عَلَى مَا أَخْبَرَ ابْنُ عَبَّاسٍ، ثُمَّ نَقَصَ رَكْعَتَيْنِ فَكَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ اللَّيْلِ عَلَى مَا أَخْبَرَ أَبُو سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ، ثُمَّ نَقَصَ مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ رَكْعَتَيْنِ فَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ، عَلَى مَا أَخْبَرَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَقِيقٍ عَنْ عَائِشَةَ ﵂

**١١٦٨-** عَنْ مَسْرُوقٍ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَسَأَلَهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ أَنَّهُ صَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، تَرَكَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قُبِضَ حِينَ قُبِضَ وَهُوَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ، آخِرُ صَلَاتِهِ مِنَ اللَّيْلِ الْوِتْرُ، ثُمَّ رُبَّمَا جَاءَ إِلَى فِرَاشِهِ هَذَا، فَيَأْتِيهِ بِلَالٌ، فَيُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: نَأْخُذُ بِالْأَخْبَارِ كُلِّهَا الَّتِي أَخْرَجْنَاهَا فِي كِتَابِ الْكَبِيرُ، فِي عَدَدِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ، وَاخْتِلَافُ الرُّوَاةِ فِي عَدَدِهَا كَاخْتِلَافِهِمْ فِي هَذِهِ الْأَخْبَارِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي هَذَا الْكِتَابِ، قَدْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي بَعْضِ اللَّيَالِي أَكْثَرَ مِمَّا يُصَلِّي فِي بَعْضٍ، فَكُلُّ مَنْ أَخْبَرَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَوْ مِنْ أَزْوَاجِهِ، أَوْ غَيْرِهِنَّ مِنَ النِّسَاءِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى مِنَ اللَّيْلِ عَدَدًا مِنَ الصَّلَاةِ، أَوْ صَلَّى بِصِفَةٍ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فَقَدْ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ تِلْكَ الصَّلَاةِ فِي بَعْضِ اللَّيَالِي، بِذَلِكَ الْعَدَدِ، وَبِتِلْكَ الصِّفَةِ، وَهَذَا الِاخْتِلَافُ مِنْ جِنْسِ الْمُبَاحِ، فَجَائِزٌ لِلْمَرْءِ أَنْ يُصَلِّيَ أَيَّ عَدَدٍ أَحَبَّ مِنَ الصَّلَاةِ مِمَّا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّاهُنَّ، وَعَلَى الصِّفَةِ الَّتِي رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّاهَا، لَا حَظْرَ عَلَى أَحَدٍ فِي شَيْءٍ مِنْهَا.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو فەرموودانەی کە باسم کردن پێچەوانە و دژی یەکدی نین، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار شەوان سیازدە ڕکاتی کردووە وەك ئیبنو عەباس ﵄ هەواڵی داوە، پاشان دوو ڕکاتی کەم کردۆتەوە یازدە ڕکات شەونوێژی کردووە وەك ئەبو سەلەمە لە عائیشەوە ﵂ هەواڵی داوە، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی لە شەونوێژەکەی کەم کردۆتەوە، نۆ ڕکاتی شەونوێژی کردووە وەك عەبدوڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە ﵂ هەواڵیداوە**

واتە: مەسڕوق دەگێڕێتەوە، ئەو ڕۆیشت بۆ لای عائیشە ﵂ پرسیاری لێکرد سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: لە شەودا سێزدە ڕکات شەونوێژی دەکرد، پاشان یازدە ڕکاتی کرد، وازی لە دوو ڕکات هێنا، پاشان تا کۆچی دوایی کرد نۆ ڕکات شەونوێژی دەکرد، کۆتا نوێژی لە شەودا ویتر بوو، پاشان دەهاتە سەر ئەم جێگایەی، دواتر بیلال دەهات بۆ لای، ئاگاداری دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەموو ئەو فەرموودانەی لە کتێبی (الكبير) هێناومانەتەوە سەبارەت بە ژمارەی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ وەریاندەگرین، وە جیاوازی گێڕەرەوەکانی لە ژمارەی فەرموودەکان وەکوو جیاوازییان وایە لەم فەرموودانەدا کە لەم کتێبەدا باسم کردووە، پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە شەوەکان شەونوێژی زیاتر دەکرد لە هەندێ لە شەوەکانی دیکە، جا هەریەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یان خێزانەکانی یان جگە لەوان لە ئافرەتان هەواڵیان داوە پێغەمبەر ﷺ ژمارەیەك ڕکات شەونوێژی کردووە، یان بە جۆرێ نوێژی کردووە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ لە شەوەکانی بەو ژمارەیە نوێژی کردووە، وە بەو جۆرەش، ئەو جیاوازییەش لە جۆری ئەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراوە، جا دروستە بۆ بەندە کام لەو ژمارانەی پێخۆش بوو شەونوێژی پێ بکات، لەوانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ئەو کردوویەتی، وە بەو جۆرەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ئەو کردوویەتی، قەدەغە نییە بۆ هیچ کەسێك بە هەر کامیان هەستێت.

## بَابُ قَضَاءِ صَلَاةِ اللَّيلِ بِالنَّهَارِ إِذَا فَاتَتْ لِمَرَضٍ أَوْ شُغلٍ أَوْ نَومٍ

**١١٦٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا، وَكَانَ إِذَا نَامَ مِنَ اللَّيْلِ أَوْ مَرِضَ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً(١).

## باسی قەزاکردنەوەی شەونوێژ لە ڕۆژدا، ئەگەر بەهۆی نەخۆشی یان سەرقاڵی یان خەوتن لە دەستی چوو

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە دەیچەسپاندو بەردەوام دەبوو لەسەری، وە ئەگەر بخەوتایە یان نەخۆش بووایە و شەونوێژی نەکردایە بە ڕۆژ دوازدە ڕکاتی دەکرد.

**١١٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَكَانَ إِذَا شَغَلَهُ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ نَوْمٌ أَوْ مَرَضٌ أَوْ وَجَعٌ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً(٢).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە حەزی دەکرد بەردەوام بێت لەسەری، وە ئەگەر خەو یان نەخۆشی یان ئێش و ئازار سەرقاڵی بکردایە لە شەونوێژ، ئەوە بەڕۆژ دوازدە ڕکاتی دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْوَقْتِ مِنَ النَّهَارِ الَّذِي يَكُونُ الْمَرْءُ فِيهِ مُدْرِكًا لِصَلَاةِ اللَّيلِ إِذَا فَاتَتْ بِاللَّيلِ فَصَلَّاهَا فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ مِنَ النَّهَارِ

**١١٧١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهْرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ئەو کاتەی ڕۆژ کە بەندە دەتوانێ تیایدا شەونوێژەکەی قەزا بکاتەوە کە شەو لە دەستی چووە

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خەوی لێکەوت نەیتوانی ئەو حیزبە قوڕئانە بخوێنێ کە بەردەوامە لەسەری، یان بەشێکی مابوو، ئینجا خوێندیەوە لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا ئەوە بۆی دەنووسرێ هەر وەکوو ئەوەی لە شەودا خوێندبێتی.

## بَابُ ذِكْرِ النَّاوِي قِيَامَ اللَّيْلِ فَيَغْلِبُهُ النَّوْمُ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ

**١١٧٢-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَتَى فِرَاشَهُ وَهُوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ حَتَّى يُصْبِحَ كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ»[١].

## باسی ئەو کەسەی نییەتی شەونوێژ دەهێنێ خەو زاڵ دەبێت بەسەریدا و شەونوێژەکەی لەدەست دەچێ

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چووە سەر جێگاکەی نییەت و مەبەستی ئەوەی هەبێت هەڵبسێ بۆ شەونوێژ خەو زۆری بۆ هێنا نەهات بەخەبەردا تا ڕۆژ بۆیەوە، پاداشتی نییەتەکەی بۆ دەنووسرێ، خەوەکەشی دەبێتە بەخششێك بۆی لە لایەن پەروەردگاریەوە.

**١١٧٣-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَدَّثَ نَفْسَهُ بِسَاعَةٍ مِنَ اللَّيْلِ يُصَلِّيهَا فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ فَنَامَ، كَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ، وَكُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: هەر کەسێك لە ناخی خۆیدا نیازی هەبێت بەشێکی شەو شەونوێژ بکات خەو زاڵ بوو بەسەریدا خەوت، ئەوە خەوەکەی بەخششێکە بۆی (لەلایەن خوای گەورەوە) خێر و پاداشتی ئەو نوێژەی بۆ دەنووسرێ کە ویستوویەتی بیکات.

---

(١) معلول بالوقف.

(٢) معلول بالوقف.

**١١٧٤-** عن أَبِي الدَّرْدَاءِ، أَوْ عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵄ قَالَ: مَا مِنْ رَجُلٍ تَكُونُ لَهُ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ يَقُومُهَا فَيَنَامُ عَنْهَا إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرَ صَلَاتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً تَصَدَّقَ بِهَا عَلَيْهِ(١).

**واتە:** ئەبو دەرداء یان ئەبو زەڕ ﵄ دەڵێ: هەر پیاوێك ساتێكی دیاری كردبێت لە شەو شەونوێژی تێدا بكات، خەو زاڵ بێت بەسەریدا و بخەوێت، حەتمەن خوا پاداشتی شەونوێژەكەی بۆ دەنووسێ، خەوەكەیشی دەبێت بە بەخششێك بۆی لەلایەن خواوە.

**١١٧٥-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: لَيْسَ عَبْدٌ يُرِيدُ صَلَاةً مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ يَنْسَى فَيَنَامُ، إِلَّا كَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنَ اللَّهِ، وَكُتِبَ لَهُ مَا نَوَى(٢).

**واتە:** ئەبو دەرداء ﵁ دەڵێ: هەر بەندەیەك نیاز و مەبەستی شەونوێژ بێت پاشان بیری بچێت و بخەوێت، حەتمەن خەوەكەی بۆی دەبێتە بەخششێك لەلایەن خواوە، وە پاداشتی ئەوەی بۆ دەنووسرێ كە نیەتی هەبووە بیكات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ أَنْ تُخَصَّ لَيْلَةُ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِي

**١١٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الْأَيَّامِ، وَلَا تَخُصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِي»(٣).

## باسی قەدەغەكردن لەوەی شەوی هەینی تایبەت بكرێ بە شەونوێژ لە نێوان شەوەكانی دیكە

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی هەینی تایبەت مەكەن بە ڕۆژووگرتن لە نێوان ڕۆژەكانی دیكەدا، شەوی هەینیش تایبەت مەكەن بە شەونوێژ لە نێوان شەوەكانی دیكەدا.

---

(١) معلول بالوقف.

(٢) معلول بالوقف.

(٣) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاقْتِصَادِ فِي صَلَاةِ التَّطَوُّعِ وَكَرَاهَةِ الْحَمْلِ عَلَى النَّفْسِ مَا لَا تُطِيقُهُ مِنَ التَّطَوُّعِ

**١١٧٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَلَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا قَامَ حَتَّى الصَّبَاحِ، وَلَا صَامَ شَهْرًا كَامِلًا غَيْرَ رَمَضَانَ[١].

## باسی فەرمانکردن بە نێوەندگیری لە نوێژی سوننەتدا، وە ناپەسندی زۆرلەخۆکردن بە کارێك کە سوننەتە و لە تواناشدا نەبێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە پێی خۆش بوو بەردەوام بێت لەسەری، وا نازانم پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو قورئانی لە شەوێکدا خوێندبێ، هەروەها شەوێك تا بەیانی شەونوێژی کردبێت، هەروەها مانگێك بە تەواوی بەرۆژوو بووبێ جگە لە ڕەمەزان.

**١١٧٨-** عَنْ قَتَادَةَ ﵁ بِهَذَا الْإِسْنَادِ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا عَمِلَ عَمَلًا أَثْبَتَهُ، قَالَتْ: وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ لَيْلَةً حَتَّى الصَّبَاحِ، وَلَا صَامَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا إِلَّا رَمَضَانَ[٢].

واتە: قەتادە ﵁ بەهەمان سەنەد دەگێڕێتەوە، عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کردەوەیەکی بکردایە دەیچەسپاند و بەردەوام دەبوو لەسەری، هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك شەونوێژ بکات تا بەیانی، مانگێکیش بەدوای یەکدا بەرۆژوو بێت جگە لە ڕەمەزان.

**١١٧٩-** عَنْ بُرَيْدَةَ ﵁ قَالَ: خَرَجْتُ ذَاتَ يَوْمٍ أَمْشِي لِحَاجَةٍ، فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي، فَظَنَنْتُهُ يُرِيدُ حَاجَةً، فَجَعَلْتُ أَكُفُّ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَفْعَلُ ذَلِكَ حَتَّى رَآنِي، فَأَشَارَ إِلَيَّ فَأَتَيْتُهُ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَانْطَلَقْنَا نَمْشِي جَمِيعًا، فَإِذَا نَحْنُ بِرَجُلٍ بَيْنَ أَيْدِينَا يُصَلِّي، يُكْثِرُ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَرَى يُرَائِي؟»، فَقُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: «فَأَرْسَلَ يَدَهُ وَطَبَّقَ بَيْنَ يَدَيْهِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ثَلَاثَ مِرَارٍ، يَرْفَعُ يَدَيْهِ وَيُصَوِّبُهُمَا وَيَقُولُ: عَلَيْكُمْ هَدْيًا قَاصِدًا، عَلَيْكُمْ هَدْيًا قَاصِدًا، عَلَيْكُمْ هَدْيًا قَاصِدًا؛ فَإِنَّهُ مَنْ يُشَادَّ هَذَا الدِّينَ يَغْلِبْهُ»[١].

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: شەوێك دەرچووم كارێكم هەبوو ڕێم دەكرد، لەپڕ بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێ دەكات، گومانم برد كارێكی هەبێت، بۆیە خۆم لێ دزیەوە، بەردەوام ئەوەم دەكرد تا بینیمی، ئاماژەی بۆ كردم چوومە خزمەتی، دەستمی گرت و دواتر پێكەوە ڕێمان دەكرد، لەپڕ پیاوێكمان بینی لە پێش خۆمانەوە نوێژی دەكرد، ڕكووع و سوژدەی زۆر دەبرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دەبینی ڕیایی دەكات، وتم: خواو پێغەمبەرەكەی زاناترن، وتی: دەستی درێژ كردووە سێ جار دەستی بەرز دەكردەوە و دایدەگرت و دەیفەرموو: دەست بگرن بە ڕێگایەكی نێوەند (بەبێ توندوتیژی و بەبێ شلگیری)، دەست بگرن بە ڕێگایەكی نێوەند، دەست بگرن بە ڕێگایەكی نێوەند، چونكە بەڕاستی هەر كەسێك ئەم ئایینە قورس بكات (لەسەر خۆی زیادەڕەوی تێدا بكات حەتمەن) توندییەكە زاڵ دەبێت بەسەریدا.

**١١٨٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسْجِدَ، وَحَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي فَإِذَا كَسِلَتْ، أَوْ فَتَرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ، فَقَالَ: «حُلُّوهُ»، ثُمَّ قَالَ: «لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا كَسِلَ أَوْ فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ»[٢].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو مزگەوت حەبلێكی بینی درێژكرا بوو لە نێوان دوو پایەدا، فەرمووی: ئەو حەبلە چییە؟ وتیان: ئەوە هی زەینەبە نوێژ دەكات، كاتێ ماندوو دەبێ خۆی پێیەوە هەڵدەواسێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بیكەنەوە، پاشان فەرمووی: با هەر یەكێك لە ئێوە بە ئەندازەی چالاكبوونی نوێژ بكات، كاتێ ماندوو بوو توانای نەما با دابنیشێ.

**١١٨١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ نَحْوَهُ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: قَالُوا: لِمَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ قَالَ: «مَا تَصْنَعُ بِهِ؟» قَالُوا: تُصَلِّي قَائِمَةً، فَإِذَا أَعْيَتِ اعْتَمَدَتْ عَلَيْهِ، فَحَلَّهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فَإِذَا أَعْيَى فَلْيَجْلِسْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) هذه الرواية شاذة.



واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە گێڕاویەتەوە، ئەوە نەبێت وتی: بە مەیمونەی کچی حاریسیان وت، (ئەوە حەبلی مەیمونەیە)، وتی: چی پێ دەکات؟ وتیان: بەڕاوەستانەوە نوێژ دەکات، کاتێ ماندوو بوو خۆی پێیەوە هەڵدەواسێ، پێغەمبەری خوا ﷺ حەبەلەکەی کردەوە و فەرمووی: با هەر یەکێك لە ئێوە نوێژ بکات ئەگەر ماندوو بوو با دابنیشێ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ وَكَثْرَتِهَا وَطُولِ الْقِيَامِ فِيهَا يَشْكُرُ اللَّهَ لِمَا يُولِي الْعَبْدَ مِنْ نِعْمَتِهِ وَإِحْسَانِهِ

**١١٨٢-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: تَكَلَّفُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَقَدْ غُفِرَ لَكَ؟ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»[١].

## باسی چاکتر وایە بەندە نوێژ زۆر بکات و زۆریش ڕاوەستێ تیایدا سوپاسگوزاری خوا بکات لەوەی ناز و نیعمەت و چاکەی پێ بەخشیوە

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی کرد تا پێیەکانی ئاوسان، پێی وترا: ئەمە زۆر لە خۆکردن نییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا خوا لە گوناهەکانت خۆش بووە؟ فەرمووی: ئایا نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم.

**١١٨٣-** عَنِ الْمُغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُوراً»[٢].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەونوێژ کرد تا پێیەکانی ئاوسان، پێی وترا: خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە، فەرمووی: ئایا نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١١٨٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَقُومُ حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَصْنَعُ هَذَا وَقَدْ جَاءَكَ مِنَ اللَّهِ أَنْ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الشُّكْرَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ يَكُونُ بِالْعَمَلِ لَهُ؛ لِأَنَّ الشُّكْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ، وَقَدْ يَكُونُ بِاللِّسَانِ قَالَ اللَّهُ: ﴿ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ ١٣﴾سبأ، فَأَمَرَهُمْ جَلَّ وَعَلَا أَنْ يَعْمَلُوا لَهُ شُكْراً، فَالشُّكْرُ قَدْ يَكُونُ بِالْقَوْلِ وَالْعَمَلِ جَمِيعًا، لَا عَلَى مَا يَتَوَهَّمُ الْعَامَّةُ أَنَّ الشُّكْرَ إِنَّمَا يَكُونُ بِاللِّسَانِ فَقَطْ، وَقَوْلُهُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ إِنَّهُ جَائِزٌ فِي اللُّغَةِ أَنْ يُقَالَ: يَكُونُ فِي مَعْنَى كَانَ؛ لِأَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا قَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾الفتح، وَقِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْقَائِلِ، وَلَمْ يَقُلْ أَيْضًا: وَعَدَنِي أَنْ يَغْفِرَ، لِأَنَّهُ قَدْ غَفَرَ.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی دەکرد تا قاچەکانی دەئاوسان پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە دەکەی لە کاتێکدا خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتوت خۆش بووە؟ فەرمووی: ئایا نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی سوپاسگوزاریکردنی خوا بەکردەوەش دەبێت، چونکە سوپاسگوزاری هەمووی هەر بۆ خوایە، هەندێ جار بەزمان دەبێت، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ ١٣﴾ سبأ: ١٣، واتە: ئەی ئالی داوود سوپاسگوزاری خوا بکەن. خوا فەرمانی پێ کردن سوپاسگوزاری بکەن بەکردەوە، جا سوپاسگوزاری بەگوفتار و کرداریش دەبێت، نەك ئەوەی کە خەڵك وا گومان دەبەن سوپاسگوزاری تەنها بەزمان دەکرێ، وە وتەکەی: (قد غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ)، لەو شێوازەیە کە وتوومە دروستە لە زمانەوانیدا بوترێ: (يَكُونُ)، بە مانای (كَانَ)، چونکە خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووە: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێدایت. بە پێغەمبەر ﷺ وترا: بێگومان خوا لە گوناهەکانی پێش و پاشت خۆش بووە،

---

(١) إسناده حسن.

پێغەمبەر ﷺ وەڵامی کابرای نەدایەوە، هەروەها نەیفەرموو: بەڵێنی پێداوم لێم خۆش بێت، چونکە خوا لێی خۆش بووبوو.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ قَبْلَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ وَبَعْدَهُنَّ

## بَابُ فَضْلِ التَّطَوُّعِ قَبْلَ الْمَكْتُوبَاتِ وَبَعْدَهُنَّ بِلَفْظَةٍ مُجْمَلَةٍ غَيْرِ مُفَسَّرَةٍ

**١١٨٥-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعاً غَيْرَ فَرِيضَةٍ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[1].

**کۆباسی نوێژە زیادەکان (سوننەتەکان) لەپێش نوێژە فەرزەکان و لە دوایانەوە**

**باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژە سوننەتەکان لەپێش نویژە فەرزەکان و لە دوایانەوە، بە دەستەواژەی (مُجْمَلة) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّرة) شیکراوە و ڕوون**

واتە: دایکی حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات سوننەت بکات جگە لە نوێژی فەرز ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت لەنێو بەهەشت.

**١١٨٦-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى لِلَّهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ» فَذَكَرَ نَحوَهُ[2].

واتە: دایکی حەبیبە ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك نوێژ بۆ خوا بکات لە هەموو ڕۆژێکدا، هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو باسی کرد.

**١١٨٧-** عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، حَدَّثَنِي النُّعْمَانُ بْنُ سَالِمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ عَنْبَسَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ: أَلَا أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا حَدَّثَتْنَاهُ أُمُّ حَبِيبَةَ ﵂؟ قُلْتُ: بَلَى قَالَ: وَمَا رَأَيْتُهُ قَالَ ذَاكَ إِلَّا لِتُسَارَّ إِلَيْهِ قَالَ: حَدَّثَتْنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَجْدَةً تَطَوُّعًا بُنِيَ

---

(١) حدیث صحیح.

(٢) صحیح.

لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ». قَالَ عَنْبَسَةُ: مَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ أُمِّ حَبِيبَةَ. قَالَ عَمْرُو بْنُ أَوْسٍ: مَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ عَنْبَسَةَ. قَالَ النُّعْمَانُ: مَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ عَمْرٍو. قَالَ دَاوُدُ: أَمَّا نَحْنُ فَإِنَّا نُصَلِّي وَنَتْرُكُ[1].

واتە: داودی کوڕی ئەبو هیند دەگێڕێتەوە، نوعمانی کوڕی سالم بۆی باس کردم لە عەمری کوڕی ئەوسەوە وتی: عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان وتی: ئایا فەرموودەیەکت بۆ باس بکەم کە ئوممو حەبیبە ﵂ بۆی باس کردین؟ وتم: بەڵێ، عەمر وتی: پێم وایە بۆیە باسی کرد بۆ ئەوەی دڵ پێی خۆش بێت، وتی: دایکی حەبیبە بۆی باس کردین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژی سوننەت بکات ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت لە بەهەشت، عەنبەسە وتی: لەو کاتەوەی بیستوومە لە ئوممو حەبیبە وازم لێ نەهێناوە، عەمری کوڕی ئەوسیش وتی: لەو کاتەوەی بیستوومە لە عەنبەسە وازم لێ نەهێناوە، نوعمانیش وتی: لەو کاتەوەی بیستوومە لە عەمر وازم لێ نەهێناوە داودیش وتی: بەڵام ئێمە دەیکەین و وازی لێ دێنین.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «فِي كُلِّ يَوْمٍ» أَيْ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ مَعَ بَيَانِ عَدَدِ هَذِهِ الرَّكَعَاتِ قَبْلَ الْفَرَائِضِ وَبَعْدَهُنَّ، قَدْ كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ تَقُولُ: يَوْمًا تُرِيدُ بِلَيْلَتِهِ، وَتَقُولُ: لَيْلَةً تُرِيدُ بِيَوْمِهَا قَالَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا فِي سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ: ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا ﴿٤١﴾﴾ آل عمران، وَقَالَ فِي سُورَةِ مَرْيَمَ: ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾﴾ مريم، فَبَانَ أَنَّهُ أَرَادَ بِقَوْلِهِ فِي آلِ عِمْرَانَ: ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أَيْ بِلَيَالِيهَا، وَصَحَّ أَنَّهُ أَرَادَ بِقَوْلِهِ فِي سُورَةِ مَرْيَمَ: ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا، أَيْ بِأَيَّامِهِنَّ قَالَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا: ﴿وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً ﴿١٤٢﴾﴾ الأعراف، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ بِأَيَّامِهِنَّ، وَقَالَ: ﴿وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ ﴿١٤٢﴾﴾ الأعراف، وَالْعَرَبُ إِذَا أَفْرَدَتْ ذِكْرَ الْأَيَّامِ قَالَتْ: عَشَرَةُ أَيَّامٍ، وَإِذَا أَفْرَدَتْ ذِكْرَ اللَّيَالِي قَالَتْ: عَشْرَ لَيَالٍ، فَظَاهِرُ هَذِهِ اللَّفْظَةِ وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ نَسَقًا عَلَى الثَّلَاثِينَ الَّتِي ذَكَرَهَا قَبْلُ، وَإِنَّمَا أَرَادَ اللَّهُ أَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرِ لَيَالٍ أَيْ بِأَيَّامِهِنَّ**

---

(١) صحيح.

١١٨٨- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ زَوْجَةِ النَّبِيِّ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ»(١).

**باسی فەرموودەیەك (المُفَسَّرة) شیكەرەوە و ڕوونكەرەوەی ئەو دەستەواژە (مُجْمَلة) كورت و ناڕوونەیە كە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەكەیدا فەرموویەتی: (فِي كُلِّ يَوْمٍ)، واتە: لە هەموو ڕۆژ و شەوێكدا. لەگەڵ ڕوونكردنەوەی ژمارەی ئەو ڕكاتانەی پێش فەڕزەكان و دوای فەڕزەكان، بێگومان من ڕامگەیاندووە لە كتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ) كە عەرەب هەندێ جار دەڵێن: (يَوْمًا) مەبەست پێی بە شەوەكەشیەوە، دەڵێن: (لَيْلَةً) مەبەستی پێی بە ڕۆژەكەیشیەوە، خوا ﷻ لە سورەتی ئالی عیمڕان فەرموویەتی: ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗا ۝٤١﴾، لە سورەتی مەریەمدا فەرموویەتی: ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ۝١٠﴾، جا ڕوون بۆیەوە مەبەستی لە فەرماییشتەكەی لە ئالی عیمڕان: (ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ)، سێ ڕۆژ، واتە: بە شەوەكانیشیەوە، وە لە فەرماییشتەكەی لە سورەتی مەریەم: (ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا)، واتە: بە ڕۆژەكانیشیەوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ ۝١٤٢﴾، واتە: بەڵێنمان بە موسا دا سی شەو. شتێكی زانراوە مەبەستی پێی بە ڕۆژەكانیشیەوە، فەرموویەتی: ﴿وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ ۝١٤٢﴾، واتە: بە دە شەوی دیكە ماوەكەیمان تەواو كرد، عەرەب ئەگەر بەتەنها باسی ڕۆژەكان بكات دەڵێ: (عَشَرَةُ أَيَّامٍ)، ئەگەریش بە تەنها باسی شەوەكان بكات دەڵێ: (عَشْرَ لَيَالٍ)، جا ڕواڵەتی ئەم دەستەواژەیە (بە دە شەوی دیكە ماوەكەیمان تەواو كرد) ڕێكخستنی سی ڕۆژەكەیە كە پێشتر باسمان كرد، بێگومان خوا مەبەستی ئەوەیە لە فەرمایشتەكەی (بە دە شەوی دیكە ماوەكەیمان تەواو كرد)، واتە: بە ڕۆژەكانیشیەوە**

واتە: ئوممو حەبیبە خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوازدە ڕكات بكات لە ڕۆژێكدا خواماڵێكی لە بەهەشت بۆ دروست دەكات، چوار ڕكات پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕكات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕكات پێش عەسر، دوو ڕكات دوای نوێژی مەغریب، دوو ڕكاتیش پێش نوێژی بەیانی.

---

(١) إسناده حسن.

**١١٨٩-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَاثْنَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

**واتە:** ئوممو حەبیبە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوازدە ڕکات بکات (لە ڕۆژێکدا) خوا ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات پێش عەسر، دوو ڕکات دوای نوێژی مەغریب، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ قَبْلَ صَلَاةِ الظُّهْرِ وَبَعْدَهَا

**١١٩٠-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ - وَقَالَ ابْنُ مَعْمَرٍ - مَنْ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعًا بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی سوننەت پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوای نوێژی نیوەڕۆ

**واتە:** دایکی حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزگاری لە چوار ڕکات بکات، - ئیبنو مەعمەر (کە یەکێکە لە سەنەدی فەرموودەکە) دەڵێ-: (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی): هەر کەسێك چوار ڕکات بکات پێش نیوەڕۆ، چوار ڕکاتیش لەدوایەوە خوا ئاگری لەسەر قەدەغە دەکات.

**١١٩١-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ صَلَاةِ الْهَجِيرِ، وَأَرْبَعًا بَعْدَهَا حُرِّمَ عَلَى جَهَنَّمَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) حديث صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: دایکی حەبیبە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزگاری لە چوار ڕکات بکات پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتیش لە دوایەوە دۆزەخی لەسەر حەڕام دەبێت.

**١١٩٢**- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بِمِثْلِهِ سَوَاءً[1].

واتە: دایکی حەبیبە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەکوو فەرموودەکەی پێشوو.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ قَبْلَ صَلَاةِ الْعَصْرِ

**١١٩٣**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ امرءا صَلَّى أَرْبَعًا قَبْلَ الْعَصْرِ»[2].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی سوننەت پێش نوێژی عەسر

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لەوکەسەی چوار ڕکات دەکات پێش نوێژی عەسر.

## بَابُ فَضْلِ التَّطَوُّعِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ

**١١٩٤**- عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ صَلَّى حَتَّى صَلَّى الْعِشَاءَ[3].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی سوننەت لە نێوان ئێوارە و عیشا

واتە: حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان نوێژی کرد تا نوێژی عیشای کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) حسنه الترمذي.

(٣) صحيح.

**١١٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ بَعْدَ الْمَغْرِبِ لَا يَتَكَلَّمُ بَيْنَهُنَّ بِشَيْءٍ إِلَّا بِذِكْرِ اللَّهِ عُدِلْنَ لَهُ بِعِبَادَةِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شەش ڕکات نوێژ بکات دوای ئێوارە لە نێوانیاندا هیچ قسە نەکات تەنها یادی خوا نەبێت، بە پەرستشی دوازدە ساڵ بۆی یەکسان دەکرێت.

## بَابُ ذِكْرِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ الْمَكْتُوبَاتِ وَبَعْدَهُنَّ

**١١٩٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى إِثْرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ رَكْعَتَيْنِ إِلَّا الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ[٢].

## باسی ئەو سوننەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژە فەڕزەکان و دوای نوێژە فەڕزەکان ئەنجامی دەدان

**واتە:** عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای هەموو نوێژێکی فەڕز دوو ڕکات نوێژی دەکرد جگە لە نوێژی بەیانی و عەسر.

**١١٩٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ[٣].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکاتیش دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکاتیش دوای ئێوارە لە ماڵی خۆی، دوو ڕکات دوای عیشا لە ماڵی خۆی.

**١١٩٨-** عَنْ سَالِمِ بنِ عَبْدِ اللَّهِ عَن أَبِيهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَذَكَرَتْ لِي حَفْصَةُ: وَلَمْ أَرَهُ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ رَكْعَتَيْنِ[٤].

---

(١) إسناده ضعيف جداً.

(٢) إسناده حسن.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نیوەڕۆ دوو ڕکاتی دەکرد، دوای نیوەڕۆیش دوو ڕکاتی دەکرد، دوای ئێوارەیش دوو ڕکاتی دەکرد، دوای عیشایش دوو ڕکاتی دەکرد، ئیبنو عومەر پێمی وت: حەفصە بۆی باس کردم، نەمبینیوە (پێغەمبەر ﷺ) کاتێ بەرەبەیان دەربکەوتایە دوو ڕکات نوێژ بکات.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ قَبْلَ الْمَكْتُوبَاتِ وَبَعْدَهُنَّ فِي الْبُيُوتِ

**١١٩٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ التَّطَوُّعِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا فِي بَيْتِي، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي بِهِمُ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ، فِيهِنَّ الْوِتْرُ، وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ صَلَاةَ الْفَجْرِ[١].

## باسی چاکتر وایە نوێژی سوننەت بکرێت پێش نوێژە فەرزەکان و دوای نوێژە فەرزەکان لەماڵەوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﷺ کرد دەربارەی نوێژە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات نوێژی دەکرد لە ماڵەکەمدا، پاشان دەردەچوو نوێژی بۆ خەڵك دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەم دوو ڕکات نوێژی دەکرد، وە نوێژی ئێوارەی بۆ خەڵك دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەم دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان نوێژی عیشای بۆ دەکردن، پاشان دەهاتە ژوورەوە بۆ لام دوو ڕکات نوێژی دەکرد، لە شەودا نۆ ڕکاتی دەکرد ویتریشیان تێدا بوو، وە کاتێ بەرەبەیان دەردەکەوت دوو ڕکاتی دەکرد، پاشان دەردەچوو نوێژی بەیانی بۆ خەڵك دەکرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ أَنْ يَرْكَعَ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي الْبُيُوتِ «بِلَفْظِ أَمْرٍ قَدْ يَحْسِبُ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّ مُصَلِّيَهَا فِي الْمَسْجِدِ عَاصٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَمَرَ أَنْ يُصَلِّيَهَا فِي الْبُيُوتِ»

**١٢٠٠-** عَنْ قَتَادَةَ عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ فَصَلَّى بِهِمُ الْمَغْرِبَ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: ارْكَعُوا هَاتَيْنِ الرَّكْعَتَيْنِ فِي بُيُوتِكُمْ. قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ مَحْمُودًا وَهُوَ إِمَامُ قَوْمِهِ يُصَلِّي بِهِمُ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيَجْلِسُ بِفِنَاءِ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَقُومَ قُبَيْلَ الْعَتَمَةِ، فَيَدْخُلَ الْبَيْتَ، فَيُصَلِّيهُمَا[١].

**باسی فەرمانکردن بەوەی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوای نوێژی ئێوارە لە ماڵەوە بکرێت، بەدەستەواژەی فەرمانکردن، جا هەندێ لەوانەی کە قووڵ نەبوونەتەوە لە زانستی شەرعیدا وا حیساب دەکات ئەو کەسەی لە مزگەوت ئەو دوو ڕکاتە دەکات سەرپێچی کردووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە لە ماڵدا بکرێت**

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، مەحمودی کوڕی لەبید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێو نەوەکانی عەبدولئەشهەل نوێژی ئێوارەی بۆ کردن، کاتێ سەلامی دایەوە، فەرمووی: ئەم دوو ڕکاتە (ی دوای نوێژی ئێوارە) لە ماڵەکانتان بکەن، وتی: مەحمودم بینی پێشنوێژی قەومەکەی خۆی بوو نوێژی ئێوارەی بۆ دەکردن، پاشان دەردەچوو لە حەوشەی مزگەوت دانیشت هەتا نزیك عیشا، دواتر دەچووە ماڵەوە ئەو دوو ڕکاتەی دەکرد.

**١٢٠١-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ فَلَمَّا صَلَّى قَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ»[٢].

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئێوارەی کرد لە مزگەوتی نەوەکانی عەبدولئەشهەل، کاتێ نوێژی تەواو کرد، خەڵکەکە هەستان سوننەتیان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست بگرن بەو نوێژەوە لە ماڵەکانتان بیکەن.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِأَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِأَنْ تُصَلَّى الرَّكْعَتَانِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي الْبُيُوتِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِذَلِكَ أَمْرُ اسْتِحْبَابٍ لَا أَمْرَ إِيجَابٍ، إِذْ صَلَاةُ النَّوَافِلِ فِي الْبُيُوتِ أَفْضَلُ مِنَ النَّوَافِلِ فِي الْمَسَاجِدِ»

**١٢٠٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ فِي بَيْتِي، وَالصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «قَدْ تَرَى، مَا أَقْرَبَ بَيْتِي مِنَ الْمَسْجِدِ، وَلَأَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِي أَحَبُّ مِنْ أَنْ أُصَلِّيَ فِي الْمَسْجِدِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»[١].

**باسی فەرموودەیەك شیكەرەوە و ڕوونكەرەوەی فەرمانەكەی پێغەمبەرە ﷺ بەوەی دوو ڕكاتەكەی دوای نوێژی ئێوارە لە ماڵەوە بكرێ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرمانكردن بەو دوو ڕكاتە لە ماڵەوە فەرمانێكە بۆ بەچاكدانان و سوننەت نەك بۆ واجیبوون، چونكە نوێژە سوننەتەكان لە ماڵەكان بكرێن چاكترە لەوەی لە مزگەوتەكان ئەنجام بدرێن**

واتە: عەبدوڵای كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی نوێژكردن لە ماڵی خۆم و نوێژكردن لە مزگەوت (كامەیان چاكترە)؟ فەرمووی: دەبینی ماڵی من چەندە لە مزگەوتەوە نزیكە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لە ماڵەكەم نوێژ بكەم پێم خۆشترە لەوەی لە مزگەوت نوێژ بكەم جگە لە فەرزەكان.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا اسْتَحَبَّ الصَّلَاةَ فِي الْبَيْتِ عَلَى الصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ خَلَا الْمَكْتُوبَةِ «إِذِ الصَّلَاةُ فِي الْبَيْتِ أَفْضَلُ مِنَ الصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ مِنْهَا»

**١٢٠٣-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی لە ماڵەوە بەچاكتر داناوە لەوەی لە مزگەوت ئەنجام بدرێت جگە لە فەرزەكان، چونكە نوێژكردن لە ماڵەوە چاكترە لە نوێژكردن لە مزگەوت جگە لە فەرزەكان**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین نوێژ بۆ بەندە ئەوەیە لەنێو ماڵەکەی ئەنجامی بدات جگە لە نوێژە فەرزەکان.

**١٢٠٤-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ؛ فَإِنَّ أَفْضَلَ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»(١).

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە نوێژەکانتان لە ماڵەکانتان بکەن، چونکە چاکترین نوێژ ئەو نوێژەیە بەندە لە ماڵەکەی خۆیدا دەیکات جگە لە فەرزەکان.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ التَّطَوُّعِ غَيْرَ مَا تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهَا

## بَابُ الْأَمْرِ بِصَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي الْبُيُوتِ وَالنَّهْيِ عَنِ اتِّخَاذِ الْبُيُوتِ قُبُورًا فَيَتَحَامَى الصَّلَاةَ فِيهِنَّ «وَهَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى الزَّجْرِ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الْمَقَابِرِ»

**١٢٠٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْعَلُوا مِنْ صَلَاتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ، وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا»(٢).

**کۆباسی نوێژە سوننەتەکان جگە لەو نوێژە سوننەتانەی کە لە پێشەوە باسم کرد**

**باسی فەرمانکردن بەوەی نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەکان ئەنجام بدرێن، وە قەدەغەکردن لەوەی ماڵەکان بکرێن بە گۆڕستان و نوێژیان تێدا نەکرێت، وە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر سەرزەنشتکردنی نوێژکردن لەنێو گۆڕستانەکان**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەندێك لە نوێژەکانتان لە ماڵەکانتان بکەن، مەیکەن بە گۆڕستان (واتە: نوێژە سوننەتەکانتان لە ماڵەوە بکەن، ئەمە بۆچوونی زۆرینەی زانایانە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِأَنْ يَجْعَلَ بَعْضَ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي الْبُيُوتِ لَا كُلَّهَا «إِذِ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا يَجْعَلُ فِي بَيْتِ الْمُصَلِّي مِنْ صَلَاتِهِ خَيْرًا» خَبَرُ ابْنِ عُمَرَ: «اجْعَلُوا مِنْ صَلَاتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ» دَالٌّ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا أَمَرَ بِأَنْ يَجْعَلَ بَعْضَ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ لَا كُلَّهَا

**١٢٠٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيبًا مِنْ صَلَاتِهِ؛ فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلَاتِهِ خَيْرًا»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەشێك لە نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە بکرێن نەك هەموویان، چونکە خوا ﷻ بەشێك لە نوێژی نوێژخوێن کە لە ماڵەکەیدا ئەنجامی دەدات دەیکات بە خێر، فەرموودەکەی ئیبنو عومەر: (اجْعَلُوا مِنْ صَلَاتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ)، واتە: هەندێك لە نوێژەکانتان لە ماڵەکانتان بکەن. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەشێك لە نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە بکرێن نەك هەموویان

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك لەئێوە لە مزگەوتەکەیدا نوێژی کرد با بەشێکی بهێڵێتەوە بۆ ماڵەکەی، چونکە خوا ﷻ نوێژکردنی لە ماڵەکەیدا کردووە بە مایەی خێر بۆی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِكْرَامِ الْبُيُوتِ بِبَعْضِ الصَّلَاةِ فِيهَا

**١٢٠٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْرِمُوا بُيُوتَكُمْ بِبَعْضِ صَلَاتِكُمْ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە ڕێزگرتنی ماڵەکان بە هەندێ نوێژکردن تیایدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێز و حورمەت لەماڵەکانتان بگرن بە کردنی هەندێ نوێژتان تیایدا (واتە: هەندێ لە نوێژە سوننەتەکان).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي عَقِبِ كُلِّ وُضُوءٍ يَتَوَضَّأُهُ الْمُحْدِثُ

**١٢٠٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ لِبِلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ: «يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ عِنْدَكَ مَنْفَعَةً فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي قَدْ سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ»، فَقَالَ: مَا عَمِلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْإِسْلَامِ عِنْدِي عَمَلًا أَرْجَى مَنْفَعَةً مِنْ أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا تَامًّا قَطُّ فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ لِرَبِّي مَا كَتَبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی سوننەت لەدوای هەموو دەستنوێژێك

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نوێژی بەیانی بە بیلالی فەرموو: ئەی بیلال، چاکترین کردەوەتم بۆ باس بکە لە ئیسلامدا کردبێتت، چونکە من ئەمشەو گوێم لە خشەی نەعلەکانت بوو لە پێشمەوە لەنێو بەهەشت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کردەوەیەکی ئەوەندە چاکم نەکردووە ئەوە نەبێت من هەر کات دەستنوێژم بگرتایە بەچاکی لە هەر کاتێکی شەو یان ڕۆژ ئیللا نوێژم دەکرد بۆ پەروەردگارم ئەوەندەی خوا بۆمی نووسیوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ عِنْدَ الذَّنْبِ يُحْدِثُهُ الْمَرْءُ لِتَكُونَ تِلْكَ الصَّلَاةُ كَفَّارَةً لِمَا أَحْدَثَ مِنَ الذَّنْبِ

**١٢٠٩-** عَنْ بُرَيْدَةَ ﵁ قَالَ: أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا فَدَعَا بِلَالًا، فَقَالَ: «يَا بِلَالُ بِمَ سَبَقْتَنِي إِلَى الْجَنَّةِ، إِنِّي دَخَلْتُ الْبَارِحَةَ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِي»، فَقَالَ بِلَالٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَا أَذْنَبْتُ قَطُّ إِلَّا صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ، وَمَا أَصَابَنِي حَدَثٌ قَطُّ إِلَّا تَوَضَّأْتُ عِنْدَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِهَذَا»[٢].

## باسی چاکتر وایە بەندە کاتێ گوناهێکی کرد بە دوایدا نوێژ بکات بۆ ئەوەی ئەو نوێژە ببێت بە کەفارەتی ئەو گوناهەی کە کردوویەتی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك بەیانی کردەوە بانگی بیلالی کرد، فەرمووی: ئەی بیلال بە چی شتێك لە بەهەشت پێشم کەوتیت، من دوێنی چوومە بەهەشتەوە گوێم لە خشەی نەعلەکانت بوو لە پێشمەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ گوناهێکم نەکردووە ئیللا دوو ڕکات نوێژم کردووە، وە هەر کات بێ دەستنوێژ بووبێتم حەتمەن دەستنوێژم گرتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەهۆی ئەوەوەیە.

## بَابُ التَّسْلِيمِ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ مِنْ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ صَلَاةِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ جَمِيعًا

**١٢١٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى»[١].

## باسی سەلامدانەوە لە هەموو دوو ڕکاتێکی نوێژی سوننەت شەو بێت یان ڕۆژ

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی (سوننەت) لە شەو و لە ڕۆژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە.

**بَابُ ذِكْرِ الْأَخْبَارِ الْمَنْصُوصَةِ وَالدَّالَّةِ عَلَى خِلَافِ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ تَطَوُّعَ النَّهَارِ أَرْبَعًا لَا مَثْنَى فِي خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ، وَفِي أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ» وَفِي خَبَرِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلَّا نَهَارًا ضُحًى، فَيَبْدَأُ بِالْمَسْجِدِ، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ وَفِي قَوْلِهِ لِجَابِرٍ لَمَّا أَتَاهُ بِالْبَعِيرِ لِيُسَلِّمَهُ إِلَيْهِ: أَصَلَّيْتَ؟ قَالَ: لَا قَالَ: قُمْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ. وَفِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ: مَنْ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ نَفْسَهُ فِيهِمَا بِشَيْءٍ، وَلَهُ عَبْدٌ أَوْ فَرَسٌ، وَبِصَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ نَهَارًا لَا لَيْلًا وَفِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ: حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَحَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ بِرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ وَفِي خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي عَلَى أَثَرِ كُلِّ صَلَاةٍ رَكْعَتَيْنِ إِلَّا الْفَجْرَ، وَالْعَصْرَ وَفِي خَبَرِ بِلَالٍ: مَا أَذْنَبْتُ قَطُّ إِلَّا صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ وَفِي خَبَرِ أَبِي بَكْرٍ**

---

(١) هذا حديث صحيح.

الصِّدِّيقِ: مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا، فَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلَّا غُفِرَ لَهُ، وَفِي خَبَرِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَنْزِلُ مَنْزِلًا إِلَّا وَدَّعَهُ بِرَكْعَتَيْنِ، وَفِي خَبَرِ عَائِشَةَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي، فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَفِي خَبَرِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْعَالِيَةِ، حَتَّى إِذَا مَرَّ مَسْجِدَ بَنِي مُعَاوِيَةَ دَخَلَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ وَصَلَّيْنَا مَعَهُ، وَفِي خَبَرِ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي بَيْتِهِ سُبْحَةَ الضُّحَى رَكْعَتَيْنِ، وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ، وَفِيهِ: رَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَفِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى قَطُّ إِلَّا أَنْ يَقْدَمَ مِنْ سَفَرٍ، فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَفِي خَبَرِ أَبِي ذَرٍّ: يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْ بَنِي آدَمَ صَدَقَةٌ، وَقَالَ فِي الْخَبَرِ: وَيُجْزِي مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَا الضُّحَى » وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: مَنْ حَافَظَ عَلَى شُفْعَتَيِ الضُّحَى، غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ، وَفِي خَبَرِ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ دَعَوْتَ، فَأَمَرَ بِنَاحِيَةِ بَيْتِهِمْ، فَنُضِحَ، وَفِيهِ بِسَاطٌ، فَقَامَ فَصَلَّي رَكْعَتَيْنِ « قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي كُلِّ هَذِهِ الْأَخْبَارِ كُلِّهَا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ التَّطَوُّعَ بِالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى لَا أَرْبَعًا كَمَا زَعَمَ مَنْ لَمْ يَتَدَبَّرْ هَذِهِ الْأَخْبَارَ، وَلَمْ يَطْلُبْهَا، فَيَسْمَعْهَا مِمَّنْ يَفْهَمُهَا. فَأَمَّا خَبَرُ عَائِشَةَ الَّذِي ذَكَرْنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، فَلَيْسَ فِي الْخَبَرِ أَنَّهُ صَلَّاهُنَّ بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ، وَابْنُ عُمَرَ، قَدْ أَخْبَرَ أَنَّهُ صَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَلَوْ كَانَتْ صَلَاةُ النَّهَارِ أَرْبَعًا لَا رَكْعَتَيْنِ، لَمَا جَازَ لِلْمَرْءِ أَنْ يُصَلِّيَ بَعْدَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ عَلَيْهِ أَنْ يُضِيفَ إِلَى الرَّكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ لِتَتِمَّ أَرْبَعًا، وَكَانَ عَلَيْهِ أَنْ يُصَلِّيَ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ أَرْبَعًا؛ لِأَنَّهُ مِنْ صَلَاةِ النَّهَارِ لَا مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، وَلَمْ نَسْمَعْ خَبَرًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ثَابِتًا مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ أَنَّهُ صَلَّى بِالنَّهَارِ أَرْبَعًا بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ صَلَاةَ تَطَوُّعٍ، فَإِنْ خُيِّلَ إِلَى بَعْضِ مَنْ لَمْ يُنْعِمِ الرَّوِيَّةَ أَنَّ خَبَرَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ، إِذْ ذَكَرَتْ أَرْبَعًا فِي الْخَبَرِ، قِيلَ لَهُ: فَقَدْ رَوَى سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ فِي ذِكْرِهَا صَلَاةَ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَهَذِهِ اللَّفْظَةُ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ كَاللَّفْظَةِ الَّتِي ذَكَرَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَقِيقٍ عَنْهَا فِي الْأَرْبَعِ قَبْلَ الظُّهْرِ، أَفَيَجُوزُ أَنْ يَتَأَوَّلَ مُتَأَوِّلٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْأَرْبَعَاتِ بِاللَّيْلِ، كُلَّ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ مِنْهَا بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ، وَهُمْ لَا يُخَالِفُونَا أَنَّ صَلَاةَ

## اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى خَلَا الْوِتْرِ، فَمَعْنَى خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ عِنْدَهُمْ كَخَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ عَنْهَا عِنْدَنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الْأَرْبَعَ بِتَسْلِيمَتَيْنِ لَا بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ. وَفِي خَبَرِ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَهُنَا كَهَيْئَتِهَا عِنْدَ الْعَصْرِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَإِذَا كَانَتْ مِنْ هَهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَهُنَا عِنْدَ الظُّهْرِ صَلَّى أَرْبَعًا، وَيُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا، وَيَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ

١٢١١- عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَلِيًّا ﷺ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: « فَفِي هَذَا الْخَبَرِ خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَدْ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ رَكْعَتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، فَأَمَّا ذِكْرُ الْأَرْبَعِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَالْأَرْبَعِ قَبْلَ الْعَصْرِ، فَهَذِهِ مِنَ الْأَلْفَاظِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي دَلَّتْ عَلَيْهِ الْأَخْبَارُ الْمُفَسَّرَةُ، فَدَلَّ خَبَرُ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى، أَنَّ كُلَّ مَا صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي النَّهَارِ مِنَ التَّطَوُّعِ، فَإِنَّمَا صَلَّاهُنَّ مَثْنَى مَثْنَى عَلَى مَا خَبَّرَ أَنَّهَا صَلَاةُ النَّهَارِ وَاللَّيْلِ جَمِيعًا، وَلَوْ ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ أَرْبَعًا بِتَسْلِيمٍ كَانَ هَذَا عِنْدَنَا مِنَ الِاخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، فَكَانَ الْمَرْءُ مُخَيَّرًا بَيْنَ أَنْ يُصَلِّيَ أَرْبَعًا بِتَسْلِيمَةٍ بِالنَّهَارِ، وَبَيْنَ أَنْ يُسَلِّمَ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ. وَقَوْلُهُ فِي خَبَرِ عَلِيٍّ: وَيَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَهَذِهِ اللَّفْظَةُ تَحْتَمِلُ مَعْنَيَيْنِ، أَحَدُهُمَا أَنَّهُ كَانَ يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِتَشَهُّدٍ، إِذْ فِي التَّشَهُّدِ التَّسْلِيمُ عَلَى الْمَلَائِكَةِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَهَذَا مَعْنًى يَبْعُدُ، وَالثَّانِي أَنَّهُ كَانَ يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ الَّذِي هُوَ فَصْلٌ بَيْنَ هَاتَيْنِ الرَّكْعَتَيْنِ، وَبَيْنَ مَا بَعْدَهُمَا مِنَ الصَّلَاةِ، وَهَذَا هُوَ الْمَفْهُومُ فِي الْمُخَاطَبَةِ؛ لِأَنَّ الْعُلَمَاءَ لَا يُطْلِقُونَ اسْمَ الْفَصْلِ بِالتَّشَهُّدِ مِنْ غَيْرِ سَلَامٍ يَفْصِلُ بَيْنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَبَيْنَ مَا بَعْدَهُمَا، وَمُحَالٌ مِنْ جِهَةِ الْفِقْهِ أَنْ يُقَالَ: يُصَلِّي الظُّهْرَ أَرْبَعًا، يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِسَلَامٍ، أَوِ الْعَصْرَ أَرْبَعًا يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِسَلَامٍ، أَوِ الْمَغْرِبَ ثَلَاثًا يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِسَلَامٍ، أَوِ الْعِشَاءَ أَرْبَعًا يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِسَلَامٍ، وَإِنَّمَا يَجِبُ أَنْ يُصَلِّيَ الْمَرْءُ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْعِشَاءَ، كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ أَرْبَعَةً مَوْصُولَةً لَا مَفْصُولَةً، وَكَذَلِكَ الْمَغْرِبَ يَجِبُ أَنْ يُصَلِّيَ ثَلَاثًا مَوْصُولَةً لَا مَفْصُولَةً، وَيَجِبُ أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَ الْوَصْلِ وَبَيْنَ الْفَصْلِ، وَالْعُلَمَاءُ مِنْ جِهَةِ الْفِقْهِ لَا يَعْلَمُونَ الْفَصْلَ بِالتَّشَهُّدِ مِنْ غَيْرِ تَسْلِيمٍ يَكُونُ بِهِ خَارِجًا مِنَ الصَّلَاةِ، ثُمَّ يُبْتَدَأُ فِيمَا بَعْدَهَا، وَلَوْ كَانَ التَّشَهُّدُ يَكُونُ فَصْلًا بَيْنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَبَيْنَ مَا بَعْدُ، لَجَازَ لِمُصَلٍّ إِذَا تَشَهَّدَ فِي كُلِّ صَلَاةٍ، يَجُوزُ أَنْ يَتَطَوَّعَ بَعْدَهَا، أَنْ يَقُومَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ فَيَبْتَدِأَ فِي التَّطَوُّعِ عَلَى الْعَمْدِ، وَكَذَاكَ كَانَ يَجُوزُ لَهُ أن يَتَطَوَّعُ مِنَ اللَّيْلِ بِعَشْرِ رَكَعَاتٍ

وَأَكْثَرَ بِتَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ يَتَشَهَّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، لَوْ كَانَ التَّشَهُّدُ فَصْلًا بَيْنَ مَا مَضَى وَبَيْنَ مَا بَعْدُ مِنَ الصَّلَاةِ، وَهَذَا خِلَافُ مَذْهَبِ مُخَالِفِينَا مِنَ الْعِرَاقِيِّينَ[١].

**باسی ئەو فەرموودانەی کە هاتوون و بەڵگەن لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی گومانی وایە نوێژی سوننەتی ڕۆژ چوار ڕکاتە نەك دوو ڕکات، لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوت با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دانیشێ. هەروەها لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هاتووە: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە و پێشنوێژ وتاری دەدا با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت. وە لە فەرموودەی کەعبی کوڕی مالیکدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لە گەشت نەدەگەڕایەوە مەگەر کاتی چێشتەنگاو، سەرەتا دەچووە مزگەوت دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد. هەروەها لە فەرموودەکەی کە بە جابری فەرموو -کاتێ هات بۆ لای و وشترەکەی بۆی هێنا-: نوێژت کرد؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە. هەروەها لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس هاتووە: هەر کەسێك دوو ڕکات نوێژ بکات داڵغە لێ نەدات تیایدا و سەرقاڵ نەبێت بە کۆیلەکەی یان ئەسپەکەی، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژەبارانەی کرد بە ڕۆژ نەك بە شەو، وە لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ دوو ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆم لەبەر کرد، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، دوو ڕکاتیش دوای ئێوارە، دوو ڕکاتیش دوای عیشا. وە حەفصەیش بۆی باس کردم دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، هەروەها لە فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب هاتووە: پێغەمبەر ﷺ دوای هەموو نوێژێك دوو ڕکاتی دەکرد جگە لە بەیانی و عەسر. وە لە فەرموودەکەی بیلال هاتووە: هیچ گوناهێکم نەکردووە حەتمەن دوو ڕکات نوێژم کردووە. وە لە فەرموودەکەی ئەبو بەکری صدیق هاتووە: هیچ بەندەیەك نییە گوناهێك بکات، دواتر دەستنوێژ بگرێ، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، ئینجا داوای لێخۆشبوون بکات حەتمەن خوا لێی خۆش دەبێت. هەروەها لە فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیك هاتووە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دابەزیایەتە هەر جێگایەك**

---

(١) إسناده حسن.

دوو ڕکات نوێژی دەکرد ئینجا جێی دەهێشت.هەروەها لە فەرموودەکەی عائیشەدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی من دوو ڕکات نوێژی دەکرد. وە لە فەرموودەکەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص هاتووە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە بەرزاییەکانی مەدینە هاتە خوارەوە، تا تێپەڕی بەلای مزگەوتەکەی نەوەکانی موعاویە، دواتر چووە مزگەوتەکەوە دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد ئێمەیش لەگەڵی نوێژمان کرد. وە لە فەرموودەکەی مەحمودی کوڕی ڕەبیع هاتووە لە عیتبانی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر ﷺ لەنێو ماڵەکەی خۆی دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد. وە لە فەرموودەکەی ئەبو هوڕەیڕە هاتووە: خۆشەویستەکەم بە سێ شت وەسیەتی بۆ کردووم، ئەوەی تێدا بوو: دوو ڕکاتی چێشتەنگاو. وە لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی شەقیق هاتووە لە عائیشەوە: هەرگیز پێغەمبەرم ﷺ نەبینوە نوێژی چێشتەنگاو بکات مەگەر لە گەشتێك گەڕابێتەوە، دوو ڕکات چێشتەنگاوی دەکرد. وە لە فەرموودەکەی ئەبو زەڕەوە هاتووە: پێویستە لەسەر نەوەی ئادەم هەموو بەیانییەك لەجیاتی هەر جومگەیەك لە جومگەکانیان خێر و بەخشینێك بکەن. وە لە فەرموودەکەدا فەرموویەتی: دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بەسە بۆی. هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو هوڕەیڕە هاتووە: هەر کەسێك پارێزگاری لە دوو ڕکاتەکەی نوێژی چێشتەنگاو بکات خوا لە گوناهەکانی خۆش دەبێت، ئەگەر چی بە قەد کەفی دەریاش بێت. هەروەها لە فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی سیرین هاتووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای خانەوادەیەکی ئەنصارەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگە دەپاڕایتەوە بۆمان، ئەویش فەرمانی کرد سووچێکی ماڵەکەیان بۆی ئاو پڕژێن کرد، ڕاخەرێکی تێدا بوو، دواتر هەستا دوو ڕکات نوێژی کرد، ئەبو بەکر دەڵێ: هەموو ئەم فەرموودانە بەگشتی بەڵگەن لەسەر ئەوەی نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا دوو ڕکاتە نەك چوار وەك هەندێ لەوانە گومانیان بردووە کە ڕۆنەچوون لە فەرموودەکاندا و بەدواداچوونیان بۆیان نەکردووە، لە کەسێك بیستوویانە خۆی لە فەرموودەکە تێنەگەیشتووە، بەڵام فەرموودەکەی عائیشە کە باسمان کرد: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی کرد. لە فەرموودەکەدا ئەوە نەهاتووە کە بەیەك سەلامدانەوە ئەو نوێژانەی کردبێت، ئیبنو عومەریش هەواڵی داوە

پێغەمبەر ﷺ پێش نیوەڕۆ دوو ڕکاتی کردووە، ئەگەر نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا چوار ڕکات بووایە نەک دوو، چۆن دروست دەبوو بۆ بەندە دوای نیوەڕۆ دوو ڕکات سوننەت بکات، پێویست بوو لەسەری دوو ڕکاتی دیکەی بۆ زیاد بکات بۆ ئەوەی ببێت بە چوار ڕکات، وە پێویست بوو پێش نوێژی بەیانی چوار ڕکاتی بکردایە، چونکە لە نوێژی ڕۆژە نەک نوێژی شەو، هەروەها فەرموودەیەکی جێگیرمان لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبیستووە لە ڕووی گواستنەوەوە ئەو لە ڕۆژدا چوار ڕکات نوێژی سوننەتی کردبێت بە یەک سەلامدانەوە، ئەگەر بە خەیاڵی کەسێکدا بێت کە نیعمەتی ڕیوایەتی پێنەبەخشراوە، فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات نوێژی کرد بە یەک سەلامدانەوە. بڵێ: چونکە باسی چواری کردووە لە فەرموودەکە، پێی دەوترێ: سەعیدی مەقبوری گێڕاویەتەوە لە باوکی سەلەمە لە عائیشەوە کە باسی شەونوێژی پێغەمبەری ﷺ کرد، وتی: چوار ڕکات نوێژی دەکرد پرسیار مەکە لە جوانی درێژیان، پاشان چوار ڕکات دیکەی دەکرد. ئەم دەستەواژەیە سەبارەت بە شەونوێژ هەر وەکو دەستەواژەکەی عەبدوڵای کوڕی شەقیقە کە باسی کردووە لە چوار ڕکاتەکەی پێش نیوەڕۆ، جا دروستە کەسێک لەیەکی بداتەوە بڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات چوار ڕکات شەونوێژی دەکرد، هەر چوار ڕکاتێک بە یەک سەلامدانەوە، بێگومان ئەوان پێچەوانەی ئێمە نین لەوەی کە شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە جگە لە ویتر، جا مانای فەرموودەکەی ئەبو سەلەمە لە عائیشەوە لەلای ئەوان وەکو فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی شەقیقە لە عائیشەوە لەلای ئێمە کە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی کرد بە دوو سەلامدانەوە نەک یەک سەلامدانەوە، هەروەها لە فەرموودەکەی عاصمی کوڕی زومرە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆر لێرەوە بەرز بۆیەوە ئاماژەی بە خۆرهەڵات کرد، وەکو چۆن لێرەوە بەرز بووەتەوە ئاماژەی بۆ خۆرئاوا کرد لە کاتی عەسردا، دوو ڕکات نوێژی دەکرد (چێشتەنگاو). ئەگەر خۆر لێرەوە ئاوای لێ بهاتایە وەکو لە کاتی نیوەڕۆدا چوار ڕکات نوێژی دەکرد (لە کاتی ترازانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان)، پێش نیوەڕۆش چوار ڕکاتی دەکرد و دوای نیوەڕۆش دوو ڕکات، پێش عەسریش چوار ڕکات، وە لە نێوان هەموو دوو ڕکاتێکدا تەحیاتی دەخوێند و

## سەلامی دەكرد لەسەر فریشتە نزیكەكان و ئەوانەشی شوێنیان كەوتوون لە مسوڵمانان و سەلامی دەدایەوە

واتە: عاصیمی كوڕی زومڕە دەڵێ: پرسیارم لە عەلی ﷺ كرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەم فەرموودەی كرد.

ئەبو بەكر دەڵێ: لەم فەرموودەدا فەرموودەكەی عەلی كوڕی ئەبو تالیب ﷺ پێغەمبەر ﷺ نوێژی كرد لە ڕۆژدا دوو ڕكات دوو ڕكات، بەڵام باس كردنی چوار ڕكات پێش نیوەڕۆ و چوار ڕكات پێش عەسر، ئەمە لەو دەستەواژە (الْمُجْمَلَةِ) ناڕوونانەیە كە دەستەواژە (الْمُفَسَّرَةُ) شیكراوەكان ڕوونیان كردۆتەوە، جا فەرموودەكەی ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: نوێژی (سوننەت) لە شەو و لە ڕۆژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەر نوێژێكی سوننەتی كردبێت لە ڕۆژدا دوو ڕكات دوو ڕكات بووە، وەكوو چۆن هەواڵی داوە كە نوێژی سوننەتی لە شەودا بێت یان لە ڕۆژدا بێت دوو ڕكات دوو ڕكات دەكرێ، وە ئەگەر جێگیر بوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە ئەو بە ڕۆژ چوار ڕكات نوێژی سوننەتی كردووە بە یەك سەلامدانەوە ئەمە لەلای ئێمە لەو جیاوازییانەیە كە ڕێگەپێدراوە، جا بەندە سەرپشكە لە نێوان ئەوەی چوار ڕكات نوێژ دەكات بە یەك سەلامدانەوە بە ڕۆژ، وە لە نێوان ئەوەی لە هەردوو ڕكاتەكە سەلام دەداتەوە. وە ئەوەی كە لە فەرموودەكەی عەلیدا ﷺ هاتووە: ( وە نێوانی هەموو دوو ڕكاتێكی جیا دەكردەوە بە سەلامدانەوە لەسەر فریشتە نزیكەكان و ئەوانەشی شوێنیان كەوتوون لە باوەڕداران)، ئەم دەستەواژەیە پێدەچێت دوو مانا لەخۆ بگرێ:

یەكەم: پێغەمبەر ﷺ نێوانی هەموو دوو ڕكاتێكی بە تەحیات جیا دەكردەوە لەوەی كە بە دوایدا دێت، چونكە لەنێو تەحیاتدا سەلامكردنی تێدایە لەسەر فریشتەكان و ئەوانەیشی شوێنیان كەوتوون لە موسوڵمانان، ئەم مانایەش دوورە.

دووەم: پێغەمبەر ﷺ هەموو دوو ڕكاتێكی بە سەلامدانەوە جیا دەكردەوە لەوەی كە بەدوایدا دێت، ئەمەش مەفهومی دواندنەكەیە، چونكە زانایان ناوی (الْفَصْلِ) جیاكردنەوە لە نوێژ بەكار ناهێنن بۆ تەحیات بەبێ سەلامدانەوەیەك دوو ڕكاتەكە

جیا بکاتەوە لەدوای خۆی، مەحاڵیشە لە ڕوی فقهییەوە بوترێ: چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ دەکات بە سەلامدانەوە لە یەکدی جیایان دەکاتەوە، یان چوار ڕکات عەسر دەکات بە سەلامدانەوە لە یەکدی جیایان دەکاتەوە، یان سێ ڕکات نوێژی ئێوارە دەکات بە سەلامدانەوە لە یەکدی جیایان دەکاتەوە، یان عیشا بە سەلامدانەوە لە یەکدی جیایان دەکاتەوە، بەڵکوو پێویستە بەندە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا بکات هەر یەکەیان چوار ڕکات گەیەنرابن بە یەکدی نەك لە یەکدی جیا کرابێتنەوە، بەهەمان شێوە ئێوارەش، وە پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان گەیاندن و لە نێوان جیاکردنەوە، (الْوَصْلِ والْفَصْلِ) زانایانیش لە ڕووی فیقهییەوە پێیان وا نییە تەحیات بەبێ سەلامدانەوە پێی دەردەچێت لە نوێژ، پاشان دوای ئەوە دەست پێ دەکاتەوە، جا ئەگەر تەحیات ببووایەتە جیاکەرەوە لە نێوان دوو ڕکاتەکە و لە نێوان دوو ڕکاتەکەی دوای ئەو، ئەوە دروست بوو بۆ نوێژخوێن ئەگەر تەحیاتی بخوێندایە لە هەموو نوێژێکدا، دروست بوو دوای ئەوە نوێژی سوننەت بکات، پێش ئەوەی سەلام بداتەوە هەستێت بە ئەنقەست دەست بکات بە نوێژی سوننەت، بەهەمان شێوە دروست بوو دە ڕکات شەونوێژ بکات بە یەك سەلامدانەوە لە نێوان هەموو دوو ڕکاتێك تەحیات بخوێنێ، ئەگەر تەحیات جیاکەرەوە بێت لە نێوان ئەوەی تێپەڕیوە ئەوەیشی لە دوایەوە دێت لە نوێژ، ئەمەش پێچەوانەی مەزهەبی پێچەوانەکارانی ئێمەیە لە عێراقییەکان.

**١٢١٢-** عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الصَّلَاةُ مَثْنَى مَثْنَى، وَتَشَهَّدْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَتَبَاءَسْ، وَتَمَسْكَنْ، وَتَقَنَّعْ يَدَيْكَ، وَتَقُولُ: اللَّهُمَّ، اللَّهُمَّ، فَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَهُوَ خِدَاجٌ»[1]

واتە: موتەلیبی کوڕی وەداعە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، لە هەر دوو ڕکاتێکدا تەحیات بخوێنە بەداماوی خۆت نیشان بدە و خۆت زەلیل و گەردنکەچ بکە، دەستەکانیشت بەرز بکەرەوە بڵێ: ئەی خوایە ئەی خوایە، هەر کەسێك ئەوە نەکات ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

**١٢١٣-** عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

**واتە: فەزلی کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوەی فەرمودەکەی پێشوو.**

**١٢١٤-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ لَا يُسَلِّمُ فِيهِنَّ تُفْتَحُ لَهُنَّ أَبْوَابُ السَّمَاءِ». عَنْ عَلِي بنِ الصَّلتِ عَن أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، إِلَّا أَنَّهُ لَيْسَ فِيهِ: لَا يُسَلِّمُ بَيْنَهُنَّ[٢].

**واتە: ئەبو ئەیوب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ لە نێوانیاندا سەلام نەداتەوە دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە. عەلی کوڕی صەلت دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئەیوب ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوەی فەرمودەکەی پێشوو، بەڵام (لَا يُسَلِّمُ بَيْنَهُنَّ)ەی تێدا نییە.**

**١٢١٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَسْتُ أَعْرِفُ عَلِيَّ بْنَ الصَّلْتِ هَذَا، وَلَا أَدْرِي مِنْ أَيِّ بِلَادِ اللَّهِ هُوَ، وَلَا أَفْهَمُ أَلَقِيَ أَبَا أَيُّوبَ أَمْ لَا؟ وَلَا يَحْتَجُّ بِمِثْلِ هَذِهِ الْأَسَانِيدِ عِلْمِي إِلَّا مُعَانِدٌ أَوْ جَاهِلٌ[٣].

**واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: من ئەم عەلی کوڕی صەلتە ناناسم، ناشزانم خەڵکی چی وڵاتێکی خوایە، تێناگەم ئایا ئەیوبی بینیوە یان نەیبینیوە؟ کەس هاوشێوەی ئەم سەنەدانە بە بەڵگە ناهێنێتەوە مەگەر کەللەرەق یان نەفام بێت.**

## بَابُ صَلَاةِ التَّسْبِيحِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ شَيْئًا

**١٢١٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ: «يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّاهُ، أَلَا أُعْطِيكَ، أَلَا أُجِيزُكَ، أَلَا أَفْعَلُ لَكَ عَشْرَ خِصَالٍ، إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللَّهُ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ

---

(١) مداره على عبدالله بن نافع وهو مجهول، أخرجه: ابن المبارك في **مسنده** (٥٣)، وفي **الزهد** له (١١٥٢)، وأحمد ٢١١/١ و ١٦٧/٤، والترمذي (٣٨٥)، وفي **العلل** له (٣٨٥)، والنسائي في **الكبرى** (٦١٥) و (١٤٤٠)، وأبو يعلى (٦٧٣٨)، والطحاوي في **شرح المشكل** (١٠٩٤) و (١٠٩٥) و (١٠٩٦)، والطبراني في **الكبير** ١٨/(٧٥٧)، وفي **الأوسط** له (٨٦٣٢)، والبيهقي ٤٨٧/٢-٤٨٨، وابن عبدالبر في **التمهيد** ١٣/ ١٨٦، والبغوي (٧٤٠)، انظر: **إتحاف المهرة** ١٢/ ٦٧١ (١٦٢٨٠).

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إستاده ضعيف.

وَآخِرَهُ، قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ، خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ، صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ، سِرَّهُ وَعَلَانِيَتَهُ، عَشْرَ خِصَالٍ: أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ، فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ قُلْتَ وَأَنْتَ قَائِمٌ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً، ثُمَّ تَرْكَعُ وَتَقُولُ وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً»[1].

## باسی نوێژی (صَلَاةِ التَّسْبِيحِ) ئەگەر فەرموودەکە تەواو بوو، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە بەرانبەر ئەم سەنەدە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی فەرموو: ئەی عەباس، ئەی مامەم، ئایا پێت ببەخشم، ئایا دە خەصلەتت پێ بڵێم، ئەگەر تۆ کردت خوا لە گوناهەکانت خۆش ببێت لە سەرەتا و کۆتایی، کۆن و نوێ، هەڵە و ئەنقەست، بچووك و گەورە، نهێنی و ئاشکرا، دە خەصلەتەکە: چوار ڕکات بکەی لە هەموو دوو ڕکاتێکیدا سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکە بخوێنە، ئەگەر لە قوڕئانخوێندن بوویتەوە لە یەکەم ڕکات، بەڕاوەستانەوە پازدە جار بڵێی: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ للَّه، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان ڕکووع ببەیت و لە ڕکووعیشدا دە جار بیڵێی، پاشان سەرت بەرز بکەیتەوە لە ڕکووع دە جار بیڵێی، پاشان سوژدە ببەیت و دە جار بیڵێی، پاشان سەرت بەرز بکەیتەوە و دە جار بیڵێی، پاشان بچیتە سوژدە و دە جار بیڵێ، پاشان لە سوژدە هەستیتەوە و دە جار بیڵێی، ئەوە لە هەر ڕکاتێکدا دەکاتە حەفتاو پێنج جار، لە هەر چوار ڕکاتدا ئەوە دەکەی، ئەگەر توانیت لە هەموو ڕۆژێکدا یەك جار بیکەیت ئەوە بیکە، ئەگەر نەتوانی، ئەوە لە هەموو هەفتەیەکدا یەك جار بیکە، ئەگەر نەتوانی، ئەوە لە هەموو مانگێکدا بیکە، ئەگەر نەتوانی ئەوە لە هەموو ساڵێکدا یەك جار بیکە، ئەگەر نەتوانی لە تەمەنتدا یەك جار بیکە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ صَلَاةِ التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيبِ

١٢١٧- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْبَلَ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْعَالِيَةِ حَتَّى إِذَا مَرَّ بِمَسْجِدِ بَنِي مُعَاوِيَةَ، دَخَلَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ، وَدَعَا رَبَّهُ طَوِيلًا، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: «سَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ، وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا»[١].

## باسی نوێژی هاندان و ترساندن

واتە: عامری کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لە بەرزاییەکانی مەدینەوە هات تا خەریك بوو تێپەڕ بێت بەلای مزگەوتی نەوەکانی موعاویە، چووە ژوورەوە، دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد، ئێمەیش لەگەڵی نوێژمان کرد، زۆر داوای لە پەروەردگاری کرد و پاڕایەوە، پاشان ڕووی تێ کردین، فەرمووی: داوای سێ شتم لە پەروەردگارم کرد دووانی پێبەخشیم و یەك دانەی پێنەبەخشیم، داوام لە پەروەردگارم کرد ئوممەتەکەم بە قاتوقڕی و برسێتی لەنێو نەبات، پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد ئوممەتەکەم بە خنکان لەنێو نەبات، ئەویشی پێ بەخشیم، وە داوام لێ کرد دووبەرەکی و دژایەتی سەخت لە نێوانیاندا دانەنێت، پێی نەبەخشیم.

١٢١٨- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَخَرَجْتُ مَعَهُ أَلْتَمِسُهُ، أَسْأَلُ كُلَّ مَنْ مَرَرْتُ بِهِ، فَيَقُولُ: مَرَّ قَبْلُ، حَتَّى مَرَرْتُ فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي، فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، وَقَدْ أَطَالَ الصَّلَاةَ، فَقُلْتُ: لَقَدْ رَأَيْتُكَ طَوَّلْتَ تَطْوِيلًا مَا رَأَيْتُكَ صَلَّيْتَهَا هَكَذَا قَالَ: «إِنِّي صَلَّيْتُ صَلَاةَ رَغْبَةٍ وَرَهْبَةٍ، سَأَلْتُ اللَّهَ ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي غَرَقًا فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُسَلِّطَ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُلْقِيَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَرَدَّ عَلَيَّ»[٢].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو منیش کەمێك دوای ئەوە بەدوایدا دەرچووم تا بگەم پێی، بەلای هەر کەسێك تێدەپەڕیم پرسیارم لێ دەکرد، دەیوت: پێشتر تێپەڕی، تا ئەندازەیەك ڕۆیشتم بینیم نوێژی دەکرد، چاوەڕێم

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

کرد تا تەواوی کرد، نوێژەکەی زۆر درێژ بوو، وتم: بەڕاستی بینیم نوێژەکەت زۆر درێژ کردەوە هەرگیز نەمبینیوە بەوشێوە درێژی بکەیتەوە، فەرمووی: بەڕاستی من نوێژی پێخۆشبوون و حەزپێکردن لە پاداشت و ترسان لە سزام کرد، داوای سێ شتم لە پەروەردگارم کرد دووانی پێ بەخشیم و یەك دانەی پێ نەبەخشیم، داوام لە پەروەردگارم کرد ئوممەتەکەم بە خنکان لەنێو نەبات، پێی بەخشیم، داوام لێ کرد دوژمن لە جگە لە خۆیان زاڵ نەکات بەسەریاندا، پێی بەخشیم، داوام لێ کرد دووبەرەکی و دژایەتی سەخت لە نێوانیاندا دانەنێت، ئەوەی ڕەت کردەوە.

**١٢١٩-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلًا ضَرِيرًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَنِي قَالَ: «إِنَّ شِئْتَ أَخَّرْتُ ذَلِكَ، وَهُوَ خَيْرٌ، وَإِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ»، قَالَ: فَادْعُهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنُ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَيَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، يَا مُحَمَّدُ ﷺ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ فَتَقْضِي لِي، اللَّهُمَّ شَفِّعْهُ فِيَّ، وَشَفِّعْنِي فِيهِ»[1].

واتە: عوسمانی کوڕی حونەیف ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێکی نابینا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: بپاڕێرەوە لە خوا چاوم چاك بکاتەوە، فەرمووی: ئەگەر بتەوێ پاڕانەوەت بۆ دوا دەخەم، بۆ (ڕۆژی دوایی، واتە: ئارام بگری خوا لەبری ئەوە بەهەشتت پێ دەبەخشێ) ئەوە بۆ تۆ چاکترە، وە ئەگەر ویستت بۆت دەپاڕێمەوە، وتی: بۆم بپاڕێرەوە، فەرمانی پێ کرد بەچاکی دەستنوێژ بگرێت و دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەم نزایەش بخوێنێ: خوایە من داوات لێ دەکەم بە پاڕانەوە و تکای پێغەمبەرەکەت موحەممەد ﷺ پێغەمبەری میهرەبانی، ئەی موحەممەد ﷺ من بە پاڕانەوە و تکای تۆ ڕووم کردە پەروەردگارم ئەم پێویستییەم بۆ جێبەجێ بکە، خوایە ئەو بکە تکاکار بۆم و نزای وەربگرە سەبارەت بە من، وە پاڕانەوەکەی منیش وەربگرە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ داوای کرد چاوت بۆ بگەڕێتەوە.

( ڕوونکردنەوە: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەوەسول بە پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ دروستە کاتێ لە ژیاندایە، بەڵام دوای ئەوەی لە ژیاندا نەما و کۆچی دوایی کرد، دروست نییە چیدی تەوەسولی پێ بکرێ).

---

(١) صحيح.

## بَابُ صَلَاةِ الِاسْتِخَارَةِ

**١٢٢٠-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اكْتُمِ الْخُطْبَةَ، ثُمَّ تَوَضَّأْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ، ثُمَّ صَلِّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكَ، ثُمَّ احْمَدْ رَبَّكَ وَمَجِّدْهُ، ثُمَّ قُلِ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، فَإِنْ رَأَيْتَ لِي فِي فُلَانَةَ، - تُسَمِّيهَا بِاسْمِهَا - خَيْرًا لِي فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَآخِرَتِي، فَاقْدِرْهَا لِي، وَإِنْ كَانَ غَيْرُهَا خَيْرًا لِي مِنْهَا فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَآخِرَتِي فَاقْضِ لِي بِهَا»[١].

## باسی نوێژی (الِاسْتِخَارَة)

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داواکردنی ژن بشارەوە، پاشان بەچاکی دەستنوێژ بگرە، پاشان بەوشێوەی خوا فەرزی کردووە لە سەرت نوێژ بکە، پاشان سوپاس و ستاییشی پەروەردگارت بکە و بەگەورەی ڕابگرە، پاشان بڵێ: ئەی خوایە بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم و تۆ دەزانیت و من نازانم و تۆ زاناترینی نهێنی و پەنهانەکانی، خوایە ئەگەر فلانە کەس- ناوی بێنە بە ناوی خۆی- چاکە و خێری تیایە بۆ دین و دنیا و دواڕۆژم ئەوە بە نسیبم بکەیت، وە ئەگەر غەیری ئەوە خێری تێدایە بۆ دین و دنیا و دواڕۆژم، ئەوە خوایە ئەوم بە نسیب بکەی.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الضُّحَى وَمَا فِيهَا مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ الْوَصِيَّةِ بِالْمُحَافَظَةِ عَلَى صَلَاةِ الضُّحَى

**١٢٢١-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لَا أَدَعُهُنَّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَبَدًا، أَوْصَانِي بِصَلَاةِ الضُّحَى، وَبِالْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ، وَبِصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## کۆباسی نوێژی چێشتەنگاو و ئەوەشی تیایدایە لە سوننەتەکان

## باسی وەسیەتکردن بە پارێزگاری لە نوێژی چێشتەنگاو

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت، ئەگەر خوا ویستی لەسەری بێت هەرگیز وازی لێ ناهێنم، وەسیەتی بۆ کردم بە ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو، هەروەها بە نوێژی ویتر پێش خەوتن، وە بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.

**١٢٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ: بِصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَلَا أَنَامُ إِلَّا عَلَى الْوِتْرِ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت، بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، هەروەها نەخەوم تا ویتر نەکەم، وە دوو ڕکاتی چێشتەنگاویش.

## بَابٌ فِي فَضْلِ صَلَاةِ الضُّحَى إِذْ هِيَ صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ

**١٢٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لَسْتُ بِتَارِكِهِنَّ: أَنْ لَا أَنَامُ إِلَّا عَلَى وِتْرٍ، وَأَنْ لَا أَدَعَ رَكْعَتَيِ الضُّحَى فَإِنَّهَا صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ[٢].

## باسی فەزڵی نوێژی چێشتەنگاو،
## چونکە ئەوە نوێژی گوێڕایەڵان و لەخواترسانە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت هەرگیز وازی لێ ناهێنم، نەخەوم تا ویتر نەکەم، وە هەرگیز دەستبەرداری نوێژی چێشتەنگاو نەبم، چونکە ئەوە نوێژی گوێڕایەڵان و لەخواترسانە، وە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.

---

(١) صحيح.

(٢) حديث صحيح، وهذا إسناد ضعيف.

تێبینی: (الْأَوَّابِينَ) واتە: ئەم نوێژە کاتێ دەست پێ دەکات کە پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە، سمی بەچکە وشتر دەسوتێنێ، کە دەکاتە نزیك کاتژمێرێك پێش بانگ، بۆیە ناو نراوە بە (الْأَوَّابِينَ) چونکە لەو کاتەدا مرۆڤ لە غەفڵەت و بێئاگاییدایە خواناسانیش خوایان لەبیرە و نوێژی تێدا دەکەن.

**١٢٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُحَافِظُ عَلَى صَلَاةِ الضُّحَى إِلَّا أَوَّابٌ. قَالَ: وَهِيَ صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەس پارێزگاری لە نوێژی چێشتەنگاو ناکات مەگەر لەخواترس و گوێڕایەڵ نەبێت، چونکە ئەوە نوێژی گوێڕایەڵان و لەخواترسانە.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الضُّحَى «وَالْبَيَانِ أَنَّ رَكْعَتَيِ الضُّحَى تُجْزِئُ مِنَ الصَّدَقَةِ الَّتِي كُتِبَتْ عَلَى سُلَامَى الْمَرْءِ فِي كُلِّ يَوْمٍ»

**١٢٢٥**- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «يُصْبِحُ أَحَدُكُمْ وَعَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْهُ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَهْلِيلٍ وَتَحْمِيدَةٍ وَتَكْبِيرَةٍ وَتَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِمَعْرُوفٍ وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَتُجْزِئُ مِنْ كُلِّ ذَلِكَ رَكْعَتَا الضُّحَى»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی چێشتەنگاو، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی دوو ڕکاتەکەی چێشتەنگاو بەسە بۆی لە جیاتی هەموو ئەو خێر و بەخشینانەی کە پێویستە بەندە لەبری جومگەکانی بیبەخشێت

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە بەیانی دەکاتەوە پێویستە لەسەری لەجیاتی هەر جومگەیەکی خێر و بەخشینێك بکات، جا هەموو (لا إله الا الله) و (الحمد لله) و (الله أكبر) و (سبحان الله)یەك خێر و بەخشینە، وە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە خێر و صەدەقەیە، وە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو لە جیاتی هەموو ئەوانە بەسە بۆی.

---

(١) إسناده معلول بالإرسال كما سيشير إليه المصنف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ السُّلَامَى «وَهِيَ الْمَفَاصِلُ الَّتِي عَلَيْهَا الصَّدَقَةُ الَّتِي تُجْزِئُ رَكْعَتَا الضُّحَى مِنَ الصَّدَقَةِ الَّتِي عَلَى تِلْكَ الْمَفَاصِلِ كُلِّهَا»

**١٢٢٦-** عَنْ أَبِي بُرَيْدَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «فِي الْإِنْسَانِ ثَلَاثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ مَفْصَلًا، فَعَلَيْهِ أَنْ يَتَصَدَّقَ عَنْ كُلِّ مَفْصِلٍ مِنْهُ صَدَقَةً»، قَالَ: وَمَنْ يُطِيقُ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: «النُّخَامَةُ فِي الْمَسْجِدِ تَدْفِنُهَا أَوِ الشَّيْءُ تُنَحِّيهِ عَنِ الطَّرِيقِ، فَإِنْ لَمْ تَقْدِرْ فَرَكْعَتَا الضُّحَى تُجْ»[1].

## باسی ژمارەی ئەو جومگانەی کە پێویستە بەندە (هەموو ڕۆژێك) لە جیاتی هەر دانەیەکیان چاکەیەك بکات، تەنها دوو ڕکاتی چێشتەنگاو بەرانبەری هەموو ئەو چاکانەیە

واتە: ئەبو بورەیدە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: سێ سەد و شەست جومگە لە مرۆڤدا هەیە، پێویستە لەسەری لەبری هەر جومگەیەك خێر و چاکەیەك بکات، وتی: کێ ئەوە دەتوانێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵغەمێك لەنێو مزگەوتدا دەبینی و دەیشاریتەوە، یان شتێك لەسەر ڕێگا لادەدەیت، ئەگەر ئەوەت نەتوانی ئەوە دوو ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاو بەسە بۆت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَأْخِيرِ صَلَاةِ الضُّحَى

**١٢٢٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَلَى قَوْمٍ وَهُمْ يُصَلُّونَ الضُّحَى فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ حِينَ أَشْرَقَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ إِذَا رَمِضَتِ الْفِصَالُ»[2].

## باسی چاکتر وایە نوێژی چێشتەنگاو دوا بخرێ

## (بۆ نزیك کاتژمێرێك پێش نیوەڕۆ)

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لای قەومێك، کاتێ خۆر هەڵهات نوێژیان دەکرد لەنێو مزگەوتی قوباء، پێغەمبەری خوا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ﷺ فەرمووی: نوێژی ئەووابین كاتێكە كە تینی گەرما لەسەر خۆڵ سمی بەچكە وشتر دەسوتێنێ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ مَسْأَلَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي صَلَاةِ الضُّحَى رَجَاءَ الْإِجَابَةِ

١٢٢٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحَى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنِّي صَلَّيْتُ صَلَاةَ رَغْبَةٍ وَرَهْبَةٍ، فَسَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ، وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَقْتُلَ أُمَّتِي بِالسِّنِينَ فَفَعَلَ، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُظْهِرَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا فَفَعَلَ، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَلْبِسَهُمْ شِيَعًا فَأَبَى عَلَيَّ»[1].

## باسی چاكتر وایە لە نوێژی چێشتەنگاودا لە خوا بپاڕێتەوە بە ئومێدی وەرگرتنی پاڕانەوەكەی

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە سەفەرێكدا هەشت ڕكات نوێژی چێشتەنگاوی كرد، كاتێ تەواو بوو، فەرمووی: بەڕاستی من نوێژی پێخۆشبوون و حەزپێكردن لە پاداشت و ترسان لە سزام كرد، داوای سێ شتم لە پەروەردگارم كرد دووانی پێ بەخشیم و یەك دانەی پێ نەبەخشیم، داوام لێ كرد ئوممەتەكەم بە وشكەساڵی و قاتوقڕی نەكوژێت، ئەوەی لێوەرگرتم، وە داوام لێ كرد هیچ دوژمنێك زاڵ نەكات بەسەریاندا، ئەوەیشی لێوەرگرتم، وە داوام لێكرد سەریان لێ نەشێوێنێ و نەیانكات بە چەندین دەستە و تاقم، ئەوەی لێ وەرنەگرتم.

## بَابُ صَلَاةِ الضُّحَى عِنْدَ الْقُدُومِ مِنَ السَّفَرِ

١٢٢٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي الضُّحَى إِلَّا أَنْ يَقْدَمَ مِنْ غَيْبَةٍ[2].

## باسی نوێژی چێشتەنگاو لە كاتی گەڕانەوە لە گەشت

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەكردووە مەگەر لە سەفەر گەڕابێتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) في أسناده مقال.

**١٢٣٠**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى قَطُّ إِلَّا أَنْ يَقْدَمَ مِنْ سَفَرٍ فَيُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ ابْنُ عُمَرَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْمُخْبِرَ وَالشَّاهِدَ الَّذِي يَجِبُ قَبُولُ خَبَرِهِ وَشَهَادَتِهِ مَنْ يُخْبِرُ بِرُؤْيَةِ الشَّيْءِ وَسَمَاعِهِ وَكَوْنِهِ، لَا مَنْ يَنْفِي الشَّيْءَ، وَإِنَّمَا يَقُولُ الْعُلَمَاءُ: لَمْ يَفْعَلْ فُلَانٌ كَذَا، وَلَمْ يَكُنْ كَذَا عَلَى الْمُسَامَحَةِ وَالْمُسَاهَلَةِ فِي الْكَلَامِ، وَإِنَّمَا يُرِيدُونَ أَنَّ فُلَانًا لَمْ يَفْعَلْ كَذَا عِلْمِي، وَإِنَّ كَذَا لَمْ يَكُنْ عِلْمِي، وَابْنُ عُمَرَ إِنَّمَا أَرَادَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي الضُّحَى إِلَّا أَنْ يَقْدَمَ مِنْ غَيْبَةٍ أَيْ لَمْ أَرَهُ صَلَّى، وَلَمْ يُخْبِرْنِي ثِقَةٌ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي الضُّحَى إِلَّا أَنْ يَقْدَمَ مِنْ غَيْبَةٍ، وَهَكَذَا خَبَرُ عَائِشَةَ ﵂، رَوَاهُ كَهْمَسُ بْنُ الْحَسَنِ وَالْجُرَيْرِيُّ جَمِيعاً عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: لَا إِلَّا أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذِهِ اللَّفْظَةُ الَّتِي فِي خَبَرِ كَهْمَسٍ وَالْجُرَيْرِيِّ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّهَا تَكَلَّمَتْ بِهَا عَلَى الْمُسَامَحَةِ وَالْمُسَاهَلَةِ، وَإِنَّمَا مَعْنَاهَا مَا قَالُوا فِي خَبَرِ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ صَلَّى صَلَاةَ الضُّحَى فِي غَيْرِ الْيَوْمِ الَّذِي كَانَ يَقْدَمُ فِيهِ مِنَ الْغَيْبَةِ، سَأَذْكُرُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ فِي مَوْضِعِهَا مِنْ هَذَا الْكِتَابِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَالْخَبَرُ الَّذِي يَجِبُ قَبُولُهُ، وَيُحْكَمُ بِهِ هُوَ خَبَرُ مَنْ أَعْلَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الضُّحَى لَا خَبَرُ مَنْ قَالَ: إِنَّهُ لَمْ يُصَلِّ.

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە نوێژی چێشتەنگاو بکات مەگەر لە سەفەرێك بگەڕایەتەوە، دوو ڕکات نوێژی دەکرد.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ﵄ لەو شێوازەیە کە لە چەند جێگایەك لە کتێبەکەماندا باسم کردووە، هەواڵدەر و شایەتیدەر کە پێویستە هەواڵەکەی و شایەتییەکەی وەربگیرێ ئەو کەسەیە هەواڵ بە بوونی شتێك بدات کە بینیوەتی و بیستوویەتی و بوونی هەبێت، نەك ئەو کەسەی شتەکە ڕەت دەکاتەوە، بێگومان زانایان دەڵێن: (لَمْ يَفْعَلْ فُلَانٌ كَذَا)، واتە: فڵانە کەس ئەو شتەی نەکرد. وە (وَلَمْ يَكُنْ كَذَا)، واتە: شتەکە نەبووە. لەسەر شێوەی ئاسانکارییە لە قسەکردندا، بەڵکوو مەبەستیان ئەوەیە بە پێی زانیاری ئێمە فڵانە کەس فڵان شتی نەکردووە، بێگومان**

---

(١) صحيح.

زانیاریم لەسەر ئەو شتە نییە، ئیبنو عومەریش ﷺ لە وتەکەیدا: (پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەکردووە مەگەر لە سەفەر بگەڕایەتەوە)، واتە: نەمبینوە ئەو نوێژی کردبێت. وە کەسێکی متمانەپێکراویش هەواڵی پێ نەداوم کە ئەو نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد مەگەر لە سەفەر بگەڕایەتەوە، بەهەمان شێوە فەرموودەکەی عائیشە ﷺ کە کەهمەسی کوڕی حەسەن و جوەریری گێڕاویانەتەوە هەموویان لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە دەڵێ: بە عائیشەم ﷺ وت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نەخێر مەگەر لە سەفەرێك بهاتایەتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیەی کە لە فەرموودەکەی کەهمەس و جوڕەیری هاتووە لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاندووە دایکی ئیمانداران ئەو قسەی کرد لەسەر چاوپۆشی و ئاسانکاری، بەڵکوو ماناکەی ئەوەیە کە لە فەرموودەی خالیدی حەزاء هاتووە: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە نوێژ بکات، بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە لەیەکم دایەوە و ڕاڤەم کرد ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردووە لە جگە لەو ڕۆژەی لە سەفەر گەڕاوەتەوە، جا ئەو فەرموودانە لە جێگای خۆیاندا باس دەکەم لەم کتێبەمدا بە ویستی خوا، جا ئەو فەرموودەی کە پێویستە وەربگیرێ و حوکمی پێ بکرێ بریتییە لە فەرموودەی ئەو کەسەی ڕایگەیاندووە پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردووە نەك ئەو کەسەی وتوویەتی: ئەو نوێژی چێشتەنگاوی نەکردووە.

## بَابُ صَلَاةِ الضُّحَى فِي الْجَمَاعَةِ «وَفِيهِ بَيَانُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ صَلَّى الضُّحَى فِي غَيْرِ الْيَوْمِ الَّذِي كَانَ يَقْدَمُ فِيهِ مِنَ الْغَيْبَةِ»

**١٢٣١-** عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي بَيْتِهِ سُبْحَةَ الضُّحَى، فَقَامُوا وَرَاءَهُ فَصَلَّوْا فِي بَيْتِهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي بَيْتِهِ يَعْنِي بَيْتَ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ.

---

(١) صحيح.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو بە کۆمەڵ، ڕوونکردنەوەشی تێدایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کرد لە غەیری ئەو ڕۆژەی لە سەفەر دەگەڕایەوە

واتە: عیتبانی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەکەیدا نوێژی چێشتەنگاوی کرد، ئەوانیش لە پشتیەوە وەستان و لە ماڵەکەیدا نوێژیان کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: (فِي بَيْتِهِ)، واتە: ماڵی عیتبانی کوڕی مالیك.

## بَابُ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ الضُّحَى «وَهَذَا مِنَ الْبَابِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ الْحُكْمَ لِلْمُخْبِرِ الَّذِي يُخْبِرُ بِكَوْنِ الشَّيْءِ، لَا مَنْ يَنْفِي الشَّيْءَ»

**١٢٣٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ عِنْدِي مُخْتَصَرٌ مِنْ حَدِيثِ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ: سَأَلْنَا عَلِيًّا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ قَالَ فِي الْخَبَرِ: إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَهُنَا عِنْدَ الْعَصْرِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَهَذِهِ صَلَاةُ الضُّحَى.

## باسی نوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی چێشتەنگاو، ئەمە لەو بەشەیە، کە پێشتر باسم کرد حوکم بۆ ئەو کەسەیە کە هەواڵ دەدات بە بوونی شتەکە نەك ئەو کەسەی شتەکە ڕەت دەکاتەوە

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەلای من کورتکراوەی فەرموودەکەی عاصمی کوڕی زومڕەیە: پرسیارمان لە عەلی ﷺ کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێشتر باسم کرد، لە فەرموودەکەدا وتی: کاتێ خۆر لێرەوە بەرز بۆیەوە ئاماژەی بە خۆرهەڵات کرد، وەکوو چۆن لێرەوە بەرزبۆتەوە ئاماژەی بۆ خۆرئاوا کرد لە کاتی عەسردا، دوو ڕکات نوێژی دەکرد، ئەوە نوێژی چیشتەنگاوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ صَلَاةِ الضُّحَى فِي السَّفَرِ «وَهُوَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ صَلَّى الضُّحَى فِي غَيْرِ الْيَوْمِ الَّذِي كَانَ يَقْدَمُ فِيهِ مِنْ غَيْبَةٍ»

**١٢٣٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ قَالَ: مَا أَخْبَرَنِي أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى إِلَّا أُمُّ هَانِئٍ، فَإِنَّهَا حَدَّثَتْ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، فَاغْتَسَلَ وَصَلَّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ مَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلَاةً أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ[(١)].

## باسی نوێژی چێشتەنگاو لە سەفەردا، ئەوەش لەو شێوازانەیە کە پێشتر باسم کرد پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کرد لە غەیری ئەو ڕۆژەی لە سەفەر دەگەڕایەوە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: هیچ کەس هەواڵی پێ نەداوم کە بینیبێتی پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد جگە لە دایکی هانی نەبێت، بێگومان ئەو باسی کرد: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە، دواتر خۆی شۆرد و هەشت ڕکات نوێژی کرد، نەمبینیوە نوێژێك بکات کورتتر بێت لەو نوێژانە، بەڵام ڕکووع و سوژدەی بەتەواوی دەبرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ مِنَ الثَّمَانِ رَكَعَاتِ اللَّاتِي صَلَّاهُنَّ صَلَاةَ الضُّحَى

**١٢٣٤-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحَى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ كَانَ يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ[(٢)].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو دوو ڕکاتێکی هەشت ڕکاتەکەی نوێژی چێشتەنگاودا کە کردی سەلامی دەدایەوە

واتە: دایکی هانیئی کچی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد لە هەموو دوو ڕکاتێکدا سەلامی دەدایەوە.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الْقِيَامِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ فِي صَلَاةِ الضُّحَى

**١٢٣٥-** عَنْ عُبيدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ أَنَّ أَبَاهُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِث قَالَ: سَأَلْتُ وَحَرَصْتُ عَلَى أَنْ أَجِدَ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ يُخْبِرُنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَبَّحَ سُبْحَةَ الضُّحَى، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُخْبِرُنِي عَنْ ذَلِكَ إِلَّا أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ ﵂ أَخْبَرَتْنِي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى بَعْدَمَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ يَوْمَ الْفَتْحِ فَأَمَرَ بِثَوْبٍ فَسُتِرَ عَلَيْهِ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، لَا أَدْرِي أَقِيَامُهُ فِيهَا أَطْوَلُ أَمْ رُكُوعُهُ أَمْ سُجُودُهُ، كُلُّ ذَلِكَ مُتَقَارِبٌ، قَالَتْ: فَلَمْ أَرَهُ سَبَّحَهَا قَبْلُ وَلَا بَعْدُ[١].

## باسی یەکسانی ماوەی نێوان ڕاوەستان و ڕکووع و سوژدە لە نوێژی چێشتەنگاودا

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەل دەگێڕێتەوە، باوکی عەبدوڵای کوڕی حاریس وتی: پرسیارم کرد و سوور بووم لەسەر ئەوەی کەسێك بدۆزمەوە هەواڵم پێبدات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردبێت، کەسم نەدۆزیەوە هەواڵم پێبدات لەوبارەیەوە جگە لە دایکی هانیئی کچی ئەبو تالیب نەبێ ئەو هەواڵی پێ دام: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە هات دوای ئەوەی خۆر بەرز بووبوویەوە فەرمانی کرد پۆشاکێکی بۆ بکرێ بە پەردە و بیپۆشێت، ئینجا خۆی شۆرد، پاشان هەستا هەشت ڕکاتی کرد نازانم وەستانی تیایدا درێژتر بوو یان ڕکووعی یان سوژدەی، هەموو ئەوانە لە یەکدییەوە نزیك بوون، دایکی هانی وتی: نە پێشتر (پێغەمبەرم ﷺ) بینیبوو ئەو نوێژە بکات، نە دوای ئەوەیش.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ قَاعِدًا

## بَابُ تَقْصِيرِ أَجْرِ صَلَاةِ الْقَاعِدِ عَنْ صَلَاةِ الْقَائِمِ فِي التَّطَوُّعِ

**١٢٣٦-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ قَاعِدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الْقَائِمِ أَفْضَلُ وَصَلَاةُ الْقَاعِدِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةِ الْقَائِمِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە پاداشتەکەی کەمترە لەوەی بەپێوە دەیکات

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی کەسێك بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نوێژ بەپێوە چاکترە، وە نوێژ بە دانیشتنەوە پاداشتەکەی نیوەی نوێژی کەسێکە بە پێوە نوێژ بکات.

## بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ اللَّهُ ﷻ خَصَّ بِهِ نَبِيَّهُ الْمُصْطَفَى ﷺ فِي الصَّلَاةِ قَاعِدًا «فَجَعَلَ صَلَاتَهُ قَاعِدًا كَالصَّلَاةِ قَائِمًا فِي الْأَجْرِ»

**١٢٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي جَالِسَاً قُلْتُ حُدِّثْتُ أَنَّكَ تَقُولُ: إِنَّ صَلَاةَ الْجَالِسِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةَ الْقَائِمِ، قَالَ: «أَجَلْ، وَلَكِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ»(١).

## باسی ئەو پاداشتەی کە خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ تایبەت کردووە، ئەویش بریتیە لەوەی پاداشتی نوێژکردنی بە دانیشتنەوە وەکو (پاداشتی) نوێژکردن بەپێوە هەژمار کردووە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی دەکرد بەدانیشتنەوە، وتم: بۆم باس کراوە تۆ فەرمووتە: نوێژ بە دانیشتنەوە بەقەد نیوەی نوێژی کەسێکە بەپێوە نوێژ بکات، فەرمووی: بەڵێ، بەڵام من وەکوو هیچ یەکێك لە ئێوە نیم.

## بَابُ التَّرَبُّعِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا صَلَّى الْمَرْءُ جَالِسًا

**١٢٣٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي مُتَرَبِّعَاً(٢).

## باسی دانیشتن بە چوارمشقی لە نوێژدا ئەگەر بەندە بە دانیشتنەوە نوێژی کرد

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واته: عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بە چوارمشقی نوێژی دەکرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ جَالِسًا «وَإِنْ لَمْ يَكُنْ بِالْمَرْءِ عِلَّةٌ مِنْ مَرَضٍ لَا يَقْدِرُ عَلَى الصَّلَاةِ قَائِمًا»

**١٢٣٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَمُتْ حَتَّى كَانَ مِنْ أَكْثَرِ صَلَاتِهِ جَالِسًا[١].

## باسی ڕێگە دراوە بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکرێ، ئەگەرچی بەندە نەخۆشیش نەبێ و بەهۆیەوە نەتوانێ بەپێوە نوێژ بکات

واته: عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی نەکرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يُكْثِرُ مِنَ التَّطَوُّعِ جَالِسًا وَإِنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ مَرَضٌ بَعْدَمَا أَسَنَّ وَحَطَمَهُ النَّاسُ

**١٢٤٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَن أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَمَا دَخَلَ فِي السِّنِّ، فَإِذَا بَقِيَ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهَا، ثُمَّ رَكَعَ[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کەوتە نێو ساڵەوە و خەڵکی شەکەتیان کرد، زۆر بەدانیشتەوە نوێژی سوننەتی دەکرد، ئەگەرچی نەخۆشیش نەبووایە

واته: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کەوتە ناو ساڵەوە بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، ئەگەر لە سوڕەتەکە سی ئایەت یان چل ئایەتی بمایە هەڵدەستا دەیخوێند، پاشان دەچووە ڕکووع.

**١٢٤١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي قَاعِدًا؟ قَالَتْ: بَعْدَمَا حَطَمَهُ النَّاسُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد بەدانیشتنەوە؟ وتی: (بەڵێ)، دوای ئەوەی خەڵکی شەکەتیان کرد.

## بَابُ التَّرَتُّلِ فِي الْقِرَاءَةِ إِذَا صَلَّى الْمَرْءُ جَالِسًا

**١٢٤٢-** عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ بِعَامٍ، فَكَانَ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ جَالِسًا، فَيَقْرَأُ السُّورَةَ فَيُرَتِّلُهَا، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا[1].

## باسی ئەگەر بەندە بە دانیشتنەوە نوێژی کرد قورئان لەسەرخۆ بخوێنێ

واتە: حەفصە ﵂ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیبوو بە دانیشتنەوە نوێژی چێشتەنگاو بکات، تا ساڵێك پێش مردنی، ئەوکات بە دانیشتنەوە نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، سوڕەتێکی دەخوێند بە لەسەرخۆیی ماوەی خوێندنەوەی درێژتر بوو لە خوێندنی سوڕەتێکی درێژتر لەو (ئەگەر بەبێ لەسەرخۆیی بخوێنرێ).

## بَابُ إِبَاحَةِ الْجُلُوسِ لِبَعْضِ الْقِرَاءَةِ وَالْقِيَامِ لِبَعْضٍ فِي الرَّكْعَةِ الْوَاحِدَةِ

**١٢٤٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي جَالِسًا، وَكَانَ إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهَا ثُمَّ رَكَعَ[2].

## باسی ڕێگەدان بە نوێژخوێن لە یەك ڕکاتدا بە دانیشتنەوە بەشێك لە قورئان و بەشەکەی دیکەش بەپێوە بخوێنێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، ئەگەر لە سوڕەتەکە سی ئایەت یان چل ئایەتی بمایە هەڵدەستا دەیخوێند، پاشان دەچووە ڕکووع.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٢٤٤-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ الْإِنْسَانُ أَرْبَعِينَ آيَةً[١].

**واتە: ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمرە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دانیشتنەوە لەنێو نوێژ قوڕئانی دەخوێند، جا ئەگەر بیویستایە بچێتە ڕكووع هەڵدەستا بە ئەندازەی ئەوەی مرۆڤ چل ئایەت بخوێنێ بە پێوە دەمایەوە.**

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي صِفَةِ صَلَاتِهِ جَالِسًا «حَسِبَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ أَنَّهُ خِلَافُ هَذَا الْخَبَرِ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ»

**١٢٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ التَّطَوُّعِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِمًا، وَلَيْلًا طَوِيلًا جَالِسًا، فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَاعِدٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ[٢].

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە، هەندێ لە زانایان وایان زانیوە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە كە باسمان كرد

**واتە: عەبدوڵای كوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم كرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: بەدرێژایی شەو بەپێوە نوێژی دەكرد، وە بە درێژایی شەو بەدانیشتنەوە، جا ئەگەر بەپێوە قوڕئانی بخوێندایە بەپێوە ڕكووع و سوژدەی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە قوڕئانی بخوێندایە بە دانیشتنەوە ڕكووع و سوژدەی دەبرد.**

**١٢٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِمًا، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا رَكَعَ قَائِمًا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرێژایی شەو بەپێوە نوێژی دەکرد، ئەگەر بەپێوە نوێژی بکردایە هەر بەپێوە ڕکووعی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی بکردایە بە دانیشتنەوە ڕکووعی دەبرد.

١٢٤٧- عَنْ أَبِي خَالِدٍ حَدَّثَنَا حُمَيدٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ عَن عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهُ سَأَلَهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِمًا، فَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا رَكَعَ قَائِمًا. فَقَالَ أَبُو خَالِدٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ هِشَامَ بْنَ عُرْوَةَ، فَقَالَ: كَذَبَ حُمَيْدٌ وَكَذَبَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَقِيقٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا قَطُّ حَتَّى دَخَلَ فِي السِّنِّ، فَكَانَ يُقْرَأُ السُّوَرَ فَإِذَا بَقِيَ مِنْهَا آيَاتٌ قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَنْكَرَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ خَبَرَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، إِذْ ظَاهِرُهُ كَانَ عِنْدَهُ خِلَافَ خَبَرِهِ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، وَهُوَ عِنْدِي غَيْرُ مُخَالِفٍ لِخَبَرِهِ؛ لِأَنَّ فِي رِوَايَةِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ: فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَاعِدٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَعَلَى هَذِهِ اللَّفْظَةِ هَذَا الْخَبَرُ لَيْسَ بِخِلَافِ خَبَرِ عُرْوَةَ وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂؛ لِأَنَّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرَهَا خَالِدٌ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّهُ كَانَ إِذَا كَانَ جَمِيعُ الْقِرَاءَةِ قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا، وَإِذَا كَانَ جَمِيعُ الْقِرَاءَةِ قَائِمًا رَكَعَ قَائِمًا، وَلَمْ يَذْكُرْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَقِيقٍ صِفَةَ صَلَاتِهِ إِذَا كَانَ بَعْضُ الْقِرَاءَةِ قَائِمًا، وَبَعْضُهَا قَاعِدًا، وَإِنَّمَا ذَكَرَهُ عُرْوَةُ وَأَبُو سَلَمَةَ وَعَمْرَةُ عَنْ عَائِشَةَ إِذَا كَانَتِ الْقِرَاءَةُ فِي الْحَالَتَيْنِ جَمِيعًا بَعْضُهَا قَائِمًا وَبَعْضُهَا قَاعِدًا، فَذَكَرَ أَنَّهُ كَانَ يَرْكَعُ وَهُوَ قَائِمٌ إِذَا كَانَتْ قِرَاءَتُهُ فِي الْحَالَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، وَلَمْ يَذْكُرْ عُرْوَةُ، وَلَا أَبُو سَلَمَةَ، وَلَا عَمْرَةُ كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْتَتِحُ هَذِهِ الصَّلَاةَ الَّتِي يَقْرَأُ فِيهَا قَائِمًا وَقَاعِدًا وَيَرْكَعُ قَائِمًا، وَذَكَرَ ابْنُ سِيرِينَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّهُ كَانَ يَفْتَتِحُهَا قَائِمًا.

واتە: ئەبو خالید دەگێڕێتەوە، حومەید بۆی باس کردین، لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە، ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدانیشتنەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرێژایی شەو بەپێوە نوێژی دەکرد، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی بکردایە بە دانیشتنەوە ڕکووعی دەبرد، ئەگەر بەپێوە نوێژی بکردایە هەر بەپێوە ڕکووعی دەبرد. ئەبو خالید وتی: بۆ هیشامی کوڕی عورووەم باس

---

(١) صحيح.

کرد وتی: حومەید و عەبدوڵای کوڕی شەقیق درۆیان کرد، باوکم بۆی باس کردم لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی کەوتە نێو ساڵەوە بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، سوڕەتی تیایدا دەخوێند ئەگەر چەند ئایەتێکی بمایە (سی یان چل ئایەت) هەڵدەستا بەپێوە دەیخوێندن، پاشان دەچووە ڕکووع).

ئەبو بەکر دەڵێ: هیشامی کوڕی عوروە نکووڵی فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی شەقیقی کردووە، چونکە ڕواڵەتەکەی لەلای ئەو پێچەوانەی فەرموودەکەی باوکیەتی لە عائیشەوە ﵂، بەڵام لەلای من پێچەوانەی فەرموودەکەی نییە، چونکە لە ریوایەتەکەی خالید لە عەبدوڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە: ئەگەر بەپێوە قورئانی بخوێندایە بەپێوە ڕکووع و سوژدەی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە قورئانی بخوێندایە بە دانیشتنەوە ڕکووع و سوژدەی دەبرد. جا بەپێی ئەم دەستەواژە ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەکەی عوروە (فەرموودەی ژمارە ١٢٤٣) و عەمرە (فەرموودەی ژمارە ١٢٤٤) نییە لە عائیشەوە ﵂، چونکە ئەم دەستەواژەی کە خالید باسی کردووە: ئەگەر هەموو قورئانخوێندنەکە بە دانیشتنەوە بووایە بە دانیشتنەوە ڕکووعی دەبرد، وە ئەگەر هەموو قورئانخوێندنەکە بەپێوە بووایە بەپێوە ڕکووعی دەبرد، عەبدوڵای کوڕی شەقیق باسی چۆنیەتی نوێژەکەی نەکردووە، ئەگەر هەندێ لە قورئانخوێندنەکە بەپێوە بوو، وە هەندێکی بەدانیشتنەوە، بەڵکوو عوروە و ئەبو سەلەمە و عەمرە لە عائیشەوە باسیان کردووە، ئەگەر قورئانخوێندنەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەندێکی بەپێوە بوو هەندێکیشی بەدانیشتنەوە، باسی کردووە ئەو بەپێوە ڕکووع دەبات ئەگەر قورئانخوێندنەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بوو (واتە: لە ڕاوەستان و دانیشتن)، وە نە عوروە و نە ئەبو سەلەمە و نە عەمرە باسی ئەوەیان نەکردووە پێغەمبەر ﷺ چۆن نوێژی دادەبەست (واتە: بە دانیشتنەوە نوێژی دادەبەست یان بەپێوە)، کە بەپێوە و بە دانیشتنەوە قورئانی تێدا دەخوێند، وە بەپێوە ڕکووعی دەبرد، بەڵام ئیبنو سیرین باسی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە ﵂ پێغەمبەر ﷺ بەپێوە نوێژی دادەبەست.

**١٢٤٨-** عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ الْعُقَيْلِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي قَائِمًا وَقَاعِدًا، فَإِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَائِماً رَكَعَ قَائِمًا، وَإِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا[1].

---

(١) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ يُبَيِّنُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ كُلَّهَا، فَعَلَى هَذَا الْخَبَرِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَائِمًا ثُمَّ قَعَدَ وَقَرَأَ انْبَغَى لَهُ أَنْ يَقُومَ فَيَقْرَأُ بَعْضَ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ يَرْكَعُ وَهُوَ قَائِمٌ، فَإِذَا افْتَتَحَ صَلَاتَهُ قَاعِدًا قَرَأَ جَمِيعَ قِرَاءَتِهِ وَهُوَ قَاعِدٌ، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ قَاعِدٌ اتِّبَاعًا لِفِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ.

واتە: ئیبنو سیرین دەگێڕێتەوە لە عەبدولڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە ﵂ پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە نوێژی دەکرد و بەدانیشتنیشەوە، ئەگەر بەپێوە نوێژی دابەستبایە بەپێوە ڕکووعی دەبرد، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی دابەستبایە بە دانیشتنەوە ڕکووعی دەبرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە هەموو فەرموودەکان ڕوون دەکاتەوە، جا لەسەر ئەم فەرموودەیە ئەگەر بەپێوە نوێژی دابەست پاشان دانیشت و قوڕئانی خوێند دەبێ دواتر هەستێ بەپێوە هەندێ قوڕئان بخوێنێ پاشان بەپێوە ڕکووع ببات، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی دابەست قوڕئان خوێندنەکەی بە دانیشتنەوە خوێند، پاشان بە دانیشتنەوە ڕکووع دەبات وەکوو شوێنکەوتنی کرداری پێغەمبەر ﷺ.

## بَابُ تَقْصِيرِ أَجْرِ صَلَاةِ الْمُضْطَجِعِ عَنْ أَجْرِ صَلَاةِ الْقَاعِدِ

١٢٤٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ النَّائِمِ عَلَى نِصْفِ صَلَاةِ الْقَاعِدِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ أَعْلَمْتُ قَبْلُ أَنَّ الْعَرَبَ تُوقِعُ اسْمَ النَّائِمِ عَلَى الْمُضْطَجِعِ وَعَلَى النَّائِمِ الزَّائِلِ الْعَقْلِ بِالنَّوْمِ، وَإِنَّمَا أَرَادَ الْمُصْطَفَى ﷺ بِقَوْلِهِ، وَصَلَاةُ النَّائِمِ الْمُضْطَجِعَ لَا زَائِلَ الْعَقْلِ بِالنَّوْمِ، إِذْ زَائِلُ الْعَقْلِ بِالنَّوْمِ لَا يَعْقِلُ الصَّلَاةَ فِي وَقْتِ زَوَالِ الْعَقْلِ.

## باسی ئەو کەسەی بەڕاکشاوی نوێژ دەکات، پاداشتەکەی کەمترە لەوکەسەی بەپێوە نوێژ دەکات

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی کەسێك بەڕاکشانەوە نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی هەیە بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێشتر باسم کرد عەرەب ناوی (النَّائِم) خەوتوو بەکار دەهێنێ بۆ (الْمُضْطَجِع) ڕاکشاو، وە بۆ ئەو کەسەش خەوتووە و عەقڵی لای خۆی نییە،

---

(١) صحيح.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی: (صَلَاةُ النَّائِمِ)، مەبەستی پێی ڕاکشاوە نەك خەوتوویەك کە عەقڵی لەدەست داوە، چونکە ئەو کەسەی بە هۆی خەوتنەوە عەقڵی لەدەست دەدات، ناتوانێ نوێژ بکات لە کاتی لە دەستدانی عەقڵی.

## بَابُ صِفَةِ صَلَاةِ الْمُضْطَجِعِ خِلَافَ مَا يَتَوَهَّمُهُ الْعَامَّةُ «إِذِ الْعَامَّةُ إِنَّمَا تَأْمُرُ الْمُصَلِّي مُضْطَجِعًا أَنْ يُصَلِّيَ مُسْتَلْقِيًا عَلَى قَفَاهُ، وَالنَّبِيُّ ﷺ أَمَرَ الْمُصَلِّي مُضْطَجِعًا أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى جَنْبٍ»

**١٢٥٠-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بِي الْبَاصُورُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَجَالِسًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ»[(١)].

## باسی چۆنیەتی نوێژی ڕاکشاو، پێچەوانەی ئەوەی خەڵکی خەیاڵی دەکەن، چونکە خەڵکی بەگشتی فەرمان بە نوێژخوێن دەکەن بەڕاکشانەوە لەسەر پشتەملی نوێژ بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە نوێژخوێن بەڕاکشانەوە نوێژ بکات لەسەر تەنیشتی

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: من مایەسیرم هەبوو پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی چۆنیەتی نوێژکردن؟ فەرمووی: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی ئەوە بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتوانی لەسەر تەنیشت.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ

## بَابُ التَّطَوُّعِ بِالنَّهَارِ لِلْمُسَافِرِ خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ كَرِهَ التَّطَوُّعَ لِلْمُسَافِرِ بِالنَّهَارِ

**١٢٥١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ الضُّحَى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ[(٢)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی نوێژی سوننەت لە سەفەر یان گەشتدا

### باسی نوێژی سوننەت بۆ گەشتیار، بە پێچەوانەی مەزهەبی ئەو کەسەی پێی باش نییە گەشتیار بە ڕۆژ نوێژی سوننەت بکات

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی دایکی هانیئ ﷺ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد.

### بَابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ قَبْلَ صَلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ

**١٢٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَعْرَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَأْخُذْ كُلُّ إِنْسَانٍ بِرَأْسِ رَاحِلَتِهِ، فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ فَغَفَلْنَا، فَدَعَا بِالْمَاءِ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَصَلَّى الْغَدَاةَ»[1].

### باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە گەشتدا پێش نوێژی فەرز

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەودا دابەزین بە مەبەستی پشوودان، جا بەخەبەر نەهاتینەوە تا خۆر هەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هەر کەس ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت، چونکە ئەم جێگایەی ئێمە بۆی دابەزین شەیتانی تێدایە بێئاگای کردین، (ئێمەش ئەوەمان کرد)، دواتر داوای کرد ئاوی بۆ بهێنرێ و دەستنوێژی گرت، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان قامەت بۆ نوێژ کرا و نوێژی بەیانی کرد.

**١٢٥٣-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَافَرْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثَمَانِيةَ عَشَرَ سَفَرًا، فَلَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتْرُكُ رَكْعَتَيْنِ حِينَ تَزِيغُ الشَّمْسُ، فَلَمْ أَرَهُ يَتْرُكُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ[2].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەژدە سەفەرم کرد، نەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ واز لە دوو ڕکات بهێنێ کاتێ خۆر دەترازا، وە نەمبینی (پێغەمبەر ﷺ) واز لە دوو ڕکات بهێنێ پێش نیوەڕۆ.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**١٢٥٤-** قَدْ رَوَى الْكُوفِيُّونَ أُعْجُوبَةً عَنِ ابْنِ عُمَرَ إِنِّي خَائِفٌ أَنْ لَا تَجُوزَ رِوَايَتُهَا إِلَّا لِتَبِينَ عِلَّتُهَا. لَا أَنَّهَا أُعْجُوبَةٌ فِي الْمَتْنِ، إِلَّا أَنَّهَا أُعْجُوبَةٌ فِي الْإِسْنَادِ فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ، رَوَوْا عَنْ نَافِعٍ وَعَطِيَّةَ بْنِ سَعْدٍ الْعَوْفِيِّ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ فِي الْحَضَرِ الظُّهْرَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالْعَصْرَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ لَيْسَ بَعْدَهَا شَيْءٌ، وَالْمَغْرِبَ ثَلَاثًا، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالْعِشَاءَ أَرْبَعًا، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالْغَدَاةَ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَهُ فِي السَّفَرِ، الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَلَيْسَ بَعْدَهَا شَيْءٌ، وَالْمَغْرِبَ ثَلَاثًا، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: هِيَ وِتْرُ النَّهَارِ لَا يَنْقُصُ فِي حَضَرٍ وَلَا سَفَرٍ، وَالْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالْغَدَاةَ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَهَا رَكْعَتَيْنِ. وَهَذَا خَبَرٌ لَا يَخْفَى عَلَى عَالِمٍ بِالْحَدِيثِ أَنَّ هَذَا غَلَطٌ وَسَهْوٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَدْ كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَحِمَهُ اللَّهُ يُنْكِرُ التَّطَوُّعَ فِي السَّفَرِ، وَيَقُولُ: لَوْ كُنْتُ مُتَطَوِّعًا مَا بَالَيْتُ أَنْ أُتِمَّ الصَّلَاةَ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَا يُصَلِّي قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا فِي السَّفَرِ[1].

واتە: لە ڕاستییدا خەڵکی کوفە شتێکی سەرسوڕهێنەریان لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە من دەترسم کە دروست نەبێت لێیەوە بیگێڕدرێتەوە مەگەر لەگەڵ ڕوونکردنەوەی عیللەتەکەی، ئەوە تەنها جێگای سەرسوڕمان نییە لە ڕووی مەتنی فەرموودەکە، بەڵکوو جێگای سەرسوڕمانە لە ڕووی سەنەدیشەوە لەم چیرۆکەدا هاتووە، لە نافیع و عەتیەی کوڕی سەعدی عەوفییەوە گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد لە نیشتەجێ و گەشتدا، لە نیشتەجێ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵی کرد، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، چوار ڕکات نوێژی عەسریش لە دوایەوە نوێژ نەبوو، سێ ڕکات نوێژی ئێوارەیش، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، چوار ڕکات نوێژی عیشایش، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، دوو ڕکاتی بەیانیش، دوو ڕکاتیش لەپێشیەوە، لە گەشتیشدا نوێژم لەگەڵی کرد، نیوەڕۆ دوو ڕکات، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، عەسریش دوو ڕکات لەدوای نوێژ نییە، ئێوارەیش سێ ڕکات، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، وتی: نوێژی ئێوارە ویتری ڕۆژە نە لە نیشتەجێ نە لە گەشت کەم ناکات، عیشایش دوو ڕکاتە، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، بەیانیش دوو ڕکاتە، دوو ڕکاتیش لەپێشەوەی. شتێکی شاراوە نییە لەلای زانای فەرموودەناس ئەم فەرموودەیە بەهەڵە لە ئیبنو عومەر گێڕدراوەتەوە، چونکە ئیبنو عومەر ﷺ نکووڵی نوێژی سوننەت

---

(١) إسناده ضعيف.

دەکات لە گەشتدا، دەڵێ: من ئەگەر نوێژی سوننەتم بکردایە لە گەشت ئەوە نوێژە فەرزەکانیشم بەتەواوی دەکرد و کورتم نەدەکردنەوە، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە گەشتدا نە لەپێشەوەی نوێژە فەرزەکان نوێژی سوننەتی دەکرد نە لەدوایانەوە.

**١٢٥٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَا يُصَلِّي قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا فِي السَّفَرِ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە گەشتدا نە لەپێشەوەی نوێژە فەرزەکان نوێژی سوننەتی دەکرد نە لەدوایانەوە.

**١٢٥٦-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُرَاقَةَ، أَنَّهُ رَأَى حَفْصَ بْنَ عَاصِمٍ يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ وَمَعَهُمْ فِي ذَلِكَ السَّفَرِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﵄، فَقِيلَ: إِنَّ خَالَكَ يَنْهَى عَنْ هَذَا، فَسَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَا يَصْنَعُ ذَلِكَ، لَا يُصَلِّي قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَا بَعْدَهَا، قُلْتُ: أُصَلِّي بِاللَّيْلِ؟ فَقَالَ: «صَلِّ بِاللَّيْلِ مَا بَدَا لَكَ»[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سوڕاقە دەگێڕێتەوە، ئەو حەفصی کوڕی عاصمی بینی لە گەشتێکدا نوێژی سوننەتی دەکرد، لەو گەشتەشدا عەبدوڵای کوڕی عومەریان ﵄ لەگەڵ بوو، وترا: خاڵۆت نەهی دەکات لەو نوێژە، منیش پرسیارم لە ئیبنو عومەر کرد لەو بارەوەیەوە، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئەوەی نەدەکرد، وە پێش نوێژ و دوای نوێژ، سوننەتی نەدەکرد، وتم: ئەی شەونوێژ بکەم؟ وتی: هەرچەند دەتوانی شەونوێژ بکە.

**١٢٥٧-** عَنْ عِيسَى بْنِ حَفْصِ ابْنِ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ ﵄ فِي سَفَرٍ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى طِنْفِسَةٍ لَهُ، فَرَأَى قَوْمًا يُسَبِّحُونَ - يَعْنِي يُصَلُّونَ - قَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُصَلِّيًا قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا لَأَتْمَمْتُهَا، صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى قُبِضَ، فَكَانَ لَا يَزِيدُ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ كَذَلِكَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَابْنُ عُمَرَ رَحِمَهُ اللَّهُ يُنْكَرُ التَّطَوُّعَ فِي السَّفَرِ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ، وَيَقُولُ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لَأَتْمَمْتُ الصَّلَاةَ، فَكَيْفَ يَرَى النَّبِيَّ ﷺ يَتَطَوَّعُ بِرَكْعَتَيْنِ فِي السَّفَرِ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ، ثُمَّ يُنْكِرُ عَلَى مَنْ يَفْعَلُ مَا فَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ.

واتە: عیسای کوڕی حەفصی کوڕی عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: من لەگەڵ ئیبنو عومەر ﷺ بووم لە گەشتێکدا دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕکات نوێژی عەسری کرد، پاشان هەستا ڕۆیشت بۆ لای ڕاخەرەکەی خەڵکێکی بینی نوێژیان دەکرد -واتە: نوێژی سوننەت-، وتی: ئەوانە چی دەکەن؟ وتی: وتم: نوێژی سوننەت دەکەن، وتی: ئەگەر لەپێش فەرزەکە یان لەدوای فەرزەکە نوێژم بکردایە ئەوە فەرزەکەم تەواو دەکرد، هاوەڵی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد تا کۆچی دوایی کرد، دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، هەروەها ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئیبنو عومەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت نکووڵی نوێژی سوننەتی دەکرد لە گەشت لە دوای نوێژە فەرزەکان، وە دەیوت: ئەگەر نوێژی سوننەتم بکردایە فەرزەکەم تەواو دەکرد، ئیدی چۆن پێغەمبەری ﷺ بینیوە دوو ڕکات سوننەتی کردبێت لە گەشتدا دوای نوێژە فەرزەکان لە نوێژی نیوەڕۆ، پاشان نکووڵی ئەوە بکات کەسێك نوێژی سوننەت بکات بەو شێوەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە؟!

**١٢٥٨-** عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لَا يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ سَجْدَةً قَبْلَ صَلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ وَلَا بَعْدَهَا حَتَّى يَقُومَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، وَكَانَ لَا يَتْرُكُ الْقِيَامَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ(١).

واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، سالمی کوڕی عەبدوڵا بۆی باس کردم، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە گەشتدا نوێژی سوننەتی نەدەکرد نە لەپێش نوێژە فەرزەکان و نە لەدوایانەوە تا نیوەی شەو ئینجا هەڵدەستا شەونوێژی دەکرد، وە هەرگیز دەستبەرداری شەونوێژ نەدەبوو لە نیوەی شەودا.

---

(١) صحيح.

**١٢٥٩-** عَنِ حَفْصِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ عَنْ تَرْكِهِ السُّبْحَةَ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ سَبَّحْتُ مَا بَالَيْتُ أَنْ أُتِمَّ الصَّلَاةَ». قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِسَالِمٍ: هَلْ سَأَلْتَ أَنْتَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ عَمَّا سَأَلَهُ عَنْهُ حَفْصُ بْنُ عَاصِمٍ؟ قَالَ سَالِمٌ: لَا، إِنَّا كُنَّا نَهَابُهُ عَنْ بَعْضِ الْمَسْأَلَةِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَخَبَرُ سَالِمٍ وَحَفْصٍ يَدُلَّانِ عَلَى أَنَّ خَبَرَ عَطِيَّةَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَهْمٌ. وَابْنُ أَبِي لَيْلَى وَاهِمٌ فِي جَمْعِهِ بَيْنَ نَافِعٍ وَعَطِيَّةَ فِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ فِي التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ، إِلَّا أَنَّ هَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ إِنَّهُ لَا يَجُوزُ أَنْ يُحْتَجَّ بِالْإِنْكَارِ عَلَى الْإِثْبَاتِ. وَابْنُ عُمَرَ رَحِمَهُ اللَّهُ، وَإِنْ لَمْ يَرَ النَّبِيَّ ﷺ مُتَطَوِّعًا فِي السَّفَرِ، فَقَدْ رَآهُ غَيْرُهُ يُصَلِّي مُتَطَوِّعًا فِي السَّفَرِ، وَالْحُكْمُ لِمَنْ يُخْبِرُ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ لَا لِمَنْ لَمْ يَرَهُ، هَذِهِ مَسْأَلَةٌ قَدْ بَيَّنْتُهَا فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا.

واتە: حەفصی کوڕی عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی وازهێنانی لە نوێژی سوننەت لە گەشتدا، عەبدولا پێی وت: ئەگەر نوێژی سوننەتم بکردایە بەخەیاڵم نەدەهات نوێژەکەم بەتەواوی بکەم. زوهری دەڵێ: بە سالمم وت: ئایا تۆ پرسیارت لە عەبدولای کوڕی عومەر کرد لەوەی کە حەفصی کوڕی عاصم پرسیاری لێکرد؟ سالم وتی: نەخێر، ئێمە لەبەر ڕێز و حورمەتی سامان دەکرد ئەو جۆرە پرسیارەی لێ بکەین.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی سالم و حەفص (فەرموودەی ژمارە: ١٢٥٧- ١٢٥٨) بەڵگەن لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی عەتییە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ هەڵەیە. وە ئیبنو ئەبو لەیلا هەڵەی کردووە لە کۆکردنەوە لە نێوان نافیع و عەتییە لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ﷺ لە نوێژی سوننەت لە گەشتدا، بەڵام ئەمە لەو شێوازەیە کە دەڵێین: دروست نییە بەڵگەی نکوولێکار وەربگیرێ لەسەر چەسپێنراوە، (واتە: دوو کەس یەکێکیان حوکمێکی شەرعی دەچەسپێنێ ئەوی دیکەیان نکوولی دەکات، قسەی ئەوەیان وەردەگیرێ کە چەسپاندوویەتی)، ئیبنو عومەریش ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەگەرچی نەیبینوە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی گەشتکردن نوێژی سوننەتی کردبێت،

---

(١) صحيح.

بێگومان جگە لە ئیبنو عومەر ﷺ بینویەتی پێغەمبەر ﷺ نوێژی سوننەتی کردووە لە کاتی گەشتدا، حوکمیش بۆ ئەوەیە کە هەواڵی داوە پێغەمبەری ﷺ بینیوە، نەك بۆ ئەوەی کە نەیبینیوە نوێژی کردووە، ئەمە بابەتێکە لە چەندین شوێنی کتێبەکەماندا باسم کردووە.

## بَابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ عِنْدَ تَوْدِيعِ الْمَنَازِلِ

**١٢٦٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَنْزِلُ مَنْزِلًا إِلَّا وَدَّعَهُ بِرَكْعَتَيْنِ(١).

## باسی نوێژی سوننەت لە کاتی بەجێهێشتنی ئەو جێگایانەی کە گەشتیار بۆی دادەبەزێ بە مەبەستی پشوودان

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دابەزیایەتە هەر جێگایەك بە مەبەستی پشوودان دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد ئینجا بەجێی دەهێشت.

## بَابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بِاللَّيْلِ فِي السَّفَرِ عَلَى الْأَرْضِ

**١٢٦١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى عَشْرَ رَكَعَاتٍ، وَأَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ صَلَّى بِنَا الصُّبْحَ(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ بِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فِي السَّفَرِ، وَالْأَخْبَارُ الَّتِي رَوَيْنَاهَا فِي كِتَابِ الْكَبِيرُ فِي نَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَنَّهُ صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە شەودا لەسەر زەوی (نەك وڵاخ) لە کاتی گەشت

---

(١) إسناده ضعيف جداً.

(٢) صحيح.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی یەخ دا، پاشان دابەزی بە مەبەستی پشوودان دە ڕکات نوێژی کرد، یەك ڕکات ویتریشی کرد، نوێژەکەی دوو ڕکات دوو ڕکات بوو، پاشان یەك ڕکات ویتری کرد، ئینجا دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کرد، پاشان نوێژی بەیانی بۆ کردین.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ لە گەشت دوو ڕکاتەکەی کردووە، هەروەها ئەو فەرموودانەش کە گێڕاومانەتەوە لە (كِتَابِ الْكَبِيرُ) سەبارەت بە خەوی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵهات، بێگومان ئەو دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی کرد پاشان نوێژی بەیانی.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ عَلَى الدَّوَابِّ

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوِتْرِ عَلَى الرَّاحِلَةِ فِي السَّفَرِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِالْمُصَلِّي الرَّاحِلَةُ «ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ حُكْمَ الْوِتْرِ حُكْمُ الْفَرِيضَةِ، وَأَنَّ الْوِتْرَ عَلَى الرَّاحِلَةِ غَيْرُ جَائِزٍ كَصَلَاةِ الْفَرِيضَةِ»

**١٢٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ(١).

## کۆباسی نوێژە سوننەتەکان لە کاتی گەشتکردن بەسەر پشتی وڵاخەوە

**باسی ڕێگە دراوە بە ویترکردن لە کاتی گەشت لەسەر وشتر، وشترەکە ڕووی نوێژخوێن بکاتە هەر جێگایەك، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە حوکمی ویتر هەمان حوکمی نوێژە فەرزەکانی هەیە، نوێژی ویتر لەسەر پشتی وشتر دروست نییە وەکو چۆن نوێژی فەرز لەسەر پشتی وشتر دروست نییە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وشتر نوێژی دەکرد وشترەکە ڕووی بکردایەتە هەر جێگایەك، ویتریشی لەسەری دەکرد، ئەوەنەبێت نوێژی فەرزی لەسەری نەدەکرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ غَلَطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهِ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ مِمَّنْ زَعَمَ أَنَّ الْوِتْرَ عَلَى الرَّاحِلَةِ غَيْرُ جَائِزٍ

**١٢٦٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي السَّفَرِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، فَإِذَا أَرَادَ الْمَكْتُوبَةَ أَوِ الْوِتْرَ أَنَاخَ فَصَلَّى بِالْأَرْضِ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: تَوَهَّمَ بَعْضُ النَّاسِ أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ دَالٌّ عَلَى خِلَافِ خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ، وَاحْتَجَّ بِهَذَا الْخَبَرِ أَنَّ الْوِتْرَ غَيْرُ جَائِزٍ عَلَى الرَّاحِلَةِ، وَهَذَا غَلَطٌ وَإِغْفَالٌ مِنْ قَائِلِهِ، وَلَيْسَ هَذَا الْخَبَرُ عِنْدَنَا وَلَا عِنْدَ مَنْ يُمَيِّزُ بَيْنَ الْأَخْبَارِ يُضَادُّ خَبَرَ ابْنِ عُمَرَ، بَلِ الْخَبَرَانِ جَمِيعًا مُتَّفِقَانِ مُسْتَعْمَلَانِ، وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَخْبَرَ بِمَا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يَفْعَلُهُ، وَيَجِبُ عَلَى مَنْ عَلِمَ الْخَبَرَيْنِ جَمِيعًا إِجَازَةَ كِلَا الْخَبَرَيْنِ. قَدْ رَأَى ابْنُ عُمَرَ النَّبِيَّ ﷺ يُوتِرُ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَأَدَّى مَا رَأَى، وَرَأَى جَابِرٌ النَّبِيَّ ﷺ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَأَوْتَرَ بِالْأَرْضِ، فَأَدَّى مَا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ، فَجَائِزٌ أَنْ يُوتِرَ الْمَرْءُ عَلَى رَاحِلَتِهِ كَمَا فَعَلَ ﷺ، وَجَائِزٌ أَنْ يُنِيخَ رَاحِلَتَهُ فَيَنْزِلُ فَيُوتِرُ عَلَى الْأَرْضِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ فَعَلَ الْفِعْلَيْنِ جَمِيعًا، وَلَمْ يَزْجُرْ عَنْ أَحَدِهِمَا بَعْدَ فِعْلِهِ، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ. وَلَوْ لَمْ يُوتِرِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْأَرْضِ، وَقَدْ أَوْتَرَ عَلَى الرَّاحِلَةِ كَانَ غَيْرُ جَائِزٍ لِلْمُسَافِرِ الرَّاكِبِ أَنْ يَنْزِلَ فَيُوتِرُ عَلَى الْأَرْضِ، وَلَكِنْ لَمَّا فَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْفِعْلَيْنِ جَمِيعًا، كَانَ الْمُوتِرُ بِالْخِيَارِ فِي السَّفَرِ إِنْ أَحَبَّ أَوْتَرَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَإِنْ شَاءَ نَزَلَ فَأَوْتَرَ عَلَى الْأَرْضِ، وَلَيْسَ شَيْءٌ مِنْ سُنَّتِهِ ﷺ مَهْجُوراً إِذَا أَمْكَنَ اسْتِعْمَالُهُ، وَإِنَّمَا يُتْرَكُ بَعْضُ خَبَرِهِ بِبَعْضٍ إِذَا لَمْ يُمْكِنِ اسْتِعْمَالُهَا جَمِيعاً، وَكَانَ أَحَدُهُمَا يَدْفَعُ الْآخَرَ فِي جَمِيعِ جِهَاتِهِ، فَيَجِبُ حِينَئِذٍ طَلَبُ النَّاسِخِ مِنَ الْخَبَرَيْنِ وَالْمَنْسُوخِ مِنْهُمَا، وَيُسْتَعْمَلُ النَّاسِخُ دُونَ الْمَنْسُوخِ، وَلَوْ جَازَ لِأَحَدٍ أَنْ يَدْفَعَ خَبَرَ ابْنِ عُمَرَ بِخَبَرِ جَابِرٍ كَانَ أَجْوَزَ لِآخَرَ أَنْ يَدْفَعَ خَبَرَ جَابِرٍ بِخَبَرِ ابْنِ عُمَرَ؛ لِأَنَّ أَخْبَارَ ابْنِ عُمَرَ فِي وِتْرِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الرَّاحِلَةِ أَكْثَرُ أَسَانِيدَ، وَأَثْبَتُ، وَأَصَحُّ مِنْ خَبَرِ جَابِرٍ، وَلَكِنْ غَيْرُ جَائِزٍ لِعَالِمٍ أَنْ يَدْفَعَ أَحَدَ هَذَيْنِ الْخَبَرَيْنِ بِالْآخَرِ بَلْ يُسْتَعْمَلَانِ جَمِيعًا عَلَى مَا بَيَّنَّا، وَقَدْ خَرَّجْتُ طُرُقَ خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ.

**باسی فەرموودەیەك ئەو كەسەی كە قووڵ نەبۆتەوە لە زانستی فەرموودە، هەڵەی كردووە لەوەی كە كردوویەتی بە بەڵگەو پێی وایە كە ویتر لەسەر وشتر دروست نییە**

---

(١) صحيح.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا نوێژی دەکردو بەسەر وشترەکەیەوە ڕووی بکردایەتە هەر شوێنێك، جا ئەگەر بیویستایە نوێژی فەڕز یان ویتر بکات، وشترەکەی یەخ ئەدا لەسەر زەوی نوێژی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەندێ لە خەڵکی وا خەیاڵ دەکەن ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ، ئەم فەرموودەی کردووەتە بەڵگە بۆ خۆی کە نوێژی ویتر دروست نییە لەسەر وشتر، بەڕاستی ئەمە هەڵە و بێئاگاییە لە خاوەنەکەیەوە، ئەم فەرموودەیە لەلای ئێمە و لەلای ئەوانەی فەرموودەکان لە یەکدی جیا دەکەنەوە پێچەوانەی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ﷺ نییە، بەڵکوو هەردوو فەرموودەکە ڕێکی یەکدین و کارپێکراون، هەریەك لەو دووانە هەواڵی ئەوەی داوە کە بینیویەتی پێغەمبەر ﷺ دەیکات، وە هەر کەسێك دوو فەرموودەکەی زانی پێویستە کار بە هەردووکیان بکات. ئیبنو عومەر پێغەمبەری ﷺ بینی لەسەر وشترەکەی ویتری کرد، ئەوەی گەیاندووە کە بینیویەتی، جابریش پێغەمبەری ﷺ بینی وشترەکەی یەخ دا دواتر لەسەر زەوی ویتری کرد، ئەویش ئەوەی گەیاندووە کە بینیویەتی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە، کەواتە دروستە بۆ بەندە ویتر لەسەر وشترەکەی بکات وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ کردی، هەروەها دروستە وشترەکەی یەخ بدات دواتر دابەزێت لەسەر زەوی ویتر بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەردووکیانی کرد، لە دوای ئەوەی کە ئەنجامی دان سەرکۆنەی هیچ کامیانی نەکرد، ئەمەش لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراوە، جا ئەو کەسەی لە گەشتدا بوو سەرپشکە ئەگەر ویستی با لەسەر وشترەکەی ویتر بکات، ئەگەر ویستیشی با دابەزێ و لەسەر زەوی ویتر بکات، هیچ کام لە سوننەتەکانی پشتگوێ ناخرێ ئەگەر کرا بەکار بهێنرێ، لە کاتێکدا واز لە هەندێ فەرموودە دەهێنرێ بە هەندێکی دیکەی ئەگەر نەتوانرا هەردووکیان پێکەوە بەکار بهێنرێن، یەکێکیان ئەوی دیکە ڕەت بکاتەوە بە هەموو ڕووەکانییەوە، ئەوکاتە پێویستە بگەڕێین بە دوای ئەوەی کام لەو دوو فەرموودە حوکمەکەی (النَّاسِخ) هەڵوەشێنەرەوەیە و کامەیان (الْمَنْسُوخ) هەڵوەشێنراوە، بۆیە کار بە (النَّاسِخ) هەڵوەشێنەرەوە دەکرێت نەك (الْمَنْسُوخ) هەڵوەشێنراو، جا ئەگەر دروست بێت بۆ کەسێك فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ڕەت بکاتەوە بە فەرموودەکەی جابر، ئەوە

دروسته بۆ کەسێکی دیکه فەرموودەکەی جابر ڕەت بکاتەوە بە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر، چونکە فەرموودەکانی ئیبنو عومەر ﷺ دەربارەی ویترکردنی پێغەمبەر ﷺ سەنەدیان زیاترە و چەسپاو و تەواوترە لە فەرموودەکەی جابر، بەڵام دروست نییە هیچ کام لەو دوو فەرموودە بەوی دیکە ڕەت بکرێتەوە، بەڵکوو هەردووکیان کاریان پێ دەکرێ وەك ڕوونمان کردەوە، بێگومان ڕێگاکانی فەرموودەکەی ئیبنو عومەرم ﷺ ڕوون کردۆتەوە لە (كِتَابِ الْكَبِيرُ).

## بَابُ إِبَاحَةِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ عَلَى الرَّاحِلَةِ فِي السَّفَرِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِالرَّاكِبِ

**١٢٦٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ[١].

## باسی ڕێگە دراوە لە گەشتدا نوێژی سوننەت لەسەر سواری بکرێ (نوێژخوێن) ڕووی لە هەر کوێ بێت

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە نوێژی دەکرد ڕووی لە هەر کوێ بووایە.

**١٢٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ[٢].

واتە: عەبدوڵای کوڕی عامر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەسەر وشترەکەیەوە نوێژی دەکرد ڕووی لە هەر جێگایەك بووایە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا صَلَّى عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا حَيْثُ مَا تَوَجَّهَتْ بِهِ إِذَا كَانَتْ مُتَوَجِّهَةً نَحْوَ الْقِبْلَةِ

**١٢٦٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ مُتَوَجِّهًا إِلَى تَبُوكَ[٣]

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ڕوونکردنەوە دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە، پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا لەسەر وشترەکەی نوێژی سوننەتی کردووە ڕووی لە هەر جێگایەك بووایە، ئەگەر ڕووی بکردایەتە قیبلە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەسەر وشترەکەیەوە نوێژی دەکرد ڕووی کردبووە تەبوك.

**١٢٦٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ مُتَوَجِّهًا مِنْ مَكَّةَ، فَنَزَلَتْ: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴿١١٥﴾﴾البقرة[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد بەسەر وشترەکەیەوە ڕووی کردبووە مەککە، دواتر ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴿١١٥﴾﴾، واتە: ئێوە ڕوو بکەنە هەر شوێنێك ئەوە خوا ﷻ لەوێیە.

## بَابُ إِبَاحَةِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ عَلَى الْحُمُرِ «وَيَخْطِرُ بِبَالِي فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْحِمَارَ لَيْسَ بِنَجَسٍ وَإِنْ كَانَ لَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ إِذِ الصَّلَاةُ عَلَى النَّجِسِ غَيْرُ جَائِزٍ»

**١٢٦٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ - أَوْ عَلَى حِمَارَةٍ - وَهُوَ مُتَوَجِّهٌ نَحْوَ خَيْبَرَ، يَعْنِي: التَّطَوُّعَ[2].

## باسی ڕێگە دراوە نوێژ بەسەر پشتی گوێدرێژەوە بکرێ، پێم وایە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوێدرێژ پیس نییە ئەگەرچی گۆشتەکەی نەخورێ، چونکە نوێژکردن لەسەر شتی پیس دروست نییە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەسەر گوێدرێژێکەوە نوێژی دەکرد، ڕووی کردبووە خەیبەر. واتە: نوێژی سوننەت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْإِيمَاءِ بِالصَّلَاةِ رَاكِبًا فِي السَّفَرِ

**١٢٦٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴿١١٥﴾﴾ البقرة، أَن تُصَلِّيَ أَيْنَمَا تَوَجَّهَتْ بِكَ رَاحِلَتُكَ فِي السَّفَرِ،كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَجَعَ مِنْ مَكَّةَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا، يُومِئُ بِرَأْسِهِ نَحْوَ الْمَدِينَةِ[١].

## باسی داچەمانەوەی سوار لەنێو نوێژ لە کاتی گەشتدا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴿١١٥﴾﴾، واتە: ئێوە ڕوو بکەنە هەر شوێنێك ئەوە خوا ﷻ لەوێیە. تا لە گەشتکردندا وشترەکەت ڕووی لەهەر جێگایەك بوو نوێژی سوننەت بکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لە مەککە گەڕایەوە نوێژی سوننەتی لەسەر وشترەکەی دەکرد، بەرەوڕووی مەدینە بەسەری ئاماژەی دەکرد (بۆ سوژدە و ڕکووع).

## بَابُ صِفَةِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ فِي الصَّلَاةِ رَاكِبًا

**١٢٧٠**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ يُصَلِّي النَّوَافِلَ فِي كُلِّ وَجْهٍ، وَلَكِنَّهُ يَخْفِضُ السَّجْدَتَيْنِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ، وَيُومِئُ إِيمَاءً[٢].

## باسی چۆنیەتی ڕکووع و سوژدەبردنی سوار لەنێو نوێژدا

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەسەر وشترەکەیەوە نوێژی سوننەتی دەکرد بەهەر ئاڕاستەیەك ڕووی بکردایە، بەڵام لە دوو سوژدەکەدا زیاتر دادەچەمی، بەسەری ئاماژەی دەکرد (بۆ سوژدە و ڕکووع).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْأَوْقَاتِ الَّتِي يُنْهَى عَنْ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِيهِنَّ

### بَابُ النَّهْيِ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ بِذِكْرِ لَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**١٢٧١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: حَدَّثَنِي رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَأَعْجَبُهُمْ إِلَيَّ عُمَرُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ فِي سَاعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ[١].

### کۆباسی ئەو کاتانەی کە نوێژی سوننەت تیایاندا قەدەغەیە

### باسی قەدەغەکردن لە نوێژی (سوننەت) دوای بەیانی تا خۆرهەڵدێ، دوای عسر تا خۆرئاوا دەبێ، بەباسکردنی دەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: ئیبنو عەباس ﭬ دەڵێ: پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان باس کردم عومەریان تێدا بوو، سەرسامترین کەسیان بەلامەوە عومەر بوو، (بۆیان باس کردم کەوا): پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە نوێژکردن لە دوو کاتدا: دوای عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت، دوای نوێژی بەیانیش تا خۆر هەڵدێت.

**١٢٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: سَمِعْتُ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، مِنْهُمْ عُمَرُ، وَكَانَ مِنْ أَحَبِّهِمْ إِلَيَّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﭬ دەڵێ: گوێم لە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ بوو، عومەریان تێدا بوو، خۆشەویستترینیان بوو بە لامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە نوێژکردن دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵدێ، وە دوای عەسر تا خۆرئاوا دەبێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلَا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، بَعْضَ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ لَا الْمَكْتُوبَةَ وَجَمِيعَ التَّطَوُّعِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ نَسِيَ صَلَاةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، دَالَّةٌ، وَإِجْمَاعُ الْمُسْلِمِينَ جَمِيعًا عَلَى أَنَّ النَّاسِيَ إِذَا نَسِيَ صَلَاةً مَكْتُوبَةً، فَذَكَرَهَا بَعْدَ الصُّبْحِ أَوْ بَعْدَ الْعَصْرِ، أَنَّ عَلَيْهِ أَنْ يُصَلِّيَهَا قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ إِنْ ذَكَرَهَا بَعْدَ الصُّبْحِ، وَقَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ إِنْ ذَكَرَهَا بَعْدَ الْعَصْرِ، لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَهَى عَنِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، إِذْ لَوْ كَانَ نَهْيُهُ عَنْ جَمِيعِ الصَّلَاةِ فَرْضِهَا وَتَطَوُّعِهَا لَمْ يَجُزْ أَنْ تُصَلَّى فَرِيضَةٌ بَعْدَ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَلَا بَعْدَ الْعَصْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَإِنْ كَانَ نَاسِيًا لَهَا، فَذَكَرَهَا فِي أَحَدِ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ، وَالدَّلِيلُ الثَّانِي أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَ التَّطَوُّعِ لَا كُلَّهَا، سَأُبَيِّنُهُ فِي مَوْضِعِهِ مِنْ هَذَا الْكِتَابِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ.**

باسی بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: نوێژ نییە دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵدێ، هەروەها دوای عەسریش تا خۆرئاوا دەبێ. بەشێك لە نوێژە سوننەتەکانە نەك فەرزەکان و هەموو سوننەتەکان، ئەبو بەکر دەڵێ: هەواڵدانی پێغەمبەر ﷺ: هەر کەسێك نوێژێکی بیر چوو ئەگەر بیری کەوتەوە با نوێژەکەی بکات. بەڵگەیە، هەروەها یەکدەنگی تێکڕای مسوڵمانانیش بەگشتی لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك نوێژێکی فەرزی بیر چوو دوای نوێژی بەیانی یان دوای عەسر هاتەوە بیری، پێویستە لەسەری پێش دەرچوونی خۆر ئەنجامی بدات، ئەگەر دوای نوێژی بەیانی هاتەوە بیری، پێش خۆرئاوابوون ئەنجامی بدات ئەگەر دوای عەسر هاتەوە بیری، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە نوێژی سوننەت دوای نوێژی بەیانی پێش خۆرهەڵاتن، وە دوای عەسریش پێش خۆرئاوابوون، ئەگەر قەدەغەکردنەکەی لە هەموو نوێژە فەرز و سوننەتەکان بووایە ئەوە دروست نەدەبوو نوێژی فەرز بکرێ دوای بەیانی و پێش دەرچوونی خۆر، هەروەها دوای عەسریش پێش خۆرئاوابوون، ئەگەرچی بیریشی چووبێ لە یەکێك لەو دوو کاتە بیری کەوتبێتەوە. بەڵگەی دووەمیش مەبەستی هەندێك لە نوێژە سوننەتەکان بووە نەك هەمووی، لە داهاتوو لە جێگای خۆی لەم کتێبە باسی دەکەم بە ویستی خوا

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ تَحَرِّي الصَّلَاةِ عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَعِنْدَ غُرُوبِهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السَّكْتَ لَا يَكُونُ خِلَافَ النُّطْقِ وَلَا يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِالسَّكْتِ عَلَى النُّطْقِ عَلَى مَا يَتَوَهَّمُهُ بَعْضُ مَنْ يَدَّعِي الْعِلْمَ، إِذْ لَوْ جَازَ الِاحْتِجَاجُ بِالسَّكْتِ عَلَى النُّطْقِ لَكَانَ فِي قَوْلِهِ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ» إِبَاحَةُ الصَّلَاةِ إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَإِنْ كَانَ الْمُصَلِّي مُتَحَرِّيًا بِصَلَاتِهِ طُلُوعَ الشَّمْسِ

**١٢٧٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحَرَّوْا بِصَلَاتِكُمْ طُلُوعَ الشَّمْسِ، وَلَا غُرُوبَهَا، فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ». وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بَرَزَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَمْسِكُوا عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى يَسْتَوِيَ، فَإِذَا غَابَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَمْسِكُوا عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى يَغِيبَ»[(١)].

**باسی سەرزەنشتکردن لە دواخستنی نوێژی (بەیانی) بۆ کاتی دەرچوونی خۆر، (نوێژی عەسر) بۆ کاتی خۆرئاوابوون، بەڵگەش لەسەر ئەوەی بێدەنگبوونی پێغەمبەر ﷺ نابێت پێچەوانەی وتەی پێغەمبەر ﷺ بێت، دروستیش نییە بێدەنگبوون بکرێ بە بەڵگە بەسەر وتەکەیەوە، وەك هەندێ لەوانەی بانگەشەی زانست دەکات وا گومان دەبات، چونکە ئەگەر دروست بوایە بێدەنگبوون بکرێ بە بەڵگە بەسەر وتەکەیەوە، ئەوە لە فەرموودەکەیدا: نوێژ نییە دوای بەیانی تا خۆرهەڵدێ. ڕێگە دەدرا بە نوێژکردن ئەگەر خۆر دەرچووایە، ئەگەرچی نوێژخوێنیش نوێژەکەی دوابخستایە بۆ لای هەڵهاتنی خۆر**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەمتەرخەمی مەکەن لە ئەنجامدانی نوێژی (بەیانی) لە کاتی خۆرهەڵهاتن ئەنجامی بدەن، یان (نوێژی عەسر لە) کاتی خۆرئاوابوون ئەنجامی بدەن، لە کاتی خۆرهەڵهاتن یان کاتی ئاوابوونی، چونکە خۆر لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان ئاوا دەبێت. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەناری سەرەوەی خۆر دەرکەوت دەست هەڵبگرن لە نوێژ تا تەواو هەڵدێت، وە ئەگەر کەناری سەرەوەی خۆر دیار نەما و ئاوا بوو، دەست هەڵبگرن لە نوێژ تا تەواو دیار نامێنێت.

---

(١) صحيح.

**١٢٧٤-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُصَلُّوا حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ، وَلَا حِينَ تَغْرُبُ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَتَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ». دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ قَدْ نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ حَتَّى تَرْتَفِعَ [١].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژ مەکەن کاتێ خۆرهەڵدێ، هەروەها کاتێکیش کە ئاوا دەبێت، چونکە خۆر لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان هەڵدێ، وە لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان ئاوا دەبێت. (ئیبنو حیبان) دەڵێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ قەدەغەی کردووە لە نوێژ کردن لەو کاتەدا، بێگومان قەدەغەی کرد لە نوێژ کردن لە دوای دەرچوونی خۆر هەتا بەرز دەبێتەوە،

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّطَوُّعِ نِصْفَ النَّهَارِ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ الِاحْتِجَاجَ بِالسَّكْتِ عَلَى النُّطْقِ غَيْرُ جَائِزٍ، إِذْ لَوْ جَازَ الِاحْتِجَاجُ بِالسَّكْتِ عَلَى النُّطْقِ لَجَازَ الِاحْتِجَاجُ بِأَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ: لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ وَلَا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، أَنْ يُقَالَ: قَدْ سَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ فِي هَذِهِ الْأَخْبَارِ عَنِ الزَّجْرِ عَنْ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ إِذَا قَامَ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ، فَيُقَالُ: الصَّلَاةُ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ جَائِزَةٌ أَوْ يُقَالُ: هَذِهِ الْأَخْبَارُ خِلَافُ الْأَخْبَارِ الَّتِي فِيهَا النَّهْيُ عَنِ الصَّلَاةِ إِذَا قَامَ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ

**١٢٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمِنْ سَاعَاتِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سَاعَةٌ تَأْمُرُنِي أَنْ لَا أُصَلِّيَ فِيهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ، إِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ فَأَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنِي الشَّيْطَانِ، ثُمَّ الصَّلَاةُ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ حَتَّى يَنْتَصِفَ النَّهَارُ، فَإِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ فَأَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ؛ فَإِنَّهُ حِينَئِذٍ تُسَعَّرُ جَهَنَّمُ، وَشِدَّةُ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ فَالصَّلَاةُ مَحْضُورَةٌ مَشْهُودَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ حَتَّى يُصَلَّى الْعَصْرُ فَإِذَا صَلَّيْتَ الْعَصْرَ فَأَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، ثُمَّ الصَّلَاةُ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ حَتَّى يُصَلَّى الصُّبْحُ» [٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) حديث صحيح.

**باسی قەدەغەکردن لە نوێژی سوننەت لە نیوەی ڕۆژ تا خۆر دەترازێ، ئەمەش لەو شێوازەیە کە باسم کرد بێگومان بەڵگەهێنانەوە بە بێدەنگبوون (ی پێغەمبەر ﷺ) لەسەر وتەکەیدا دروست نییە، چونکە ئەگەر بەڵگەهێنانەوە بە بێدەنگبوون بەسەر وتەکەیەوە دروست بووایە، ئەوە دروست بوو بەڵگە بهێنرێتەوە بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ: نوێژ نییە لە دوای بەیانی تا خۆرهەڵدێ، هەروەها دوای عەسریش تا خۆرئاوا دەبێ بوترایە: پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودانەدا بێدەنگ بووە لە سەرزەنشتکردن لە نوێژی سوننەت، ئەگەر کەسێك (نزیك دە دەقیقە) پێش نیوەڕۆ هەستایە بۆ نوێژ، بوترێ: نوێژ لەو کاتەدا دروستە، یان بوترێ: ئەم فەرموودانە جیاوازن لەو فەرموودانەی کە قەدەغەکردنی تێدایە لە نوێژ ئەگەر کەسێك پێش نیوەڕۆ هەستا بۆ نوێژ**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ کاتێك هەیە لە کاتەکانی شەو و ڕۆژ فەرمانم پێ بکەیت نوێژی تێدا نەکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر نوێژی بەیانیت تەواو کرد نوێژی دیکە مەکە تاکو خۆر هەڵدێت، چونکە خۆر لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان هەڵدێت، پاشان نوێژکردن لەدوای ئەو کاتە فریشتەکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن و وەرگیراوە (یان پیاوچاکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن) تا ڕۆژ نیوە دەبێت، جا ئەگەر ڕۆژ نیوە بوو نوێژ مەکە هەتا خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان دەترازێت، چونکە ئەوکاتە دۆزەخ هەڵدەگیرسێنرێت، وە سەختی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە، جا ئەگەر خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا فریشتەکان ئامادەی نوێژ دەبن و شایەتی بۆ دەدەن و وەرگیراوە (یان پیاوچاکان ئامادەی نوێژ دەبن و شایەتی بۆ دەدەن) تا نوێژی عەسر دەکرێ، جا ئەگەر نوێژی عەسرت کرد دەست لە نوێژکردن هەڵبگرە تا خۆر ئاوا دەبێت، پاشان نوێژکردن لەدوای ئەو کاتە فریشتەکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن و وەرگیراوە (یان پیاوچاکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن) هەتا نوێژی بەیانی دەکرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ نَهْيَ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ «نَهْيٌ خَاصٌّ لَا عَامٌّ، إِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَ التَّطَوُّعِ لَا كُلَّهُ، وَقَدْ أَعْلَمْتُ قَبْلُ فِي الْبَابِ الَّذِي تَقَدَّمَ أَنَّهُ لَمْ يُرِدْ بِهَذَا النَّهْيِ نَهْيًا عَنْ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ»

**١٢٧٦-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ؛ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ صَلَّى بَعْدَ الظُّهْرِ شَيْئًا[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژکردن دوای نوێژی بەیانی تا خۆر دەکەوێ، دوای عەسریش تا خۆر ئاوا دەبێ، قەدەغەکردنێکی (خَاصٌّ) تایبەتە نەك (عَامٌّ) گشتی، بێگومان مەبەستی پێی هەندێ نوێژی سوننەتە نەك هەمووی، لە بەشی پێشوو باسم کرد مەبەست لەم قەدەغەکردنە، قەدەغەکردن نییە لە نوێژی فەرز

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆیە دوو ڕکاتی دوای نوێژی عەسر کرد، چونکە دوای نیوەڕۆ هیچ نوێژێکی نەکردبوو.

**١٢٧٧-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ الْعَصْرِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَيُّ صَلَاةٍ هَذِهِ؟ مَا كُنْتَ تُصَلِّيهَا قَالَ: إِنَّهُ قَدِمَ وَفْدٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ فَشَغَلُونِي عَنْ رَكْعَتَيْنِ كُنْتُ أَرْكَعُهُمَا بَعْدَ الظُّهْرِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ تَطَوَّعَ بِرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ قَضَاءَ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الظُّهْرِ، فَلَوْ كَانَ نَهْيُهُ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ عَنْ جَمِيعِ التَّطَوُّعِ، لَمَا جَازَ أَنْ يَقْضِيَ رَكْعَتَيْنِ كَانَ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الظُّهْرِ، فَيَقْضِيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، وَإِنَّمَا صَلَّاهُمَا اسْتِحْبَابًا مِنْهُ لِلدَّوَامِ عَلَى عَمَلِ التَّطَوُّعِ؛ لِأَنَّهُ أَخْبَرَ ﷺ أَنَّ أَفْضَلَ الْأَعْمَالِ أَدْوَمُهَا، وَكَانَ ﷺ إِذَا عَمِلَ عَمَلًا أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهِ.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژی عەسر هات بۆ لام دوو ڕکات نوێژی کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە چی نوێژێکە، تو تا

---

(١) حديث حسن.

(٢) صحيح.

ئێستا ئەو نوێژەت نەکردووە؟ فەرمووی: نوێنەرانێك لە نەوەکانی تەمیم هاتن بۆ لام سەرقاڵیان کردم لەو دوو ڕکاتەی دوای نیوەڕۆ دەمکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دوای نیوەڕۆی لەدوای نوێژی عەسر قەزا کردەوە، جا ئەگەر قەدەغەکردنەکەی لە نوێژکردن لە دوای عەسر تا خۆرئاوابوون بۆ هەموو نوێژە سوننەتەکان بووایە، ئیدی چۆن دروست بوو دوو ڕکاتی دوای نوێژی نیوەڕۆ لە دوای عەسر قەزا بکاتەوە، بۆیە ئەو نوێژەی کرد لەبەر بەردەوامبوونی لەسەر نوێژی سوننەت، چونکە هەواڵیداوە چاکترین کردەوەکان ئەوەیانە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کردەوەیەکی بکردایە پێی خۆش بوو بەردەوام بێت لەسەری.

**١٢٧٨-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ فِي بَيْتِهَا قَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا أَوْ نَسِيَهُمَا فَصَلَّاهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا»[١].

واتە: ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کردووە لە عائیشە ﵂ دەربارەی ئەو دوو ڕکاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای عەسر لە ماڵەکەی ئەنجامی دا، وتی: پێشتر ئەو دوو ڕکاتەی پێش عەسری دەکرد، پاشان سەرقاڵ کرا لە ئەنجامدانی یان بیری چوو، ئینجا دوای عەسر ئەو دوو ڕکاتەی کرد، دواتر چەسپاندی، جا ئەو ئەگەر نوێژێکی بکردایە دەیچەسپاند و بەردەوام دەبوو لەسەری.

**١٢٧٩-** وَفِي خَبَرِ جَابِرِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ الْأَسْوَدِ السُّوَائِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلرَّجُلَيْنِ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ: إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا، ثُمَّ جِئْتُمَا وَالْإِمَامُ يُصَلِّي فَصَلِّيَا مَعَهُ، تَكُونُ لَكُمَا نَافِلَةً[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَالنَّبِيُّ ﷺ فِي هَذَا الْخَبَرِ قَدْ أَمَرَ مَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِي رَحْلِهِ أَنْ يُصَلِّيَ مَعَ الْإِمَامِ، وَأَعْلَمَ أَنَّ صَلَاتَهُ تَكُونُ مَعَ الْإِمَامِ نَافِلَةً فَلَوْ كَانَ النَّهْيُ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

نَهْيًا عَامًا لَا نَهْيًا خَاصًا، لَمْ يُجِزْ لِمَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِي الرَّحْلِ أَنْ يُصَلِّيَ مَعَ الْإِمَامِ فَيَجْعَلَهَا تَطَوُّعًا، وَأَخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ: سَيَكُونُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا، فَصَلُّوا الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، وَاجْعَلُوا صَلَاتَكُمْ مَعَهُمْ سُبْحَةً، فِيهَا دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَ إِذَا أَخَّرَ الْعَصْرَ أَوِ الْفَجْرَ أَوْ هُمَا، إِنَّ عَلَى الْمَرْءِ أَنْ يُصَلِّيَ الصَّلَاتَيْنِ جَمِيعًا لِوَقْتِهِمَا، ثُمَّ يُصَلِّي مَعَ الْإِمَامِ وَيَجْعَلُ صَلَاتَهُ مَعَهُ سُبْحَةً، وَهَذَا تَطَوُّعٌ بَعْدَ الْفَجْرِ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ، وَقَدْ أَمْلَيْتُ قَبْلُ خَبَرَ قَيْسِ بْنِ قَهْدٍ، وَهُوَ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ زَجَرَ بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، وَبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْ يَمْنَعُوا أَحَدًا يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ.

**واتە: وە لە فەرموودەی جابری کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسوەدی سوائی لە باوکیەوە ﷺ هاتووە، پێغەمبەر ﷺ دوای تەواوبوونی لە نوێژی بەیانی بەو دوو پیاوەی فەرموو: ئەگەر لە شوێنی مانەوەی خۆتان نوێژتان کرد، پاشان هاتن پێشنوێژ نوێژی دەکرد ئەوە لەگەڵی نوێژ بکەن، بۆتان دەبێت بە نوێژی سوننەت.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودە فەرمانی کردووە هەر کەسێك لە شوێنی مانەوەی خۆی نوێژی کرد لەگەڵ پێشنوێژیش نوێژ بکات، ئاگاداریشی کردۆتەوە نوێژکردنەکەی لەگەڵ پێشنوێژ دەبێتە سوننەت بۆی، جا ئەگەر قەدەغەکردن لە نوێژکردن دوای بەیانی تا خۆرهەڵدێ قەدەغەکردنێکی گشتی بووایە نەك قەدەغەکردنێکی تایبەتی، ئەوە دروست نەدەبوو ئەو کەسەی لە جێگای خۆی نوێژی بەیانی کردووە لەگەڵ پێشنوێژیش نوێژ بکات، بیکات بە سوننەت، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: لە داهاتوودا خەڵکانێك دەبنە کاربەدەستان نوێژ لە کاتی خۆی دوا دەخەن، ئێوە نوێژ لە کاتی خۆیدا بکەن، نوێژەکانیشتان لەگەڵ ئەوان بکەن بە سوننەت (واتە: بە نوێژی سوننەت بۆتان ئەژمار دەکرێ)، بەڵگەی تێدایە پێشنوێژ ئەگەر نوێژی عەسری دوا خست یان بەیانی یان هەردووکیان، ئەوە پێویستە لەسەر بەندە نوێژەکە لە کاتی خۆیدا بکات، پاشان لەگەڵ پێشنوێژ نوێژەکەی خۆی بکات، نوێژەکەی لەگەڵ ئەودا بکات بە سوننەت، ئەمەش نوێژی سوننەتە دوای بەیانی، پێشتر باسی فەرموودەکەی قەیسی کوڕی قەهدم کرد، ئەوەش لەم شێوازەیە، پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی نەوەکانی عەبدو مەنافی کرد، هەروەها نەوەکانی عەبدولموتەڵیب ڕێگری کەسێك بکەن لەلای بەیت نوێژ بکات هەر کاتێکی شەو یان ڕۆژ بێت.**

١٢٨٠- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قال: «يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ إِنْ كَانَ إِلَيْكُمْ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ فَلَا أَعْرِفَنَّ مَا مَنَعْتُمْ أَحَدًا يُصَلِّي عِنْدَ هَذَا الْبَيْتِ أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ»(١).

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی نەوەکانی عەبدو مەناف، ئەی نەوەکانی عەبدولموتەڵیب ئەگەر هەر کاروبارێکی موسوڵمانانتان لە ئەستۆ گرت با نەبینم ڕێگری لە یەکێك بکەن لەلای ئەم بەیتەدا (کەعبە) نوێژ بکات، هەر کاتێك ویستی شەو بێت یان ڕۆژ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا دَاوَمَ عَلَى الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ بَعْدَمَا صَلَّاهُمَا مَرَّةً لِفَضْلِ الدَّوَامِ عَلَى الْعَمَلِ

١٢٨١- عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ ﵂، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، كَيْفَ كَانَ عَمَلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، هَلْ كَانَ يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الْأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لَا، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يَسْتَطِيعُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَطِيعُ؟(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەردەوام بوو لەسەر دوو ڕکاتی دوای عەسر، دوای ئەوەی جارێك کردی، لەبەر فەزڵی بەردەوامبوون لەسەر کردەوە

واتە: عەلقەمە دەڵێ: پرسیم لە دایکی ئیمانداران عائیشە ﵂، وتم: ئەی دایکی ئیمانداران، کردەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو، ئایا ڕۆژێکی تایبەت دەکرد لەنێو ڕۆژەکاندا؟ وتی: نەخێر، کردەوەکانی بەردەوام بوو، کێ هەیە لە ئێوە بتوانێت ئەوە بکات پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی بیکات؟

١٢٨٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ عِنْدِي امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟» فَقُلْتُ: فُلَانَةٌ تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَهْ، عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»، قَالَتْ: وَكَانَ أَحَبُّ الدِّينِ إِلَيْهِ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێکم لەلا بوو لە نەوەکانی ئەسەد، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە فەرمووی: ئەمە کێیە؟ وتم: فڵانە کەسە، باسی نوێژەکانی دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست هەڵگرە، سەرقاڵ بن بەوەی لە تواناتاندایە، سوێند بە خوا، خوا ماندوو نابێت هەتا ئێوە ماندوو دەبن، وە خۆشەویستترین پەرستش لەلای ئەوە بووە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت لەسەری.

**١٢٨٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مَا دَاوَمَ وَإِنْ قَلَّ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً دَاوَمَ عَلَيْهَا، وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾ المعارج[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: خۆشەویستترین کردەوە لەلای پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو لەسەری بەردەوام بێت ئەگەر چی کەمیش بێت، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە بەردەوام دەبوو لەسەری، ئەبو سەلەمە وتی: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: ئەوانەی کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِبَعْضِ اللَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ غَيْرَ مُرْتَفِعَةٍ، فَدَانَتْ لِلْغُرُوبِ

**١٢٨٤**- عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُصَلَّى بَعْدَ الْعَصْرِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الشَّمْسُ بَيْضَاءَ مُرْتَفِعَةً»[2].

## باسی فەرموودەیەکی شیکەرەوە (الْمُفَسِّر) بۆ ئەو دەستەواژە (مُجْمَل)ەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا قەدەغەی کرد لە نوێژکردن دوای عەسر تا خۆرئاوابوون، ئەگەر خۆر بەرز نەبێ و نزیك خۆرئاوابوون بێ

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوای عەسر نوێژ ناکرێ مەگەر خۆر سپی و بەرز بێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٢٨٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُصَلُّوا بَعْدَ الْعَصْرِ إِلَّا أَنْ تُصَلُّوا وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ»(١).

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوای عەسر نوێژ مەكەن مەگەر كاتێ نوێژ دەكەن خۆر سپی و بەرز بێت.**

**١٢٨٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِه(٢).

**واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەكەی پێشوو.**

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

**١٢٨٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ»، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: «لِمَنْ شَاءَ» فَكَانَ ابْنُ بُرَيْدَةَ يُصَلِّي قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ(٣).

## باسی ڕێگەدان بە نوێژكردن لە كاتی خۆرئاوابوون و پێش نوێژی ئێوارە

**واتە: عەبدوڵای كوڕی موغەفەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە نێوان هەر دوو بانگێكدا نوێژێك هەیە، لە نێوان هەر دوو بانگێكدا نوێژێك هەیە (واتە: دوو ڕكات نوێژی سوننەت)، پاشان بۆ جاری سێیەم فەرمووی: بۆ ئەو كەسەی دەیەوێ، ئیبنو بوڕەیدە پێش مەغریب دوو ڕكات نوێژی دەكرد.**

**١٢٨٨-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: إِنْ كَانَ الْمُؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ يُصَلُّونَ حَتَّى يَخْرُجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَهُمْ كَذَلِكَ يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ شَيْءٌ(٤).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: كاتێ بانگدەر بانگی بدایە خەڵكانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەیان دەكرد دەچوون لە پاڵ كۆڵەكەكان نوێژیان دەكرد (واتە: دەیانكرد بە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

سوترە بۆ نوێژەکانیان) تا پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو ئەوان بەو شێوەیە دەبوون، دوو ڕکات پێش نوێژی ئێوارەیان دەکرد، لە نێوان بانگ و قامەتکردندا کاتێکی زۆر نەبوو.

**١٢٨٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ»، ثُمَّ قَالَ: «صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ»، ثُمَّ قَالَ عِنْدَ الثَّالِثَةِ: «لِمَنْ شَاءَ»، خَشِيَ أَنْ يَحْسَبَهَا النَّاسُ سُنَّةً[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا اللَّفْظُ مِنْ أَمْرِ الْمُبَاحِ إِذْ لَوْ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَمْرِ الْمُبَاحِ لَكَانَ أَقَلُّ الْأَمْرِ أَنْ يَكُونَ سُنَّةً إِنْ لَمْ يَكُنْ فَرْضًا، وَلَكِنَّهُ أَمْرُ إِبَاحَةٍ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ لِأَمْرِ الْإِبَاحَةِ عَلَامَةٌ مَتَى زَجَرَ عَنْ فِعْلٍ، ثُمَّ أَمَرَ بِفِعْلِ مَا قَدْ زَجَرَ عَنْهُ، كَانَ ذَلِكَ الْأَمْرُ أَمْرَ إِبَاحَةٍ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ زَاجِرًا عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ عَلَى الْمَعْنَى الَّذِي بَيَّنْتُ، فَلَمَّا أَمَرَ بِالصَّلَاةِ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ صَلَاةَ تَطَوُّعٍ كَانَ ذَلِكَ أَمْرَ إِبَاحَةٍ، وَأَمْرُ اللَّهِ ﷻ بِالِاصْطِيَادِ عِنْدَ الْإِحْلَالِ مِنَ الْإِحْرَامِ أَمْرُ إِبَاحَةٍ، إِذْ كَانَ اصْطِيَادُ صَيْدِ الْبَرِّ فِي الْإِحْرَامِ مَنْهِيًّا عَنْهُ، لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿غَيْرَ مُحِلِّي ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۝١﴾المائدة، وَبِقَوْلِهِ: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۝٩٦﴾المائدة، وَبِقَوْلِهِ: ﴿لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۝٩٥﴾المائدة، فَلَمَّا أَمَرَ بَعْدَ الْإِحْلَالِ بِاصْطِيَادِ صَيْدِ الْبَرِّ كَانَ ذَلِكَ الْأَمْرُ أَمْرَ إِبَاحَةٍ، قَدْ بَيَّنْتُ هَذَا الْجِنْسَ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ.

واتە: عەبدوڵای موزەنی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش نوێژی مەغریب دوو ڕکات نوێژ بکەن، پاشان فەرمووی: پێش نوێژی مەغریب دوو ڕکات نوێژ بکەن، پاشان لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ هەر کەسێك ویستی لەسەر بێت، ترسا لەوەی خەڵکی بیکەن بە سوننەت.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە لە فەرمانی ڕێگەپێدراوە (مباح)، ئەگەر لە فەرمانی ڕێگەپێدراو نەبووایە ئەوە کەمترینی ئەو فەرمانە دەبووە سوننەت ئەگەر نەبووایە بە فەرز، بەڵام فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان، بێگومان لە چەندین جێگای کتێبەکەماندا باسم کردووە کە فەرمانکردنی ڕێگەپێدان نیشانەیەکی هەیە کەی سەرزەنشتی کرد لە کردەوەیەك پاشان فەرمانی کرد بە ئەنجامدانی ئەوەی سەرزەنشتی کردووە، ئەوە ئەو فەرمانە فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان، وە پێغەمبەر ﷺ نوێژکردنی دوای عەسری قەدەغە کرد

---

(١) صحيح.

تا خۆرئاوابوون لەسەر ئەو مانایەی ڕوونم کردەوە، کاتێ فەرمانی کرد بە نوێژکردنی سوننەت دوای خۆرئاوابوون ئەوە فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان، وە فەرمانکردنی خوا ﷻ بە ڕاوکردن لە کاتی ئیحرامشکاندن فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان، چونکە ڕاوکردنی نێچیری کێوی و وشکایی لە ئیحرامدا قەدەغە کردووە، بە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ ﴿١﴾﴾، واتە: دروست نییە ڕاو بکەن لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدا بن. وە بە فەرمایشتی: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ ﴿٩٦﴾﴾، واتە: وە ڕاوی نێچیری کێوی و وشکایی حەرام کراوە لێتان تا لە ئیحرامدا بن. وە بە فەرمایشتی: ﴿لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ ﴿٩٥﴾﴾، واتە: نێچیر مەکوژن لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان. جا کاتێ فەرمانی کرد دوای ئیحرامشکاندن بە ڕاوکردنی نێچیری کێوی ئەو فەرمانکردنە فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان، بێگومان ئەم شێوازەم لە کتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ) باسم کردووە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ فَضَائِلِ الْمَسَاجِدِ وَبِنَائِهَا وَتَعْظِيمِهَا

## بَابُ ذِكْرِ بِنَاءِ أَوَّلِ مَسْجِدٍ بُنِيَ فِي الْأَرْضِ وَالثَّانِي وَذِكْرِ الْقَدْرِ الَّذِي بَيْنَ أَوَّلِ بِنَاءِ مَسْجِدٍ وَالثَّانِي

**١٢٩٠-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَأَبِي نَجْلِسُ فِي الطَّرِيقِ فَيَعْرِضُ عَلَيَّ الْقُرْآنَ، وَأَعْرِضُ عَلَيْهِ قَالَ: فَقَرَأَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، فَقُلْتُ لَهُ: أَتَسْجُدُ فِي الطَّرِيقِ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الْأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: «مَسْجِدُ الْحَرَامِ»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى»، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: «أَرْبَعُونَ سَنَةً»، ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةَ فَصَلِّ فَهُوَ مَسْجِدٌ»[1].

## کۆباسی فەزڵ و گەورەیی مزگەوت و بونیادنانی و بەگەورە تەماشاکردنی

## باسی بونیادنانی یەکەم مزگەوت و دووەم مزگەوت، باسی ئەو ئەندازەی لە نێوان یەکەم مزگەوت و دووەم مزگەوت هەیە

واتە: ئیبراهیمی تەیمی دەڵێ: من و باوکم لەسەر ڕێگا دادەنیشتین قورئانی بۆم دەخوێندەوە و منیش بۆم دەخوێندەوە، وتی: سورەتی (السَّجْدَةَ)ی خوێند، دواتر

(١) صحيح.

سوژدەی برد، وتم: ئایا لەسەر ڕێگا سوژدە دەبەیت؟ وتی: بەڵێ، گوێم لە ئەبو زەڕ ﷺ بوو دەیوت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتم: یەکەم مزگەوتێك لەسەر زەوی دروست کرا کامە بوو؟ فەرمووی: مزگەوتی حەڕام، وتی: وتم: پاشان چی دیکە؟ فەرمووی: پاشان مزگەوتی ئەقصاء، وتی: وتم: نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: چل ساڵ، دواتر فەرمووی: لە هەر شوێنێك کاتی نوێژ هات نوێژەکەت بکە، ئەو جێگایە مزگەوتە.

## بَابُ فَضْلِ بِنَاءِ الْمَسَاجِدِ إِذَا كَانَ الْبَانِي يَبْنِي الْمَسْجِدَ لِلَّهِ لَا رِيَاءً وَلَا سُمْعَةً

**١٢٩١-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[١].

### باسی فەزڵ و ڕێزی دروستکردنی مزگەوت، ئەگەر دروستکەرەکەی لەپێناوی خوا مزگەوت دروست بکات نەك بۆ ڕیایی یان ناوبانگ

واتە: عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مزگەوتێك لەپێناوی خوا دروست بکات خوا ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات.

## بَابٌ فِي فَضْلِ الْمَسْجِدِ وَإِنْ صَغُرَ الْمَسْجِدِ وَضَاقَ

**١٢٩٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَفَرَ مَاءً لَمْ يَشْرَبْ مِنْهُ كَبِدٌ حَرِيٌّ مِنْ جِنٍّ وَلَا إِنْسٍ وَلَا طَائِرٍ إِلَّا آجَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ بَنَى مَسْجِدًا كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ أَوْ أَصْغَرَ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[٢].

### باسی فەزڵ و پاداشتی دروستکردنی مزگەوت هەرچەند بچووك و تەنگیش بێ

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بیرێك هەڵکەنێ بە نیازی ئەوەی تینوویەك ئاوی لێ بخواتەوە لە جنۆکە و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مرۆڤ و باڵندەکان ئیللا خوا لە ڕۆژی دوایی پاداشتی دەداتەوە، هەر کەسێکیش لەپێناو خوادا مزگەوتێك دروست بکات، ئەگەرچی بە ئەندازەی لانە کەوێك (یاخود کۆترێکیش) بێت، خوا لە بەهەشت ماڵێکی بۆ دروست دەکات.

## بَابُ فَضْلِ الْمَسَاجِدِ إِذْ هِيَ أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ

**١٢٩٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ أَسْوَاقُهَا»[١].

## باسی فەزڵ و ڕێزی مزگەوتەکان، چونکە خۆشەویستترین جێگان لەلای خوا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستترینی جێگاکان لای خوا مزگەوتەکانە، وە خراپترین جێگاکان لای خوا بازاڕەکانە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِبِنَاءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ

**١٢٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِبِنَاءِ الْمَسْجِدِ فِي الدُّورِ[٢].

## باسی فەرمانکردن بە دروستکردنی مزگەوت لەنێو ماڵەکان

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوت لەنێو ماڵەکان.

## بَابُ تَطْيِيبِ الْمَسَاجِدِ

**١٢٩٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَتَّهَا بِيَدِهِ - يَعْنِي النُّخَامَةَ أَوِ الْبُزَاقَ - ثُمَّ لَطَّخَهَا بِالزَّعْفَرَانِ، دَعَا بِهِ، قَالَ: فَلِذَلِكَ صُنِعَ الزَّعْفَرَانُ فِي الْمَسَاجِدِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) هذا إسناد معلول.

(٣) صحيح.

## باسی بۆنخۆشكردنی مزگەوتەكان

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دەستی كڕاندی -واتە: بەڵغەم یان تف (كە بە دیوار یان زەوی مزگەوتەوە بوو)- پاشان بە زەعفەران سڕییەوە، داوای زەعفەرانی كرد، وتی: لەبەر ئەوە زەعفەران لە مزگەوتەكان دانرا.

**١٢٩٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَاحْمَرَّ وَجْهُهُ فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَحَكَّتْهَا، فَجَعَلَتْ مَكَانَهَا خَلُوقًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَحْسَنَ هَذَا[١].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵغەمێكی بینی لە قیبلەی مزگەوت، توڕە بوو تا ڕوخساری سوور هەڵگەڕا، ئافرەتێك لە ئەنصارِ هەستا كڕاندی و بۆنێكی خۆشی كرد بە شوێنەكەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئای ئەمە چەندە كارێكی جوانە.

## بَابُ فَضْلِ إِخْرَاجِ الْقَذَى مِنَ الْمَسْجِدِ

**١٢٩٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتِي حَتَّى الْقَذَاةُ يُخْرِجُهَا الرَّجُلُ مِنَ الْمَسْجِدِ، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي فَلَمْ أَرَ ذَنْبًا هُوَ أَعْظَمُ مِنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيهَا رَجُلٌ ثُمَّ نَسِيَهَا[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی لابردنی پیسایی لەنێو مزگەوت

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاداشتی ئوممەتەكەم خرایە ڕوو بۆم تەنانەت پیسییەك (بە ئەندازەی پووشێك كە دەكەوێتە نێو چاو) پیاوێك لە مزگەوت دەریبكات، هەروەها گوناهی ئوممەتەكەم خرایە ڕوو بۆم گوناهێكم نەبینی گەورەتر بێت لە سوڕەتێك یان ئایەتێك ببەخشرێت بە كەسێك پاشان لە بیری خۆی بباتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حيدث ضعيف معلول بالإنقطاع.

## بَابُ ذِكْرِ بَدْءِ تَحْصِيبِ الْمَسْجِدِ كَانَ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَسَاجِدَ إِنَّمَا تُحَصَّبُ حَتَّى لَا يُقَذِّرَ الطِّينُ وَالْبَلَلُ الثِّيَابَ إِذَا مُطِرُوا، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ»

**١٢٩٨-** عَنْ أَبِي الْوَلِيدِ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ ﭬ: مَا بَدْءُ هَذَا الْحَصَا فِي الْمَسْجِدِ؟ قَالَ: مُطِرْنَا مِنَ اللَّيْلِ، فَجِئْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ لِلصَّلَاةِ قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَحْمِلُ فِي ثَوْبِهِ الْحَصَا، فَيُلْقِيَهُ، فَيُصَلِّي عَلَيْهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا هَذَا؟» فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: «نِعْمَ الْبِسَاطُ هَذَا»، قَالَ: فَاتَّخَذَهُ النَّاسُ. قَالَ. قُلْتُ: مَا كَانَ بَدْءُ هَذَا الزَّعْفَرَانِ؟ قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ، فَإِذَا هُوَ بِنُخَاعَةٍ فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَحَكَّهَا، وَقَالَ: «مَا أَقْبَحَ هَذَا»، قَالَ: فَجَاءَ الرَّجُلُ الَّذِي تَنَخَّعَ فَحَكَّهَا، ثُمَّ طَلَى عَلَيْهَا الزَّعْفَرَانَ قَالَ: إِنَّ هَذَا أَحْسَنُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: قُلْتُ: مَا بَالُ أَحَدِنَا إِذَا قَضَى حَاجَتَهُ نَظَرَ إِلَيْهَا إِذَا قَامَ عَنْهَا؟ فَقَالَ: إِنَّ الْمَلَكَ يَقُولُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَا نَحَلْتَ بِهِ إِلَى مَا صَارَ»[(١)].

## باسی بەردڕێژ کردنی مزگەوت و، بەڵگەش لەسەر ئەوەی بۆیە مزگەوتەکان بەردڕێژ دەکران تا قوڕ و تەڕایی جلوبەرگ پیس نەکەن کاتێك باران باری، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێ

واتە: ئەبو وەلید دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﭬ وت: سەرەتا ئەو بەردانە چۆن هاتە مزگەوت؟ وتی: شەوێك باران باری، دواتر ئێمەیش هاتین بۆ مزگەوت بۆ نوێژ، وتی: هەر پیاوێك جلەکانی پڕ دەکرد لە وردە بەرد لەنێو مزگەوت ڕایدەخست و نوێژی لەسەری دەکرد، کاتێ ڕۆژمان کردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە؟ هەواڵیان پێدا، فەرمووی: ئەوە چاکترین ڕاخەرە، وتی: خەڵکیش کردیان بە ڕاخەر. وتی: وتم: سەرەتا ئەو زەعفەرانە چۆن هاتە مزگەوتەوە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نوێژی بەیانی، بەڵغەمێکی بینی لە قیبلەی مزگەوت، دواتر کڕاندی و فەرمووی: ئای چەندە ناشرینە ئەو ڕەفتارە، وتی: ئەو پیاوەی بەڵغەمەکەی کردبوو بەو شوێنەدا هات کڕاندی، پاشان زەعفەرانی کرد بە شوێنەکەیدا، فەرمووی: بەڕاستی ئەمە چاکترە لەوی دیکە. وتی: وتم: بۆچی هەر یەکێك لە ئێمە کاتێ سەرئاوی کرد و هەستایەوە تەماشای شوێنی پیسییەکەی دەکات؟ فەرمووی: بەڕاستی فریشتە پێی دەڵێ: تەماشای ئەوە بکە کە هەوڵت بۆ دەدا بزانە بوو بە چی.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ تَقْمِيمِ الْمَسَاجِدِ وَالْتِقَاطِ الْعِيدَانِ وَالْخُرَقِ مِنْهَا وَتَنْظِيفِهَا

**١٢٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَمَاتَتْ، فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْهَا بَعْدَ أَيَّامٍ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهَا مَاتَتْ قَالَ: «فَهَلَّا آذَنْتُمُونِي، فَأَتَى قَبْرَهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا»[١].

## باسی خزمەتکردنی مزگەوتەکان و هەڵگرتنی وردە دارو خاشاك و پڕکردنەوەی کەلێن و پاککردنەوەیان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێکی ڕەشپێست نێو مزگەوتی خاوێن دەکردەوە و خزمەتی دەکرد، دواتر مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیبینییەوە، دوای چەند ڕۆژێك پرسیاری کرد، پێی وترا: ئەو مرد، فەرمووی: ئەی بۆچی ئاگاداری منتان نەکردەوە، دواتر چوو بۆ لای گۆڕەکەی نوێژی لەسەر کرد.

**١٣٠٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَلْتَقِطُ الْخِرَقَ وَالْعِيدَانَ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْقَبْرِ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك هەبوو خۆڵ و خاشاك و وردە داری نێو مزگەوتی خاوێن دەکردەوە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕەکەی کرد.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ نَشْدِ الضَّوَالِّ فِي الْمَسْجِدِ

**١٣٠١-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ دَعَا إِلَى الْجَمَلِ الْأَحْمَرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا وَجَدْتَ، إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) في إسناده مقال.

(٣) صحيح.

## باسی قەدەغە کردن لە بانگەواز بۆ شتی ونبوو لەنێو مزگەوت

واتە: سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، پیاوێك وتی: کێ وشترێکی سووری دۆزیوەتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ (وەك دوعا لێکردن) فەرمووی: نەیدۆزیتەوە، مزگەوتەکان تەنها بۆ پەرستش و یادی خوا دروستکراون.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالدُّعَاءِ عَلَى نَاشِدِ الضَّالَّةِ فِي الْمَسْجِدِ أَنْ لَا يُؤَدِّيَهَا اللَّهُ عَلَيْهِ

**١٣٠٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سَمِعَ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ لَهُ: لَا أَدَّاهَا اللَّهُ عَلَيْكَ؛ فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا»[1].

## باسی فەرمان کراوە ئەو کەسەی لەنێو مزگەوت بانگەواز بۆ شتی ونبوو دەکات، نزای لێ بکرێ کە خوا بۆی نەگێڕێتەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك گوێی لێبوو پیاوێك بانگەوازی بۆ شتێکی ونبوو دەکرد لەنێو مزگەوتدا، با پێی بڵێ: خوا بۆتی نەگێڕێتەوە، چونکە بەڕاستی مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون.

**١٣٠٣-** عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: سَمِعَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَغَضِبَ وَسَبَّهُ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا كُنْتَ فَحَّاشًا يَا ابْنَ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنَّا كُنَّا نُؤْمَرُ بِذَلِكَ[2].

واتە: ئەبو عوسمان دەڵێ: ئیبنو مەسعود ﷺ گوێی لێبوو پیاوێك لەنێو مزگەوت بانگەوازی بۆ شتی ونبوو کرد، ئەویش توڕە بوو قسەی ناشرینی پێ وت، پیاوێك پێی وت: تۆ هەرگیز زمانپیس نەبووی ئەی ئیبنو مەسعود ﷺ، وتی: ئێمە بەوە فەرمانمان پێکراوە (بۆ کەسێك لەنێو مزگەوت کارێك بکات کە شیاوی نێو مزگەوت نییە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْبَيْعِ وَالشِّرَاءِ فِي الْمَسَاجِدِ

**١٣٠٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّرَى وَالْبَيْعِ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ الشِّعْرُ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ الضَّالَّةُ، وَعَنِ الْحِلَقِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ[1].

### باسی قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتن لەنێو مزگەوتەکان

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە کڕین و فرۆشتن لەنێو مزگەوت، هەروەها لەوەی شیعری تێدا بوترێ، هەروەها لە بانگەواز بۆ شتی ونبوو تیایدا، هەروەها لە دانیشتن بەکۆمەڵ بەشێوەی بازنەیی لە ڕۆژی هەینی لەنێو مزگەوت پێش نوێژکردن، (مەبەستی پێی ئەوکاتانەی کە خەڵك دێن بۆ مزگەوت بۆ نوێژی هەینی، بۆ ئەوەی بارگرانی لەسەر موسوڵمانان دروست نەبێت).

## بَابُ الْأَمْرِ بِالدُّعَاءِ عَلَى الْمُتَبَايِعَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ أَنْ لَا تَرْبَحَ تِجَارَتُهُمَا «وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْبَيْعَ يَنْعَقِدُ وَإِنْ كَانَا عَاصِيَيْنِ بِفِعْلِهِمَا»

**١٣٠٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا: لَا أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً فَقُولُوا: لَا أَدَّى اللَّهُ عَلَيْكَ»[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَوْ لَمْ يَكُنِ الْبَيْعُ يَنْعَقِدُ لَمْ يَكُنْ لِقَوْلِهِ ﷺ: لَا أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ، مَعْنًى.

### باسی فەرمان بە نزاکردن لەوکەسانەی لەنێو مزگەوت کڕین و فرۆشتن دەکەن، بەوەی لە بازرگانییەکەیان قازانج نەکەن، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی کڕین و فرۆشتن دادەمەزرێ ئەگەرچی گوناهباریش بن بەو کردەوەیانە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بینیتان کەسێك شتی دەفرۆشت یان دەیکڕی لە مزگەوتدا، بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانییەکەت،

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

وە ئەگەر بینیتان کەسێك لەنێو مزگەوت بانگەواز بۆ شتی ونبوو دەکات بڵێ: خوا بۆت نەگێڕێتەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر گرێبەستی مامەڵە و بازرگانی لەنێو مزگەوتدا دانەمەزرایە و دروست نەبووایە، ئەوە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: خوا قازانج نەخاتە بازرگانییەکەت. هیچ مانایەکی نەدەبوو.

### بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِنْشَادِ الشِّعْرِ فِي الْمَسَاجِدِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ - عِلْمِي - خَاصٌّ

**١٣٠٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْبَيْعِ وَالِابْتِيَاعِ، وَأَنْ تُنْشَدَ الضَّوَالُّ، وَعَنْ تَنَاشُدِ الْأَشْعَارِ، وَعَنِ التَّحَلُّقِ لِلْحَدِيثِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ، يَعْنِي فِي الْمَسْجِدِ(١).

### باسی سەرزەنشتکردن لە وتنی شیعر لە مزگەوتەکان، بەدەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی -بەزانیاری خۆم- (خَاص) تایبەتە

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە رضي الله عنه، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە کڕین و فرۆشتن لەنێو مزگەوت، هەروەها لە بانگەوازکردن بۆ شتی ونبوو، وە وتنی شیعر لەنێو مزگەوتدا، هەروەها لە دانیشتن بەشێوەی بازنە بۆ قسەکردن لە ڕۆژی هەینی پێش نوێژ، واتە: لەنێو مزگەوت.

### بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَهَى عَنْ تَنَاشُدِ بَعْضِ الْأَشْعَارِ فِي الْمَسَاجِدِ لَا عَنْ جَمِيعِهَا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَبَاحَ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ أَنْ يَهْجُوَ الْمُشْرِكِينَ فِي الْمَسْجِدِ، وَدَعَا لَهُ أَنْ يُؤَيَّدَ بِرُوحِ الْقُدُسِ مَا دَامَ مُجِيبًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

**١٣٠٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: مَرَّ عُمَرُ بِحَسَّانَ، وَهُوَ يُنْشِدُ فِي الْمَسْجِدِ فَلَحَظَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أُنْشِدُ وَفِيهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَجِبْ عَنِّي، اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ؟» قَالَ: نَعَمْ(٢).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها قەدەغەی کرد لە وتنی هەندێ لە شیعرەکان لەنێو مزگەوت، نەك هەموو جۆرەکانی، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا بە حەسانی کوڕی سابت لەنێو مزگەوت قسە بە هاوبەشدانەران بڵێ، وە بۆی پاڕایەوە پشتیوانی لێ بکرێ بە جبریل مادام لەجیاتی پێغەمبەر ﷺ وەڵامیان دەداتەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عومەر تێپەڕی بەلای حەساندا ﷺ، لە مزگەوتدا شیعری دەوت، بە تیلەی چاوی سەرنجێکی دا، وتی: من شیعرم وتووە کەسێکی تێدا بووە لە تۆ چاکتر بووە، پاشان حەسان ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا نەتبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە جیاتی من وەڵامیان بدەرەوە، خوایە پشتیوانی لێ بکە بە جبریل؟ وتی: بەڵێ (بیستوومە).

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْبُزَاقِ فِي الْمَسْجِدِ إِذَا لَمْ يُدْفَنْ

١٣٠٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ أَعْمَالُ أُمَّتِي، حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا، فَوَجَدْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَوَجَدْتُ فِي مَسَاوِي أَعْمَالِهَا النُّخَاعَةَ فِي الْمَسْجِدِ لَا تُدْفَنُ»[١].

**باسی قەدەغەکردن لە تفکردنە نێو مزگەوت، ئەگەر نەشاردرێتەوە**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کردەوەکانی ئوممەتەکەم خرایە ڕوو بۆم، ئەوەی چاکە و ئەوەیشی خراپە، جا لە کردەوە چاکەکانیانم بینی، (بریتی بوو لە) لابردنی هەر پیساییەك لەسەر ڕێگا، وە لە کردەوە خراپەکانیشیانم بینی، (بریتی بوو لە) بەڵغەمکردنە نێو مزگەوت و نەشاردنەوەی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِدَفْنِ الْبُزَاقِ فِي الْمَسْجِدِ لِيَكُونَ كَفَّارَةً لِلْبَزْقِ

١٣٠٩- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بە شاردنەوەی تف لەنێو مزگەوت، تا ببێتە کەفارەتی گوناهەکە

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تفکردنە نێو مزگەوت گوناه و هەڵەیە، کەفارەتەکەیشی شاردنەوەیەتی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِعْمَاقِ الْحَفْرِ لِلنُّخَامَةِ فِي الْمَسْجِدِ

١٣١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ دَخَلَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ فَبَزَقَ فِيهِ أَوْ تَنَخَّمَ فَلْيَحْفُرْ فِيهِ فَلْيُبْعِدْ، فَلْيَدْفِنْهُ فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلْيَبْزُقْ فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ يَخْرُجْ بِهِ»[1].

## باسی فەرمانکردن بە قووڵکردنی چاڵ بۆ بەڵغەم لەنێو مزگەوت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك هاتە نێو ئەم مزگەوتە، دواتر تفی کردە نێوی یان بەڵغەم، با چاڵی بۆ بکات و دووری بخاتەوە، دواتر با بیشارێتەوە، ئەگەر ئەوەی نەکرد ئەوە با تف بکاتە نێو پۆشاکەکەی، پاشان بیباتە دەرەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا أَمَرَ بِدَفْنِ النُّخَامَةِ فِي الْمَسْجِدِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ أَمَرَ بِهِ كَيْ لَا يَتَأَذَّى بِذَلِكَ النُّخَامَةِ مُؤْمِنٌ أَنْ يُصِيبَ جِلْدَهُ أَوْ ثَوْبَهُ فَيُؤْذِيَهُ»

١٣١١- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فِي الْمَسْجِدِ فَلْيُغَيِّبْ نُخَامَتَهُ، أَنْ يُصِيبَ جِلْدَ مُؤْمِنٍ أَوْ ثَوْبِهِ فَيُؤْذِيَهُ»[2].

## باسی هۆکاری فەرمانکردن بە شاردنەوەی بەڵغەم لەنێو مزگەوت، بەڵگەش لەسەر ئەوەی بۆیە فەرمانی کردووە تا بڕوادارێك بە هۆی ئەو بەڵغەمەوە ئازار نەبینێ بەر پێستی بکەوێ، یان بەر جلوبەرگی و ئازاری بدات

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بەڵغەمی کردە نێو مزگەوت با بەڵغەمەکەی بشارێتەوە، تا بەر مرۆڤێك نەکەوێ یان جەستەی بڕوادارێك یان جلوبەرگی و ئازاری بدات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّنَخُّمِ فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ

**١٣١٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَنَخَّمَ فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ بُعِثَ وَهِيَ فِي وَجْهِهِ»(١).

## باسی قەدەغەکردن لە بەڵغەمکردنە قیبلەی مزگەوت

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەڵغەم بکاتە قیبلەی مزگەوت زیندوو دەکرێتەوە و بەڵغەمەکە بە ڕوخسارەوەیە.

**١٣١٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُبْعَثُ صَاحِبُ النُّخَامَةِ فِي الْقِبْلَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهِيَ فِي وَجْهِهِ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی بەڵغەمی کردووە بە قیبلەی مزگەوت لە ڕۆژی دوایی زیندوو دەکرێتەوە و بەڵغەمەکە بە ڕوخسارەوەیە.

**١٣١٤-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَفَلَ تُجَاهَ الْقِبْلَةِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَتَفْلُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ»(٣).

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەرەو ڕووی قیبلە تف بکات لە ڕۆژی دوایی دێت تفەکەی بە نێوچاوانیەوەیە.

---

(١) صحيح موقوفاً.

(٢) إسناده معلول بالوقف.

(٣) صحيح.

## بَابُ حَكِّ النُّخَامَةِ مِنْ قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ

١٣١٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَكَّ بُزَاقًا فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ[١].

## باسی كڕاندنی بەڵغەم لە قیبلەی مزگەوت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تفێكی كڕاند كە بە قیبلەی مزگەوتەوە بوو.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْمُرُورِ بِالسِّهَامِ فِي الْمَسَاجِدِ مِنْ غَيْرِ قَبْضٍ عَلَى نُصُولِهَا

١٣١٦- عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَمْرِو بْنَ دِينَارٍ: أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجُلٍ مَرَّ بِأَسْهُمٍ فِي الْمَسْجِدِ: «أَمْسِكْ بِنِصَالِهَا»، قَالَ: نَعَمْ[٢].

## باسی قەدەغەكردن لە تێپەڕبوون بەنێو مزگەوتەكاندا بەكۆمەڵە تیرێكەوە بەبێ ئەوەی سەرە تیژەكانیان بە دەست بگرێ

واتە: ئیبنو عویەینە دەڵێ: بە عەمری كوڕی دینارم وت: ئایا گوێت لە جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ بوو دەیوت: پیاوێك بە كۆمەڵە تیرێكەوە تێپەڕ بوو بەنێو مزگەوتدا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: سەری تیرەكان بە دەست بگرە، (تا كەس ئازاری بەرنەكەوێت بەهۆیانەوە) وتی: بەڵێ.

١٣١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ أَمَرَ رَجُلًا كَانَ يَتَصَدَّقُ بِالنَّبْلِ فِي الْمَسْجِدِ أَلَّا يَمُرَّ بِهَا إِلَّا وَهُوَ آخِذٌ بِنِصَالِهَا[٣].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لەنێو مزگەوت تەڵە تیری دەبەخشیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكرد كاتێ پێیەوە تێدەپەڕێ سەری تیرەكان بگرێ. (بۆ ئەوەی ئازار بە كەس نەگەیەنێ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا أَمَرَ بِالْإِمْسَاكِ عَلَى نِصَالِ السَّهْمِ إِذَا مَرَّ بِهِ فِي الْمَسْجِدِ

١٣١٨- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَسْجِدِنَا أَوْ فِي سُوقِنَا وَمَعَهُ نَبْلٌ فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا بِكَفِّهِ أَنْ يُصِيبَ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِنْهَا شَيْءٌ»(١).

### باسی هۆکاری ئەوەی فەرمان کراوە بەندە سەری تیرەکان بە دەست بگرێ، کاتێ بەنێو مزگەوت تێپەڕ بوو

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە تێپەڕی بەنێو مزگەوتەکانماندا، یان بازاڕەکانمان با سەرە تیرەکان بە لەپی دەستی بگرێ تا ئازاری هیچ یەکێك لە موسوڵمانان نەدات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِيطَانِ الرَّجُلِ الْمَكَانَ مِنَ الْمَسْجِدِ، وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْمَسْجِدَ لِمَنْ سَبَقَ إِلَيْهِ، لَيْسَ أَحَدٌ أَحَقَّ بِمَوْضِعٍ مِنَ الْمَسْجِدِ مِنْ غَيْرِهِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ ﴿١٨﴾ ﴾الجن.

١٣١٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ، وَافْتِرَاشِ السَّبْعِ، وَأَنْ يُوطِنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ أَوِ الْمَقَامَ كَمَا يُوطِنُهُ الْبَعِيرُ. يَعْنِي فِي الْمَسْجِدِ(٢).

### باسی قەدەغەکردن لەوەی پیاو شوێنێك لەنێو مزگەوت بۆ خۆی دیاری بکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانیشتن لە هەر جێگایەك لە جێگاکانی مزگەوت بۆ ئەو کەسەیە سەرەتا دەچێت بۆ مزگەوت، هیچ کەس شیاوتر نییە بە جێگایەك لەوی دیکە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان مزگەوتەکان تایبەتن بە خوای گەورەو ماڵی خوای گەورەن

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی شیبلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە دەنووکدانی قەلەڕەش (مەبەستی سوژدەبردنی کورتە لە نوێژدا)، هەروەها درێژکردنی

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

باڵ لە سوژدەداو بەرزنەکردنەوەی لە زەوی لە نوێژ، وەکوو چۆن دڕندەکان (سەگ و گورگ و هاوشێوەکانیان) باڵیان درێژ دەکەن، وە پیاوێك (لەنێو مزگەوت) شوێنێك دیاری بکات بۆ نوێژکردن وەکوو چۆن حوشتر لە شوێنە کۆنەکەی خۆی نەبێت ئەژنۆ دانادات.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَوْسِعَةِ الْمَسَاجِدِ إِذَا بُنِيَتْ

**١٣٢٠-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَوْماً مِنَ الْأَنْصَارِ وَهُمْ يَبْنُونَ مَسْجِداً، فَقَالَ لَهُمْ: «أَوْسِعُوهُ تَمْلَئُوهُ»[١].

### باسی فەرمانکردن بە فراوانکردنی مزگەوتەکان، ئەگەر دروست کرا

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێو هۆزێکی ئەنصارەکان خەریك بوو مزگەوتیان دروست دەکرد، پێیانی فەرموو: فراوانی بکەن پڕی دەکەنەوە (بە نوێژخوێن).

## بَابُ كَرَاهَةِ التَّبَاهِي فِي بِنَاءِ الْمَسَاجِدِ وَتَرْكِ عِمَارَتِهَا بِالْعِبَادَةِ فِيهَا

**١٣٢١-** عَنْ أَبِي قِلَابَةَ الْجَرْمِيُّ قَالَ: انْطَلَقْنَا مَعَ أَنَسٍ ﷺ نُرِيدُ الزَّاوِيَةَ قَالَ: فَمَرَرْنَا بِمَسْجِدٍ فَحَضَرَتْ صَلَاةُ الصُّبْحِ، فَقَالَ أَنَسٌ: لَوْ صَلَّيْنَا فِي هَذَا الْمَسْجِدِ؛ فَإِنَّ بَعْضَ الْقَوْمِ يَأْتِي الْمَسْجِدَ الْآخَرَ قَالُوا: أَيُّ مَسْجِدٍ؟ فَذَكَرْنَا مَسْجِداً، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَتَبَاهَوْنَ بِالْمَسَاجِدِ لَا يَعْمُرُونَهَا إِلَّا قَلِيلًا - أَوْ قَالَ: يَعْمُرُونَهَا قَلِيلًا»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الزَّاوِيَةُ قَصْرٌ مِنَ الْبَصْرَةِ عَلَى شَبَهٍ مِنْ فَرْسَخَيْنِ.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) في إسناده مقال.

## باسی شانازیکردن بە دروستکردنی مزگەوتەکان باش نییە و کەڕاهەتی هەیە، هەروەها وازهێنان لە ئاوەدانکردنەوەیان بە پەرستشکردن تیایاندا

واتە: ئەبو قیلابەی جەرمی دەڵێ: لەگەڵ ئەنەس ﷺ دەرچووین بۆ باڵەخانەی زاویە (لە بەصرە) بەلای مزگەوتێك تێپەڕین کاتی نوێژی بەیانی هات، ئەنەس وتی: خۆزگە لەم مزگەوتە نوێژمان دەکرد، چونکە بەشێك لە خەڵکەکە دەچن بۆ مزگەوتێکی دیکە، وتیان: چی مزگەوتێك؟ باسی مزگەوتێکیان بۆیان کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەردەمانێك بەسەر خەڵکدا دێت خۆیان هەڵدەکێشن و شانازی دەکەن بە (ڕازاندنەوە و جوانکردنی) مزگەوتەکانیان، بە پەرستش ئاوەدانی ناکەنەوە مەگەر کەمێك نەبێت، -یان فەرمووی: کەمێك ئاوەدانی دەکەنەوە. ئەبو بەکرد دەڵێ: زاویە: باڵەخانەیەك بوو لە بەصرە نزیکەی دوو فەرسەخ دوور دەبوو لێیەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّبَاهِيَ فِي الْمَسَاجِدِ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ

**١٣٢٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَتَبَاهَى النَّاسُ بِالْمَسَاجِدِ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆهەڵکێشان بە دروستکردنی مزگەوت لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە خەڵکی خۆیان هەڵدەکێشن و شانازی دەکەن بە (ڕازاندنەوەی) مزگەوتەکان. (واتە: جوانی دەکەن و دەیڕازێننەوە بە مەبەستی ڕیایی و ڕووپامی نەك لەپێناو خوا، یان هەر کەسە و شانازی دەکات بە مزگەوتەکەی خۆیەوە، ئەو دەڵێ: مزگەوتەکەی من چاکترە و ئەوی دیکەش دەڵێ: هی من چاکترە).

---

(١) صحيح.

**١٣٢٣**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ»[١].

**واته:** ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت تاکو خەڵکی خۆیان هەڵدەکێشن و شانازی دەکەن بە (دروستکردنی) مزگەوتەکان.

## بَابُ صِفَةِ بِنَاءِ مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِي كَانَ عَلَى عَهْدِهِ

**١٣٢٤**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَبْنِيًّا بِاللَّبِنِ، وَسَقْفُهُ الْجَرِيدُ، وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخْلِ، فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئًا، وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ، وَبَنَاهُ عَلَى بُنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّبِنِ، وَالْجَرِيدِ، وَأَعَادَ عُمُدَهُ خَشَبًا، ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ، فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً، وَبَنَى جِدَارَهُ بِالْحِجَارَةِ الْمَنْقُوشَةِ وَالْقِصَّةِ، وَجَعَلَ عُمُدَهُ حِجَارَةً مَنْقُوشَةً، وَسَقْفَهُ بِالسَّاجِ[٢].

## باسی چۆنیەتی دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی خۆیدا

**واته:** عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دیواری مزگەوتی (مەدینە) بونیاد نرابوو لە خشت سەربانەکەیشی لە لقی دارخورما پایەکانیشی لە داری دارخورما، ئەبو بەکر هیچی لێ زیاد نەکرد، بەڵام عومەر زیادی کرد تیایدا و لەسەر شێوەی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بونیادی نایەوە بە خشت و لقی دارخورماو دووبارە پایەکانی لە دار چاك کردەوە، پاشان عوسمان گۆڕانی تێدا کرد، شتێکی زۆری تێدا زیاد کرد، دیوارەکەی بە بەردی نەخشێنراو کە گەچ بوو دروست کرد، پایەکانیشی هەر لە بەردی نەخشێنراو دروست کرد، سەربانەکەیشی بە ساج (کە جۆرە دارێکی هیندی بوو ڕەنگی ڕەش بوو نرخەکەشی گران بوو) پۆشی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الصَّلَاةِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ قَبْلَ الْجُلُوسِ إِذْ هِيَ مِنْ حُقُوقِ الْمَسَاجِدِ

**١٣٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا الْأَمْرُ أَمْرُ فَضِيلَةٍ لَا أَمْرُ فَرِيضَةٍ، وَالدَّلِيلُ عَلَى ذَلِكَ خَبَرُ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ لَمَّا ذَكَرَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ قَالَ الرَّجُلُ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ، فَأَعْلَمَ أَنَّ مَا سِوَى الْخَمْسِ مِنَ الصَّلَوَاتِ فَتَطَوُّعٌ لَا فَرْضٌ.

## باسی نوێژکردن لە کاتی چوونە نێوەوەی مزگەوت پێش دانیشتن، چونکە ئەوە یەکێکە لە مافی مزگەوتەکان

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە با دانەنیشێ تاکو دوو ڕکات نوێژ دەکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرمانە فەرمانێکە بۆ فەزڵ و چاکەیە نەك فەرمانێك بێت بۆ فەڕزبوون، بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی تەڵحەی کوڕی عەبدوڵایە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کاتێ باسی پێنج نوێژە فەڕزەکەی کرد، پیاوەکە وتی: جگە لەو پێنج فەڕزە هیچی دیکەم لەسەرە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر نوێژی زیادە بکەیت، هەواڵی دا کە جگە لەو پێنج نوێژە فەڕزە زیادەیە و فەڕز نییە.

## بَابُ كَرَاهَةِ الْمُرُورِ فِي الْمَسَاجِدِ مِنْ غَيْرِ أَنْ تُصَلَّى فِيهَا وَالْبَيَانِ أَنَّهُ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ

**١٣٢٦-** عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَقِيَ عَبْدَ اللَّهِ ﵁ رَجُلٌ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا ابْنَ مَسْعُودٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَمُرَّ الرَّجُلُ فِي الْمَسْجِدِ لَا يُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، وَأَنْ لَا يُسَلِّمَ الرَّجُلُ إِلَّا عَلَى مَنْ يَعْرِفُ، وَأَنْ يُبَرِّدَ الصَّبِيُّ الشَّيْخَ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی تێپەڕبوون بەنێو مزگەوتدا بەبێ ئەوەی دوو ڕکات سوننەتی تێدا بکرێ باش نییە و کەڕاهەتی هەیە، وە ڕوونکردنەوەش کە ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

واتە: سالمی کوڕی ئەبو جەعد دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: پیاوێك گەیشت بە عەبدوڵا ﷺ، وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ) ئەی ئیبنو مەسعود، عەبدوڵا وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بێگومان لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە پیاو بەنێو مزگەوتدا تێپەڕ دەبێت دوو ڕکات نوێژی تێدا ناکات، وە پیاو سەلام ناکات لە کەس مەگەر بیناسێت، منداڵیش کرێکاری بە پیاوی ڕیش سپی دەکات.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ جُلُوسِ الْجُنُبِ وَالْحَائِضِ فِي الْمَسْجِدِ

**١٣٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَوُجُوهُ بُيُوتِ أَصْحَابِهِ شَارِعَةٌ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «وَجِّهُوا هَذِهِ الْبُيُوتَ عَنِ الْمَسْجِدِ»، ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَصْنَعِ الْقَوْمُ شَيْئًا رَجَاءَ أَنْ يَنْزِلَ لَهُمْ فِي ذَلِكَ رُخْصَةٌ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ بَعْدُ، فَقَالَ: «وَجِّهُوا هَذِهِ الْبُيُوتَ عَنِ الْمَسْجِدِ؛ فَإِنِّي لَا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلَا جُنُبٍ»(١).

### باسی سەرزەنشتکردن لە دانیشتنی لەشگران و ئافرەتی حەیزدار لەنێو مزگەوت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات ڕووی دەرگای ماڵی هاوەڵان کراوە بوو بۆ نێو مزگەوتەکە، فەرمووی: ئەو ماڵانەی کە دەرگاکانیان ڕوویان لەنێو مزگەوتە وەریان بچەرخێنن (بۆ جێگایەکی دیکە)، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە، خەڵکەکە هیچ دەستکارییان نەکرد بە ئومێدی ئەوەی لەو بارەوە مۆڵەتێکیان بۆ دابەزێت، دواتر هاتە دەرەوە بۆ نێویان فەرمووی: ئەو ماڵانەی کە دەرگاکانیان ڕوویان لەنێو مزگەوتە وەریان بچەرخێنن، چونکە بەڕاستی من حەڵاڵی ناکەم بۆ حەیزدار و لەشگران بچێتە نێو مزگەوتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ الْمُبَاحَةِ فِي الْمَسْجِدِ غَيْرِ الصَّلَاةِ وَذِكْرِ اللَّهِ

### بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِنْزَالِ الْمُشْرِكِينَ الْمَسْجِدَ غَيْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِذَا كَانَ ذَلِكَ أَرْجَا لِإِسْلَامِهِمْ وَأَرَقَّ لِقُلُوبِهِمْ إِذَا سَمِعُوا الْقُرْآنَ وَالذِّكْرَ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ﴿٢٨﴾ ﴾التوبة

١٣٢٨- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ: أَنَّ وَفْدَ ثَقِيفٍ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَنْزَلَهُمُ الْمَسْجِدَ حَتَّى يَكُونَ أَرَقَّ لِقُلُوبِهِمْ[1].

## کۆباسی ئەو کردەوانەی ڕێگەپێدراون لەنێو مزگەوت جگە لە نوێژ و یادی خوا

### باسی مۆڵەتدان بە هاتنی هاوبەشدانەران بۆ نێو مزگەوت جگە لە مزگەوتی حەرام، ئەگەر ئومێدی ئەوە هەبوو مسوڵمان ببن و دڵیان بە بیستنی قورئان نەرم بێت، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: لەدوای ئەم ساڵ (کە ساڵی (٩)ی کۆچی بوو) با نزیک کەعبەی پیرۆز نەکەونەوە

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبولعاص ﷺ دەگێڕێتەوە، نوێنەری خەڵکی سەقیف هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەنێو مزگەوت پێشوازی لێ کردن بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دڵ نەرمبوونیان.

### بَابُ إِبَاحَةِ دُخُولِ عَبِيدِ الْمُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الذِّمَّةِ[2] الْمَسْجِدَ وَالْمَسْجِدَ الْحَرَامَ أَيْضًا

١٣٢٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، يَقُولُ فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ﴿٢٨﴾ ﴾التوبة، قَالَ: إِلَّا أَنْ يَكُونَ عَبْدًا أَوْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ[3].

---

(١) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٢) (أَهْلِ الذِّمَّةِ): دەستەواژەیەکی فیقهییە، مەبەست پێی هەریەك لە جوولەکە و گاور و خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانە کە لە ژێر دەسەڵات و دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین.

(٣) صحيح.

## باسی ڕێگە دراوە کۆیلە هاوبەشدانەرەکان و ئەو هاوبەشدانەرانەی کە لەژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلام دەژین بچنە نێو مزگەوت، هەروەها مزگەوتی حەرامیش

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ﴿٢٨﴾﴾، واتە: بەڕاستی هاوبەشدانەران پیسن، لە دوای ئەم ساڵ (کە ساڵی (٩)ی کۆچی بوو) با نزیك کەعبەی پیرۆز نەکەونەوە. دەڵێ: مەگەر کۆیلە بێت، یان یەکێك بێت لەو هاوبەشدانەرانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان دەژین.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي النَّوْمِ فِي الْمَسْجِدِ

**١٣٣٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَعْزَبُ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە خەوتن لەنێو مزگەوت

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ گەنج بووم لەنێو مزگەوت دەخەوتم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي مُرُورِ الْجُنُبِ فِي الْمَسْجِدِ مِنْ غَيْرِ جُلُوسٍ فِيهِ

**١٣٣١-** عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: كَانَ أَحَدُنَا يَمُرُّ فِي الْمَسْجِدِ وَهُوَ جُنُبٌ مُجْتَازًا[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە تێپەڕبوونی لەشگران بەنێو مزگەوت بەبێ دانیشتن تیایدا

واتە: جابر ﵁ دەڵێ: کەسی وا هەبوو لەنێو ئێمە بەنێو مزگەوتدا تێدەپەڕی لەشی گران بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ضَرْبِ الْخِبَاءِ وَاتِّخَاذِ بُيُوتِ الْقَصَبِ لِلنِّسَاءِ فِي الْمَسْجِدِ

**١٣٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ وَلِيدَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ لِحَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ فَأَعْتَقُوهَا، وَكَانَتْ عِنْدَهُمْ، فَخَرَجَتْ صَبِيَّةٌ لَهُمْ يَوْمًا عَلَيْهَا وِشَاحٌ مِنْ سُيُورٍ حُمْرٍ، فَوَقَعَ مِنْهَا، فَمَرَّتِ الْحُدَيَّاةُ فَحَسِبَتْهُ لَحْمًا فَخَطِفَتْهُ، فَطَلَبُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَاتَّهَمُوهَا بِهِ، فَفَتَّشُوهَا حَتَّى فَتَّشُوا قُبُلَهَا قَالَ: فَبَيْنَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ مَرَّتِ الْحُدَيَّاةُ، فَأَلْقَتِ الْوِشَاحَ، فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ، فَقَالَتْ لَهُمْ: هَذَا الَّذِي اتَّهَمْتُمُونِي بِهِ، وَأَنَا مِنْهُ بَرِيئَةٌ، وَهَا هُوَ ذِي كَمَا تَرَوْنَ، فَجَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَسْلَمَتْ، فَكَانَ لَهَا فِي الْمَسْجِدِ خِبَاءٌ أَوْ حِفْشٌ قَالَتْ: فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَجْلِسُ إِلَيَّ، فَلَا تَكَادُ تَجْلِسُ مِنِّي مَجْلَسَةً إِلَّا قَالَتْ: وَيَوْمُ الْوِشَاحِ مِنْ تَعَاجِيبِ رَبِّنَا إِلَّا أَنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الْكُفْرِ أَنْجَانِي فَقُلْتُ لَهَا: مَا بَالُكِ لَا تَجْلِسِينَ مِنِّي مَجْلِسًا إِلَّا قُلْتِ هَذَا؟ قَالَتْ: فَحَدَّثَتْنِي الْحَدِيثَ(١).

### باسی مۆڵەتدان بە دانانی چادر و
### دروستکردنی ماڵ بە قامیش بۆ ئافرەتان لەنێو مزگەوت

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: کچێکی ڕەشپێست کەنیزەکی هۆزێك لە هۆزەکانی عەرەب بوو، دواتر ئازادیان کرد، ئەو کەنیزەکە لەگەڵیان دەژیا، جارێك کچێکیان (بە مەبەستی بە شوودانی) دەرچوو پارچەیەکی پێستی سووری لەسەر شان و ملی دانابوو، نەخشێنرابوو بە مرواری گرانبەها، (کە ویستی خۆی بشۆری لەگەڵ جلەکانی دیکە) داینا، سوورەداڵێك تێپەڕی وای زانی پارچە گۆشتە بەسەریەوە،(کاتێ سپیایی مرواری بینی لەسەر سوورایی پێستەکە وایزانی گۆشتێکی قەڵەوە) بۆیە پەلاماریداو فڕاندی، ئەوانیش گەڕان بەدوایدا نەیاندۆزیەوە، کەنیزەکەکەیان تۆمەتبار کرد بەتەواوی پشکنییان تەنانەت داوێنیشیان پشکنی، وتی: لە کاتێکدا ئەوان لەو حاڵەدا بوون لەپڕ سوورەداڵێك هات و پێستەکەی فڕێدایە خوارەوە کەوتە نێوانیان، پێی وتن: ئەمە ئەوەیە کە ئێوە منتان بە دزینی تۆمەتبار کرد، لە کاتێکدا من لەوە بەری بووم، ئا ئەوە ئەوەیە کە دەیبینن، (ئەوانیش لەبەر ئەو تۆمەتەی دایانە پاڵی ئازادیان کرد)، ئەویش هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمان بوو، چادرێکی لەنێو مزگەوتدا هەڵدابوو، عائیشە

---

(١) صحيح.



وتی: دەهات بۆ لام دادەنیشت باسوخواسی دەکرد، هەر کاتێ دانەدەنیشت لەلام ئیللا دەیوت: (وَيَوْمَ الْوِشَاحِ مِنْ أَعَاجِيبِ رَبِّنَا... أَلَا إِنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الْكُفْرِ أَنْجَانِي)، واتە: لە ڕۆژی ئەو پارچە پێستەدا لە سەرسوڕێنەرەکانی پەروەردگارمان بوو... تەنها خوا منی ڕزگار کرد لە وڵاتی بێبڕوایی. عائیشە وتی: پێم وت: ئەوە چییە هەر کە لەلام دادەنیشیت ئەمە دەڵێی؟ وتی: ئەم بەسەرهاتەی بۆ باس کردم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ضَرْبِ الْأَخْبِيَةِ لِلْمَرْضَى فِي الْمَسْجِدِ وَتَمْرِيضِ الْمَرْضَى فِي الْمَسْجِدِ

**١٣٣٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ سَعْدًا رُمِيَ فِي أَكْحَلِهِ، فَضَرَبَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ خِبَاءً فِي الْمَسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ قَالَ: فَتَحَجَّرَ كَلْمُهُ لِلْبُرْءِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنْ لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أُجَاهِدَ فِيكَ مِنْ قَوْمٍ كَذَّبُوا نَبِيَّكَ، وَأَخْرَجُوهُ، وَفَعَلُوا وَفَعَلُوا، وَإِنِّي أَظُنُّ أَنْ قَدْ وُضِعَتِ الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، فَافْجُرْ هَذَا الْكَلْمَ حَتَّى يَكُونَ مَوْتِي فِيهِ قَالَ: فَبَيْنَاهُمْ ذَاتَ لَيْلَةٍ إِذِ انْفَجَرَ كَلْمُهُ فَسَالَ الدَّمُ مِنْ جُرْحِهِ حَتَّى دَخَلَ خِبَاءَ الْقَوْمِ، فَنَادَوْا: يَا أَهْلَ الْخِبَاءِ، مَا هَذَا الَّذِي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ، فَنَظَرُوا فَإِذَا لَبَّتُهُ قَدِ انْفَجَرَ مِنْ كَلْمِهِ، وَإِذَا الدَّمُ لَهُ هُدَيْرٌ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە دانانی دەوار بۆ نەخۆش لەنێو مزگەوت، وە چارەسەرکردنی نەخۆش لە مزگەوت

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، (لە ڕۆژی ئەحزابدا) تیر درا لە باڵی سەعد، پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا دەوارێکی بۆ هەڵدا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە سەردانی بکات و بارودۆخی بزانێ، برینی دەستی وشك بۆیەوە، وتی: خوایە بەڕاستی تۆ چاك دەزانی هیچ شتێك لەلای من خۆشەویستتر نییە ئەوەندەی ئەوەی لەپێناوی تۆ جیهادی ئەو هۆزە (قوڕەیش) بکەم، کە پێغەمبەرەکەتیان ﷺ بەدرۆ دانا و، شاربەدەریان کرد و، ئاواو ئاوایان کرد، من وا گومان دەبەم جەنگ لە نێوان ئێمە و ئەواندا وەستاوە، ئەم برینە بکولێنەوە تا بەهۆیەوە بمرم، وتی: لە کاتێکدا ئەوان لەسەر شێوەی ئاسایی خۆیان بوون لەپڕ برینەکەی تەقی و خوێنی لێ هاتە خوارەوە تا چووە نێو دەواری

---

(١) صحيح.




خەڵکەکەوە، وتیان: ئەی خاوەن دەوار ئەوە چییە لەلاتانەوە دێت بۆمان، تەماشایان کرد بینیان برینەکەی تەقیوە، خوێن جۆگەی بەستووە.

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ فِي مَسْجِدِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، وَتَكْفِيرِ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا بِهَا

١٣٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ دَاوُدَ لَمَّا فَرَغَ مِنْ بُنْيَانِ مَسْجِدِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سَأَلَ اللَّهَ حُكْمًا يُصَادِفُ حُكْمَهُ، وَمُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ، وَلَا يَأْتِي هَذَا الْمَسْجِدَ أَحَدٌ لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ فِيهِ إِلَّا خَرَجَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا اثْنَتَانِ فَقَدْ أُعْطِيَهُمَا، وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدْ أُعْطِيَ الثَّالِثَةَ»[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژکردن لە بەیتولمەقدیس، کە دەبێت بە کەفارەتی گوناە و هەڵەکان

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (فەرموویەتی): سولەیمانی کوڕی داود (علیهما السلام) کاتێ مزگەوتی بەیتولمەقدیسی تەواو کرد، داوای کرد لە خوا ﷻ (سێ شتی پێ ببەخشێ)، داوای کرد دەسەڵاتێکی پێ ببەخشێ هاوشێوەی دەسەڵاتی خۆی بێت، وە داوای پاشایەتییەکی کرد لە دوای ئەو بۆ هیچ کەس نەبێت، وە داوای کرد هەر کەسێك بچێت بۆ ئەو مزگەوتە (بەیتولمەقدیس) تەنها مەبەست و نیازی نوێژکردن بێت تیایدا مەگەر کاتێ دەردەچێت لێی پاك بێتەوە وەکوو چۆن لە دایك دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵام دووانیان خوا پێی بەخشیوە، ئومێدیش دەکەم خوا سێیەمی پێ بەخشیبێ.

## بَابُ ذِكْرِ صَلَاةِ الْوُسْطَى الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ بِالْمُحَافَظَةِ عَلَيْهَا عَلَى التَّكْرَارِ، وَالتَّأْكِيدِ بَعْدَ دُخُولِهَا فِي جُمْلَةِ الصَّلَوَاتِ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِالْمُحَافَظَةِ عَلَيْهَا، وَهَذَا مِنْ وَاوِ الْوَصْلِ الَّتِي نَقُولُ إِنَّمَا عَلَى مَعْنَى التَّكْرَارِ وَالتَّأْكِيدِ، لَا مِنْ وَاوِ الْفَصْلِ، إِذْ مُحَالٌ أَنْ تَكُونَ الصَّلَاةُ الْوُسْطَى لَيْسَتْ مِنَ الصَّلَوَاتِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾﴾البقرة، فَالصَّلَاةُ الْوُسْطَى كَانَتْ دَاخِلَةً فِي

---

(١) صحيح من غير هذا الطريق.

**الصَّلَوَاتِ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ فِي أَوَّلِ الذِّكْرِ بِالْمُحَافَظَةِ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: ﴿ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾ ﴾البقرة، عَلَى مَعْنَى التَّكْرَارِ وَالتَّأْكِيدِ، وَقَدِ اسْتَقْصَيْتُ هَذَا الْجِنْسَ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ عِنْدَ ذِكْرِ اعْتِرَاضِ مَنِ اعْتَرَضَ عَلَيْنَا فَادَّعَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ فَرَّقَ بَيْنَ الْإِيمَانِ وَالْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ بِوَاوِ اسْتِئْنَافٍ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴿٨٢﴾ ﴾البقرة**

**١٣٣٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ يَوْمَ الْأَحْزَابِ: «مَا لَهُمْ؟ مَلَأَ اللَّهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَارًا، كَمَا شَغَلُونَا عَنِ الصَّلَاةِ الْوُسْطَى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ»[1].

**باسی (صَلَاةِ الْوُسْطَى) واتە: نوێژی نێوەڕاست، کە خوا ﷻ فەرمانی کردووە پارێزگاری لێ بکرێ، ئەوەش بە جۆرێك کە لە ئایەتەکەدا بۆ جەختکردنەوە دووبارەی کردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەی دەچێتە نێو پێنج نوێژەکان، وە ئەو (واو)ەی کە لە (وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ )دا هاتووە بۆ دووبارە و جەختکردنەوەیە، نەك (واو)ی جیاکەرەوەی نێوان دوو ڕستە بێت، چونکە مەحاڵە (الصَّلَاةُ الْوُسْطَى) لەو نوێژانە نەبێ کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ حَٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾ ﴾، کەواتە: (الصَّلَاةُ الْوُسْطَى) لە چوارچێوەی ئەو نوێژانەیە کە خوا سەرەتا فەرمانی کردووە پارێزگارییان لێ بکرێ، پاشان فەرمووی: ﴿ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾ ﴾، بە مانای دووبارەکردنەوە و جەختکردنەوە، بێگومان ئەم شێوازەم لە پەرتووکی (الْإِيمَانِ) بە تێروتەسەلی باس کردووە، لە کاتی پەڵپگرتنی ئەو کەسەی پەڵپی لێ گرتووین، کە بانگەشەی ئەوە دەکات بێگومان خوا ﷻ ئیمان و کردەوەی چاکی لە یەکدی جیاکردۆتەوە بە (وَاوِ)ی (اسْتِئْنَاف) لە فەرمایشتی خۆی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴿٨٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە**

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئەحزابدا فەرمووی: ئەوە چییانە؟ خوا ماڵ و گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر، وەکوو چۆن سەرقاڵیان کردین لە ئەنجامدانی نوێژی (الْوُسْطَى) نێوەڕاست، تا خۆر ئاوا بوو.

---

(١) صحيح.

١٣٣٦- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: «مَلَأَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا كَمَا شَغَلُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى»(١).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئەحزابدا فەرمووی: خوا دڵ و گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر، وەکوو چۆن سەرقاڵیان کردین لە ئەنجامدانی نوێژی (الْوُسْطَى) نێوەڕاست.

١٣٣٧- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «شَغَلُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى صَلَاةِ الْعَصْرِ، مَلَأَ اللَّهُ قُبُورَهُمْ - أَوْ قَالَ: بُيُوتَهُمْ - نَارًا، ثُمَّ صَلَّى بَيْنَ الْعِشَاءَيْنِ»(٢).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرقاڵیان کردین لە ئەنجامدانی نوێژی (الْوُسْطَى) نێوەڕاست، نوێژی عەسر، خوا گۆڕەکانیان -یان فەرمووی: ماڵەکانیان- پڕ بکات لە ئاگر، پاشان لە نێوانی ئێوارەو عیشا ئەنجامیدا.

١٣٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الصَّلَاةُ الْوُسْطَى صَلَاةُ الْعَصْرِ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی (الْوُسْطَى) نێوەڕاست نوێژی عەسرە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ السَّهَرِ بَعْدَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

١٣٣٩- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَلَا يُحِبُّ الْحَدِيثَ بَعْدَهَا(٤).

## باسی سەرزەنشتکردن لە مانەوەی دوای نوێژی عیشا بە دەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: ئەبو بەرزە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ خەوتنی پێ باش نەبوو پێش نوێژی عیشا، حەزیشی لە قسەکردن و گفتوگۆ نەبوو لە دوایەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) هذا حجيث معلول.

(٤) صحيح.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَدَبَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السَّمَرَ بَعْدَ الْعَتَمَةِ.

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشتی کردین لە مانەوەو گفتوگۆ لە دوای نوێژی عیشا.

١٣٤٠- عَنِ عَبْدِ الصَّمَدِ قَالَ: يَعْنِي بِالْجَدْبِ الذَّمَّ[1].

واتە: عەبدولصەمەد دەڵێ: مانای (الْجَدْبِ): سەرزەنشتکردنە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ كَرَاهَةَ السَّمَرِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي غَيْرِ مَا يَجِبُ عَلَى الْمَرْءِ أَنْ يُنَاظِرَ فِيهِ، يَسْمُرُ فِيهِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي أُمُورِ الْمُسْلِمِينَ

١٣٤١- عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ ﷺ وَهُوَ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، جِئْتُ مِنَ الْكُوفَةِ وَتَرَكْتُ بِهَا رَجُلًا يُمْلِي الْمَصَاحِفَ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِهِ، فَغَضِبَ عُمَرُ وَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَزَالُ يَسْمُرُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ اللَّيْلَةَ كَذَاكَ فِي الْأَمْرِ مِنْ أُمُورِ الْمُسْلِمِينَ[2].

## باسی بەڵگە لەسەر کەراهەتی مانەوە لەدوای نوێژی عیشا بۆ ئەو شتە نییە کە پێویستە لەسەر بەندە گفتو گۆی تێدا بکات و بمێنێتەوە بۆ راپەڕاندنی کاروباری مسوڵمانان

واتە: عەلقەمە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عومەر ﷺ، ئەو لە عەرەفە ڕاوەستا بوو، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە کوفەوە هاتووم، پیاوێکم بەجێهێشت تیایدا موصحەفی قورئانی بەلەبەر دەنووسی، عومەر ﷺ تورە بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە دوای عیشا لەلای ئەبو بەکر ﷺ دەمایەوە، بەهەمان شێوە بۆ کاروبارێکیش لە کاروبارەکانی موسوڵمانان.

١٣٤٢- قَالَ أَبُو بَكْرٍ خَبَرُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُنَا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ حَتَّى يُصْبِحَ مَا يَقُومُ فِيهَا إِلَّا إِلَى عُظْمِ صَلَاةٍ. وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ[3].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

(٣) حديث عبدالله بن عمرو صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يُحَدِّثُهُمْ بَعْدَ الْعِشَاءِ عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لِيَتَّعِظُوا مِمَّا قَدْ نَالَهُمْ مِنَ الْعُقُوبَةِ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَا أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مِنَ الْعِقَابِ فِي الْآخِرَةِ لَمَّا عَصَوْا رُسُلَهُمْ، وَلَمْ يُؤْمِنُوا فَجَائِزٌ لِلْمَرْءِ أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا يَعْلَمُ أَنَّ السَّامِعَ يَنْتَفِعُ بِهِ مِنْ أَمْرِ دِينِهِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يَسْمُرُ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي الْأَمْرِ مِنْ أُمُورِ الْمُسْلِمِينَ، مِمَّا يَرْجِعُ إِلَى مَنْفَعَتِهِمْ عَاجِلًا وَآجِلًا دِينًا وَدُنْيَا، وَكَانَ يُحَدِّثُ أَصْحَابَهُ عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لِيَنْتَفِعُوا بِحَدِيثِهِ، فَدَلَّ فِعْلُهُ ﷺ عَلَى أَنَّ كَرَاهَةَ الْحَدِيثِ بَعْدَ الْعِشَاءِ بِمَا لَا مَنْفَعَةَ فِيهِ دِينًا، وَلَا دُنْيَا، وَيَخْطِرُ بِبَالِي أَنَّ كَرَاهَتَهُ ﷺ الِاشْتِغَالَ بِالسَّمَرِ؛ لِأَنَّ ذَلِكَ يُثَبِّطُ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ؛ لِأَنَّهُ إِذَا اشْتَغَلَ أَوَّلَ اللَّيْلِ بِالسَّمَرِ ثَقُلَ عَلَيْهِ النَّوْمُ آخِرَ اللَّيْلِ، فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ، وَإِنِ اسْتَيْقَظَ لَمْ يَنْشَطْ لِلْقِيَامِ.

ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی عەبدوڵای كوڕی عەمر ﷺ لەم شێوازەیە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی نەوەكانی ئیسرائیل قسەی بۆ دەكردن تا ڕۆژ دەبۆیەوە، هەڵنەدەستا تیایدا مەگەر بۆ نوێژە فەرزەكان نەبووایە. وە عیمرانی كوڕی حوصەینیش بەهەمان شێوەی ئەو دەگێڕێتەوە.

ئەبو بەكر دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ دوای عیشا قسەی بۆ دەكردن دەربارەی نەوەكانی ئیسرائیل بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری وەربگرن لەو سزا و ڕیسواییەی لە دنیادا تووشیان بوو، لەگەڵ ئەو سزایەی خوا بۆی ئامادە كردوون لە ڕۆژی دواییدا، كاتێ سەرپێچی پێغەمبەرەكانیان كردو بڕوایان نەهێنا، جا دروستە بۆ بەندە دوای عیشا هەرچی دەزانی باسی بكات بۆ ئەوەی بیسەر سوودی لێ وەربگرێ لە كاروباری ئاینیەكەی، چونكە پێغەمبەر ﷺ دوای عیشا دەمایەوە بۆ كاروبارێك لە كاروبارەكانی موسوڵمانان كە قازانجی هەبوو بۆیان لە ئیستا یان لە داهاتوو، وە بۆ دین و دنیایان، وە دوای عیشا قسەی بۆ دەكردن دەربارەی نەوەكانی ئیسرائیل تا سوود لە قسەكانی وەربگرن، جا كردەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەڕاهەتی قسەكردن دوای عیشا بۆ شتێكە سوودی نەبێت نە بۆ دین و نە بۆ دنیا، پێم وایە كەڕاهەت و باشنەبوونی خۆسەرقاڵكردن بە مانەوە دوای عیشا بۆ ئەوە بێت مرۆڤ خاو بكاتەوە لە شەونوێژ، چونكە ئەگەر سەرەتای شەو سەرقاڵ بوو بە نەخەوتن و مانەوە، ئەوە خەوی كۆتایی شەوی قورس دەبێت و هەڵناسێت، وە ئەگەر لەخەو هەستا ئەوە چالاك نابێت بۆ شەونوێژكردن.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الْخَوْفِ

### بَابُ صَلَاةِ الْإِمَامِ فِي شِدَّةِ الْخَوْفِ بِكُلِّ طَائِفَةٍ مِنَ الْمَأْمُومِينَ رَكْعَةً وَاحِدَةً لِتَكُونَ لِلْإِمَامِ رَكْعَتَانِ وَلِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةٌ، وَتَرْكِ الطَّائِفَتَيْنِ قَضَاءَ الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى جَوَازِ فَرِيضَةٍ لِلْمَأْمُومِ خَلْفَ الْإِمَامِ الْمُصَلِّي نَافِلَةً

**١٣٤٣-** عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ بِطَبَرِسْتَانَ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷺ: أَنَا، قَالَ: فَقَامَ حُذَيْفَةُ فَصَفَّ النَّاسَ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ مَكَانَ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا[١].

## كۆباسی نوێژی ترس

### باسی پێشنوێژ لە ئەوپەڕی ترسدا یەك ڕكات نوێژ دەكات بۆ هەریەك لەو دوو كۆمەڵە، نوێژی پێشنوێژ دەبێتە دوو ڕكات، وە نوێژی هەریەك لەو دوو دەستە دەبێتە ڕكاتێك، هەروەها هەردوو كۆمەڵەكە ڕكاتی دووەم قەزا ناكەنەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە بۆ نوێژخوێن نوێژی فەرز بكات لەپشت پێشنوێژەوە كە ئەو نوێژی سوننەت بكات

واتە: سەعلەبەی كوڕی زەهدەم دەڵێ: ئێمە لەگەڵ سەعیدی كوڕی عاصدا بووین لە تەبەرستان وتی: كێ لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی كردووە؟ حوزەیفە ﷺ وتی: من، وتی: حوزەیفە هەستا، خەڵكەكەی لە پشتیەوە كرد بە دوو ڕیز: ڕیزێك لە پشتیەوە، وە ڕیزێك ڕووبەڕووی دوژمن، یەك ڕكات نوێژی بەو ڕیزە كرد كە لە پشتیەوە بوون، پاشان ئەو ڕیزە ڕۆیشتنە شوێنی ئەوانە ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئەوانیش هاتن (لە پشتیەوە ڕیز بوون)، یەك ڕكات نوێژی بۆ ئەوانیش كرد، نوێژەكەیان نەگێڕایەوە.

**١٣٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِذِي قَرَدٍ، مِثْلُ صَلَاةِ حُذَيْفَةَ[٢].

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذِي قَرَدٍ) (کە جێگایەکە مەودای ڕۆژێك لە مەدینەوە دوورە) نوێژی کرد، هەر وەکوو نوێژەکەی حوزەیفە.

**١٣٤٥-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ صَلَاةِ حُذَيْفَةَ(١).

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەکوو نوێژەکەی حوزەیفە.

**١٣٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً(٢).

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ نوێژی فەڕز کردووە لە شوێنی نیشتەجێبووندا چوار ڕکات، وە لە گەشتدا دوو ڕکات، وە لە کاتی ترسیشدا یەك ڕکات.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى هَذِهِ الصَّلَاةَ بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضِ الطَّائِفَتَانِ شَيْئًا، وَالْعَدُوُّ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، وَأَنَّ الطَّائِفَةَ الَّتِي حَرَسَتْ مِنَ الْعَدُوِّ كَانَتْ أَمَامَ النَّبِيِّ ﷺ لَا خَلْفَهُ

**١٣٤٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِهِمْ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَقَامَ صَفٌّ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَصَفٌّ خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَقَدَّمَ هَؤُلَاءِ حَتَّى قَامُوا مَقَامَ أَصْحَابِهِمْ، وَجَاءَ أُولَئِكَ حَتَّى قَامُوا مَقَامَ هَؤُلَاءِ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَانِ وَلَهُمْ رَكْعَةٌ(٣).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەر یەکێك لەو دوو کۆمەڵە یەك ڕکات نوێژی کرد، وە هیچ کام لەو دوو کۆمەڵە نوێژەکەیان نەگێڕایەوە، دوژمن لە نێوان ئەوو قیبلەدا بوو، ئەو کۆمەڵەی پاسەوانییان کرد لەپێشی پێغەمبەرەوە ﷺ بوون نەك دوایەوە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردن، ڕیزێك لەپێشیەوە وەستان (ڕووبەڕووی دوژمن)، ڕیزێکی دیکەش لە دوایەوە، یەك ڕکات نوێژی بۆ ئەوانە کرد کە لە دوایەوە بوون، پاشان ئەوانە هاتنە پێشەوە لە جێگای هاوەڵەکانیان ڕاوەستان، ئەوانیشی کە لەپێشەوە بوون هاتن لە جێگای ئەوانی دیکە نوێژیان دابەست، پێغەمبەری خوا ﷺ یەك ڕکات نوێژی بۆ کردن، پاشان سەلامی دایەوە، جا پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی کرد ئەوانیش یەك ڕکاتیان کرد.

**١٣٤٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ، وَلَمْ يَقُلْ: ثُمَّ سَلَّمَ[١].

واتە: بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو لە ڕێگایەکی دیکەوە لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، بەڵام نەیوت: پاشان سەلامی دایەوە.

**١٣٤٩-** عَنِ ابْنِ عُمَر ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ صِفَةِ صَلَاةِ الْخَوْفِ «وَالْخَوْفُ أَقَلُّ مِمَّا ذَكَرْنَا، إِذَا كَانَ الْعَدُوُّ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، وَافْتِتَاحِ كِلْتَا الطَّائِفَتَيْنِ الصَّلَاةَ مَعَ الْإِمَامِ وَرُكُوعِهِمَا مَعَ الْإِمَامِ مَعًا»

**١٣٥٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْخَوْفِ فَرَكَعَ بِهِمْ جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ وَالْآخَرُونَ قِيَامٌ حَتَّى إِذَا نَهَضَ سَجَدَ أُولَئِكَ بِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الْمُقَدَّمُ حَتَّى قَامُوا مَعَ أُولَئِكَ، وَتَخَلَّلَ أُولَئِكَ حَتَّى قَامُوا مَقَامَ الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ، رَكَعَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ، فَلَمَّا رَفَعُوا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

رُءُوسَهُمْ سَجَدَ أُولَئِكَ سَجْدَتَيْنِ، كُلُّهُمْ قَدْ رَكَعَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَسَجَدُوا بِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، وَكَانَ الْعَدُوُّ مِمَّا يَلِي الْقِبْلَةَ»[١].

## باسی چۆنیەتی نوێژی ترس، کە ترس کەمتر بوو لەوەی باسمان کرد، ئەگەر دوژمن لە نێوان مسوڵمانان و قیبلە بوو، هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ پێشنوێژ نوێژ دەست پێدەکەن لەگەڵ پێشنوێژ ڕکووع دەبەن

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بۆ هاوەڵەکانی کرد، ڕکووعی بۆ هەموویان برد بە گشتی، پاشان پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد، لەگەڵ ئەو ڕیزەی کە ڕاستەوخۆ لە پشتیەوە بوون، ڕیزەکەی دوای دواوەوە ڕاوەستا بوون (چاودێری دوژمنیان دەکرد) هەتا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە سوژدەکەی هەستایەوە، ئینجا ئەوان دوو سوژدەیان بۆ خۆیان برد (واتە: ڕیزی دواوە)، پاشان ڕیزەکەی پێشەوە هاتە دواوە، تا لەگەڵ ئەوانی دیکەدا وەستان، ڕیزەکەی دواوەیش هاتنە ڕیزی یەکەم، پێغەمبەر ﷺ ڕکووعی بە هەموویان برد بە گشتی، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی برد هەروەها ئەو ڕیزەیش کە ڕاستەخۆ لە پشتیەوە بوون، کاتێ سەریان بەرز کردەوە، ئینجا ڕیزەکەی دواوە دوو سوژدەیان بۆ خۆیان برد، هەموویان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕکاتێکیان کرد، وە دوو سوژدەیان بۆ خۆیان برد، دوژمنیش لە نێوان موسوڵمانان و قیبلەدا بوو.

## بَابٌ فِي صِفَةِ الْخَوْفِ أَيْضًا «وَالْخَوْفُ أَشَدُّ مِمَّا تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهُ فِي الْبَابِ قَبْلَ هَذَا، وَإِبَاحَةِ افْتِتَاحِ الصَّفِّ الثَّانِي صَلَوَاتِهِمْ مَعَ الْإِمَامِ وَهُمْ قُعُودٌ وَافْتِتَاحِ الصَّفِّ الْأَوَّلِ صَلَوَاتِهِمْ مَعَ الْإِمَامِ وَهُمْ قِيَامٌ»

**١٣٥١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَطَائِفَةٌ مِنْ وَرَاءِ الطَّائِفَةِ الَّتِي خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قُعُودٌ وُجُوهُهُمْ كُلُّهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرَتِ الطَّائِفَتَانِ، فَرَكَعَ، فَرَكَعَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي خَلْفَهُ، وَالْآخَرُونَ قُعُودٌ، ثُمَّ سَجَدَ، فَسَجَدُوا أَيْضًا، وَالْآخَرُونَ قُعُودٌ، ثُمَّ قَامَ وَقَامُوا، وَنَكَسُوا خَلْفَهُمْ حَتَّى كَانُوا مَكَانَ

---

(١) صحيح.

أَصْحَابِهِمْ قُعُودٌ، وَأَتَتِ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، وَالْآخَرُونَ قُعُودٌ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَتِ الطَّائِفَتَانِ كِلْتَاهُمَا، فَصَلَّوْا لِأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ[1].

**باسی چۆنیەتی نوێژی ترس، ئەگەر ترسەکە سەختتر بوو لەوەی کە پێش ئەم بەشە باسمان کرد، وە ڕێگەدان بە ڕیزی دووەم نوێژەکانیان لەگەڵ پێشنوێژ دابەستن بەدانیشتنەوە، هەروەها ڕیزی یەکەمیش نوێژەکانیان لەگەڵ پێشنوێژ دابەستن بەپێوە**

واتە: جابری کوڕی عەبدولا ﷺ دەربارەی نوێژی ترس لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا کۆمەڵێکیش لەپشت ئەو کۆمەڵەی لەدوای پێغەمبەری خواوە ﷺ بوون دانیشتبوون، هەموویان ڕوویان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیر (الله أكبر)ی کرد، هەردوو کۆمەڵەکەیش تەکبیریان کرد، دواتر ڕکووعی برد، ئەو کۆمەڵەی لە پشتیەوە بوون ڕکووعیان برد، ئەوانی دیکەش دانیشتبوون، پاشان سوژدەی برد هەروەها ئەوانیش سوژدەیان برد، ئەوانی دیکەش دانیشتبوون، پاشان هەستایەوە ئەوانیش هەستانەوە، ئینجا بەدواوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە جێگای ئەوانەی دانیشتوون، دەستەکەی دیکەش هاتن ڕکووعێك و دوو سوژدەی بۆ ئەوانیش برد، ئەوانی دیکەش دانیشتبوون، پاشان سەلامی دایەوە، هەردوو کۆمەڵەکە هەستانەوە هەریەکەیان ڕکووعێك و دوو سوژدەیان بۆ خۆیان برد، ڕکووعێك و دوو سوژدەیان بۆ خۆیان برد.

**بَابٌ فِي صِفَةِ صَلَاةِ الْخَوْفِ وَالْعَدُوُّ خَلْفَ الْقِبْلَةِ «وَصَلَاةِ الْإِمَامِ بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَتَيْنِ، وَهَذَا أَيْضًا الْجِنْسَ الَّذِي أَعْلَمْتُ مِنْ جَوَازِ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ فَرِيضَةً خَلْفَ الْإِمَامِ الْمُصَلِّي نَافِلَةً، إِذْ إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ تَطَوُّعًا وَلِلْمَأْمُومِينَ فَرِيضَةً»**

**١٣٥٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى بِالطَّائِفَةِ الْأُخْرَى رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَصَلَّى بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَتَيْنِ[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**باسی چۆنیەتی نوێژی ترس کە دوژمن لەپشت قیبلە بوو، وە پێشنوێژ دوو ڕکات نوێژ دەکات بۆ هەردوو کۆمەڵەکە، بەهەمان شێوە ئەمەش لەو شێوازەیە کە پێشتر باسم کرد دروستە بۆ نوێژخوێن نوێژی فەرز بکات لەپشت پێشنوێژەوە کە ئەو نوێژی سوننەت بکات، چونکە یەکێك لەو دوو ڕکاتە بۆ پێغەمبەر ﷺ سوننەتە و بۆ نوێژخوێنەکانیش فەرزە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی بە یەکێك لەو دوو کۆمەڵە کرد، پاشان دوو ڕکاتیشی بەکۆمەڵەکەی دیکە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکاتی کرد، بۆ هەر کۆمەڵێك دوو ڕکات نوێژی کرد.

**١٣٥٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ قَالَ: صَلَّى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ بِطَائِفَةٍ مِنَ الْقَوْمِ رَكْعَتَيْنِ، وَطَائِفَةٌ تَحْرُسُ، فَسَلَّمَ فَانْطَلَقَ هَؤُلَاءِ الْمُصَلُّونَ، وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما دەربارەی نوێژی ترس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی بۆ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی کرد، کۆمەڵێکی دیکە پاسەوانییان دەکرد، دواتر سەلامی دایەوە، پاشان نوێژخوێنەکان چوونە جێگای ئەوانەی پاسەوانییان دەکرد، ئینجا ئەوانی دیکە هاتن دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، پاشان سەلامی دایەوە.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَيْضًا إِذَا كَانَ الْعَدُوُّ خَلْفَ الْقِبْلَةِ «وَالرُّخْصَةِ لِلطَّائِفَةِ الْأُولَى فِي تَرْكِ اسْتِقْبَالِهَا الْقِبْلَةَ بَعْدَ فَرَاغِهَا مِنَ الرَّكْعَةِ الْأُولَى لِتَحْرُسَ الطَّائِفَةَ الثَّانِية مِنَ الْعَدُوِّ وَقَضَاءِ الطَّائِفَتَيْنِ الرَّكْعَةَ الثَّانِية بَعْدَ تَسْلِيمِ الْإِمَامِ»

**١٣٥٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِهِمْ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَصَلَّى بِطَائِفَةٍ خَلْفَهُ رَكْعَةً، وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةٌ الْعَدُوَّ، ثُمَّ قَامَتِ الطَّائِفَةُ الَّذِينَ صَلَّوْا فَوَاجَهُوا الْعَدُوَّ، وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى هَؤُلَاءِ رَكْعَةً وَهَؤُلَاءِ رَكْعَةً»[٢].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی نوێژی ترس بەهەمان شێوە ئەگەر دوژمن لەپشت قیبلە بوو، وە ڕوخسەتدان بەکۆمەڵی یەکەم بە وازهێنان لە ڕووکردنە قیبلەدوای لێبوونەوەیان لە ڕکاتی یەکەم، بۆ ئەوەی پاسەوانی کۆمەڵی دووەم بکەن لە دوژمن، هەریەك لەو دوو دەستەیەش دوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ یەك ڕکاتەکەی دیکە تەواو دەکەن

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردن، یەك ڕکات نوێژی کرد بەکۆمەڵێك کە لە پشتیەوە بوون، کۆمەڵەکەی دیکەش بەرانبەر دوژمن بوون، پاشان ئەو کۆمەڵەی نوێژیان کرد هەستان بەرامبەر دوژمن بوونەوە، ئەوانی دیکەش هاتن، پێغەمبەر ﷺ یەك ڕکاتی پێ کردن، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان ئەوان یەك ڕکاتی دیکەیان کرد، ئەمانیش یەك ڕکاتیان کرد.

**١٣٥٥-** عَنْ مَعْمَرٍ، بِنَحْوِهِ[١].
واتە: لە ڕێگای مەعمەریشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَيْضًا إِذَا كَانَ الْعَدُوُّ خَلْفَ الْقِبْلَةِ وَإِتْمَامِ الطَّائِفَةِ الْأُولَى الرَّكْعَةَ الثَّانِيةَ قَبْلَ الْإِمَامِ

**١٣٥٦-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ قَالَ: يَقُومُ الْإِمَامُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَتَقُومُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ مِنْ قِبَلِ الْعَدُوِّ، وُجُوهُهُمْ إِلَى الْعَدُوِّ فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ يَقُومُونَ فَيَرْكَعُونَ لِأَنْفُسِهِمْ، وَيَسْجُدُونَ لِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، وَيَذْهَبُونَ إِلَى مَقَامِ أُولَئِكَ، وَيَجِيءُ أُولَئِكَ فَيَرْكَعُ بِهِمْ، وَيَسْجُدُ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، فَهِيَ لَهُ اثْنَتَانِ، وَلَهُمْ وَاحِدَةٌ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ، لِأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ[٢].

## باسی نوێژی ترس، بەهەمان شێوە ئەگەر دوژمن لەپشت قیبلە بوو، کۆمەڵی یەکەم ڕکاتی دووەم پێش ئیمام تەواو دەکەن

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەربارەی نوێژی ترس دەڵێ: پێشنوێژ هەڵدەستێ ڕوو دەکاتە قیبلە، کۆمەڵێکیش لە ئەوان لەگەڵی هەڵدەستن، کۆمەڵێکی

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

دیکەشیان ڕووبەڕووی دوژمن دەوەستن و ڕوویان لە دوژمنە، یەك ڕکات نوێژیان پێ دەکات، پاشان هەڵدەستن لە جێگای خۆیان ڕکووعێك بۆ خۆیان دەبەن و لەگەڵ دوو سوژدە، (واتە: ڕکاتێکی دیکە دەکەن)، دواتر دەچنە جێگای ئەوان، ئەوانیش دێن ڕکووعێکیان پێ دەبات لەگەڵ دوو سوژدە، بۆ پێشنوێژ دەبێتە دوو ڕکات، بۆ ئەوانیش یەك ڕکات، پاشان یەك ڕکووع بۆ خۆیان دەبەن لەگەڵ دوو سوژدەدا (واتە: ڕکاتێکی دیکە دەکەن).

**١٣٥٧-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوە.

## بَابُ انْتِظَارِ الْإِمَامِ الطَّائِفَةَ الْأُولَى جَالِسًا لِتَقْضِيَ الرَّكْعَةَ الثَّانِيَة، وَانْتِظَارِهِ الطَّائِفَةَ الثَّانِيَة جَالِسًا قَبْلَ التَّسْلِيمِ لِيَقْضِيَ الرَّكْعَةَ الثَّانِيَة

**١٣٥٨-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ: تَقُومُ طَائِفَةٌ وَرَاءَ الْإِمَامِ وَطَائِفَةٌ خَلْفَهُ، فَيُصَلِّي بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَقْعُدُ مَكَانَهُ حَتَّى يَقْضُوا رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَتَحَوَّلُونَ إِلَى مَكَانِ أَصْحَابِهِمْ، ثُمَّ يَتَحَوَّلُ أَصْحَابُهُمْ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، فَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَقْعُدُ مَكَانَهُ حَتَّى يُصَلُّوا رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ ثُمَّ يُسَلِّمُ[٢].

## باسی پێشنوێژ بەدانیشتەوە چاوەڕوانی کۆمەڵی یەکەم دەکات بۆ ئەوەی ڕکاتی دووەم تەواو بکەن، هەروەها چاوەڕوانی کۆمەڵی دووەمیش دەکات بە دانیشتنەوە پێش سەلامدانەوە بۆ ئەوەی ڕکاتی دووەم تەواو بکەن

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەڵێ: لە نوێژی ترسدا کۆمەڵێك لەدوای پێشنوێژەوە ڕادەوەستن (بۆ چاودێری)، وە کۆمەڵەکەی دیکەش ڕاستەوخۆ لە پشتیەوە دەبن، ڕکووعێك و دوو سوژدە بۆ ئەوانە دەبات کە ڕاستەوخۆ لە پشتیەوە بوون (واتە: یەك ڕکات)، پاشان لە جێگای خۆی دەمێنێ هەتا ڕکووعێك و دوو سوژدەکەی دیکەیان تەواو دەکەن، پاشان هەڵدەستن دەچن بۆ جێگای هاوەڵەکانیان، ئینجا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

هاوەڵەکانیان شوێنەکەیان دەگوازنەوە دێن بۆ جێگاکەی ئەمان، پێشنوێژ ڕکووعێك و دوو سوژدەیان پێ دەبات، پاشان لە جێگای خۆی دادەنیشێ هەتا یەك ڕکووعەکە و دوو سوژدەکەیان تەواو دەکەن، پاشان سەلام دەداتەوە.

**١٣٥٩**- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ هَذَا(١).

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوەی ئەوی دیکە.

**١٣٦٠**- عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ أَبِيهِ بِنَحْوِهِ(٢).

واتە: صاڵحی کوڕی خەووات لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوە.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَيْضًا، وَالرُّخْصَةِ لِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنْ تُكَبِّرَ مَعَ الْإِمَامِ وَهِيَ غَيْرُ مُسْتَقْبِلَةِ الْقِبْلَةِ إِذَا كَانَ الْعَدُوُّ خَلْفَ الْقِبْلَةِ «وَانْتِظَارِ الْإِمَامِ قَائِمًا بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الرَّكْعَةِ الْأُولَى لِلطَّائِفَةِ الَّتِي كَبَّرَتْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةِ فَيُصَلِّي الرَّكْعَةَ الَّتِي سَبَقَهُمْ بِهَا الْإِمَامُ وَانْتِظَارِ الطَّائِفَةِ الْأُولَى قَاعِدًا بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ السَّلَامِ، لِتَقْضِيَ الرَّكْعَةَ الثَّانِيةَ لِيَجْمَعَهُمْ جَمِيعًا بِالسَّلَامِ فَيُسَلِّمُونَ إِذَا سَلَّمَ إِمَامُهُمْ»

**١٣٦١**- عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ: هَلْ صَلَّيْتَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: نَعَمْ قَالَ: مَتَى؟ قَالَ: كَانَ عَامَ غَزْوَةِ نَجْدٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَقَامَتْ مَعَهُ طَائِفَةٌ وَطَائِفَةٌ أُخْرَى مُقَابِلَ الْعَدُوِّ، ظُهُورُهُمْ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكَبَّرُوا مَعَهُ جَمِيعًا الَّذِينَ مَعَهُ، وَالَّذِينَ يُقَابِلُونَ الْعَدُوَّ، ثُمَّ رَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَاحِدَةً، وَرَكَعَ مَعَهُ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ، وَالْآخَرُونَ قِيَامٌ مِمَّا يَلِي الْعَدُوَّ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَامَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ فَذَهَبُوا إِلَى الْعَدُوِّ فَقَابَلُوهُمْ، وَأَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ، فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ كَمَا هُوَ، ثُمَّ قَامُوا فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف والمتن صحيح.

ﷺ رَكْعَةً أُخْرَى، فَرَكَعُوا مَعَهُ وَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدٌ وَمَنْ مَعَهُ، ثُمَّ كَانَ السَّلَامُ فَسَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَلَّمُوا جَمِيعًا، فَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَانِ، وَلِكُلِّ رَجُلٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَتَانِ، رَكْعَتَانِ[1].

**باسی بەهەمان شێوە دەربارەی نوێژی ترس، وە مۆڵەتدان بە یەکێك لەو دوو کۆمەڵە لەگەڵ پێشنوێژ تەکبیر بکەن لە کاتێکدا ڕووبەڕووی قیبلە نەبن، ئەگەر دوژمن لەپشت قیبلە بوو، وە پێشنوێژ دوای تەواوکردنی ڕکاتی یەکەم بەڕاوەستانەوە چاوەڕوانی ئەو کۆمەڵە دەکات کە ڕووبەڕووی قیبلە نەبوون و تەکبیریان کرد، ئەوانیش دێن ئەو یەك ڕکاتە دەکەن کە پێشنوێژ پێشیان کەوتبوو، وە کۆمەڵی یەکەم چاوەڕوانی دەکات بە دانیشتنەوە هەتا لەدوای تەواوبوونی لە دوو ڕکاتەکە پێش سەلامدانەوە، بۆ ئەوەی ڕکاتی دووەم بکات هەموویان بەیەکەوە کۆبکاتەوە و بەیەکەوە سەلام بدەنەوە کاتێك پێشنوێژەکەیان سەلامی دایەوە**

واتە: مەڕوانی کوڕی حەکەم پرسیاری کرد لە ئەبو هورەیرە ﷺ: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترست کردووە؟ ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: بەڵێ، وتی: کەی؟ وتی: ساڵی جەنگی نەجد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژی عەسر، کۆمەڵێك لەگەڵی هەستان بۆ نوێژ، کۆمەڵەکەی دیکەیان ڕووبەڕووی دوژمن بوون و پشتیان لە قیبلە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیری کرد، هەموویان تەکبیریان کرد بەگشتی، ئەوانەی لەگەڵیدا بوون و ئەوانەیش کە ڕووبەڕووی دوژمن بوون، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ یەك ڕکووعی برد، ئەو کۆمەڵەی کە لەدواوەی بوون ڕکووعیان برد، پاشان سوژدەی برد، ئەو کۆمەڵەیش کە لەدواوەی بوون سوژدەیان برد، کۆمەڵەکەی دیکەش ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستابوون، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە، ئەو کۆمەڵەیش کە لە پشتیەوە بوون هەستانەوە، پاشان ڕۆیشتن ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستان، وە ئەو کۆمەڵەش هاتن کە ڕووبەڕووی دوژمن وەستابوون، ڕکووع و سوژدەیان برد، پێغەمبەری خواش ﷺ وەکوو خۆی ڕاوەستابوو، پاشان هەستانەوە، پێغەمبەری

---

(١) صحيح.

خوا ﷺ ڕکووعێکی دیکەی برد ئەوانیش لەگەڵیدا ڕکووعیان برد، هەروەها لەگەڵی سوژدەیشیان برد، پاشان ئەو کۆمەڵە هاتن کە ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستابوون، ڕکووعیان برد و سوژدەیان برد، پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشتبوو لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە ئەوانیش هەموویان سەلامیان دایەوە بە گشتی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی کرد، وە هەر پیاوێك لەو دوو کۆمەڵە دوو ڕکات دوو ڕکاتیان کرد.

**١٣٦٢-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁، وَمَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ يَسْأَلُهُ عَنْ صَلَاةِ الْخَوْفِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ قَالَ: فَصَدَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ صَدْعَيْنِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِمِثْلِ مَعْنَاهُ[١].

واتە: عورووەی کوڕی زوبەیر ﵄ دەڵێ: گوێم لێ بوو مەڕوانی کوڕی حەکەم پرسیاری لە ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەکرد دەربارەی نوێژی ترس، ئەبو هوڕەیرە ﵁ وتی: من لەو جەنگەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانی کرد بە دوو بەشەوە، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد بە هەمان مانای فەرموودەکەی پێشوو-.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَيْضًا وَانْتِظَارِ الْإِمَامِ الطَّائِفَةَ الْأُولَى بَعْدَ سَجْدَةٍ مِنَ الرَّكْعَةِ الْأُولَى لِيَسْجُدَ السَّجْدَةَ الثَّانِيَةَ «وَانْتِظَارِ الثَّانِيَةِ حَتَّى تَرْكَعَ رَكْعَةً لِتَلْحَقَ بِالْإِمَامِ فَتَسْجُدَ مَعَهُ السَّجْدَةَ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ يَنْتَظِرُهُمُ الْإِمَامُ قَائِمًا لِتَسْجُدَ السَّجْدَةَ الثَّانِيَةَ، وَجَمْعِ الْإِمَامِ الطَّائِفَتَيْنِ جَمِيعًا بِالرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ فَيَكُونُ فَرَاغُ الْإِمَامِ وَالْمَأْمُومِينَ جَمِيعًا مِنَ الصَّلَاةِ مَعًا»

**١٣٦٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ بِذَاتِ الرِّقَاعِ قَالَتْ: فَصَدَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ صَدْعَيْنِ، فَصَفَّتْ طَائِفَةٌ وَرَاءَهُ، وَقَامَتْ طَائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ قَالَتْ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكَبَّرَتِ الطَّائِفَةُ الَّذِينَ صُفُّوا خَلْفَهُ، ثُمَّ رَكَعَ وَرَكَعُوا، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدُوا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَرَفَعُوا، ثُمَّ مَكَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا وَسَجَدُوا لِأَنْفُسِهِمُ السَّجْدَةَ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ قَامُوا

---

(١) إسناده حسن.

فَنَكَصُوا عَلَى أَعْقَابِهِمْ يَمْشُونَ الْقَهْقَرَى، حَتَّى قَامُوا مِنْ وَرَائِهِمْ، وَأَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ قَالَ أَحْمَدُ: الْأُخْرَى، وَقَالَا جَمِيعًا: فَصَفُّوا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَكَبَّرُوا، ثُمَّ رَكَعُوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَجْدَتَهُ الثَّانِية، فَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي رَكْعَتِهِ، وَسَجَدُوا لِأَنْفُسِهِمُ السَّجْدَةَ الثَّانِية، ثُمَّ قَامَتِ الطَّائِفَتَانِ جَمِيعَاً، فَصَفُّوا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً وَرَكَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدُوا جَمِيعَاً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَرَفَعُوا مَعَهُ، كَانَ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَرِيعًا جِدًّا، لَا يَأْلُو أَنْ يُخَفِّفَ مَا اسْتَطَاعَ، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَلَّمُوا، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ شَرَكَهُ النَّاسُ فِي صَلَاتِهِ كُلِّهَا[1].

## باسی بەهەمان شێوە نوێژی ترس و، پێشنوێژ دوای سوژدەی یەکەم لە ڕکاتی یەکەم چاوەڕوانی کۆمەڵەی یەکەم دەکات بۆ ئەوەی سوژدەی دووەم ببەن، وە چاوەڕوانی کۆمەڵی دووەمیش دەکات تا یەك ڕکات دەکەن و دەگەن بە پێشنوێژ و سوژدەی دووەمی لەگەڵدا دەبەن، پاشان پێشنوێژ بەڕاوەستانەوە چاوەڕوانیان دەبێ تا سوژدەی دووەم دەبەن، دواتر پێشنوێژ لە ڕکاتی دووەم هەموویان کۆ دەکاتەوە، ئەوکات پێشنوێژو نوێژخوێنان پێکەوە نوێژەکە تەواو دەکەن

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کرد لە (ذَاتِ الرِّقَاع)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکەکەی کرد بە دوو بەشەوە، ڕیزێکی لە پشتیەوە دانا، ڕیزەکەی دیکەش ڕووبەڕووی دوژمن وەستان، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیری کرد، وە ئەو کۆمەڵەی کە ڕیزیان بەستبوو لە پشتیەوە تەکبیریان کرد، پاشان ڕکووعی برد و ئەوانیش ڕکووعیان برد، پاشان سوژدەی برد و ئەوانیش سوژدەیان برد، پاشان سەری بەرز کردەوە ئەوانیش سەریان بەرز کردەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە دانیشتنەکەیدا مایەوە، ئەوان سوژدەی دووەمیان بۆ خۆیان برد، پاشان هەستانەوە و پاشەوپاش بەدوای خۆیاندا گەڕانەوە، هەتا لە پشت کۆمەڵەکەی دیکەوە وەستان، وە دەستەکەی دیکەش هاتن لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیزیان بەست، دواتر تەکبیریان کرد، پاشان بۆ خۆیان ڕکووعیان برد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی دووەمی برد، ئەوانیش لەگەڵی سوژدەیان برد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە

---

(١) إسناده حسن.

بۆ ڕکاتەکەی دیکە، ئەوانیش سوژدەی دووەمیان بۆ خۆیان برد، پاشان هەردوو دەستەکە پێکەوە وەستان لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیزیان بەست، یەك ڕکووعی بۆ بردن هەموویان پێکەوە ڕکووعیان برد، پاشان سوژدەی برد هەموویان پێکەوە سوژدەیان برد، پاشان سەری بەرز کردەوە ئەوانیش لەگەڵی سەریان بەرز کردەوە، هەموو ئەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی ئەنجامی دان، درێغی نەدەکرد لەوەی نوێژەکە کورت بکاتەوە ئەوەندەی لە توانایدا بووایە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە، ئەوانیش سەلامیان دایەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا هەموو خەڵکەکە بەشدار بوون لە نوێژەکەیدا.

**بَابُ الْإِقَامَةِ لِصَلَاةِ الْخَوْفِ وَقَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ، أَنَّ قَوْلَهُ ﷻ: ﴿فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿١٠٢﴾﴾ النساء، تَحْمِلُ مَعْنَيَيْنِ: أَيْ صَلَّيْتَ لَهُمْ، وَالْمَعْنَى الثَّانِي أَيْ أَمَرْتَ بِإِقَامَةِ الصَّلَاةِ لِاجْتِمَاعِ النَّاسِ لِلصَّلَاةِ، وَأَعْلَمْتُ أَنَّ هَذَا عَلَى هَذَا الْمَعْنَى مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْنَا فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا: أَنَّ الْعَرَبَ تُضِيفُ الْفِعْلَ إِلَى الْآمِرِ، كَمَا تُضِيفُهُ إِلَى الْفَاعِلِ، فَإِذَا أَمَرَ الْإِمَامُ الْمُؤَذِّنَ بِالْإِقَامَةِ جَازَ أَنْ يُقَالَ: أَقَامَ الصَّلَاةَ إِذْ هُوَ الْآمِرُ بِهَا، فَأُقِيمَ بِأَمْرِهِ**

**١٣٦٤-** عَنْ يَزِيدَ الْفَقِيرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَسْأَلُ عَنِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ، أَقَصْرُهُمَا؟ قَالَ: لَا، إِنَّ الرَّكْعَتَيْنِ فِي السَّفَرِ لَيْسَتَا بِقَصْرٍ، وَإِنَّمَا الْقَصْرُ وَاحِدَةٌ عِنْدَه الْقِتَالِ، ثُمَّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَامَتْ خَلْفَهُ طَائِفَةٌ، وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِي خَلْفَهُ رَكْعَةً، وَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ إِنَّهُمُ انْطَلَقُوا فَقَامُوا مَقَامَ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَانُوا فِي وُجُوهِ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتْ تِلْكَ الطَّائِفَةُ فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَلَّمَ، فَسَلَّمَ الَّذِينَ خَلْفَهُ وَسَلَّمَ أُولَئِكَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُ جَابِرٍ: إِنَّ الرَّكْعَتَيْنِ فِي السَّفَرِ لَيْسَتَا بِقَصْرٍ، أَرَادَ لَيْسَتَا بِقَصْرٍ عَنْ صَلَاةِ الْمُسَافِرِ.

---

(١) صحيح.

**باسی قامەتکردن بۆ نوێژی ترس، بێگومان من ڕوونم کردەوە لە پەرتوکی (مَعَانِي الْقُرْآنِ)، فەرمایيشتی خوا ﷻ: ﴿ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، دوو مانا هەڵدەگرێ: واتە: نوێژت بۆ کردن، مانای دووەم: فەرمانت کرد بە قامەتکردنی نوێژ بۆ ئەوەی خەڵك کۆببنەوە بۆ نوێژ، جا ڕوونمکردۆتەوە ئەم مانایە لەو شێوازەیە کە لە چەندین شوێنی کتێبەکەماندا باسمان کردووە: عەرەب کار (الْفِعْلَ) دەداتە پاڵ فەرمان (الْأَمْرِ) وەکو چۆن دەیداتە پاڵ بکەر (الْفَاعِلِ)، جا ئەگەر پێشنوێژ فەرمانی کرد بە بانگدەر بە قامەتکردن، دروستە بوترێ: (أَقَامَ الصَّلَاةَ)، چونکە ئەو فەرمانکەرە، بە فەرمانی ئەو قامەت کراوە**

واتە: یەزیدی فەقیر دەگێڕێتەوە، پرسیاری کرد لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەربارەی نوێژ لە سەفەر ئایا کورتی بکەمەوە؟ وتی: نەخێر، بەڕاستی دوو ڕکاتی گەشت کورتکردنەوە نییە، بەڵکوو کورتکردنەوە یەك ڕکاتە لە کاتی جەنگ، پاشان وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، قامەت بۆ نوێژ کرا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا، کۆمەڵێکیش لە پشتیەوە هەستان، کۆمەڵێکی دیکەش ڕووبەڕووی دوژمن وەستان، یەك ڕکووع و دوو سوژەی بە ئەوانەی پشتەوەی کرد، (واتە: یەك ڕکات) پاشان ئەوان ڕۆیشتن لە جێگای ئەو کۆمەڵە ڕاوەستان کە ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئەو کۆمەڵەش هاتن پێغەمبەری خوا ﷺ یەك ڕکووع و دوو سوژدەی پێ کردن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە، ئەوانەی پشتەوەی سەلامیان دایەوە، هەروەها ئەوانی دیکەش.

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی جابر ﷜: بێگومان دوو ڕکات لە گەشت کورتکردنەوە نییە. مەبەستی پێی نوێژی کورت نییە بۆ گەشتیار (چونکە لە بنچینەدا دوو ڕکات بوو).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْقِتَالِ وَالْكَلَامِ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ، قَبْلَ إِتْمَامِ الصَّلَاةِ، إِذَا خَافُوا غَلَبَةَ الْعَدُوِّ

**١٣٦٥-** عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَبْدٍ السَّلُولِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ بِطَبَرِسْتَانَ، وَكَانَ مَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ شَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷜: أَنَا،

مُرْ أَصْحَابَكَ، فَيَقُومُوا طَائِفَتَيْنِ، طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، وَطَائِفَةٌ مِنْهُمْ خَلْفَكَ، فَتُكَبِّرُ وَيُكَبِّرُونَ جَمِيعًا، ثُمَّ تَرْكَعُ وَيَرْكَعُونَ ثُمَّ تَرْفَعُ فَيَرْفَعُونَ جَمِيعًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَسْجُدُ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيكَ، وَتَقُومُ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَإِذَا رَفَعْتَ رَأْسَكَ قَامَ الَّذِينَ يَلُونَكَ وَخَرَّ الْآخَرُونَ سُجَّدًا، ثُمَّ تَرْكَعُ فَيَرْكَعُونَ جَمِيعًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَسْجُدُ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيكَ، وَالطَّائِفَةُ الْأُخْرَى قَائِمَةٌ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَإِذَا رَفَعْتَ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ سَجَدَ الَّذِينَ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، ثُمَّ تُسَلِّمُ عَلَيْهِمْ، وَتَأْمُرُ أَصْحَابَكَ إِنْ هَاجَمَهُمْ هَيْجٌ، فَقَدْ حَلَّ لَهُمُ الْقِتَالُ وَالْكَلَامُ[١].

## باسی مۆڵەتدراوە لە کاتی جەنگ لەنێو نوێژی ترس قسە بکرێ، پێش تەواوبوونی نوێژ، ئەگەر ترسان لە زاڵبوونی دوژمن

واتە: سولەیمی کوڕی عەبدی سەلولی دەڵێ: ئێمە لەگەڵ سەعیدی کوڕی عاصدا بووین لە تەبەرستان، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ لەگەڵ بوو، وتی: کێ لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کردووە؟ حوزەیفە ﷺ وتی: من، فەرمان بە هاوەڵانت بکە، ببنە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێکیان ڕووبەڕووی دوژمن بوەستن، کۆمەڵەکەی دیکەشیان لە دواتەوە بوەستن، تۆ تەکبیر بکە ئەوانیش هەموویان تەکبیر بکەن، پاشان ڕکووع ببە و ئەوانیش ڕکووع ببەن، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە ئەوانیش سەریان بەرز بکەنەوە، پاشان سوژدە ببەکۆمەڵەکەی پشتەوەت سوژدە ببەن، کۆمەڵەکەی دیکەش ڕووبەڕووی دوژمن بوەستن، کاتێ سەرت بەرز کردەوە لە سوژدە و ڕاوەستای، ئەوانەی لەدواتەوەن هەڵدەستن، ئەوانی دیکە سوژدە دەبەن، پاشان ڕکووع دەبەی هەموویان لەگەڵت ڕکووع دەبەن، پاشان سوژدە دەبەی ئەو کۆمەڵەی لەدواتەوەن سوژدە دەبەن، کۆمەڵەکەی دیکە وەستاون ڕووبەڕووی دوژمن، جا کاتێ سەرت بەرز کردەوە لە سوژدە، ئەوانەی ڕووبەڕووی دوژمنن سوژدە دەبەن، پاشان سەلامیان بۆ دەدەیتەوە، فەرمانیش بە هاوەڵانت بکە ئەگەر دوژمن لەو کاتە هێرشی بۆ هێنان حەلاڵە لەدژیان بجەنگن و قسەش بکەن.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ إِبَاحَةِ صَلَاةِ الْخَوْفِ رُكْبَانًا وَمُشَاةً فِي شِدَّةِ الْخَوْفِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾ ﴾البقرة

**١٣٦٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلَاةِ الْخَوْفِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَإِنْ كَانَ خَوْفٌ أَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ صَلَّوْا رِجَالًا قِيَامًا عَلَى أَقْدَامِهِمْ، أَوْ رُكْبَانًا مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةَ وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا[1].

## باسی ڕێگەدان بە نوێژی ترس بەسواریی و پیادە لە کاتی ترسێکی سەخت، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ترسان ئەوە بەپیادە یان بە سواری

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، ئەو کاتێ پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی نوێژی ترس، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد بەدرێژی- وتی: ئەگەر ترسەکە لەوە زیاتر بوو بەپیادە لەسەر پێیەکانیان نوێژ بکەن، یان بەسواری بەرەوڕووی قیبلە بێت یان بەرەوڕووی نەبێت.

**١٣٦٧-** حَدَّثَنَا الرَّبِيعُ، عَنِ الشَّافِعِيِّ، عَنْ مَالِكٍ[2]

واتە: ئەم فەرموودەیە بەهەمان شێوە لە ڕێگایەکی دیکە لە مالیکەوە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ صَلَاةِ الْإِمَامِ الْمَغْرِبَ بِالْمَأْمُومِينَ صَلَاةَ الْخَوْفِ

**١٣٦٨-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِالْقَوْمِ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ سِتُّ رَكَعَاتٍ، وَلِلْقَوْمِ ثَلَاثٌ ثَلَاثٌ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

باسی چۆنیەتی نوێژ ترس لە نوێژی ئێوارە لەلایەن پێشنوێژەوە بە نوێژخوێنان

واتە: ئەبو بەكرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سێ ڕكات نوێژی ئێوارەی بەكۆمەڵێك لە هاوەڵانی كرد، پاشان ڕۆیشتن، وە كۆمەڵەكەی دیكە هاتن سێ ڕكات نوێژی بۆ ئەوانیش كرد، پێغەمبەر ﷺ شەش ڕكاتی كرد، خەڵكەكەش هەر كۆمەڵێك سێ ڕكاتیان كرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي وَضْعِ السِّلَاحِ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ إِذَا كَانَ بِالْمُصَلِّي أَذًى مِنْ مَطَرٍ أَوْ كَانَ مَرِيضًا

١٣٦٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ ﴿١٠٢﴾﴾النساء، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: كَانَ جَرِيحاً[١].

## باسی مۆڵەتدان بە دانانی چەك لە نوێژی ترس، ئەگەر نوێژخوێن ناڕەحەت بوو بەهۆی باران یان نەخۆش بوو

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە دەربارەی: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ ﴿١٠٢﴾﴾، واتە: تاوانتان لەسەر نییە، ئەگەر بەهۆی بارانەوە ناڕەحەت بوون یان نەخۆش بوون. عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف دەڵێ: ئەگەر بریندار بوو (با چەكەكەی دابنێت بەڵام دەبێ وریایی خۆی بكات).

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الْكُسُوفِ

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَأَنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ»

١٣٧٠- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِهِ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا، دِلَالَةٌ عَلَى حُجَّةِ مَذْهَبِ الْمُزَنِيِّ رَحِمَهُ اللَّهُ فِي الْمَسْأَلَةِ الَّتِي خَالَفَهُ فِيهَا بَعْضُ أَصْحَابِنَا فِي الْحَالِفِ إِذَا كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَقَالَ: إِذَا وَلَدْتُمَا وَلَدًا فَأَنْتُمَا طَالِقَتَانِ قَالَ الْمُزَنِيُّ: إِذَا وَلَدَتْ إِحْدَاهُمَا وَلَدًا طُلِّقَتَا إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ الْمَرْأَتَيْنِ لَا تَلِدَانِ جَمِيعًا وَلَدًا وَاحِدًا، وَإِنَّمَا تَلِدُ وَاحِدًا امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ، فَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا، إِنَّمَا أَرَادَ إِذَا رَأَيْتُمْ كُسُوفَ إِحْدَاهُمَا فَصَلُّوا، إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ فِي وَقْتٍ وَاحِدٍ، كَمَا لَا تَلِدُ امْرَأَتَانِ وَلَداً وَاحِداً».

## کۆباسی نوێژی خۆرگیران و مانگگیران

### باسی فەرمان بە نوێژکردن لە کاتی خۆرگیران و مانگگیران و، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو دووانە ناگیرێن لەبەر مردنی هیچ کەسێك، ئەو دووانە دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا

واتە: ئەبو مەسعود کە عوقبەی کوڕی عەمرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن، بەڵکوو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، ئەگەر بینیتان ئەوە نوێژ بکەن.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەی: ئەگەر بینیتان ئەوە نوێژ بکەن. بەڵگەیە بۆ مەزهەبی موزەنی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لەو مەسەلەی کە هەندێ لە هاوڕاکانمان پێچەوانەیان کردووە، سەبارەت بە سوێند خۆر ئەگەر دوو ژنی هەبوو بڵێ: ئەگەر منداڵێکتان بوو ئەوە هەردووکتان تەڵاق دراون، موزەنی دەڵێ: ئەگەر یەکێکیان منداڵێکی ببێت هەردووکیان تەڵاق دراون، بێگومان زانست پەی بەوە دەبات و ئاشکرایە کە دوو ئافرەت پێکەوە یەك منداڵیان نابێت، بەڵکوو منداڵێك تەنها لە یەك ئافرەت لە دایك دەبێت، جا فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ئەگەر بینیتان ئەوە نوێژ بکەن. تەنها مەبەستی ئەوەیە ئەگەر بینیتان یەکێك لەو دووانە گیرا، ئەوە نوێژ بکەن، چونکە زانست پەی بەوە دەبات خۆر و مانگ لە یەك کاتدا ناگیرێن، وەکوو چۆن دوو ئافرەت یەك منداڵیان نابێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ كُسُوفَهُمَا تَخْوِيفٌ مِنَ اللَّهِ لِعِبَادِهِ، قَالَ اللَّهُ ﷻ:

﴿وَمَا نُرْسِلُ بِالْآيَاتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾﴾ الإسراء

**١٣٧١-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: خُسِفَتِ الشَّمْسُ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ فَزِعًا يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ، فَقَامَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَقَامَ يُصَلِّي بِأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُهُ فِي صَلَاةٍ قَطُّ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الْآيَاتِ الَّتِي يُرْسِلُ اللَّهُ لَا تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئًا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ، وَدُعَائِهِ، وَاسْتِغْفَارِهِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆرگیران و مانگگیران بۆ ترساندنی بەندەکانە لەلایەن خواوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِالْآيَاتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾﴾، واتە: ئێمە موعجیزەکان نانێرین مەگەر بۆ ترساندن

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەپەلە هەستا ترسا لەوەی ڕۆژی دوایی ڕوو بدات، هەستا تا هاتە مزگەوت، نوێژی دابەست بەوەستانەوە بەدرێژترین وەستان و ڕوکوع و سوژدە، هەرگیز نەمبینی بوو بەو شێوەیە نوێژ بکات، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم نیشانانەی کە خوا دەینێرێ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەس نییە، بەڵکوو خوا بۆیە دەینێرێ بەندەکانی پێ بترسێنێ، جا ئەگەر ئێوە شتێکی لەو جۆرەتان بینی، بگەڕێنەوە بۆ لای یادی خوا و لێی بپاڕێنەوە و داوای لێخۆشبوون لێ بکەن.

تێبینی: لە دەقی ئەم فەرموودەدا پیتی (ما) لە پێش (رَأَيْتُهُ) نەهاتوە، بۆیە ماناکردنی بەبێ (ما) ڕستەکە دەبێتە هەڵە، بەڵام دوای گەڕان و پشکنین بۆمان دەرکەوت لە صەحیحی موسلیم ئاماژەی بەو (ما) کردووە لە فەرموودەی ژمارە (٩١٢) هەروەها لە سونەنی نەسائی موجتەبایش بە ژمارە (١٥٠٣).

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْخُطْبَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْأَمْرِ بِالتَّسْبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّكْبِيرِ مَعَ الصَّلَاةِ عِنْدَ الْكُسُوفِ إِلَى أَنْ يَنْجَلِيَ

**١٣٧٢-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّاسُ: إِنَّمَا انْكَسَفَتْ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاحْمَدُوا اللَّهَ، وَكَبِّرُوا، وَسَبِّحُوا، وَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ كُسُوفُ أَيِّهِمَا انْكَسَفَ، قَالَ: ثُمَّ نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[1].

### باسی وتاردان لەسەر مینبەر و فەرمانکردن بە (سبحان الله) و (الحمد لله) و (الله أكبر) لەگەڵ نوێژکردن، لە کاتی خۆرگیران یان مانگگیران تا دەردەکەوێتەوە

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی وتیان: لەبەر مردنی ئیبراهیم گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا، فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، ئەگەر ئەوەتان بینی (الحمد لله) و (الله أكبر) و (سبحان الله) بکەن و نوێژ بکەن، تاکو گیرانی هەریەکەیان کە گیراوە دەردەکەوێ، وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی دوو ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الدُّعَاءِ وَالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ فِي الْكُسُوفِ

**١٣٧٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا أَرْتَمِي بِأَسْهُمٍ لِي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذِ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَنَبَذْتُهَا وَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَانْتَهَيْتُ وَهُوَ قَائِمٌ رَافِعٌ يَدَيْهِ يُسَبِّحُ، وَيُكَبِّرُ، وَيَحْمَدُ، وَيَدْعُو حَتَّى انْجَلَتْ، وَقَرَأَ سُورَتَيْنِ، وَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی دەستبەرزکردنەوە لە کاتی پاڕانەوە و (سبحان الله) و (الله أکبر) و (الحمد لله) لە خۆرگیران یان مانگگیران

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من تیرم دەهاویشت لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ (نیشانەم پێی دەشکاند بەمەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد)، لەناکاو خۆر گیرا تیرەکانم فڕێدا، ڕۆیشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەیشتمە لای بینیم ڕاوەستاوە دەستەکانی بەرز کردۆتەوە (سبحان الله) و (الله أکبر) و (الحمد لله)ی دەکرد و دەپاڕایەوە تا خۆر دەرکەوتەوە، دوو سوڕەتی خوێند و دوو ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالدُّعَاءِ مَعَ الصَّلَاةِ عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ

**١٣٧٤-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَانْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ إِلَى الْمَسْجِدِ يَجُرُّ رِدَاءَهُ مِنَ الْعَجَلَةِ، وَلَاثَ إِلَيْهِ النَّاسُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا تُصَلُّونَ. فَلَمَّا كُشِفَ عَنْهَا خَطَبَنَا فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِمَا عِبَادَهُ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُمَا شَيْئًا فَصَلُّوا، وَادْعُوا حَتَّى يَنْكَشِفَ مَا بِكُمْ»[١].

## باسی فەرمانکردن بە پاڕانەوە لەگەڵ نوێژ لە کاتی خۆرگیران و مانگگیران

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەر ﷺ بووین، خۆر گیرا، (پێغەمبەر ﷺ) هەستا ڕۆیشت بۆ مزگەوت، عەباکەی ڕادەکێشا لە پەلەکردندا، خەڵکیش بۆ لای دەچوون، دواتر دوو ڕکات نوێژی کرد وەکوو چۆن نوێژ دەکەن، کاتێ خۆر دەرکەوت، وتارێکی بۆ داین، فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە، خوا ﷻ بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ، بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە هەتا بۆتان دەردەکەوێتەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ النِّدَاءِ بِأَنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ فِي الْكُسُوفِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا أَذَانَ وَلَا إِقَامَةَ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ»

**١٣٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄: إِنَّهُ لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نُودِيَ أَنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

## باسی بانگدان بە وتنی: نوێژ کۆکەرەوەیە، لە کاتی خۆرگیران یان مانگگیران، بەڵگەش لەسەر ئەوەی نوێژی خۆرگیران و مانگگیران بانگ و قامەتی تێدا نیە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە، کاتێ خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بانگ کرا بەڕاستی نوێژ کۆکەرەوەیە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

**١٣٧٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى يَقُولُ: حَجَّاجٌ الصَّوَّافُ مَتِينٌ، يُرِيدُ أَنَّهُ ثِقَةٌ حَافِظٌ[2].

واتە: (لەم ڕێگایشەوە هەمان فەرمودە گێڕدراوەتەوە) وە موحەممەدی کوڕی یەحیا دەڵێ: حەجاجی صەواف پتەوە، مەبەستی پێی ئەوەیە متمانەپێکراو و شارەزایە.

## بَابُ ذِكْرِ قَدْرِ الْقِرَاءَةِ مِنْ صَلَاةِ الْكُسُوفِ وَتَطْوِيلِ الْقِرَاءَةِ فِيهَا

**١٣٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّهُ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا نَحْوًا مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ ذَلِكَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ ذَاكَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ ذَلِكَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ ذَلِكَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لَا يُخْسَفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ فِي مَقَامِكَ هَذَا ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ. فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ مِنْهَا عُنْقُودًا، وَلَوْ أَخَذْتُهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا وَرَأَيْتُ النَّارَ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ مَنْظَرًا، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ، قَالُوا: مِمَّ يَا رَسُولَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: بِكُفْرِهِنَّ، قِيلَ: أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ[1].

## باسی ئەندازەی قورئانخوێندن لە نوێژی خۆرگیران و مانگگیران، وە درێژکردنەوەی قورئان خوێندن تیایاندا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، خەڵکەکەش لەگەڵی بوون، ڕاوەستا (نوێژی دابەست و فاتیحە و قورئانی خوێند) بەڕاوەستانێکی درێژ، کە بە نزیکەی خوێندنی سورەتی بەقەرە دەبوو، پاشان ڕکووعی برد ڕکووعێکی درێژ، پاشان سەری بەرز کردەوە و ڕاوەستا (فاتیحە و قورئانی خوێند) بەڕاوەستانێکی درێژ، کورتتر بوو لە ڕاوەستانەکەی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد ڕکووعێکی درێژ، کورتتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان هەستایەوە (فاتیحە و قورئانی خوێند) بەهەستاوەنەیەکی درێژ، کورتتر لە هەستانەوەی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد ڕکووعێکی درێژ، کورتتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سەری بەرز کردەوە و ڕاوەستا (فاتیحە و قورئانی خوێند) بەڕاوەستانێکی درێژ، کورتتر لە ڕاوەستانەکەی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد ڕکووعێکی درێژ، کورتتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان لێ بۆیەوە، خۆر دەرکەوتبوو، فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر ئەوەتان بینی یادی خوای گەورە بکەن. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بینیمان لە شوێنی خۆت تۆزێ پێش کەوتیت، دواتر بینیمان هاتیتە دواوە، فەرمووی: بەڕاستی من بەهەشتم بینی ویستم هێشوویەکی لێ بهێنم، ئەگەر بمهێنایە لێتان دەخوارد هەتا دنیا دەما، ئاگریشم بینی، هەرگیز دیمەنی وەکوو ئەمڕۆم نەبینیوە، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن، وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بە هۆی کوفرکردنیان، وترا: کوفر بە خوا دەکەن؟ فەرمووی: کوفر بەرانبەر مێردەکانیان دەکەن کە لەگەڵیان دەژین (واتە: شتی نابەجێیان بەرانبەر دەکەن، وە نکووڵی چاکەکان دەکەن، ئەگەر بە درێژایی ساڵ چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت پاشان شتێکی لێت بینی دەڵێ: هەرگیز خێر و چاکەم لە تۆ نەبینیوە).

---

(١) صحيح.

## بَابُ تَطْوِيلِ الْقِرَاءَةِ فِي الْقِيَامِ الْأَوَّلِ وَالتَّقْصِيرِ فِي الْقِرَاءَةِ فِي الْقِيَامِ الثَّانِي عَنِ الْأَوَّلِ

١٣٧٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرْكَبًا لَهُ قَرِيبًا، فَلَمْ يَأْتِ حَتَّى كَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَخَرَجْتُ فِي نِسْوَةٍ فَكُنَّا بَيْنَ يَدَيِ الْحُجْرَةِ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ مَرْكَبِهِ سَرِيعًا، وَقَامَ مَقَامَهُ الَّذِي كَانَ يُصَلِّي، وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَكَبَّرَ، وَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودِ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ سُجُودًا دُونَ السُّجُودِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، وَانْصَرَفَ، فَكَانَتْ صَلَاتُهُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، فَجَلَسَ، وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ[1].

## باسی درێژەدان بە قورئان خوێندن لە وەستانی یەکەم و کورتکردنەوەی قورئانخوێندن لە وەستانی دووەم، لە چاو وەستانی یەکەم

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخێکی خۆی بوو چوو بۆ شوێنێکی نزیك نەهاتەوە تا خۆر گیرا، منیش لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێك دەرچووم ئێمە لە پێشی ژوورەکەوە بووین، پێغەمبەر ﷺ بەسواری بەپەلە هات، لەو جێگایە کە نوێژی تێدا دەکرد وەستا خەڵکەکەیش لە پشتیەوە وەستان، دواتر تەکبیر (الله أكبر) ی کرد، ئەندازەیەکی زۆر بەپێوە وەستا، پاشان ڕکووعی برد ئەندازەیەکی زۆر لە ڕکووع مایەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، ئینجا وەستا درێژەی بە وەستانەکەیدا، بەڵام کەمتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد درێژەی دا بە ڕکووعەکەی، بەڵام کەمتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان هەستایەوە، پاشان سوژدەی برد و درێژەی دا بە سوژدەکەی، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان سوژدەی برد بە سوژدەبردنێك کورتتر لە سوژدەی یەکەم، پاشان هەستایەوە درێژەی دا بە وەستانەکەی، بەڵام کەمتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد و درێژەی دا بە ڕکووعەکەی، بەڵام کەمتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سەری بەرز کردەوە و هەستایەوە درێژەی دا بە وەستانەکەی،

---

(١) صحيح.

بەڵام کەمتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد و درێژەی دا بە ڕکووعەکەی، بەڵام کەمتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، نوێژەکەی تەواو کرد، جا نوێژەکەی چوار ڕکووع بوو لە چوار سوژدەدا، دواتر دانیشت خۆر دەرکەوتبووەوە.

## بَابُ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ مِنْ صَلَاةِ كُسُوفِ الشَّمْسِ

**١٣٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتِ: انْخَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّلَاةِ، ثُمَّ قَرَأَ قِرَاءَةً يَجْهَرُ فِيهَا، ثُمَّ رَكَعَ عَلَى نَحْوِ مَا قَرَأَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَرَأَ نَحْوًا مِنْ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ رَكَعَ عَلَى نَحْوِ مَا قَرَأَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، وَسَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فِي الرَّكْعَةِ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ بَشَرٍ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: وَذَلِكَ أَنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ مَاتَ يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ النَّاسُ: إِنَّمَا كَانَ هَذَا لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ»[1].

## باسی قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە نوێژی خۆرگیران

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژ، پاشان قورئانی خوێند دەنگی بەرز کردەوە تیایدا، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی ئەوەی کە قورئانی خوێند، پاشان سەری بەرز کردەوە، ئەندازەیەك قورئانی خوێند، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی ئەوەی کە قورئانی خوێند، پاشان سەری بەرز کردەوە و سوژدەی برد، پاشان لە ڕکاتەکەی دیکە هەستایەوە، بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەمی کرد، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر ئەوەتان بینی ڕوو بکەنە نوێژکردن، وتی: (بۆیە ئەوەی فەرموو چونکە) ئیبراهیم لەو ڕۆژەدا مرد، خەڵکەکە وتیان: بێگومان ئەوە بە هۆی مردنی ئیبراهیمەوەیە.

## ذِكْرُ عَدَدِ الرُّكُوعِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِنْ صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٨٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: وَكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَصَلَّى بِأَصْحَابِهِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ

---

(١) صحيح.

سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ نَحْوًا مِنْ ذَلِكَ، فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّهُ عُرِضَ عَلَيَّ كُلُّ شَيْءٍ تُوعَدُونَهُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ وَقَالَ: «وَإِنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُرِيكُمُوهَا، فَإِذَا خَسَفَا فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ»[١].

## باسی ژمارەی ڕكووع بردن لە هەموو ڕكاتێكدا لە نوێژی خۆرگیران

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا لە ڕۆژێكی زۆر گەرمدا، (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی بە هاوەڵەكانی كرد، وەستانی نوێژەكەی درێژ كردەوە تا خەریك بوو بەڕوودا بكەونە سەر زەوی، پاشان ڕكووعی بردو درێژی كردەوە، پاشان هەستایەوە و درێژی كردەوە، پاشان دوو سوژدەی برد، پاشان هەستایەوە بەهەمان شێوەی ڕكاتی یەكەمی كرد، جا چوار ڕكووع و چوار سوژدەی برد، پاشان فەرمووی: پاشان هەموو ئەو شتانەی بەڵێنیان پێ دراوە بۆم خرایە ڕوو نیشانم دران، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەكەی كرد، وە فەرمووی: ئەوان دەیانوت: بەڕاستی خۆر و مانگ ناگیرێن مەگەر لەبەر مردنی پیاوێكی گەورە نەبێت، بەڵام خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوا نیشانی ئێوەی دەدات، ئەگەر هەریەكێكیان گیران نوێژ بكەن تا دەردەكەوێتەوە.

١٣٨١- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا شَدِيدَ الْحَرِّ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَصْحَابِهِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ جَعَلَ يَتَقَدَّمُ ثُمَّ يَتَأَخَّرُ، فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّهُ عُرِضَ عَلَيَّ كُلُّ شَيْءٍ تُوعَدُونَهُ، فَعُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ حَتَّى تَنَاوَلْتُ مِنْهَا قِطْفًا، وَلَوْ شِئْتُ لَأَخَذْتُهُ، ثُمَّ تَنَاوَلْتُ مِنْهَا قِطْفًا فَقَصَرَتْ يَدَيَّ عَنْهُ، ثُمَّ عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ فَجَعَلْتُ أَتَأَخَّرُ خِيفَةَ تَغْشَاكُمْ، وَرَأَيْتُ فِيهَا امْرَأَةً حِمْيَرِيَّةً سَوْدَاءَ طَوِيلَةً تُعَذَّبُ فِي هِرَّةٍ لَهَا رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ، وَرَأَيْتُ أَبَا ثُمَامَةَ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، وَإِنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْخَسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُرِيكُمُوهَا اللَّهُ فَإِذَا خَسَفَتْ فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ هاوەڵەکانی کرد وەستانی نوێژی درێژ کردەوە تا خەریك بوو بەڕوودا بکەونە سەر زەوی، پاشان ڕکووعی برد و درێژی کردەوە، پاشان هەستایەوە و بەهەمان شێوەی کرد، ئینجا دەچووە پێشەوە و دەهاتە دواوە، چوار ڕکووعی برد و چوار سوژدەی برد، پاشان فەرمووی: (ئەوەم بۆ خرایە ڕوو کە بەڵێنتان پێ درابوو، بەهەشتم بۆ خرایە ڕوو تا دەستم درێژ کرد بۆ بۆڵێکی، ئەگەر بمویستایە دەمگرت، پاشان دەستم درێژ کرد بۆ بۆڵێکی دەستم پێی نەگەیشت، پاشان ئاگرم پێ نیشاندرا منیش دەهاتمە دواوە تا نەتانپۆشێ، وە ئافرەتێکی ڕەش پێستی باڵابەرز لە هۆزی حیمیەرییەم بینی تیایدا بە هۆی پشیلەیەکەوە سزا دەدرا بەستبوویەوە نە خۆراك و ئاوی پێ دەدا نە لێی دەگەڕا لە مێرووی سەر زەوی بخوات، وە ئەبو سومامە عەمری کوڕی مالیکم بینی ڕێخۆڵەی ڕادەکێشا لەنێو ئاگردا، وە ئەوان دەیانوت: خۆر و مانگ ناگیرێن مەگەر بۆ مردنی پیاوێکی گەورە، بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا نیشانتان دەدات، ئەگەر گیرا نوێژ بکەن هەتا دەردەکەوێ.

**١٣٨٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي كُسُوفٍ سِتَّ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە خۆرگیران شەش ڕکات و چوار سوژدەی برد.

**١٣٨٣-** عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنِ عُمَيْرٍ يُحَدِّثُ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ أُصَدِّقُ قَالَ: فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يُرِيدُ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ بِالنَّاسِ قِيَامًا شَدِيدًا، يَقُومُ بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُومُ، ثُمَّ يَرْكَعُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ ثَلَاثُ رَكَعَاتٍ، فَرَكَعَ الثَّالِثَةَ ثُمَّ سَجَدَ، حَتَّى إِنَّ رِجَالًا يَوْمَئِذٍ لَيُغْشَى عَلَيْهِمْ، حَتَّى سِجَالَ الْمَاءِ لَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مِمَّا قَامَ بِهِمْ، يَقُولُ إِذَا كَبَّرَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَلَمْ يَنْصَرِفْ حَتَّى تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُخَوِّفُكُمْ بِهِمَا، فَإِذَا كَسَفَا فَافْزَعُوا إِلَى اللَّهِ حَتَّى يَنْجَلِيَا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو عوبەیدوڵای کوڕی عومەیر باسی دەکرد، وتی: هەواڵی پێ دام ئەو کەسەی کە بەڕاستی دەزانم و بڕوام پێیەتی، گومانم برد مەبەستی پێی عائیشە ﵂ بێت، عائیشە وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، خەڵکی هەستان بۆ نوێژ بەوەستانێکی زۆر، پاشان ڕکووعی دەبرد، پاشان هەڵدەستا، پاشان ڕکووعی دەبرد، پاشان هەڵدەستا، پاشان ڕکووعی دەبرد، دوو ڕکاتی کرد لە هەر ڕکاتێکدا سێ ڕکووعی برد، دواتر سێیەم ڕکووعی کرد پاشان سوژدەی برد، تا پیاوانێك لەو ڕۆژەدا بێهۆش بوون، تەنانەت بە دۆڵەکە ئاویان دەکرد بەسەریاندا بەهۆی زۆر زۆر وەستاندنی لە نوێژدا، کاتێ (بچووایەتە ڕکووع) دەیفەرموو: (الله أكبر)، وە کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوەدەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده)، نوێژەکەی تەواو نەکرد تا خۆر دەردەکەوت، ئینجا هەستا سوپاس و ستاییشی خوای کرد و فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن، بەڵکوو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا دەتانترسێنێ پێی، ئەگەر گیران بە ترسەوە بڕۆن یادی خوا ﷻ بکەن تا دەردەکەوێت.

**١٣٨٤-** وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ ﵁: سِتُّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ[١].

واتە: وە لە فەرموودەی عەبدولمەلیکەوە هاتووە لە عەتاء لە جابرەوە ﵁: شەش ڕکووع بە چوار سوژدە.

**١٣٨٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ، فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ وَالْأُخْرَى مِثْلُهَا[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَجَائِزٌ لِلْمَرْءِ أَنْ يُصَلِّيَ فِي الْكُسُوفِ كَيْفَ أَحَبَّ، وَشَاءَ مِمَّا فَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ عَدَدِ الرُّكُوعِ، إِنْ أَحَبَّ رَكَعَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ رُكُوعَيْنِ، وَإِنْ أَحَبَّ رَكَعَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، وَإِنْ أَحَبَّ رَكَعَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ؛ لِأَنَّ جَمِيعَ هَذِهِ الْأَخْبَارِ صِحَاحٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهَذِهِ الْأَخْبَارُ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ مَرَّاتٍ لَا مَرَّةً وَاحِدَةً.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە خۆرگیران نوێژی کرد، قورئانی خوێند، پاشان ڕکووعی برد، پاشان قورئانی خوێند، پاشان ڕکووعی برد، پاشان قورئانی خوێند، پاشان ڕکووعی برد، پاشان قورئانی خوێند، پاشان ڕکووعی برد، پاشان سوژدەی برد، پاشان لە ڕکاتەکەی دیکە بەهەمان شێوەی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: دروستە بۆ بەندە چۆن پێی خۆشە بەو شێوە نوێژی خۆرگیران بکات، بەو شێوەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی لە ژمارەی ڕکووعەکان، ئەگەر پێی خۆش بوو با لە هەر ڕکاتێکدا دوو ڕکووع ببات، ئەگەریش پێی خۆش بوو لە هەر ڕکاتێدا سێ ڕکووع ببات، ئەگەریش پێی خۆش بوو لە هەر ڕکاتێدا چوار ڕکووع ببات، چونکە هەموو ئەو فەرموودانە تەواون لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەم فەرموودانەیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە چەند خۆرگیرانێك نوێژی کردووە نەك یەك جار.

## بَابُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ كُلِّ رُكُوعٍ وَبَيْنَ الْقِيَامِ الَّذِي قَبْلَهُ مِنْ صَلَاةِ الْكُسُوفِ

١٣٨٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَذَلِكَ يَوْمَ مَاتَ فِيهِ ابْنُهُ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، كَبَّرَ، ثُمَّ قَرَأَ فَأَطَالَ الْقِرَاءَةَ، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَامَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَرَأَ دُونَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَرَأَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَرَأَ دُونَ الْقِرَاءَةِ الثَّانِية، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَرَأَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ انْحَدَرَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ لَيْسَ فِيهَا رَكْعَةٌ إِلَّا الَّتِي قَبْلَهَا أَطْوَلُ مِنَ الَّتِي بَعْدَهَا، إِلَّا أَنَّ رُكُوعَهُ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِ، ثُمَّ تَأَخَّرَ فِي صَلَاتِهِ فَتَأَخَّرَتِ الصُّفُوفُ مَعَهُ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَتَقَدَّمَتِ الصُّفُوفُ مَعَهُ، فَقَضَى الصَّلَاةَ وَقَدْ أَضَاءَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ بَشَرٍ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكِ، فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ»[١].

## باسی یەکسانی لە نێوان ڕکووع و لە نێوان وەستانی پێش ڕکووع لە نوێژی خۆرگیران

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، ئەویش ئەو ڕۆژە بوو کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا کۆچی دوایی

---

(١) صحیح.

کرد، دواتر نوێژی بە خەڵکەکە کرد شەش جار ڕکووعی برد و چوار جاریش سوژدەی برد، تەکبیری کرد، پاشان قورئانی خوێند قورئانخوێندنەکەی درێژ کردەوە، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی ئەوەی کە بەپێوە وەستا، پاشان سەری بەرز کردەوە، دواتر قورئانی خوێند کورتتر لە قورئان خوێندنی یەکەم، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی ئەوەی قورئانی خوێند، پاشان سەری بەرز کردەوە، قورئانی خوێند کورتتر لە قورئان خوێندنی دووەم، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی ئەوەی قورئانی خوێند، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان داچەمی دوو سوژدەی برد، پاشان هەستا سێ ڕکووعی برد پێش ئەوەی سوژدە ببات، هیچ ڕکووعێکی تێدا نەبوو ئیللا ڕکووعی یەکەم درێژتر بوو لە ڕکووعی دوای ئەوە، ڕکووعەکەی بە ئەندازەی وەستانەکەی بوو، پاشان لەنێو نوێژەکەیدا هاتە دواوە، ڕیزەکانیش لەگەڵیدا هاتنە دواوە، پاشان چووە پێشەوە، ڕیزەکانیش لەگەڵیدا چوونە پێشەوە، نوێژەکەی تەواو کرد، خۆر ڕووناك بووبوو، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردنی هیچ مرۆڤێك ناگیرێن، ئەگەر شتێکی لەو جۆرەتان بینی، ئەوە نوێژ بکەن هەتا دەردەکەوێ.

## بَابُ التَّكْبِيرِ لِلرُّكُوعِ وَالتَّحْمِيدِ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ فِي كُلِّ رُكُوعٍ يَكُونُ بَعْدَهُ قِرَاءَةٌ، أَوْ بَعْدَ سُجُودٍ فِي آخِرِ رُكُوعٍ مِنْ كُلِّ رَكْعَةٍ

**١٣٨٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَخَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقَامَ وَكَبَّرَ وَصَفَّ النَّاسَ وَرَاءَهُ، فَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ، فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الْأَخِيرَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يُخْسَفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ»(١).

---

(١) صحيح.

## باسی (الله أكبر) كردن بۆ ڕكووع بردن و ستاییش كردن لە كاتی سەربەرزكردنەوە لە ڕكووع لە هەموو ڕكووعێك لە دوایەوە قوڕئان خوێندن دێت، یان دوای سوژدەبردن لە كۆتا ڕكووع لە هەموو ڕكاتێكدا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: خۆر گیرا لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵك دەرچوون بۆ مزگەوت، هەستا و تەكبیر (الله أكبر)ی كرد، خەڵكی لەدوای خۆی ڕیز كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕئانێكی درێژی خوێند، پاشان تەكبیری كرد، ڕكووعی برد ڕكووع بردنێكی درێژ، پاشان سەری بەرز كردەوە، فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، پاشان هەستایەوە قوڕئانێكی درێژی خوێند، كەمتر بوو لە خوێندنی یەكەم، پاشان تەكبیری كرد، ڕكووعی برد ڕكووع بردنێكی درێژ، كەمتر بوو لە خوێندنی یەكەم، پاشان فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، پاشان لە ڕكاتی كۆتاییدا بەوشێوەی كرد، چوار ڕكووعی تەواو كرد لەگەڵ چوار سوژدە، خۆر دەركەوت پێش ئەوەی نوێژەكەی تەواو بكات، پاشان هەستا وتاری بۆ خەڵكدا، سوپاس و ستاییشی خوای كرد بەوەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوا لەبەر مردن و ژیانی هیچ كەسێك ناگیرێن، ئەگەر بینیتان (هەركامەیان گیرا) ئەوە ڕوو بكەنە نوێژكردن.

## بَابُ الدُّعَاءِ وَالتَّكْبِيرِ فِي الْقِيَامِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ وَبَعْدَ قَوْلِ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٨٨-** عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ رَجُلٍ يُدْعَى حَنَشًا، عَنْ عَلِيٍّ ﵁: كَسَفَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى عَلِيٌّ ﵁ بِالنَّاسِ، بَدَأَ فَقَرَأَ بِـ "يس" أَوْ نَحْوِهَا، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِنْ قَدْرِ السُّورَةِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَامَ قَدْرَ السُّورَةِ يَدْعُو، وَيُكَبِّرُ، ثُمَّ رَكَعَ قَدْرَ قِرَاءَتِهِ أَيْضًا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ قَامَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، فَفَعَلَ كَفِعْلِهِ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى، ثُمَّ حَدَّثَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ كَذَلِكَ يَفْعَلُ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي هَذَا الْخَبَرِ: إِنَّهُ رَكَعَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِثْلُ خَبَرِ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ[١].

---

(١) إسناده ضعيف.

## باسی پاڕانەوە و تەکبیر (الله أكبر) کردن لە وەستانی دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع و دوای وتنی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) لە نوێژی خۆرگیران

واتە: حەکەم دەگێڕێتەوە لە پیاوێکەوە بانگ دەکرا بە حەنەش لە عەلییەوە ﷺ، خۆر گیرا عەلی ﷺ نوێژی بۆ خەڵك کرد، سەرەتا دەستی کرد بە سوڕەتی (یَس)، یان وێنەی ئەوە، پاشان ڕکووعی برد ئەندازەی خوێندنی سوڕەتێك مایەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، پاشان وەستا بە ئەندازەی خوێندنی سوڕەتێك دەپاڕایەوە و تەکبیری دەکرد، پاشان ڕکووعی برد بە ئەندازەی قورئان خوێندنەکەی، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان لە ڕکاتی دووەم هەستایەوە، بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەمی کرد، پاشان بۆی باس کردن پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەدا ئەو لە هەموو ڕکاتێکدا چوار جار ڕکووعی بردووە وەکوو فەرموودەکەی تاوس لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ.

## بَابُ تَطْوِيلِ السُّجُودِ فِي صَلَاةِ الكسوف

**١٣٨٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ، فَقَامَ حَتَّى لَمْ يَكَدْ يَرْكَعُ، ثُمَّ رَكَعَ حَتَّى لَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، وَلَمْ يَكَدْ يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ وَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَلَمْ يَكَدْ يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ(١).

## باسی درێژکردنەوەی سوژدە لە نوێژی خۆرگیران

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژێك خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ ئەوەی نوێژ بکات، نوێژی دابەست بەپێوە ئەندازەیەکی زۆر وەستا، پاشان ڕکووعی برد ئەندازەیەکی زۆر لە ڕکووع مایەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە ئەندازەیەکی زۆر مایەوە، پاشان سوژدەی برد ئەندازەیەکی زۆر لە سوژدە مایەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ تَقْصِيرِ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ فِي الْأُولَى فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٩٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْكُسُوفِ، وَقَالَ فِي الْخَبَرِ: ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ سُجُودًا دُونَ السُّجُودِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ ذَكَرَ بَاقِي الْحَدِيثِ[1].

### باسی کورتکردنەوەی سوژدەی دووەم لە ڕکاتی یەکەم لە نوێژی خۆرگیران

**واتە:** یەحیای کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە، لە عەمرە، لە عائیشەوە ﵂، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد بەدرێژی دەربارەی نوێژی خۆرگیرانی پێغەمبەر ﷺ، وە لە فەرموودەکەدا وتی: پاشان سوژدەی برد سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان سوژدەی برد کورتتر لە سوژدەی یەکەم، پاشان باسی تەواوی فەرموودەکەی کرد.

**١٣٩١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ مِثْلَهُ[2].

**واتە:** لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە عائیشەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ الْبُكَاءِ وَالدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٩٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ، فَقَامَ حَتَّى لَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْكَعَ، ثُمَّ رَكَعَ حَتَّى لَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَجَعَلَ يَنْفُخُ وَيَبْكِي، وَيَقُولُ: رَبِّ، أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ رَبِّ، أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُكَ؟. فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيْنِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ فَإِذَا انْكَسَفَا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ»، ثُمَّ قَالَ: «لَقَدْ عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ حَتَّى لَوْ شِئْتُ تَعَاطَيْتُ قِطْفًا مِنْ قُطُوفِهَا، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ فَجَعَلْتُ أَنْفُخُهَا، فَخِفْتُ أَنْ يَغْشَاكُمْ، فَجَعَلْتُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

أَقُولُ: رَبِّ، أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ رَبِّ، أَلَمْ تَعِدْنِي أَلَا تُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ؟»، قَالَ: «فَرَأَيْتُ فِيهَا الْحِمْيَرِيَّةَ السَّوْدَاءَ الطَّوِيلَةَ صَاحِبَةَ الْهِرَّةِ، كَانَتْ تَحْبِسُهَا فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَسْقِهَا وَلَا تَتْرُكُهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ، فَرَأَيْتُهَا كُلَّمَا أَدْبَرَتْ نَهَشَتْهَا، وَكُلَّمَا أَقْبَلَتْ نَهَشَتْهَا فِي النَّارِ، وَرَأَيْتُ صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ أَخَا بَنِي دُعْدُعٍ، يُدْفَعُ فِي النَّارِ بِعَصًا ذِي شُعْبَتَيْنِ، وَرَأَيْتُ صَاحِبَ الْمِحْجَنِ فِي النَّارِ الَّذِي كَانَ يَسْرِقُ الْحَاجَّ بِمِحْجَنِهِ، وَيَقُولُ: إِنِّي لَا أَسْرِقُ إِنَّمَا يَسْرِقُ الْمِحْجَنُ، فَرَأَيْتُهُ فِي النَّارِ مُتَّكِئًا عَلَى مِحْجَنِهِ»[1].

## باسی گریان و پاڕانەوە لە سوژدەدا لە نوێژی خۆرگیران

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژێك خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ ئەوەی نوێژ بکات، نوێژی دابەست بەپێوە ئەندازەیەکی زۆر وەستا، پاشان ڕکووعی برد ئەندازەیەکی زۆر لە ڕکووع مایەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە ئەندازەیەکی زۆر مایەوە، پاشان سوژدەی برد ئەندازەیەکی زۆر لە سوژدە مایەوە، فووی دەکرد و دەگریا و دەیفەرموو: ئەی پەروەردگارم بەڵێنت پێ نەدام تا من لەنێویان بم سزایان نەدەی، ئەی پەروەردگارم بەڵێنت پێ نەدام سزایان نەدەی هەتا ئێمە داوای لێخۆشبوونت لێ بکەین، کاتێ دوو ڕکاتەکەی تەواو کرد خۆر دەرکەوت، دواتر هەستا سوپاس و ستاییشی خوای کرد و فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا ﷻ، ئەگەر بینیتان یەکێکیان گیرا ئەوە بچن یادی خوا ﷻ بکەن، پاشان فەرمووی: بەڕاستی بەهەشتم لێ نزیك کرایەوە تەنانەت ئەگەر بمویستایە دەستم درێژ بکەم هێشووەکانم دەگرت، هەروەها ئاگریشم لێ نزیك کرایەوە فووم تێدەکرد ترسام لەوەی بتانپۆشێ، بۆیە دەموت: ئەی پەروەردگارم ئایا بەڵێنت پێ نەدام سزایان نەدەی تا من لەنێویاندا بم، ئەی پەروەردگارم ئایا بەڵێنت پێ نەدام سزایان نەدەی هەتا ئەوان داوای لێخۆشبوون بکەن، فەرمووی: ئافرەتێکی ڕەشپێستی باڵابەرزم بینی لە خێڵی حیمیەرییە بەهۆی پشیلەیەکەوە سزا دەدرا بەستبوویەوە نە خۆراك و ئاوی پێ دەدا، نە ڕێگەیشی پێ دەدا لە مێرووی سەر زەوی بخوات، بینیم کاتێ ئافرەتەکە لەنێو ئاگر پشتی لە پشیلەکە بکردایە گازی لێ دەگرت، کاتێکیش ڕووی تێبکردایە گازی لێ دەگرت، هەروەها خاوەنی دوو وشترەکەم بینی

---

(١) صحيح.

تیایدا برای نەوەکانی دوعدوع (ئەو دوو وشترەی پێغەمبەر ﷺ پێشکەشی کردبووە (بیت الحرام) پیاوێك لە هاوبەشدانەران هەردووكیانی برد، بۆیە ئەو ناوەی لێنا، چونکە بۆ خوا دایانبوو) لەنێو ئاگردا پاڵی پێوە دەنرا بە گۆچانێك دوو سەری هەبوو، وە خاوەن گۆچانەکەم بینی لەنێو ئاگر کە بە گۆچانەکەی دزی لە حاجییەکان دەکرد، دەیوت: من دزی ناکەم بەڵکوو گۆچانەکەم دزی دەکات، بینیم لەنێو ئاگردا کەوتبوو بەسەر گۆچانەکەیدا.

## بَابُ طُولِ الْجُلُوسِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى قِيلَ: لَا يَرْكَعُ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ حَتَّى قِيلَ: لَا يَرْفَعُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى قِيلَ: لَا يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ حَتَّى قِيلَ: لَا يَرْفَعُ، ثُمَّ رَفَعَ فَجَلَسَ حَتَّى قِيلَ: لَا يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَفَعَلَ فِي الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَمْحَصَتِ الشَّمْسُ[١].

### باسی درێژی دانیشتن لە نێوان دوو سوژدەکە لە نوێژی خۆرگیران

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی دابەست (فاتیحە و قورئانی زۆر تێدا خوێند) ئەوەندە درێژی کردەوە تا وترا: ئیدی ڕکووع نابات، پاشان ڕکووعی برد ئەوەندە ڕکووعەکەی درێژ کردەوە تا وترا: سەر بەرز ناکاتەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە وەستانەکەی ئەوەندە درێژ کردەوە تا وترا: ئیدی سوژدە نابات، پاشان سوژدەی برد، سوژدەکەی ئەوەندە درێژ کردەوە تا وترا: ئیدی سەر بەرز ناکاتەوە لە سوژدە، پاشان سەری بەرز کردەوە و دانیشت تا وترا: ئیدی سوژدە نابات، پاشان سوژدەی برد، پاشان لە ڕکاتەکەی دیکەشدا بەهەمان شێوەی کرد، پاشان خۆر دەرکەوتەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدُّعَاءِ وَالرَّغْبَةِ إِلَى اللَّهِ فِي الْجُلُوسِ فِي آخِرِ صَلَاةِ الْكُسُوفِ حَتَّى تَنْجَلِيَ الشَّمْسُ إِذَا لَمْ يَكُنْ قَدِ انْجَلَتْ قَبْلُ

**١٣٩٤-** عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ رَجُلٍ يُدْعَى حَنَشاً، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، كَسَفَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى عَلِيٌّ بِالنَّاسِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَا: قَامَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيةِ، فَفَعَلَ كَفِعْلِهِ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى، ثُمَّ جَلَسَ يَدْعُو وَيَرْغَبُ حَتَّى انْكَشَفَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ كَذَلِكَ يَفْعَلُهُ، قَالَ يُوسُفُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ كَذَلِكَ[١].

## باسی پاڕانەوە لە خوا لە دانیشتنی کۆتایی نوێژی خۆرگیران تا خۆر دەردەکەوێ، ئەگەر پێشتر دەرنەکەوتبوو

واتە: حەکەم دەگێڕێتەوە لە پیاوێکەوە بانگ دەکرا بە حەنەش لە عەلییەوە ﷺ، خۆر گیرا عەلی نوێژی بۆ خەڵك كرد، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتیان: (مەبەستی پێی گێڕەرەوەی نێو سەنەدەکەیە، موحەممەدی کوڕی یەحیا و یوسفی کوڕی موسا): (عەلی) لە ڕکاتی دووەم هەستایەوە، بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەمی کرد، پاشان دانیشت و دەپاڕایەوە تا خۆر دەرکەوت، پاشان بۆی باس کردن پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد. یوسف وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوەی کرد.

## بَابُ خُطْبَةِ الْإِمَامِ بَعْدَ صَلَاةِ الْكُسُوفِ

**١٣٩٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ فِي قِصَّةِ كُسُوفِ الشَّمْسِ، وَقَالَ: فَلَمَّا تَجَلَّتْ قَامَ - يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يُخْسَفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَا لِحَيَاتِهِ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ إِنْ مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ؟»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی وتاری پێشنوێژ دوای نوێژی خۆرگیران

واتە: لە عائیشەوە ﷺ، باسی فەرموودەکەی کرد لە باسی نوێژی خۆرگیران، وتی: کاتێ خۆر دەرکەوت پێغەمبەر ﷺ هەستا و وتاری بۆ خەڵکەکە دا، سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن، ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ، سوێند بە خوا هیچ کەس ئەوەندەی خوا توڕە نابێ کاتێ ببینێ بەندەکەی یان کەنیزەکەکەی زینا بکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ سوێند بە خوا ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، ئاگاداربن ئەوە من پەیامی خوام ڕاگەیاند.

**١٣٩٦-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ خَطَبَ أَيْضًا قَبْلَ الصَّلَاةِ. فَيَنْبَغِي لِلْإِمَامِ فِي الْكُسُوفِ أَنْ يَخْطُبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَبَعْدَهَا[١].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو مەسعود ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ بەهەمان شێوە پێش نوێژ وتاریدا. بۆیە دەبێ پێشنوێژ لە خۆرگیراندا پێش نوێژ و دوای نوێژ وتار بدات.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ اسْتِحْدَاثِ التَّوْبَةِ عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ، لِمَا سَبَقَ مِنَ الْمَرْءِ مِنَ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا

**١٣٩٧-** عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ عَبَّادٍ الْعَبْدِيِّ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ، أَنَّهُ شَهِدَ خُطْبَةً يَوْمًا لِسَمُرَةَ بْنَ جُنْدُبٍ، فَذَكَرَ فِي خُطْبَتِهِ قَالَ سَمُرَةُ بْنُ جُنْدُبٍ ﷺ: بَيْنَا أَنَا يَوْمًا وَغُلَامٌ مِنَ الْأَنْصَارِ نَرْمِي غَرَضًا لَنَا، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ قَيْدَ رُمْحَيْنِ، أَوْ ثَلَاثَةٍ فِي غَيْرِ النَّاظِرِينَ مِنَ الْأُفُقِ اسْوَدَّتْ حَتَّى كَأَنَّهَا تَنُّومَةٌ، فَقَالَ أَحَدُنَا لِصَاحِبِهِ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَوَاللَّهِ لَيُحْدِثَنَّ شَأْنُ هَذِهِ الشَّمْسِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي أُمَّتِهِ حَدَثًا، فَدَفَعْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا هُوَ بَارِزٌ، فَوَافَقْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ قَالَ: فَاسْتَقْدَمَ فَصَلَّى بِنَا كَأَطْوَلِ مَا قَامَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ، ثُمَّ رَكَعَ بِنَا كَأَطْوَلِ مَا رَكَعَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، وَلَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ، ثُمَّ سَجَدَ بِنَا كَأَطْوَلِ

---

(١) إسناده ضعيف.

مَا سَجَدَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ قَالَ: ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِية مِثْلَ ذَلِكَ قَالَ: فَوَافَقَ تَجَلِّي الشَّمْسِ جُلُوسَهُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِية قَالَ: فَسَلَّمَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَشَهِدَ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَشَهِدَ أَنَّهُ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ رَسُولُ اللَّهِ، فَأُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي قَصَرْتُ عَنْ شَيْءٍ مِنْ تَبْلِيغِ رِسَالَاتِ رَبِّي لَمَا أَجَبْتُمُونِي حَتَّى أُبَلِّغَ رِسَالَاتِ رَبِّي كَمَا يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُبَلَّغَ، وَإِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي قَدْ بَلَّغْتُ رِسَالَاتِ رَبِّي لَمَا أَخْبَرْتُمُونِي، قَالَ: فَقَامَ النَّاسُ، فَقَالُوا: شَهِدْنَا أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ رِسَالَاتِ رَبِّكَ، وَنَصَحْتَ لِأُمَّتِكَ، وَقَضَيْتَ الَّذِي عَلَيْكَ قَالَ: ثُمَّ سَكَتُوا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّ رِجَالًا يَزْعُمُونَ أَنَّ كُسُوفَ هَذِهِ الشَّمْسِ، وَكُسُوفَ هَذَا الْقَمَرِ، وَزَوَالَ هَذِهِ النُّجُومِ عَنْ مَطَالِعِهَا لِمَوْتِ رِجَالٍ عُظَمَاءٍ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، وَأَنَّهُمْ كَذَبُوا، وَلَكِنَّهَا آيَاتٌ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، يَفْتِنُ بِهَا عِبَادَهُ لِيَنْظُرَ مَنْ يُحْدِثُ مِنْهُمْ تَوْبَةً، وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ مُنْذُ قُمْتُ أُصَلِّي مَا أَنْتُمْ لَاقُونَ فِي دُنْيَاكُمْ وَآخِرَتِكُمْ، وَإِنَّهُ وَاللَّهِ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ ثَلَاثُونَ كَذَّابًا آخِرُهُمُ الْأَعْوَرُ الدَّجَّالُ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ الْيُسْرَى كَأَنَّهَا عَيْنُ أَبِي يَحْيَى - أَوْ تَحْيَا - لِشَيْخٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَإِنَّهُ مَتَى خَرَجَ فَإِنَّهُ يَزْعُمُ أَنَّهُ اللَّهُ، فَمَنْ آمَنَ بِهِ وَصَدَّقَهُ وَاتَّبَعَهُ، فَلَيْسَ يَنْفَعُهُ صَالِحٌ مِنْ عَمَلٍ سَلَفَ، وَمَنْ كَفَرَ بِهِ، وَكَذَّبَه فَلَيْسَ يُعَاقَبُ بِشَيْءٍ مِنْ عَمَلِهِ سَلَفَ، وَإِنَّهُ سَيَظْهَرُ عَلَى الْأَرْضِ كُلِّهَا إِلَّا الْحَرَمَ وَبَيْتَ الْمَقْدِسِ، وَإِنَّهُ يحصر الْمُؤْمِنِينَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَيُزَلْزَلُونَ زِلْزَالًا شَدِيدًا قَالَ: فَيَهْزِمُهُ اللَّهُ وَجُنُودَهُ، حَتَّى أَنَّ جِذْمَ الْحَائِطِ وَأَصْلَ الشَّجَرَةِ لَيُنَادِي: يَا مُؤْمِنُ هَذَا كَافِرٌ يَسْتَتِرُ بِي، تَعَالَ اقْتُلْهُ قَالَ: وَلَنْ يَكُونَ ذَلِكَ كَذَلِكَ حَتَّى تَرَوْا أُمُورًا يَتَفَاقَمُ شَأْنُهَا فِي أَنْفُسِكُمْ، تَسَأَلُونَ بَيْنَكُمْ هَلْ كَانَ نَبِيُّكُمْ ذَكَرَ لَكُمْ مِنْهَا ذِكْرًا، وَحَتَّى تَزُولَ جِبَالٌ عَنْ مَرَاتِبِهَا عَلَى أَثَرِ ذَلِكَ الْقَبْضُ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ الَّتِي فِي هَذَا الْخَبَرِ لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْنَا أَنَّ الْخَبَرَ الَّذِي يَجِبُ قَبُولُهُ خَبَرُ مَنْ يُخْبِرِ بِكَوْنِ الشَّيْءِ، لَا مَنْ يَنْفِي، وَعَائِشَةُ قَدْ خَبَّرَتْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ، فَخَبَرُ عَائِشَةَ يَجِبُ قَبُولُهُ؛ لِأَنَّهَا حفظَتْ جَهْرَ الْقِرَاءَةِ، وَإِنْ لَمْ يَحْفَظْهَا غَيْرُهَا، وَجَائِزٌ أَنْ يَكُونَ سَمُرَةُ كَانَ فِي صَفٍّ بَعِيدٍ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْقِرَاءَةِ، فَقَوْلُهُ: لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ: أَيْ لَمْ أَسْمَعْ صَوْتًا عَلَى مَا بَيَّنْتُهُ قَبْلُ أَنَّ الْعَرَبَ، تَقُولُ: لَمْ يَكُنْ كَذَا، لِمَا لَمْ يُعْلَمْ كَوْنُهُ.

---

(١) إسناده ضعيف.

## باسی چاکتر وایە بۆ مسوڵمان لە کاتی خۆرگیران تەوبەکەی نوێ بکاتەوە لەو گوناهو هەڵانەی کردوویەتی

واتە: سەعلەبەی کوڕی عەبادی عەبدی لە خەڵکی بەصرە دەگێڕێتەوە، ئەو ڕۆژێك گوێی لە وتاری سەمورەی کوڕی جوندوب بوو باسی وتارەکەی کرد، سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ وتی: لە کاتێکدا من و منداڵێکی ئەنصارەکان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تیرمان دەهاویشت بۆ ئەوەی ئامانجەکەمان بپێکین، تا خۆر بە ئەندازەی دوو ڕم یان سێ ڕمی مابوو لەپێش چاوی بینەر لە ئاسۆدا، تا وەکوو (تَنُّومَةٌ)ەی لێهات، (جۆرە ڕووەکێکە بەروبوومەکەی کەمێك ڕەشە) لەناکاو ڕەش بوو، یەکێکمان بەوی دیکەی وت: بڕۆ با بچین بۆ مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەم خۆرگیرانە بۆ ئوممەتەکەی دەکات، ڕۆیشتین بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خوامان ﷺ بینی کاتێ دەرچوو بۆ نێو خەڵکەکە، هەستا و نوێژی بۆ کردین، هەرگیز نوێژی ئەوەندە درێژی بۆ نەکردبووین، هیچ دەنگمان لێی نەدەبیست، پاشان ڕکووعی بۆ بردین هەرگیز ڕکووعی وا درێژی لە هیچ نوێژێکدا نەبردبوو، هیچ دەنگێکی لێ نەدەبیسترا، پاشان سوژدەی بۆ بردین هەرگیز سوژدەی وا درێژی لەنێو نوێژدا بۆ نەبردبووین، هیچ دەنگێکی لێ نەدەبیسترا، وتی: پاشان لە ڕکاتی دووەمیشدا بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەمی کرد، وتی: پاشان دانیشت لە ڕکاتی دووەم دانیشتەکەی لەگەڵ دەرچوونی خۆردا ڕێك بۆیەوە، وتی: ئینجا سەلامی دایەوە، دواتر سوپاس و ستاییشی خوای کرد و شایەتی دا بەوەی هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە لە خوا ﷻ، وە شایەتی دا بەوەی ئەو بەندەی خوا و پێغەمبەرێتی، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی منیش مرۆڤێکی نێردراوی خوام، یادی خواتان بیر دێنمەوە، ئەگەر ئێوە دەزانن، من کەمتەرخەمییەکم کردووە لە گەیاندنی پەیامی پەروەردگارم بۆ وەڵامم نادەنەوە تا پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم وەکوو چۆن پێویستە بەو شێوە بگەیەنرێ، وە ئەگەر ئێوە دەزانن من پەیامی خوام وەکوو خۆی ڕاگەیاندوە بۆچی هەواڵم پێ نادەن. وتی: خەڵکەکە هەستان وتیان: شایەتی دەدەین بەڕاستی تۆ پەیامی پەروەردگارت گەیاند و ئامۆژگاری ئوممەتەکەت کردووە و ئەرکی سەرشانت ڕاپەڕاندوە، وتی: پاشان بێدەنگ بوون، وتی: پێغەمبەری

خوا ﷺ فەرمووی: دوای ئەوە، بەڕاستی کەسانێك وا دەزانن ئەم خۆرگیرانە و ئەم مانگگیرانە، وە نەمانی ئەم ئەستێرانە لە جێگای خۆیان بەهۆی مردنی پیاوێکی گەورەی سەر زەوییەوەیە، بەڕاستی ئەوان درۆیان کرد، بەڵکوو نیشانەی خوایە بەندەکانی خۆی پێ تاقی دەکاتەوە، تا تەماشا بکات کێ لە ئەوان داوای تەوبە و لێخۆشبوون دەکات، سوێند بە خوا کاتێ هەستام بۆ نوێژ ئەوەی توشتان دەبێت لە کاروباری دنیا و دواڕۆژتان بینیم، وە سوێند بە خوا ڕۆژی دوایی نایەت تا سی درۆزن دەردەچێت یەکێکیان دەجالی کوێرە کە چاوی چەپی سڕاوەتەوە، هەر وەکوو چاوی ئەبو یەحیا -یان تەحیا- پیاوێکی بەساڵاچووی ئەنصارەکان وایە، بێگومان ئەو هەر کاتێك دەربچێت بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو خوایە، جا هەر کەس بڕوای پێ بهێنێت و بەڕاستی دابنێت و شوێنی بکەوێت، ئەوە هیچ کردەوەیەکی چاکی پێشووی سوودی پێ ناگەیەنێ، هەر کەسێکیش بڕوای پێ نەکات و بەدرۆی بخاتەوە ئەوە هەرگیز لەسەر کردەوە خراپەکانی پێشووی سزا نادرێت، وە بێگومان ئەو زاڵ دەبێت بەسەر هەموو سەر زەویدا جگە لە حەڕەم و بەیتولمەقدیس نەبێت، وە ئەو موسوڵمانان گیر دەدات لە بەیتولمەقدیس دەوریان دەدات بە سەختترین شێوە، فەرمووی: خوا دەجال و سەربازەکانی دەشکێنێ، تەنانەت دیوار و دار بانگی بڕوادار دەکات: ئەی بڕوادار ئەمە بێبڕوایەکە لێرەدا خۆی حەشار داوە، وەرە بیکوژە، ئەوەیش ڕوو نادات تا کۆمەڵە ڕووداوێکی مەزن نەبینن کە لە نەفس و دەروونتاندا گرانە و لەنێو یەکدیدا پرسیار لەبارەیەوە دەکەن: ئایا پێغەمبەرەکەتان باسی لەو جۆرەی بۆ کردوون، وە تا کێوەکان لە جێگای خۆیان نامێنن، وتی: بەدوای ئەوە ڕووحکێشان دێت، بە دەستی ئاماژەی کرد (سەر پەنجەکانی نوقاند).

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەی کە لەم فەرموودەدا هاتووە: (لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ)، واتە: هیچ دەنگی لێ نەدەبیسترا. لەو شێوازەیە زانیومانە ئەو فەرموودەی کە پێویستە وەربگیرێ فەرموودەی ئەو کەسەیە هەواڵ دەدا بە بوونی شتەکە نەك ئەو کەسەی ڕەتی دەکاتەوە، جا عائیشە هەواڵی داوە پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی بەرز قوڕئانی خوێند، هەواڵەکەی عائیشە پێویستە وەربگیرێ، چونکە ئەو قوڕئانخوێندنی بەدەنگی بەرز لە نوێژی خۆرگیران لەبەر کردووە، ئەگەرچی جگە لە ئەو لەبەری نەکردبێت، وە دروستە سەمورە لە ڕیزێکی دوور لە پێغەمبەر ﷺ بووبێت و گوێی لە قوڕئانخوێندنی نەبووبێت،

وتەکەی: (لَا يُسْمَعُ لَهُ صَوْتٌ)، واتە: من گوێم لە هیچ دەنگێك نەبوو، وەکوو پێشتر ڕوونم کردەوە کە عەرەب دەڵێ: (لَمْ يَكُنْ كَذَا)، مەبەستی ئەوەیە ئەو زانیاری نییە لەسەر بوونی ئەو شتە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّدَقَةِ عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ

**١٣٩٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ فِي آخِرِهِ: ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا تَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ، وَزَادَ فِيهِ هِشَامٌ: إِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَتَصَدَّقُوا، وَصَلُّوا»[1].

## باسی فەرمان بە بەخشین لە کاتی خۆرگیران

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆرگیرا، نوێژی بە خەڵکەکە کرد، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- لە کۆتاییەکەیدا وتی: پاشان تەواو بوو، فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ لەبەر مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، بەڵکوو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، جا ئەگەر ئەوەتان بینی ڕوو بکەنە نوێژکردن. هیشام ئەوەیشی تێدا زیاد کردووە: ئەگەر ئەوەتان بینی ببەخشن و نوێژ بکەن.

**١٣٩٩-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ زَمَانَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: «فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ، وَإِلَى ذِكْرِ اللَّهِ، وَالصَّدَقَةِ»[2].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وە فەرمووی: ئەگەر ئەوەتان بینی ڕوو بکەنە نوێژکردن و ڕوو بکەنە یادی خوا و بەخشین.

**١٤٠٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ الشَّمْسَ كَسَفَتْ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَظَنَّ النَّاسُ أَنَّهَا كَسَفَتْ لِمَوْتِهِ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

آيَاتِ اللَّهِ لَا يَكْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ، وَإِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَادْعُوا وَتَصَدَّقُوا»[١].

واته: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، خۆرگیرا لەو ڕۆژەی کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا کۆچی دوایی کرد، خەڵکەکە گومانیان وا بوو خۆر لەبەر مردنی ئیبراهیم گیراوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی ڕوو بکەنە نوێژکردن، وە بۆ لای یادی خوا و بپاڕێنەوە و ببەخشن.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ

١٤٠١- عَنْ أَسْمَاءَ ﷺ قَالَتْ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ[٢].

### باسی فەرمانکردن بە ئازادکردنی کۆیلە و کەنیزەك لە کاتی بینینی خۆرگیران

واته: ئەسماء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە خۆرگیراندا فەرمانی دەکرد بە ئازادکردنی کۆیلە و کەنیزەك.

## بَابُ ذِكْرِ عِلَّةٍ لِمَا تَنْكَسِفُ الشَّمْسُ إِذَا انْكَسَفَتْ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَخَالُ أَبَا قِلَابَةَ سَمِعَ مِنَ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَلَا أَقِفُ أَلِقَبِيصَةَ الْبَجَلِيِّ صُحْبَةٌ أَمْ لَا؟

١٤٠٢- عَنْ أَبِي قِلَابَةَ عَنْ قَبِيصَةَ الْبَجَلِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ انْخَسَفَتْ، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى انْجَلَتْ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّهُمَا خَلْقَانِ مِنْ خَلْقِهِ، وَيُحْدِثُ اللَّهُ فِي خَلْقِهِ مَا شَاءَ، ثُمَّ إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا تَجَلَّى لِشَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ خَشَعَ لَهُ، فَأَيُّهُمَا انْخَسَفَ فَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ أَوْ يُحْدِثَ لَهُ اللَّهُ أَمْرًا[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

**باسی هۆکارێکی خۆرگیران کاتێ کە گیرا، ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، بێگومان من پێم وا نییە ئەبو قیلابە هیچی بیستبێ لە نوعمانی کوڕی بەشیر، ناشزانم قەبیصەی بەجەلی هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ کردووە یان نا؟**

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە لە قەبیصەی بەجەلییەوە رضي الله عنه دەڵێ: خۆر گیرا، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی کرد تا دەرکەوت، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن، بەڵکوو دوو دروستکراون لە دروستکراوەکانی، بێگومان خوا پێشی دێنێ لە دروستکراوەکانیدا چۆنی بوێ، پاشان بەڕاستی خوا تبارك وتعالى ئەگەر خۆی نیشانی دروستکراوێکی بدات خوشوع و ترس و بیم دایدەگرێ، جا هەر کامەیان خۆر یان مانگ گیرا نوێژ بکەن تا دەردەکەوێ یان خوا شتێك دێنێتە پێش.

**١٤٠٣-** عَن أيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: فَإِذَا تَجَلَّى اللَّهُ لِشَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ خَشَعَ لَهُ[١].

واتە: ئەیوب دەگێڕێتەوە، لە ئەبو قیلابە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە رضي الله عنه دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- فەرمووی: ئەگەر خوا تبارك وتعالى خۆی نیشانی دروستکراوێکی بدات خوشوع و ترس و بیم دایدەگرێ.

**١٤٠٤-** عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه، نَحْوَ حَدِيثِ أَيُّوب[٢].

واتە: خالید دەگێڕێتەوە، لە ئەبو قیلابە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە رضي الله عنه بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی ئەیوب.

---

(١) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٢) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ وَمَا فِيهَا مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ التَّوَاضُعِ وَالتَّبَذُّلِ وَالتَّخَشُّعِ وَالتَّضَرُّعِ عِنْدَ الْخُرُوجِ إِلَى الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤٠٥-** عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَرْسَلَنِي أَمِيرٌ مِنَ الْأُمَرَاءِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ أَسْأَلُهُ عَنِ الِاسْتِسْقَاءِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَسْأَلَنِي؟ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَاضِعًا، مُتَبَذِّلًا، مُتَخَشِّعاً، مُتَضَرِّعاً، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدِ، وَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ[١].

## کۆباسی نوێژەبارانە و ئەوەشی تیایدایە لە سوننەتەکان

## باسی خۆبەکەمزانین و پۆشینی جلوبەرگی کۆنە و گەردنکەچی لە کاتی دەرچوون بۆ نوێژەبارانە

واتە: هیشامی کوڕی ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵای کوڕی کینانە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: کاربەدەستێك لە کاربەدەستان ناردمی بۆ لای ئیبنو عەباس ، پرسیاری لێبکەم دەربارەی نوێژەبارانە، ئیبنو عەباس وتی: ئەی خۆی بۆ پرسیارم لێ ناکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بە سادەیی و پۆشاکێکی کۆن و دڵسافی و گەردنکەچییەوە بۆ خوا، دوو ڕکات نوێژی کرد وەکوو چۆن لە جەژندا دەیکرد. وتاری نەدا وەکوو ئەم وتارەی ئێوە.

## بَابُ الْخُرُوجِ إِلَى الْمُصَلَّى لِلِاسْتِسْقَاءِ

**١٤٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﭬ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى فَاسْتَسْقَى، فَقَلَبَ رِدَاءَهُ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی دەرچوون بۆ نوێژگە بە مەبەستی نوێژەبارانە

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نوێژگە بە مەبەستی نوێژەبارانە، عەباکەی هەڵگێڕایەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ الْخُطْبَةِ قَبْلَ صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ

١٤٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَخَطَبَ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَدَعَا، وَاسْتَسْقَى، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ وَصَلَّى بِهِمْ(١).

## باسی وتاردان پێش نوێژەبارانە

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ نوێژەبارانە، وتاری دا، دواتر ڕووی کردە قیبلە و پاڕایەوە و داوای بارانی کرد، عەباکەیشی هەڵگێڕایەوە و نوێژی بۆ کردن.

## بَابُ تَرْكِ الْكَلَامِ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِي خُطْبَةِ الِاسْتِسْقَاءِ

١٤٠٨- عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَرْسَلَنِي فُلَانٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَسْأَلُهُ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَبَذِّلًا، مُتَضَرِّعًا، مُتَوَاضِعًا، فَلَمْ يَخْطُبْ نَحْوَ خُطْبَتِكُمْ هَذِهِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ(٢).

## باسی وازهێنان لە قسەکردن لە کاتی پاڕانەوە لە وتاری نوێژەبارانە

واتە: هیشامی کوڕی ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵای کوڕی کینانە دە گێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: فڵانە کەس ناردمی بۆ لای ئیبنو عەباس ، پرسیاری لێ بکەم دەربارەی نوێژەبارانەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

بەجلوبەرگێکی کۆن و شڕ و بەگەردنکەچی و بەخۆبەکەمزانینەوە، وتاری نەدا وەکوو ئەم وتارەی ئێوە، دوو ڕکات نوێژیشی کرد.

## بَابُ تَرْكِ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لِصَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ لَا يُؤَذَّنُ وَلَا يُقَامُ لِلتَّطَوُّعِ، وَإِنْ صُلِّيَتِ التَّطَوُّعُ فِي الْجَمَاعَةِ

**١٤٠٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا يَسْتَسْقِي، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ وَجَهَرَ، بِلَا أَذَانٍ وَإِقَامَةٍ(١).

## باسی وازهێنان لە بانگ و قامەت بۆ نوێژەبارانە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی بانگ و قامەت نادرێ بۆ نوێژی سوننەت، ئەگەرچی نوێژی سوننەت بە کۆمەڵیش بکرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك دەرچوو بۆ نوێژەبارانە، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین (قورئانی) بەدەنگی بەرز تێدا خوێند، بەبێ بانگ و قامەت (نوێژەکەمان کرد).

## بَابُ خُرُوجِ الْإِمَامِ بِالنَّاسِ إِلَى الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤١٠**- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ يَسْتَسْقِي فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ وَجَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَاسْتَسْقَى، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ(٢).

## باسی بردنەدەرەوەی خەڵك لە لایەن پێشەوای مسوڵمانانەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژەبارانە

واتە: عەبادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە، لە مامیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بردە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە، دواتر دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، (قورئانی) بە دەنگی بەرز تێدا خوێند، عەباکەیشی هەڵگێڕایەوە و دەستی بەرز کردەوە و داوای بارانی کردو ڕووی کردە قیبلە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ لِلدُّعَاءِ قَبْلَ الصَّلَاةِ لِلِاسْتِسْقَاءِ، وَتَحْوِيلِ الْأَرْدِيَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ

**١٤١١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ[١].

## باسی ڕووکردنە قیبلە بۆ پاڕانەوە پێش نوێژەبارانە، وە هەڵگێڕانەوەی عەبا پێشنوێژ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هیچ یەکێك لە پاڕانەوەکانی دەستی بەرز نەدەکردەوە جگە نوێژەبارانە نەبووایە.

## بَابُ صِفَةِ رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤١٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: اسْتَسْقَى هَكَذَا، وَمَدَّ يَدَيْهِ، وَجَعَلَ بَاطِنَهَا مَا يَلِي الْأَرْضَ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ[٢].

## باسی چۆنیەتی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە نوێژەبارانەدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە داوای بارانی دەکرد، دەستەکانی بەرز کردەوە و لەپی دەستی ڕوو کرد لە زەوی، تا سپیایی بنباڵەکانیم بینی.

**١٤١٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَادًّا يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، قَالَ سُلَيْمَانُ: ظَنَنْتُهُ يَدْعُو فِي الِاسْتِسْقَاءِ[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستەکانی درێژ کردبوو تا سپیایی بنباڵەکانیم بینی، سولەیمان (کە یەکێکە لە سەنەدی فەرموودەکە) وتی: پێم وایە لە نوێژەبارانەدا دەپاڕایەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ صِفَةِ تَحْوِيلِ الرِّدَاءِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ إِذَا كَانَ الرِّدَاءُ ثَقِيلًا

**١٤١٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى فَاسْتَسْقَى، فَقَلَبَ رِدَاءَهُ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَالَ الْمَسْعُودِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، قُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنَا جَعَلَ أَعْلَاهُ أَسْفَلَهُ، أَوْ أَسْفَلَهُ أَعْلَاهُ، أَمْ كَيْفَ جَعَلَهُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ جَعَلَ الْيَمِينَ الشِّمَالَ وَالشِّمَالَ الْيَمِينَ[1].

### باسی چۆنیەتی هەڵگێڕانەوەی عەبا لە نوێژەبارانە، ئەگەر عەباکە قورس بوو

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نوێژگە بۆ نوێژەبارانە، عەباکەی هەڵگێڕایەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد. مەسعودی دەڵێ: لە ئەبو بەکرەوە لە عەبادی کوڕی تەمیمەوە، پێم وت: هەواڵمان بدەرێ سەرەوەی خستە خوارەوە یان خوارەوەی خستە سەرەوە، یان چۆن؟ وتی: نەخێر، لای ڕاستی خستە لای چەپ و لای چەپیشی خستە لای ڕاست.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا حَوَّلَ رِدَاءَهُ، فَجَعَلَ الْأَيْمَنَ عَلَى الْأَيْسَرِ، وَالْأَيْسَرَ عَلَى الْأَيْمَنِ؛ لِأَنَّ الرِّدَاءَ ثَقُلَ عَلَيْهِ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ أَنْ يَجْعَلَ أَعْلَاهُ أَسْفَلَهُ

**١٤١٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﵁ قَالَ: اسْتَسْقَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ، فَأَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْخُذَهَا بِأَسْفَلِهَا فَيَجْعَلَهَا أَعْلَاهُ، فَلَمَّا ثَقُلَتْ عَلَيْهِ قَلَبَهَا عَلَى عَاتِقَيْهِ[2].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە عەباکەی هەڵگێڕایەوە و لای ڕاستی خستە لای چەپی و لای چەپیشی خستە لای ڕاستی، چونکە عەباکە قورس بوو لەسەر شانی، بۆیە گران بوو لەسەری خوارەوەی بخاتە سەرەوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەبارانەی کرد، پۆشاکێکی نەخشداری ڕەشی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی (پۆشاکەکەی هەڵاوگێر بکات) بەشی خوارەوەی پۆشاکەکە بهێنێتە سەرەوە، کاتێ کە قورس بوو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

بەلایەوە و نەگونجا، هەڵیگێڕایەوە بەسەر هەردوو شانیدا (واتە: لای ڕاستی خستە لای چەپی لای چەپیشی خستە لای ڕاستی).

## بَابُ صِفَةِ الدُّعَاءِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤١٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بَوَاكِي، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيًّا مُرِيعًا عَاجِلًا غَيْرَ آجِلٍ، نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ، فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمْ[١].

## باسی چۆنیەتی پاڕانەوە لە نوێژەبارانە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: کۆمەڵێك لە ئافرەتان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگریان (بەهۆی وشکەساڵی و نەبوونی باران)، فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنی بارانێکی بە فڕ و پیت و خۆش بێت (خنکان و ماڵ ڕوخان بەدوایدا نەیەت)، بەپەلە و بێدواکەوتن، بەسوود و بێزیان بێ، دەستبەجێ هەور دەرکەوت و ئاسمانی ناوچەکەیانی تەنی.

**١٤١٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە.

## بَابُ عَدَدِ رَكَعَاتِ صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤١٨-** قالَ أبُو بَكر فِي خَبرِ يُونس ومَعْمَر عنِ الزُّهْرِيِّ: صَلَّى رَكْعَتَيْنِ[٣].

## باسی ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژەبارانە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی یونس و مەعمەر هاتووە لە زوهرییەوە: (پێغەمبەر ﷺ) دوو ڕکاتی کرد.

---

(١) إسناده معلول بالإرسال.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ عَدَدِ التَّكْبِيرَاتِ فِي صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ كَالتَّكْبِيرِ فِي الْعِيدَيْنِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ، فَقَالَ: كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدَيْنِ

١٤١٩- عَنْ عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ الْمَدِينِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ جَدَّهُ هِشَامَ بْنَ إِسْحَاقَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ عُتْبَةَ أَمِيرَ الْمَدِينَةِ، أَرْسَلَهُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، سَلْهُ كَيْفَ صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ يَوْمَ اسْتَسْقَى بِالنَّاسِ؟ قَالَ إِسْحَاقُ: فَدَخَلْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا الْعَبَّاسِ، كَيْفَ صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ يَوْمَ اسْتَسْقَى؟ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَخَشِّعًا، مُتَبَذِّلًا، فَصَنَعَ فِيهِ كَمَا يَصْنَعُ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى[١].

## باسی ژمارەی تەكبیرەكانی نێو نوێژەبارانە، وەكو تەكبیری هەردوو جەژن وایە، ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەی سەوریدا هاتووە لە هیشامی كوڕی ئیسحاقەوە، وتی: هەر وەكو چۆن لە هەردوو جەژندا نوێژی دەكرد

واتە: عامری كوڕی لوئەی مەدینی دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە باپیرەی هیشامی كوڕی ئیسحاق بوو باسی دەكرد لە باوكیەوە ئیسحاقی كوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە، وەلیدی كوڕی عوتبە كاربەدەستی مەدینە، ناردی بۆ لای ئیبنو عەباس ، وتی: ئەی برازام پرسیاری لێ بكە بزانە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە نوێژەبارانەی بۆ خەڵك كرد چی كرد؟ ئیسحاق وتی: چووم بۆ لای ئیبنو عەباس، وتم: ئەی باوكی عەباس، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی نوێژەبارانەی كرد چی كرد؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەملكەچی و جلوبەرگێكی كۆنە هاتە دەرەوە، لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان چی كرد لەویشدا هەر ئەوەی كرد.

## بَابُ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ مِنَ التَّابِعِينَ أَنَّ صَلَاةَ النَّهَارِ عَجْمَاءُ، يُرِيدُ أَنْ لَا يَجْهَرَ بِالْقِرَاءَةِ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلَوَاتِ النَّهَارِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: جَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ

١٤٢٠- عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَوَلَّى النَّاسَ ظَهْرَهُ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، قَرَأَ فِيهِمَا، وَجَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

**باسی قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز لە نوێژەبارانەدا، بەڵگەش لەسەر دژی وتەی ئەو كەسەی لە تابعییەكان كە وا دەزانێ نوێژی ڕۆژ بەدەنگی بەرز قورئانی تێدا ناخوێنرێ، ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی مەعمەر، لە زوهرییەوە هاتووە (پێغەمبەر ﷺ) قورئانی بەدەنگی بەرز خوێندوە**

واتە: ئیبنو ئەبو زیئب دەگێڕێتەوە، لە زوهرییەوە، لە عەبادی كوڕی تەمیمەوە، لە مامیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێژەبارانە، ڕووی كردە قیبلە، خەڵكەكەش لە پشتیەوە بوون، عەباكەی هەڵگێڕایەوە و دوو ڕكات نوێژی كرد، قورئانی تیایاندا خوێند و لە قورئان خوێندنەكەیدا دەنگی بەرز كردەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاسْتِسْقَاءِ بِبَعْضِ قَرَابَةِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْبَلْدَةِ الَّتِي يَسْتَسْقِي بِهَا بِبَعْضِ قَرَابَتِهِ ﷺ

**١٤٢١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِذَا قَحَطُوا خَرَجَ يَسْتَسْقِي بِالْعَبَّاسِ، فَيَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا إِذَا قَحَطْنَا اسْتَسْقَيْنَا بِنَبِيِّكَ فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَسْتَسْقِيكَ الْيَوْمَ بِعَمِّ نَبِيِّكَ - أَوْ نَبِيِّنَا - فَاسْقِنَا، فَيُسْقَوْنَ(١).

**باسی چاكتر وایە داوای بارانبارین بكرێ بە هۆی هەندێ لە خزمەكانی پشتی پێغەمبەر ﷺ لەو شارەی كە داوای بارانی تێدا دەكرێ (بەمەرجێ ئەو كەسە كە لە خانەوادەی پێغەمبەری خوایە ﷺ زیندوو بێ، چونكە وەسیلە بە مردوو دروست نییە و سەری لەنێو شیركدایە، پەنا دەگرم بە خوا لە هاوبەشدانان بۆ خوا)**

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتاب ﷺ كاتێ وشكەساڵی و بێبارانی بووایە دەهاتە دەرەوە عەباسی دەهێنایە دەرەوە بە ئەو داوای بارانبارینی دەكرد، دەیوت: ئەی خوایە ئێمە ئەگەر تووشی وشكەساڵی بووایەین لە سەردەمی پێغەمبەرەكەت ﷺ هانامان بۆی دەهێنا داوامان لێی دەكرد بپاڕێتەوە بەڵكوو بارانمان بۆ ببارێنیت، بارانت بۆ دەباراندین، وە ئێمە ئەمڕۆ هانامان بۆ هێناوی بە مامی پێغەمبەرەكەت ﷺ -یان پێغەمبەرەكەمان ﷺ- بارانمان بۆ ببارێنە، دواتر بارانیان بۆ دەباری.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِعَادَةِ الْخُطْبَةِ الثَّانِيةِ بَعْدَ صَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ

**١٤٢٢-** عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ رَاشِدٍ يُحدِّثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ حُمَيد بْنِ عَبْدِ الرَّحمن عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمًا يَسْتَسْقِي، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ بِلَا أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ قَالَ: ثُمَّ خَطَبَنَا وَدَعَا اللَّهَ، وَحَوَّلَ وَجْهَهُ نَحْوَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ، ثُمَّ قَلَبَ رِدَاءَهُ، فَجَعَلَ الْأَيْمَنَ عَلَى الْأَيْسَرِ، وَالْأَيْسَرَ عَلَى الْأَيْمَنِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْقَلْبِ مِنَ النُّعْمَانِ بْنِ رَاشِدٍ فَإِنَّ فِي حَدِيثِهِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ تَخْلِيطٌ كَثِيرٌ، فَإِنْ ثَبَتَ هَذَا الْخَبَرُ فَفِيهِ دَلَالَةٌ عَلَى: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ وَدَعَا، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ مَرَّتَيْنِ: مَرَّةً قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَمَرَّةً بَعْدَهَا.

### باسی دووبارەکردنەوەی وتاری دووەم دوای نوێژەبارانە

واتە: نوعمانی کوڕی ڕاشید باس دەکات لە زوهرییەوە، لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك دەرچوو بۆ نوێژەبارانە دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین بەبێ بانگ و بەبێ قامەت، پاشان وتاری بۆ داین و لە خوا پاڕایەوە و ڕووی کردە قیبلە و دەستەکانی بەرز کردەوە، پاشان عەباکەی هەڵگێرایەوە، لای ڕاستی خستە لای چەپی و لای چەپیشی خستە لای ڕاستی.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی نوعمانی کوڕی بەشیر، چونکە لە فەرموودەکەی لە زوهرییەوە تێکەڵاوییەکی زۆر هەیە، ئەگەر ئەم فەرموودەیە جێگیر بوو ئەوە بەڵگەی تێدایە پێغەمبەر ﷺ دوو جار وتاری داوە و پاڕاوەتەوە و پۆشاکەکەی هەڵگێڕاوەتەوە، جارێك پێش نوێژ جارێکیش دوای نوێژ.

## بَابُ الِاسْتِسْقَاءِ فِي الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذَا اشْتُكِيَ إِلَى الْإِمَامِ بِقَحْطِ الْمَطَرِ، وَدُعَاءِ الْإِمَامِ بِحَبْسِ الْمَطَرِ عَنِ الْمُدُنِ وَالْقُرَى، إِذَا اشْتُكِيَ إِلَيْهِ كَثْرَةَ الْأَمْطَارِ وَخِيفَ هَدْمُ الْبُنْيَانِ وَانْقِطَاعُ السَّبِيلِ

---

(١) إسناده ضعيف.

١٤٢٣- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَامَ إِلَيْهِ النَّاسُ فَصَاحُوا قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَحَطَ الْمَطَرُ، وَاحْمَرَّ الشَّجَرُ، وَهَلَكَ الْبَهَائِمُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا، اللَّهُمَّ اسْقِنَا، قَالَ: وَايْمُ اللَّهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً مِنْ سَحَابٍ فَنَشَأَتْ سَحَابَةٌ فَانْتَشَرَتْ، ثُمَّ إِنَّهَا أَمْطَرَتْ، فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى وَانْصَرَفَ، فَلَمْ يَزَلْ تُمْطِرُ إِلَى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، فَلَمَّا قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، صَاحُوا قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَحْبِسَهَا عَنَّا قَالَ: فَتَبَسَّمَ، وَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا»، قَالَ: فَتَقَشَّعَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ، فَجَعَلَتْ تُمْطِرُ حَوْلَهَا، وَمَا تُمْطِرُ بِالْمَدِينَةِ قَطْرَةً قَالَ فَنَظَرْتُ إِلَى الْمَدِينَةِ وَإِنَّهَا لَفِي مِثْلِ الْإِكْلِيلِ(١).

## باسی داوای بارانبارین لە وتاری ڕۆژی هەینی، ئەگەر سکاڵای وشکەساڵی و نەبوونی باران کرا لەلای پێشنوێژ، پێشنوێژ بپاڕێتەوە داوا لە خوا بکات باران لەنێو شار و لادێکان نەبارێ، ئەگەر سکاڵای زۆری بارانبارین لەلای کرا و مەترسی ئەوە هەبوو خانووەکان بڕوخێن و ڕێگاکان بپچڕێن

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند، خەڵکەکە هەستان و هاواریان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باران گیراوە و نەما، دارەکان سوور هەڵگەڕان و ئاژەڵ و مەڕوماڵات لەنێو چوون، داوا لە خوا بکە بەڵکوو بارانمان بۆ ببارێنێ، فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، وتی: سوێند بە خوا لە ئاسمان پەڵە هەورێکمان نەدەبینی، دواتر هەورێك هات و بڵاوەی کرد، پاشان باران باری، پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر مینبەرەکە هاتە خوارەوە و نوێژی کرد و ڕۆیشت، بەردەوام باران دەباری تا هەینییەکەی دیکە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر بۆ وتاردان هاواریان بۆ هێنا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ماڵەکان ڕوخان و ڕێگاوبانەکان پچڕان، داوا بکە لە خوا بارانمان لێ بگرێتەوە، وتی: پێغەمبەر ﷺ بزەیەك پێکەنینی کرد و فەرمووی: ئەی خوایە بە دەوروبەرماندا نەك بەسەرماندا، وتی: بارانەکە لەسەر مەدینە نەما، بەڵکوو بە دەوروبەریدا دەباری، لەنێو مەدینە تکێکیش نەباری، وتی: تەماشای مەدینەم کرد هەر وەکوو بازنەیەك هەور دەوری دابوو.

---

(١) صحيح.

## بَابُ تَرْكِ الْإِمَامِ الْعَوْدَ لِلْخُرُوجِ لِصَلَاةِ الِاسْتِسْقَاءِ ثَانِيًا إِذَا أُسْقُوا فِي أَوَّلِ مَرَّةٍ فَسُقُوا

**١٤٢٤-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، أَنَّ عَمَّهُ ﷺ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: خَرَجَ بِالنَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي لَهُمْ، فَقَامَ فَدَعَا قَائِمًا، ثُمَّ تَوَجَّهَ قِبَلَ الْقِبْلَةِ وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ فَأُسْقُوا(١).

## باسی وازهێنانی پێشنوێژ بۆ دووەم جار ڕۆیشتن بۆ نوێژەبارانە، ئەگەر یەکەم جار داوای بارانبارینیان کرد و بۆیان باری

واتە: عەبادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە لە مامیەوە ﷺ کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا، پێغەمبەر ﷺ خەڵکەکەی دەبرد بۆ نوێژگە نوێژەبارانەیان بۆ بکات، هەستا، بەپێوە پاڕایەوە، پاشان ڕووی کردە قیبلە و عەباکەی هەڵگێڕایەوە، دواتر بارانیان بۆ باری.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ، الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى، وَمَا يَحْتَاجُ فِيهِمَا مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ عَدَدِ رَكَعَاتِ صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

**١٤٢٥-** قَالَ عُمَرُ ﷺ: صَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْمُسَافِرِ رَكْعَتَانِ تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ، وَقَدْ خَابَ مَنِ افْتَرَى(٢).

## کۆباسی نوێژی هەردوو جەژنی ڕەمەزان و قوربان و، ئەوەی پێویست دەکات ئەنجام بدرێ لە سوننەتەکان

## باسی ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی هەردوو جەژن

واتە: عومەر ﷺ وتوویەتی: نوێژی جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، نوێژی هەینی دوو ڕکاتە، نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، نوێژی گەشتیار دوو ڕکاتە، تەواوە بەبێ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کورتکردنەوە، وە ئەوەیشی درۆ بۆ خوای گەورە هەڵبەستێ و سەر لە خەڵکی بشوێنێت زەرەرمەند و خەسارەتمەند دەبێت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْأَكْلِ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الْخُرُوجِ إِلَى الْمُصَلَّى، وَتَرْكِ الْأَكْلِ يَوْمَ النَّحْرِ إِلَى الرُّجُوعِ مِنَ الْمُصَلَّى فَيَأْكُلَ مِنْ ذَبِيحَتِهِ إِنْ كَانَ مِمَّنْ يُضَحِّي

**١٤٢٦-** عَنْ بُرَيْدَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: كَانَ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلَا يَطْعَمُ يَوْمَ النَّحْرِ حَتَّى يَذْبَحَ[١].

**باسی بەچاکدانانی نانخواردن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش دەرچوون بۆ نوێژگە، وە وازهێنان لە نانخواردن لە ڕۆژی جەژنی قوربان تا حەیوان سەر دەبڕێ**

واتە: بورەیدە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دەرنەدەچوو بۆ نوێژگە تا خواردنی نەخواردبایە، لە جەژنی قوربانیش خواردنی نەدەخوارد تا حەیوانی سەرنەبڕیبایە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ تَرْكَ الْأَكْلِ يَوْمَ النَّحْرِ حَتَّى يَذْبَحَ الْمَرْءُ فَضِيلَةٌ، وَإِنْ كَانَ الْأَكْلُ مُبَاحًا قَبْلَ الْغُدُوِّ إِلَى الْمُصَلَّى، وَالْآكِلُ غَيْرُ خَارِجٍ وَلَا آثِمٍ

**١٤٢٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْأَضْحَى بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ: ذَبَحْتُ شَاتِي وَتَغَدَّيْتُ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الصَّلَاةَ، فَقَالَ: شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ[٢].

**باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وازهێنان لە نانخواردن لە جەژنی قوربان تا حەیوان سەر دەبڕێ چاکەیە، ئەگەرچی خواردنیش ڕێگەپێدراوە پێش ڕۆیشتن بۆ نوێژگە، جا ئەو کەسەی نان دەخوا نە سنووری شەرعی بەزاندووە و نە گوناهی کردووە**

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین لە جەژنی قوربان لەدوای نوێژ، ئەبو بوردەی كوڕی نیار وتی: مەڕەكەم سەر بڕی و بەیانیم كردەوە پێش ئەوەی بچم بۆ نوێژ، وتی: مەڕەكەت مەڕی گۆشتە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ أَكْلِ التَّمْرِ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الْغُدُوِّ إِلَى الْمُصَلَّى

**١٤٢٨-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُفْطِرُ يَوْمَ الْفِطْرِ عَلَى تَمَرَاتٍ، ثُمَّ يَغْدُو[١].

## باسی بەچاكدانانی خواردنی خورما لە یەكەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ڕۆیشتن بۆ نوێژگە

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەكەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا چەند خورمایەكی دەخوارد، پاشان زوو دەچوو بۆ نوێژگە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ يَوْمَ الْفِطْرِ عَلَى وِتْرٍ مِنَ التَّمْرِ

**١٤٢٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرَ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ، وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا[٢].

## باسی چاكتر وایە بۆ بەندە لە یەكەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان چەند خورمایەك بەتاك بخوات

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا دەرنەدەچوو تا چەند خورمایەكی دەخوارد، بەتاك دەیخواردن.

## بَابُ الْخُرُوجِ إِلَى الْمُصَلَّى لِصَلَاةِ الْعِيدَيْنِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَلَاةَ الْعِيدَيْنِ تُصَلَّى فِي الْمُصَلَّى لَا فِي الْمَسَاجِدِ، إِذَا أَمْكَنَ الْخُرُوجُ إِلَى الْمُصَلَّى

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

**١٤٣٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ إِلَى الْمُصَلَّى، فَصَلَّى بِهِمْ، ثُمَّ انْصَرَفَ[١].

## باسی دەرچوون بۆ نوێژگە بۆ نوێژی هەردوو جەژن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی نوێژی هەردوو جەژن لە نوێژگە دەکرێ نەك لە مزگەوت، ئەگەر گونجا خەڵك دەربچن بۆ نوێژگە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی قوربان یان ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ نوێژگە، دواتر نوێژی بۆ کردن، پاشان ڕۆیشت.

## بَابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ فِي الْغُدُوِّ إِلَى الْمُصَلَّى فِي الْعِيدَيْنِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْخَبَرِ، وَأَحْسَبُ الْحَمْلَ فِيهِ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ الْعُمَرِيِّ، إِنْ لَمْ يَكُنِ الْغَلَطُ مِنَ ابْنِ أَخِي ابْنِ وَهْبٍ

**١٤٣١-** عَنْ أَحْمَدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ فِي الْعِيدَيْنِ مَعَ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَالْعَبَّاسِ، وَعَلِيٍّ، وَجَعْفَرٍ، وَالْحَسَنِ، وَالْحُسَيْنِ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَزَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ، وَأَيْمَنَ ابْنِ أُمِّ أَيْمَنَ، رَافِعًا صَوْتَهُ بِالتَّهْلِيلِ وَالتَّكْبِيرِ، فَيَأْخُذُ طَرِيقَ الْحَدَّادِينَ حَتَّى يَأْتِيَ الْمُصَلَّى، فَإِذَا فَرَغَ رَجَعَ عَلَى الْحَذَّائِينَ حَتَّى يَأْتِيَ مَنْزِلَهُ[٢].

## باسی وتنی (لا إله الا الله) و (ألله أكبر) لە بەیانی هەردوو جەژن لە کاتی ڕۆیشتن بۆ نوێژگە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێ، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە سەبارەت بەم فەرموودەیە، پێم وایە هەڵگرتنەکە (واتە: ڕاستی فەرموودەکە) لەسەر عەبدوڵای کوڕی عومەرییە، ئەگەر هەڵەکە لە برازای ئیبنو وەهب نەبێت

واتە: ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی وەهب دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی باس کردین لە نافیع لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردوو جەژن دەردەچوو لەگەڵ فەزلی کوڕی عەباس و عەبدوڵای کوڕی عەباس و

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.




عەباس و عەلی و جەعفەر و حەسەن و حوسەین و ئوسامەی کوڕی زەید و زەیدی کوڕی حاریسە و ئەیمەنی کوڕی دایکی ئەیمەن، دەنگی بەرز دەکردەوە بە (لا إله الا الله) و (ألله أكبر)، کاتێ دەهات بۆ نوێژگە ڕێگای ئاسنگەرەکانی دەگرتە بەر، کاتێکیش بگەڕایەتەوە بە ڕێگای پێڵاوفرۆشەکان دەگەڕایەوە تا دەگەیشتە ماڵەکەی.

## بَابُ تَرْكِ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لِصَلَاةِ الْعِيدَيْنِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنْ لَا أَذَانَ، وَلَا إِقَامَةَ إِلَّا لِصَلَاةِ الْفَرِيضَةِ، وَإِنْ صُلِّيَتْ غَيْرُ الْفَرِيضَةِ جَمَاعَةً

**١٤٣٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يُؤَذِّنْ وَلَمْ يُقِمْ[(١)].

**باسی وازهێنان لە بانگ و قامەت بۆ نوێژی هەردوو جەژن، ئەمەش لەو شێوازەیە کە باسم کرد بانگ و قامەت نییە تەنها بۆ نوێژی فەرز نەبێ، ئەگەرچی جگە لە فەرز بەکۆمەڵیش ئەنجام بدرێ**

واتە: جابری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، نە بانگ درا و نە قامەت کرا.

## بَابُ إِخْرَاجِ الْعَنَزَةِ فِي الْعِيدَيْنِ إِلَى الْمُصَلَّى، لِيَسْتَتِرَ بِهَا الْإِمَامُ فِي الْمُصَلَّى إِذَا صَلَّى بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ لَمْ يُبَيِّنْ فِيهِ الْعِلَّةَ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخْرِجُ الْعَنَزَةَ مِنْ أَجْلِهَا

**١٤٣٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْكُزُ الْحَرْبَةَ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالنَّحْرِ يُصَلِّي إِلَيْهَا، وَكَانَ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلَاةِ[(٢)].

**باسی دەرهێنانی خەنجەر و قایمکردنی لە نوێژگە لە نوێژی هەردوو جەژن، بۆ ئەوەی پێشنوێژ بیکاتە بەربەست لە نوێژگە کاتێ نوێژی کرد، بە بەڵگەی فەرموودەیەکی کورت و ناڕوون هۆکارەکەی ڕوون نەکردۆتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بۆچی خەنجەری دەرهێنا و لە زەوی قاییمی کرد**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی ڕەمەزان و قورباندا خەنجەرەکەی دەچەقاند بە زەویدا، دواتر نوێژی لەلای دەکرد (واتە: دەیکرد بە سوترە) دوای نوێژیش وتاری دەدا.

١٤٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ الْأَضْحَى بِالْحَرْبَةِ يَغْرِزُهَا بَيْنَ يَدَيْهِ حِينَ يَقُومُ يُصَلِّي(١).

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا کاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ خەنجەرەکەی دەردەهێنا و لەپێشی خۆی دەیچەقاند بە زەویدا (وەکوو سوترە).

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْعِلَّةِ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخْرِجُ الْعَنَزَةَ إِلَى الْمُصَلَّى، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا كَانَ خَرَّجَهَا إِذْ لَا بِنَاءَ بِالْمُصَلَّى يَوْمَئِذٍ يَسْتُرُ الْمُصَلِّي

١٤٣٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى فِي الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ خَرَجَ بِالْعَنَزَةِ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى تُرْكَزَ فِي الْمُصَلَّى فَيُصَلِّي إِلَيْهَا، وَذَلِكَ أَنَّ الْمُصَلَّى كَانَ فَضَاءً لَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ مَبْنِيٌّ يَسْتَتِرُ بِهِ(٢).

## باسی فەرموودەیەك هۆكاری ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە پێغەمبەر ﷺ خەنجەری لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ نوێژگە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە دەری هێنا و كردی بە سوترە، چونكە نوێژگەكە ئەوكات شتێكی تێدا نەبوو تا بیكات بە سوترە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەرچووایە بۆ نوێژگە لە جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا خەنجەرێکی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەوەی لە نوێژگەکەی بیچەقێنی و لەلای نوێژ بکات، ئەوەش چونکە ئەوکاتە نوێژگە چۆڵەوانی بوو هیچ شتێکی بونیادنراوی تێدا نەبوو بیکاتە بەربەست بۆ خۆی.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ تَرْكِ الصَّلَاةِ فِي الْمُصَلَّى قَبْلَ الْعِيدَيْنِ وَبَعْدَهَا اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ وَاسْتِنَانًا بِهِ ﷺ

١٤٣٦- عَنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ يُحَدِّث عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحًى وَأَكْبَرُ عِلْمِي أَنَّهُ قَالَ: يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي خِرْصَهَا وَصَخَابِهَا[١].

### باسی وازهێنان لە نوێژکردن لە نوێژگە پێش هەردوو جەژن و دوای هەردوو جەژن، وەکو پەیڕەوکردن و شوێنپێهەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەیگێڕایەوە لە ئیبنو عەباسەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان پێم وایە وتی: یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان، دوو ڕکات نوێژی کرد، نە لەپێشیەوە نوێژی کرد نە لە دوایەوە، پاشان هات بۆ لای ئافرەتان بیلالیشی لەگەڵ بوو فەرمانی پێ کردن بە بەخشین، ئافرەتی وا هەبوو گوارەکەی و موستیلەکەی دادەنا.

## بَابُ الْبَدْءِ بِصَلَاةِ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ

١٤٣٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ فِي يَوْمِ الْعِيدِ[٢].

### باسی دەستپێکردن بە نوێژی هەردوو جەژنەکە پێش وتاردان

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژ جەژن نوێژی کرد پێش ئەوەی وتار بدات.

## بَابُ عَدَدِ التَّكْبِيرِ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ فِي الْقِيَامِ قَبْلَ الرُّكُوعِ

١٤٣٨- عَنِ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَبَّرَ فِي الْأَضْحَى سَبْعًا وَخَمْسًا، وَفِي الْفِطْرِ مِثْلَ ذَلِكَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف. جداً.

## باسی ژمارەی تەکبیر (الله أکبر) لە نوێژی هەردوو جەژن لە وەستان پێش ڕکووعبردن

واتە: کەسیری کوڕی عەبدولڵای کوڕی عەمر باس دەکات لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە نوێژی جەژنی قوربان حەوت تەکبیر (الله أکبر) و پێنج (الله أکبر)ی کرد، لە نوێژی جەژنی ڕەمەزانیش بە هەمان شێوەی کرد (حەوت جار لە ڕکاتی یەکەم و پێنج جار لە ڕکاتی دووەمدا).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يُوَالِي بَيْنَ الْقِرَاءَتَيْنِ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

١٤٣٩- عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْعِيدَيْنِ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ، وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانية خَمْسَ تَكْبِيرَاتٍ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ[(١)].

## باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە، کە تەکبیرەکان دوای فاتیحە و قورئانخوێندنی دوای فاتیحەن لە نوێژی جەژندا

واتە: کەسیری کوڕی عەبدولڵا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە نوێژی هەردوو جەژنەکەدا پێش قورئانخوێندن تەکبیر (الله أکبر)ی دەکرد، لە ڕکاتی یەکەم حەوت جار، لە ڕکاتی دووەمیش پێنج جار.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

١٤٤٠- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَأَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ بِمَا قَرَأَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخُرُوجِ فِي الْعِيدَيْنِ، فَقُلْتُ: قَرَأَ: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١﴾ ، وَ ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ۝١﴾[(٢)].

---

(١) إسناده ضعيف جداً.

(٢) صحيح.

## باسی قورئان خوێندن لە نوێژی هەردوو جەژنەکان

واتە: ئەبو واقیدی لەیسی دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ پرسیاری لێ کردم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنوێژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا چی دەخوێند؟ وتم: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ١﴾ و ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١﴾ ی دەخوێند.

١٤٤١- وَفِي خَبَرِ النُّعْمَانِ بْنِ بِشِيرٍ، وَسَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾ وَ ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ١﴾» وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ[١].

واتە: وە لە فەرموودەی نوعمانی کوڕی بەشیر و سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی هەردوو جەژندا ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ١﴾ی دەخوێند.

## بَابُ اسْتِقْبَالِ الْإِمَامِ النَّاسَ لِلْخُطْبَةِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ

١٤٤٢- قالَ أَبُو بَكْر فِي خَبَرِ دَاوُدِ بْنِ قَيْسٍ عَنْ عِياض عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فَإِذَا قَضَى صَلَاتَهُ وَسَلَّمَ، قَامَ فَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ[٢].

## باسی ڕووکردنی پێشنوێژ لە خەڵکەکە بۆ وتاردان لە دوای تەواوبوونی نوێژ

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی داودی کوڕی قەیس لە عیاز لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئەگەر نوێژەکەی تەواو بکردایە و سەلامی بدایەتەوە، هەڵدەستا و ڕووی دەکردە خەڵك.

## بَابُ الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ بَعْدَ صَلَاةِ الْعِيدِ

١٤٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلَاةِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی وتاردانی ڕۆژی جەژن دوای نوێژی جەژن

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی جەژن وتاری دەدا.

## بَابُ الْخُطْبَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي الْعِيدَيْنِ

**١٤٤٤-** عَنِ ابْنِ جُرَيجٍ أَخْبَرَنِي عَطَاء عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﭭ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلَالٍ، وَبِلَالٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ يُلْقِينَ النِّسَاءُ صَدَقَةً، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةُ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنَّهُ صَدَقَةٌ يَتَصَدَّقْنَ بِهَا حِينَئِذٍ، تُلْقِي الْمَرْأَةُ فَتْخَهَا، وَيُلْقِينَ وَيُلْقِينَ[١].

## باسی وتاردان لەسەر مینبەر لە هەردوو جەژنەکەدا

واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، عەتاء هەواڵی پێ دام وتی: گوێم لێ بوو جابری کوڕی عەبدوڵا ﭭ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هەستا و نوێژی کرد، پێش وتاردان دەستی بە نوێژ کرد، پاشان وتاری بۆ خەڵکەکە دا، کاتێ پێغەمبەر ﷺ وتارەکەی تەواو کرد، دابەزی هات بۆ لای ئافرەتان، ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوە، پاڵی دابوو بەسەر دەستی بیلال، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخستبوو ئافرەتان خێر و صەدەقەیان لەسەری دادەنا، بە عەتائم وت: زەکاتی سەرفترەیان دادەنا؟ وتی: نەخێر، بەڵکوو خێر و صەدەقەیەك بوو لەو کاتەدا دەیانکرد، ئافرەتی وا هەبوو موستیلەکەی دەبەخشییەوە، وە شتی جۆراوجۆری دیکەیشیان دەبەخشی.

## بَابُ الْخُطْبَةِ قَائِمًا عَلَى الْأَرْضِ إِذَا لَمْ يَكُنْ بِالْمُصَلَّى مِنْبَرٌ

**١٤٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﭬ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ يَوْمَ عِيدٍ عَلَى رَاحِلَتِهِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ تَحْتَمِلُ مَعْنَيَيْنِ، أَحَدُهُمَا أَنَّهُ خَطَبَ قَائِمًا لَا جَالِسًا، وَالثَّانِي أَنَّهُ خَطَبَ عَلَى الْأَرْضِ، كَإِنْكَارِ أَبِي سَعِيدٍ عَلَى مَرْوَانَ لَمَّا أَخْرَجَ الْمِنْبَرَ، فَقَالَ: لَمْ يَكُنْ يُخْرِجُ الْمِنْبَرَ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی وتاردان بەپێوە لەسەر زەوی ئەگەر لە نوێژگە مینبەر نەبوو

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی یەکەمی جەژن لەسەر وشترەکەی وتاری دا.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە دوو مانا لەخۆ دەگرێ، یەکەمینیان: ئەو بەپێوە وتاری دا نەك بەدانیشتنەوە، دووەمیان: ئەو لەسەر زەوی وتاری دا، وەك نکووڵیکردنی ئەبو سەعید لەسەر مەڕوان کاتێ مینبەری دەرکرد بۆ وتاردان، وتی: ئەو (پێغەمبەر ﷺ) هەرگیز مینبەری دەرنەکردووە (بۆ وتاردان).

## بَابُ عَدَدِ الْخُطَبِ فِي الْعِيدَيْنِ وَالْفَصْلِ بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ بِجُلُوسٍ

١٤٤٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ الْخُطْبَتَيْنِ وَهُوَ قَائِمٌ، وَكَانَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِجُلُوسٍ[١].

## باسی ژمارەی وتارەکان لە هەردوو جەژندا، وە جیاکردنەوە لە نێوان ئەو دوو وتارە بە دانیشتنێك

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو وتاری دا بەپێوە، وە جیای دەکردنەوە لە یەکدی بە دانیشتنێك لە نێوانیاندا.

## بَابُ السُّكُوتِ فِي الْجُلُوسِ بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ وَتَرْكِ الْكَلَامِ فِيهِ

١٤٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ السُّوَائِيِّ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِمًا، ثُمَّ يَقْعُدُ قَعْدَةً لَا يَتَكَلَّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ خُطْبَةً أُخْرَى، فَمَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ قَاعِدًا فَقَدْ كَذَبَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بێدەنگبوون لە دانیشتنی نێوان دوو وتارەکەی جەژن و وازهێنان لە قسەکردن تیایدا

واتە: جابری کوڕی سەمورەی سوائی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی هەینی بەپێوە وتاری دەخوێند، پاشان کەمێك دادەنیشت هیچ قسەی نەدەکرد، پاشان هەڵدەستا وتارێکی دیکەی دەخوێند، هەر کەسێك بۆی باس کردن پێغەمبەری خوا ﷺ بە دانیشتنەوە وتاری دەخوێند ئەوە درۆی کردووە.

## بَابُ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الْخُطْبَةِ، وَالِاقْتِصَادِ فِي الْخُطْبَةِ، وَالصَّلَاةِ جَمِيعًا

**١٤٤٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا، وَيَجْلِسُ بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ وَيَتْلُو آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ، وَكَانَتْ خُطْبَتُهُ قَصْدًا، وَصَلَاتُهُ قَصْدًا، غَيْرَ أَنَّ الْحَسَنَ قَالَ: وَكَانَ يَتْلُو عَلَى الْمِنْبَرِ فِي خُطْبَتِهِ آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ[1].

## باسی قورئان خوێندن لە وتاری جەژن، وە وتاردان و نوێژی جەژن بەشێوەی نێوەند و کورت و پوخت

واتە: جابری کوڕی سەمورە دەگێڕێتەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وتاری دەدا، لە نێوانی دوو وتارەکەدا دادەنیشت، ئایەتێکی لە قورئانیش دەخوێند (لەسەر مینبەر لەنێو وتارەکەی)، وتارەکەی مامناوەند بوو، نوێژەکەیشی مامناوەند بوو. بەڵام حەسەن وتی: وە لەسەر مینبەر ئایەتێکی لە قورئان دەخوێند.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّدَقَةِ وَمَا يَنُوبُ الْإِمَامُ مِنْ أَمْرِ الرَّعِيَّةِ فِي خُطْبَةِ الْعِيدِ

**١٤٤٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ فَيَبْدَأُ بِالصَّلَاةِ، فَإِذَا قَضَى صَلَاتَهُ وَسَلَّمَ قَامَ، فَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ، وَهُمْ جُلُوسٌ فِي مُصَلَّاهُمْ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ بِبَعْثٍ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ ذَكَرَهُ لِلنَّاسِ، وَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ أَمَرَهُمْ بِهَا، وَكَانَ يَقُولُ: تَصَدَّقُوا. تَصَدَّقُوا. تَصَدَّقُوا، وَكَانَ أَكْثَرَ مَنْ يَتَصَدَّقُ النِّسَاءُ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَلَمْ تَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى كَانَ

---

(١) إسناده حسن.




مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ، فَخَرَجْتُ مُخَاصِرًا مَرْوَانَ حَتَّى أَتَيْنَا الْمُصَلَّى، فَإِذَا كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ قَدْ بَنَى مِنْبَرًا مِنْ طِينٍ وَلَبِنٍ، وَإِذَا مَرْوَانُ يُنَازِعُنِي يَدَهُ كَأَنَّهُ يَجُرُّنِي نَحْوَ الْمِنْبَرِ، وَأَنَا أَجُرُّهُ نَحْوَ الْمُصَلَّى، فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ مِنْهُ، قُلْتُ: أَيْنَ الِابْتِدَاءُ بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ مَرْوَانُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، تُرِكَ مَا تَعْلَمُ، فَرَفَعْتُ صَوْتِي: كَلَّا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَأْتُونَ بِخَيْرٍ مِمَّا أَعْلَمُ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ[1].

## باسی فەرمانکردن بە بەخشین، وە ئەوەشی کاربەدەست فەرمانی پێ دەکات لە کاروباری ژێردەستەکانی لە وتاری جەژن

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی قوربان و ڕەمەزان دەردەچوو سەرەتا نوێژی دەکرد، کاتێ نوێژەکەی تەواو بکردایە و سەلامی بدایەوە هەڵدەستا (بۆ وتاردان)، ڕووی دەکردە خەڵکەکە، ئەوان دانیشتبوون لە نوێژگەکانیان، ئەگەر کارێکی هەبووایە بە ناردنی سەرباز بۆ شوێنێك یان جگە لەوە ئەوا بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد، وە ئەگەر هەر پێویستییەکی دیکەی هەبووایە فەرمانی پێ دەکردن بەو پێویستییە، وە دەیفەرموو: (ببەخشن، ببەخشن، ببەخشن)، زۆربەی ئەوانەی دەیانبەخشی ئافرەتان بوون، پاشان دەڕۆیشت بۆ ماڵەوە، بەردەوام بەو شێوەیە بوو (واتە: نوێژی جەژن پێش دەخرا بەسەر وتاردان)، تا مەڕوانی کوڕی حەکەم بوو بە کاربەدەستی مەدینە، من لەگەڵ مەڕوان دەرچووم بۆ نوێژی جەژن دەستمان لەنێو دەستی یەکدیدا بوو، تا گەیشتینە نوێژگە، لەپڕ یەزیدی کوڕی صەلت مینبەرێکی دروست کردبوو لە قوڕ و خشت، مەڕوانیش ڕایدەکێشام بۆ لای مینبەرەکە منیش ئەوم ڕادەکێشا بۆ لای نوێژگەکە، کاتێ بینیم سوورە لەسەر مینبەرەکە، وتم: ئەی نابێت سەرەتا نوێژ بکرێ؟ مەڕوان وتی: ئەوەی تۆ دەزانی وازی لێ هێنرا، منیش دەنگم بەرز کردەوە: نەخێر، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەرگیز شتێك ناهێنن چاکتر بێت لەوەی من زانیومە، سێ جار، پاشان ڕۆیشتم.

---

(١) صحیح.

## بَابُ إِشَارَةِ الْخَاطِبِ بِالسَّبَّابَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِي الْخُطْبَةِ وَتَحْرِيكِهِ إِيَّاهَا عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِهَا

**١٤٥٠-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَاهِرًا يَدَيْهِ قَطُّ يَدْعُو عَلَى مِنْبَرِهِ وَلَا عَلَى غَيْرِهِ، وَلَكِنْ رَأَيْتُهُ يَقُولُ هَكَذَا: وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ يُحَرِّكُهَا[١].

### باسی وتارخوێن لە وتارەکەیدا ئاماژە بە پەنجەی هەڕەشە (شایەتمان) دەکات لەسەر مینبەر لە کاتی پاڕانەوە، وە دەیجوڵێنێ لە کاتی ئاماژەپێکردنی

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە لەسەر مینبەرەکەی و جگە لە مینبەرەکەیشی هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە و بپاڕێتەوە، بەڵکوو بینیم بەم شێوەی دەکرد، ئاماژەی کرد بە پەنجەی هەڕەشە و دەیجوڵاندەوە.

## بَابُ كَرَاهَةِ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي الْخُطْبَةِ

**١٤٥١-** عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ أَنَّهُ، رَأَى بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ رَافِعًا يَدَيْهِ، فَقَالَ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يُشِيرَ بِأُصْبُعِهِ[٢].

### باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە کاتی وتاردان لەسەر مینبەر کەڕاهەتی هەیە

واتە: عومارەی کوڕی ڕوەیبە دەگێڕێتەوە، ئەو بیشری کوڕی مەڕوانی ﷺ بینی لەسەر مینبەر هەردوو دەستی بەرز کردۆتەوە، وتی: خوا ئەو دەستە ناشرین بکات، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی تەنها بە پەنجەی ئاماژەی دەکرد لەوە زیاتری نەدەکرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ الِاعْتِمَادِ عَلَى الْقِسِيِّ أَوِ الْعِصِيِّ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي الْخُطْبَةِ

**١٤٥٢-** عَنْ شُعَيْبِ بْنِ رُزَيْقٍ الطَّائِفِيِّ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى - أَوْ مَعَ - رَجُلٍ لَهُ صُحْبَةٌ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُقَالُ لَهُ الْحَكَمُ بْنُ حَزَنٍ الْكُلَفِيُّ، فَأَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا قَالَ: وَفَدْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَابِعَ سَبْعَةٍ، أَوْ تَاسِعَ تِسْعَةٍ، فَشَهِدْنَا الْجُمُعَةَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَكِّئًا عَلَى قَوْسٍ أَوْ عَصًا، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ كَلِمَاتٍ طَيِّبَاتٍ خَفِيفَاتٍ مُبَارَكَاتٍ(١).

## باسی خۆدانە سەر تیر یان گۆچان لەسەر مینبەر لە کاتی وتاردانداً

واتە: شوعەیبی کوڕی ڕوزەیقی تائیفی دەڵێ: دانیشتم لەلای -یان لەگەڵ- پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەوترا: حەکەمی کوڕی حەزەنی کولەفی، دەستی کرد بە قسەکردن بۆمان، وتی: بە نوێنەرایەتی چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ حەوتەم کەس یان نۆیەم کەس بووم، ئامادەی نوێژی هەینی بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا خۆیدا بەسەر کەوانێك یان گۆچانێکدا، دواتر سوپاس و ستاییشی خوای کرد بە چەند وشەیەکی پاك و ئاسان و پیرۆز.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْكَلَامِ فِي الْخُطْبَةِ بِالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْخُطْبَةَ صَلَاةٌ، وَلَوْ كَانَتِ الْخُطْبَةُ صَلَاةً مَا تَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فِيهَا بِمَا لَا يَجُوزُ فِي الصَّلَاةِ

**١٤٥٣-** عَنْ قَيْسٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَآنِي النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَأَمَرَنِي فَحَوَّلْتُ إِلَى الظِّلِّ، وَفِي خَبَرِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ بِشْرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ وَهُوَ يَخْطُبُ لِمَنْ أَخَّرَ الْمَجِيءَ: اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ وَآنَيْتَ، وَفِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ: فَإِنْ كَانَ لَهُ حَاجَةٌ بِبَعْثٍ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ ذَكَرَهُ لِلنَّاسِ، وَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ أَمَرَهُمْ بِهَا، وَكَانَ يَقُولُ: تَصَدَّقُوا، وَفِي خَبَرِ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنْ عِيَاضٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، فِي الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلدَّاخِلِ: هَلْ صَلَّيْتَ؟ قَالَ: لَا. قَالَ: قُمْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: تَصَدَّقُوا، وَفِي أَخْبَارِ جَابِرٍ فِي قِصَّةِ سُلَيْكٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَصَلَّيْتَ؟ قَالَ: لَا قَالَ: قُمْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ ﷺ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ. فَفِي هَذِهِ الْأَخْبَارِ كُلِّهَا دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْخُطْبَةَ لَيْسَتْ بِصَلَاةٍ، وَأَنَّ لِلْخَاطِبِ أَنْ يَتَكَلَّمَ فِي خُطْبَتِهِ بِالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ، وَمَا يَنُوبُ الْمُسْلِمِينَ، وَيُعَلِّمُهُمْ مِنْ أَمْرِ دِينِهِمْ(٢).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەدان بە قسەکردن لەنێو وتاردا فەرمانکردن بێت یان ڕێگریکردن، وە بەڵگەش لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات وتار نوێژە، ئەگەر نوێژ بووایە پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی تێدا نەدەکرد کە دروست نییە لەنێو نوێژدا بکرێ

واتە: قەیسی کە کوڕی ئەبو حازمە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ وتاری دەدا منی بینی لەبەر خۆرم، فەرمانی پێ کردم چوومە بەر سێبەرەکە، وە لە فەرموودەی عوبەیدوڵای کوڕی بیشر هاتووە: پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا بەوکەسەی فەرموو کە دوا کەوتبوو: دانیشە بەڕاستی خەڵکت ئازار دا و دوا کەوتیت، وە لە فەرموودەکەی ئەبو سەعید هاتووە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کارێکی هەبووایە بە ناردنی سەرباز بۆ شوێنێك یان جگە لەوە ئەوا بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد، وە ئەگەر هەر پێویستییەکی دیکەی هەبووایە فەرمانی پێ دەکردن بەو پێویستییە، وە دەیفەرموو: ببەخشن، وە لە فەرموودەکەی ئیبنو عەجلان لە عیاز لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە لە وتاری ڕۆژی هەینی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژت کردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە، پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو: ببەخشن، وە لە فەرموودەکەی جابر هاتووە لە بەسەرهاتەکەی سولەیك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژت کردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئیوە لە ڕۆژی هەینی هات (بۆ مزگەوت) پێشنوێژیش وتاری دەدا با دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەم فەرموودانە هەموویان بەڵگەیان تێدایە لەسەر ئەوەی وتار نوێژ نییە، وتاربێژیش بۆی هەیە لە وتارەکەیدا قسە بکات بە فەرمانکردن و ڕێگریکردن، ئەوەیشی پەیوەندی بە بەرژەوەندیی موسوڵمانانەوە هەبێت، هەروەها فێری کاروباری ئایینەکەیان بکات.

## بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ الْقَارِئَ بِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَاسْتِمَاعِهِ لِلْقِرَاءَةِ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَالْبُكَاءِ عَلَى الْمِنْبَرِ عِنْدَ اسْتِمَاعِ الْقُرْآنِ

١٤٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْهِ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ مِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ وَعَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ[1].

---

(١) صحيح.

**باسی پێشنوێژ فەرمان بکات بە قورئان خوێن قورئانی بەسەردا بخوێنێ و گوێ لە قورئان خوێندنەکە بگرێ، لە کاتێکدا لەسەر مینبەر بێت، هەروەها گریان لەسەر مینبەر لە کاتی گوێگرتن بۆ قورئان**

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم قورئانی بەسەردا بخوێنم ئەو لەسەر مینبەرەکەی بوو، منیش قورئانم بەسەریدا خوێند لە سورەتی (النِّسَاءِ) تا گەیشتمە: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾، واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئوممەتێك شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە) تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بە شایەت بەسەر ئائەوانەوە. تەماشام کرد چاوەکانی فرمێسکی لێ دەهاتە خوارەوە.

**بَابُ النُّزُولِ عَنِ الْمِنْبَرِ لِلسُّجُودِ إِذَا قَرَأَ الْخَاطِبُ السَّجْدَةَ عَلَى الْمِنْبَرِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ؛ لِأَنَّ بَعْضَ أَصْحَابِ ابْنِ وَهْبٍ أَدْخَلَ بَيْنَ ابْنِ أَبِي هِلَالٍ وَبَيْنَ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ فِي هَذَا الْخَبَرِ إِسْحَاقَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي فَرْوَةَ، رَوَاهُ ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ وَلَسْتُ أَرَى الرِّوَايَةَ عَنِ ابْنِ أَبِي فَرْوَةَ هَذَا**

**١٤٥٥-** عَنِ ابْنِ أَبِي هِلَالٍ، وَهُوَ سَعِيدٌ عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا فَقَرَأَ ص فَلَمَّا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ نَزَلَ فَسَجَدَ، وَسَجَدْنَا مَعَهُ، وَقَرَأَ بِهَا مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ تَيَسَّرْنَا لِلسُّجُودِ، فَلَمَّا رَآنَا قَالَ: إِنَّمَا هِيَ تَوْبَةُ نَبِيٍّ، وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَدِ اسْتَعْدَدْتُمْ لِلسُّجُودِ، فَنَزَلَ وَسَجَدَ وَسَجَدْنَا(١).

**باسی دابەزین لەسەر مینبەر بۆ سوژدەبردن، ئەگەر وتاربێژ سوژدەی برد لەسەر مینبەر، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە، چونکە هەندێك لە هاوەڵانی ئیبنو وەهب لەم فەرموودە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو فەروەیان خستووەتە نێوان ئیبنو ئەبو هیلال و عیازی کوڕی عەبدوڵا، ئیبنو وەهب گێڕاویەتەوە لە عەمری کوڕی حاریس، من پێم وا نییە لە ئیبنو ئەبو فەروە گێڕدرابێتەوە**

---

(١) صحيح.

واتە: ئیبنو ئەبو هیلال کە سەعیدە دەگێڕێتەوە لە عیازی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەعد لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك وتاری بۆ داین سورەتی (ص)ی خوێند، کاتێ بەسەر ئایەتی سوژدە تێپەڕ بوو دابەزی و سوژدەی برد، ئێمەیش سوژدەمان برد، وە جارێکی دیکە خوێندیەوە، کاتێ گەیشتە ئایەتی سوژدە ئێمە خۆمان ئامادە کرد بۆ سوژدەبردن، کاتێ ئێمەی بینی فەرمووی: (بێگومان ئەوە تەوبەی پێغەمبەرێك بوو، بەڵام من وا دەبینم خۆتان ئامادە کردووە بۆ سوژدە)، دابەزی و سوژدەی برد، ئێمەیش سوژدەمان برد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْخَاطِبِ فِي قَطْعِ الْخُطْبَةِ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لَهُ

**١٤٥٦**- عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ إِذْ أَقْبَلَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ قَالَ: فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَمَلَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴿١٥﴾ ﴾ التغابن، إِنِّي رَأَيْتُ هَذَيْنِ الْغُلَامَيْنِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى نَزَلْتُ وَحَمَلْتُهُمَا[1].

## باسی مۆڵەت دراوە بە وتاربێژ وتارەکەی ببڕێت لەبەر پێویستییەك بێتە پێشەوە

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا لەسەر مینبەر لەپڕ حەسەن و حوسەین ڕێیان دەکرد ئەوەندە منداڵ بوون خەریك بوو بەملا و بەولادا دەکەوتن، دوو کراسی سووریان لەبەردا بوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکە دابەزیە خوارەوە هەردووکیانی هەڵگرت، پاشان فەرمووی: خوا ﷻ ڕاستی فەرموو: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴿١٥﴾ ﴾، من ئەم دووانەم بینی ڕێیان دەکرد خەریك بوو بەملا و بەولادا دەکەوتن، خۆم ڕانەگرت هەتا قسەکەم بڕی و هەردووکیانم هەڵگرت.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ إِبَاحَةِ قَطْعِ الْخُطْبَةِ لِيُعَلِّمَ بَعْضَ الرَّعِيَّةِ

**١٤٥٧-** عَنْ أَبِي رِفَاعَةَ ﷺ قَالَ: جِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَقُلْتُ: رَجُلٌ جَاهِلٌ عَنْ دِينٍ، لَا يَدْرِي مَا دِينُهُ، فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيَّ وَتَرَكَ الْخُطْبَةَ، ثُمَّ أُتِيَ بِكُرْسِيٍّ خَلَتْ قَوَائِمُهُ مِنْ حَدِيدٍ، فَقَعَدَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ قَائِمًا[(١)].

## باسی ڕێگە دراوە وتار ببڕدرێ بۆ ئەوەی هەندێ لە خەڵك فێر بكرێ

واتە: ئەبو ڕیفاعە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو وتاری دەدا، وتم: من پیاوێكم هیچ لە ئایینەكەم نازانم، پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێكردم و وازی لە وتارەكەی هێنا، پاشان كورسییەكیان بۆی هێنا پێم وایە قاچەكانی ئاسن بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دانیشت، ئەوەی فێر دەكردم كە خوا فێری كردبوو، پاشان چوو بۆ لای وتارەكەی بەپێوە وتاری دا.

## بَابُ انْتِظَارِ الْقَوْمِ الْإِمَامَ جُلُوسًا فِي الْعِيدَيْنِ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الْخُطْبَةِ لِيَعِظَ النِّسَاءَ وَيُذَكِّرَهُنَّ

**١٤٥٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ صَلَاةَ الْفِطْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ، فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَقَرَأَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، حَتَّى خَتَمَ الْآيَةَ، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ: أَنْتُنَّ عَلَى ذَلِكَ؟ فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ: لَمْ تُجِبْهُ غَيْرُهَا لَا يَدْرِي الْحَسَنُ مَنْ هِيَ: نَعَمْ قَالَ: «فَتَصَدَّقْنَ»، قَالَ: فَبَسَطَ بِلَالٌ ثَوْبَهُ، فَقَالَ: هَلُمَّ فِدًى لَكُنَّ، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِمَ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ[(٢)].

## باسی خەڵك لە هەردوو جەژن بەدانیشتەوە چاوەڕوانی پێشنوێژ دەكەن دوای تەواوبوونی وتار، بۆ ئەوەی ئامۆژگاری ئافرەتان بكات و یادیان بخاتەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكر و عومەر و عوسمان، هەموویان پێش وتار نوێژیان دەكرد،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی هەر وەك ئێستا لەپێش چاومە خەڵکەکەی دادەنیشاند بەنێوانیاندا دەڕۆیشت تا گەیشتە لای ئافرەتان، بیلالیشی لەگەڵ بوو، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ ﴿١٢﴾ ﴾، تا ئایەتەکەی تەواو کرد، پاشان کاتێ ئایەتەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئێوە لەسەر ئەو پەیمانەن کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، یەکێك لە ئافرەتەکان وتی: بەڵێ، جگە لەو ئافرەتە کەس وەڵامی نەدایەوە، حەسەنی (کوڕی موسلیم کە یەکێکە لە زەنجیرەی فەرموودەکە) نەیزانی ئەو ئافرەتە کێ بوو، وتی: ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێر و چاکە بکەن، دواتر دەستیان کرد بە بەخشین، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخست وتی: پەلە بکەن دەبێتە فیدیە بۆتان، ئەوانیش ئەڵقە و موستیلەکانیان دەخستە نێو پۆشاکەکەی بیلال.

## بَابُ ذِكْرِ عِظَةِ الْإِمَامِ النِّسَاءَ وَتَذْكِيرِهِ إِيَّاهُنَّ وَأَمْرِهِ إِيَّاهُنَّ بِالصَّدَقَةِ بَعْدَ خُطْبَةِ الْعِيدَيْنِ

**١٤٥٩-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ يَوْمَ الْفِطْرِ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ، فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلَالٍ، وَبِلَالٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ، يُلْقِينَ النِّسَاءُ صَدَقَةً، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةُ يَوْمِ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنَّهُ صَدَقَةٌ يَتَصَدَّقْنَ بِهَا حِينَئِذٍ، تُلْقِي الْمَرْأَةُ فَتْخَهَا، وَيُلْقِينَ وَيُلْقِينَ، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَتَرَى حَقًّا عَلَى الْإِمَامِ الْآنَ أَنْ يَأْتِيَ النِّسَاءَ حِينَ يَفْرُغَ، فَيُذَكِّرَهُنَّ؟ قَالَ: أَيْ، لَعَمْرِي إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ، وَمَا لَهُمْ لَا يَفْعَلُونَ ذَلِكَ؟[1].

## باسی پێشنوێژ دوای وتاری هەردوو جەژن ئامۆژگاری ئافرەتان بکات و یادیان بخاتەوە و فەرمانیان پێ بکات بە بەخشین

واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، عەتاء هەواڵی پێ دام وتی: گوێم لێ بوو جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هەستا و نوێژی کرد، پێش وتاردان دەستی بە نوێژ کرد، پاشان وتاری بۆ خەڵکەکە دا، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وتارەکەی تەواو کرد دابەزی، دواتر هات بۆ لای ئافرەتان،

---

(١) صحيح.

ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوە، پاڵی دابوو بەسەر دەستی بیلال، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخستبوو ئافرەتان خێر و صەدەقەیان لەسەری دادەنا، بە عەتائم وت: زەکاتی سەرفترەیان دادەنا؟ وتی: نەخێر، بەڵکوو خێر و صەدەقەیەك بوو لەو کاتەدا دەیانکرد، ئافرەتی وا هەبوو موستیلەکەی دەبەخشییەوە، وە شتی جۆراوجۆری دیکەیشیان دەبەخشی، بە عەتائم وت: ئایا پێت وایە پێشنوێژ لەسەریەتی کاتێ وتار تەواو دەکات بچێت بۆ لای ئافرەتان ئامۆژگارییان بکات و یادیان بخاتەوە؟ وتی: بەڵێ سوێند بێت ئەوە پێویستە لەسەریان، ئەی بۆچی ئەنجامی نادەن؟

**١٤٦٠**- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُنَّ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ، وَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَحَثَّهُنَّ عَلَى طَاعَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: تَصَدَّقْنَ؛ فَإِنَّ أَكْثَرَكُنَّ حَطَبُ جَهَنَّمَ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ سِطَةِ النِّسَاءِ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ: لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «إِنَّكُنَّ تُكْثِرْنَ الشَّكَاةَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَةَ، فَجَعَلْنَ يَتَبَرَّعْنَ بِقَلَائِدِهِنَّ وَحُلِيِّهِنَّ وَقُرُطِهِنَّ وَخَوَاتِمِهِنَّ، يَقْذِفْنَهُ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ يَتَصَدَّقْنَ بِهِ»[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: وە لە فەرموودەکەی عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمان لە عەتاء لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئافرەتان کرد بە خۆپارێزی و لە خواترسان، وە ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوە، وە سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان هانی دان لەسەر گوێڕایەڵی کردنی، دواتر فەرمووی: ببەخشن، چونکە بەڕاستی زۆربەتان سوتەمەنی دۆزەخن، ئافرەتێك ژیرترینی ئافرەتان بوو ڕوومەت گەنمی بوو، وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئێوە سکاڵا زۆر دەکەن و سپڵە بەرانبەر مێردەکانتان دەکەن کە لەگەڵیان دەژین (واتە: شتی نابەجێیان بەرانبەر دەکەن)، ئەوانیش ملوانکە و خشڵ و گوارە و مستیلەکانیان داکەندو دەیانخستە نێو جلەکانی بیلال و دەیانبەخشی.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَتَى النِّسَاءَ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الْخُطْبَةِ لِيَعِظَهُنَّ إِذِ النِّسَاءُ لَمْ يَسْمَعْنَ خُطْبَتَهُ وَمَوْعِظَتَهُ

**١٤٦١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَيُّوبَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: فَرَأَى أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ، فَأَتَاهُنَّ، يُذَكِّرُهُنَّ وَوَعَظَهُنَّ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە دوای تەواوکردنی وتارەکەی هات بۆ لای ئافرەتەکان تا ئامۆژگارییان بکات، چونکە ئافرەتەکان گوێیان لە وتار و ئامۆژگارییەکەی نەبوو

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەیوب لە عەتاء لە ئیبنو عەباسەوە ، پێی وایە ئافرەتەکان گوێیان لە وتارەکەی (پێغەمبەر ﷺ) نەبوو، بۆیە هات بۆ لایان و یادی خستنەوە و ئامۆژگاری کردن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ انْتِظَارِ الرَّعِيَّةِ لِلْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ

**١٤٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عِيدٍ صَلَّى، وَقَالَ: «قَدْ قَضَيْنَا الصَّلَاةَ فَمَنْ شَاءَ جَلَسَ لِلْخُطْبَةِ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يَذْهَبَ ذَهَبَ»[٢].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی خەڵك چاوەڕوانی وتاری ڕۆژی جەژن نەبێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژن ئامادە بووم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، وە وتی: نوێژمان تەواو کرد، هەر کەسێك ویستی بۆ وتارەکە دانیشت، هەر کەسێکیش ویستی بڕوات ڕۆیشت.

---

(١) صحيح.

(٢) هذا جيدث معلول بالإرسال.

## بَابُ اجْتِمَاعِ الْعِيدِ وَالْجُمُعَةِ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، وَصَلَاةِ الْإِمَامِ بِالنَّاسِ الْعِيدَ ثُمَّ الْجُمُعَةَ، وَإِبَاحَةِ الْقِرَاءَةِ فِيهِمَا جَمِيعًا بِسُورَتَيْنِ بِأَعْيَانِهِمَا

١٤٦٣- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ، وَقَالَ مَرَّةً: فِي الْعِيدِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾، فَإِنْ وَافَقَ ذَلِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَرَأَ بِهِمَا[1].

## باسی کۆبونەوەی نوێژی جەژن و هەینی لە یەک ڕۆژدا، پێشنوێژ نوێژی جەژن بۆ خەڵک بکات پاشان هەینیش، وە ڕێگە دراوە لە هەردوو نوێژەکەدا دوو سورەت بە تایبەت بخوێنێ

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە هەردوو جەژنەکەدا، وە جارێکی دیکە وتی: لە جەژندا: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ی دەخوێند، ئەگەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕۆژی هەینی یەکانگیر بووایەتەوە لە هەردووکیاندا دەیخوێند.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِبَعْضِ الرَّعِيَّةِ فِي التَّخَلُّفِ عَنِ الْجُمُعَةِ إِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ إِيَاسَ بْنَ أَبِي رَمْلَةَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

١٤٦٤- عَنْ إِيَاسِ بْنِ أَبِي رَمْلَةَ: أَنَّهُ شَهِدَ مُعَاوِيَةَ وَسَأَلَ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﵄: شَهِدْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِيدَيْنِ اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، صَلَّى الْعِيدَ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يَجْمَعَ فَلْيَجْمَعْ»[2].

## باسی مۆڵەتدراوە بە هەندێ لە خەڵک نەچێت بۆ نوێژی هەینی ئەگەر جەژن و هەینی لە یەک ڕۆژدا کۆبوونەوە، ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بوو، چونکە من نازانم ئیاسی کوڕی ئەبو ڕەملە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دادپەروەرە یان لەکەدارە

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: ئیاسی کوڕی ئەبو ڕەملە دەگێڕێتەوە، ئەو موعاویەی بینی و پرسیاری لە زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵄ کرد: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی هەردوو جەژنەکە بووی لە یەك ڕۆژدا؟ وتی: بەڵێ، نوێژی جەژنی کرد لە سەرەتای ڕۆژ، پاشان مۆڵەتیدا بۆ نوێژی هەینی، فەرمووی: هەر کەس پێی خۆشە کۆی بکاتەوە با (هەردووکیان) کۆبکاتەوە (واتە: ئەگەر ویستی بەتەنها بچێت بۆ نوێژی جەژن، وە نەچێت بۆ نوێژی هەینی).

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْإِمَامِ إِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدَانِ وَالْجُمُعَةُ أَنْ يُعِيدَ بِهِمْ وَلَا يَجْمَعَ بِهِمْ، إِنْ كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَرَادَ بِقَوْلِهِ أَصَابَ ابْنُ الزُّبَيْرِ السُّنَّةَ، سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ

**١٤٦٥-** عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ قَالَ: شَهِدْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﵄ بِمَكَّةَ وَهُوَ أَمِيرٌ فَوَافَقَ يَوْمُ فِطْرٍ - أَوْ أَضْحًى - يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَخَّرَ الْخُرُوجَ حَتَّى ارْتَفَعَ النَّهَارُ فَخَرَجَ وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَ وَأَطَالَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَلَمْ يُصَلِّ الْجُمُعَةَ فَعَابَ عَلَيْهِ نَاسٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ ابْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ أَصَابَ ابْنُ الزُّبَيْرِ السُّنَّةَ، وَبَلَغَ ابْنَ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ إِذَا اجْتَمَعَ عِيدَانِ صَنَعَ مِثْلَ هَذَا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ أَصَابَ ابْنُ الزُّبَيْرِ السُّنَّةَ يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ، وَجَائِزٌ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ سُنَّةَ أَبِي بَكْرٍ، أَوْ عُمَرَ، أَوْ عُثْمَانَ، أَوْ عَلِيٍّ، وَلَا أَخَالُ أَنَّهُ أَرَادَ بِهِ أَصَابَ السُّنَّةَ فِي تَقْدِيمِهِ الْخُطْبَةَ قَبْلَ صَلَاةِ الْعِيدِ؛ لِأَنَّ هَذَا الْفِعْلَ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَإِنَّمَا أَرَادَ تَرْكَهُ أَنْ يَجْمَعَ بِهِمْ بَعْدَمَا قَدْ صَلَّى بِهِمْ صَلَاةَ الْعِيدِ فَقَطْ دُونَ تَقْدِيمِ الْخُطْبَةِ قَبْلَ صَلَاةِ الْعِيدِ.

## باسی مۆڵەت دراوە بە پێشنوێژ ئەگەر هەردوو جەژن و هەینی پێکەوە کۆ بوونەوە، نوێژی جەژنیان بۆ بکات و هەینییان بۆ نەکات، ئەگەر ئیبنو عەباس مەبەستی لە وتەکەی: ئیبنو زوبەیر سوننەتی پێکاوە، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت

واتە: وەهبی کوڕی کەیسان دەڵێ: کاتێ ئیبنو زوبەیر ﵄ ئەمیری مەککە بوو منیش لەوێ ئامادە بووم، وا ڕێککەوت ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان لەگەڵ هەینی

---

(١) صحيح.

كۆ بۆیەوە، دەرچوونی بۆ نوێژ دوا خست هەتا خۆر بەرز بۆیەوە، دواتر دەرچوو چووە سەر مینبەر، وتارێكی درێژی خوێند، پاشان دوو ڕكات نوێژی كرد، نوێژی هەینیشی نەكرد، جا خەڵكانێك لە نەوەكانی ئومەییەی كوڕی عەبدوشەمس ڕەخنەیان لێ گرت، ئەو ڕەخنەو تێبینییە گەیشتە ئیبنو عەباس، وتی: ئیبنو زوبەیر سوننەتی پێكاوە، هەروەها گەیشتە ئیبنو زوبەیریش وتی: عومەری كوڕی خەتابم بینی ئەگەر دوو جەژن كۆ بووایەتەوە بەهەمان شێوەی ئەمەی دەكرد.

ئەبو بەكر دەڵێ: وتەكەی ئیبنو عەباس: ئیبنو زوبەیر سوننەتی پێكاوە، پێدەچێت مەبەستی پێی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت، وە دروستیشە مەبەستی پێی سوننەتی ئەبو بەكر یان عومەر یان عوسمان یان عەلی بێت، پێم وا نییە مەبەستی ئەوە بێت سوننەتی پێكاوە لە پێشخستنی وتار پێش نوێژی جەژن، چونكە ئەو كردەوە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەكر و عومەرە، بەڵكوو مەبەستی وازهێنان بووە لەوەی هەردوو نوێژەكەی لە ڕۆژێكدا بۆ نەكردوون، دوای ئەوەی كە تەنها نوێژی جەژنی بۆ كردن، نەك پێشخستنی وتار پێش نوێژی جەژن.

## بَابُ إِبَاحَةِ خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الْعِيدَيْنِ، وَإِنْ كُنَّ أَبْكَارًا ذَوَاتِ خُدُورٍ حُيَّضًا كُنَّ أَوْ أَطْهَارًا

**١٤٦٦-** عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنَّا نَمْنَعُ عَوَاتِقَنَا أَنْ يَخْرُجْنَ، فَقَدِمَتِ امْرَأَةٌ، فَنَزَلَتْ قَصْرَ بَنِي خَلَفٍ، فَحَدَّثَتْ أَنَّ أُخْتَهَا كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدْ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ غَزْوَةً، كَانَتْ أُخْتِي مَعَهُ فِي سِتِّ غَزَوَاتٍ قَالَتْ: كُنَّا نُدَاوِي الْكَلْمَى، وَنَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى، فَسَأَلَتْ أُخْتِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: هَلْ عَلَى إِحْدَانَا بَأْسٌ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ أَنْ لَا تَخْرُجَ؟ قَالَ: لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا، وَلْتَشْهَدِ الْخَيْرَ، وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ. فَلَمَّا قَدِمَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ سَأَلْتُهَا - أَوْ سَأَلْنَاهَا - فَقُلْنَا: سَمِعْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كَذَا وَكَذَا وَكَانَتْ لَا تَذْكُرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِلَّا قَالَتْ: بِأَبَا فَقَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبَا قَالَ: لِتَخْرُجِ الْعَوَاتِقُ ذَوَاتُ الْخُدُورِ، أَوِ الْعَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الْخُدُورِ، وَالْحُيَّضُ فَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ، وَتَعْتَزِلُ الْحَائِضُ الْمُصَلَّى، قُلْتُ لِأُمِّ عَطِيَّةَ: الْحَائِضُ؟ قَالَتْ: أَلَيْسَتْ تَشْهَدُ عَرَفَةَ، وَتَشْهَدُ كَذَا، وَتَشْهَدُ كَذَا؟[1].

---

(١) صحيح.

## باسی ڕێگە دراوە ئافرەتان بۆ هەردوو جەژن دەربچن، ئەگەرچی کچانی تازەپێگەیشتووش بن، خۆیان داپۆشیبوو، جا لە حەیزدا بن یان پاك بن

واتە: حەفصە ﵂ دەڵێ: ئێمە ڕێگریمان لە کچانی تازەپێگەیشتوو دەکرد دەربچن بۆ نوێژی جەژن، ئافرەتێك هات چووە کۆشکەکەی نەوەکانی حەلەف (لە بەصرە)، باسی کرد کە خوشکەکەی خێزانی پیاوێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە دوازدە جەنگدا بەژداری کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، خوشکەکەم لە شەش جەنگدا لەگەڵ مێردەکەیدا بوو، وتی: ئێمە چارەسەری بریندارەکانمان دەکرد و چاودێری نەخۆشەکانیشمان دەکرد، خۆشکەکەم پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتی: ئایا یەکێك لە ئێمە گوناهبار دەبێت ئەگەر عەبای نەبوو دەرنەچێت؟ فەرمووی: با لە خوشکەکەی وەری بگرێت و ئامادەی کۆڕ و مەجلیسی خێر و چاکە (وەکوو بیستنی فەرموودە و سەردانی نەخۆش و پاڕانەوەی موسوڵمانان وەکوو کۆبوونەوە بۆ نوێژی جەژن و نوێژەبارانە بێت)، کاتێ دایکی عەتیە هات پرسیارم لێ کرد -یان پرسیارمان لێ کرد-، وتمان: بیستووتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا و ئاوای فەرموویێت، جا ئەو هەر کات باسی پێغەمبەری خوای ﷺ بکردایە دەیوت: دایك و باوکم بەقوربانی بێت، وتی: دایك و باوکم بەقوربانی بێت، فەرمووی: با کچانی تازەپێگەیشتوو کە خۆیان داپۆشیوە، یان کچانی تازەپێگەیشتوو ئەوانەیش کە خۆیان داپۆشیوە و ئەوانەیش لە حەیزدان، ئامادەی کۆڕ و مەجلیسی خێر و چاکە (وەکوو بیستنی فەرموودە و سەردانی نەخۆش) و پاڕانەوەی موسوڵمانان (وەکوو کۆبوونەوە بۆ نوێژی جەژن و نوێژەبارانە) بن، وە ئافرەتانی حەیزداری خۆیان دوور بگرن لە نوێژگە، بە دایکی عەتیەم وت: ئافرەتی حەیزدار؟ وتی: ئایا ئەوە نییە ئامادەی عەرەفە دەبێت، ئامادەی ئەوە و ئامادەی ئەوە دەبێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِاعْتِزَالِ الْحَائِضِ إِذَا شَهِدَتِ الْعِيدَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهَا إِنَّمَا أُمِرَتْ بِالْخُرُوجِ لِمُشَاهَدَةِ الْخَيْرِ وَدَعْوَةِ الْمُسْلِمِينَ

**١٤٦٧-** عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُخْرِجُ الْأَبْكَارَ، الْعَوَاتِقَ، ذَوَاتَ الْخُدُورِ، وَالْحُيَّضَ يَوْمَ الْعِيدِ، فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الْمُصَلَّى، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِإِحْدَانَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: فَلْتُعِرْهَا أُخْتُهَا مِنْ جَلَابِيبِهَا[1].

## باسی فەرمانکردن بە خۆبەدوورگرتنی ئافرەتی حەیزدار لە نوێژ و شوێنی نوێژ، ئەگەر ئامادەی جەژن بوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە بۆیە فەرمانی پێکراوە بە دەرچوون لەبەر بەشداریکردنی لە کۆڕی خێرو پاڕانەوەی مسوڵمانان

واتە: ئوممو عەتییە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژندا کچانی تازەپێگەیشتوو ئەوانەی کە خۆیان داپۆشیبوو ئەوانەیش لە حەیزدا بوون فەرمانی پێ دەکردن بۆ نوێژ دەربچن، بەڵام ئەوانەی لە حەیزدا بوون دوور دەکەوتنەوە لە شوێنی نوێژ، وە ئامادەی کۆڕ و مەجلیسی خێر و چاکە دەبوون (وەکوو بیستنی فەرمووده و سەردانی نەخۆش) و پاڕانەوەی موسوڵمانان (وەکوو کۆبوونەوە بۆ نوێژی جەژن و نوێژەبارانە)، یەکێکیان وتی: ئەگەر یەکێك لە ئێمە عەبای نەبوو چی بکات؟ فەرمووی: با عەبا لە خوشکەکەی بخوازێت (ئەگەر لێی زیاد بوو).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الرُّجُوعِ مِنَ الْمُصَلَّى مِنْ غَيْرِ الطَّرِيقِ الَّذِي أَتَى فِيهِ الْمُصَلِّي

**١٤٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَرَجَ إِلَى الْعِيدَيْنِ رَجَعَ فِي غَيْرِ الطَّرِيقِ الَّذِي خَرَجَ فِيهِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی چاکتر وایە بۆ نوێژخوێن لە ڕێگایەکەوە بگەڕێتەوە جگە لەو ڕێگایەی لێی چووە بۆ نوێژگە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەربچووایە بۆ هەردوو جەژنەکە لە ڕێگایەکی دیکە دەگەڕایەوە جگە لەو ڕێگایەی لێیەوە دەرچووبوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ فِي الْمَنْزِلِ بَعْدَ الرُّجُوعِ مِنَ الْمُصَلَّى

**١٤٦٩**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْعِيدِ حَتَّى يَطْعَمَ، فَإِذَا خَرَجَ صَلَّى لِلنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ، فَإِذَا رَجَعَ صَلَّى فِي بَيْتِهِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ لَا يُصَلِّي قَبْلَ الصَّلَاةِ شَيْئًا[1].

### باسی چاکتر وایە بۆ نوێژخوێن دوای گەڕانەوەی لە نوێژگە نوێژی سوننەت بکات

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن دەرنەدەچوو تا شتێکی نەخواردبایە، جا کاتێ دەردەچوو دوو ڕکات نوێژی بۆ خەڵك دەکرد، کاتێکیش بگەڕایەتەوە لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پێش نوێژی جەژنیش هیچ نوێژێکی نەدەکرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

## كِتَابُ الْإِمَامَةِ فِي الصَّلَاةِ، وَمَا فِيهَا مِنَ السُّنَنِ مُخْتَصَرٌ مِنْ كِتَابِ الْمُسْنَدِ

### بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ عَلَى صَلَاةِ الْفَذِّ

**١٤٧٠**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمِيعِ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاتِهِ وَحْدَهُ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ»[١].

## پەرتووكی پێشنوێژیكردن و ئەوەشی تیایدایە لە سوننەتەكان پوختكراوەیەكە لە پەرتووكی (الْمُسْنَدِ)

### باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی بەكۆمەڵ لەسەر نوێژی بەتەنها

واتە: عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو بەكۆمەڵ بیست و پێنج پلە چاكترە لە نوێژی بەتەنها.

**١٤٧١**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمِيعِ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاتِهِ وَحْدَهُ سَبْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو بەكۆمەڵ بیست و حەوت پلە چاكترە لە نوێژی بەتەنها.

### بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَا يُخَاطِبُ أُمَّتَهُ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ، مَوَّهَ بِجَهْلِهِ عَلَى بَعْضِ الْغَبَاءِ، احْتِجَاجًا لِمَقَالَتِهِ هَذِهِ أَنَّهُ إِذَا خَاطَبَهُمْ بِكَلَامٍ مُجْمَلٍ فَقَدْ خَاطَبَهُمْ بِمَا لَمْ يُفِدْهُمْ مَعْنًى، زَعَمَ

**١٤٧٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمِيعِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهِ وَحْدَهُ بِبِضْعٍ وَعِشْرِينَ صَلَاةً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَوْلُهُ ﷺ: بِضْعٍ كَلِمَةٌ مُجْمَلَةٌ إِذِ الْبِضْعُ يَقَعُ عَلَى مَا بَيْنَ الثَّلَاثِ إِلَى الْعَشْرِ مِنَ الْعَدَدِ، وَبَيَّنَ عَلَيْهِ السَّلَامُ فِي خَبَرِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهَا تَفْضُلُ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ، وَلَمْ يَقُلْ: لَا تَفْضُلُ إِلَّا بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ، وَأَعْلَمَ فِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهَا تَفْضُلُ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً.

**باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو كەسەی پێی وایە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئوممەتەكەی نەدواوە بە دەستەواژەی كورت و ناڕوون (مُجْمَل) بە نەفامی خۆی حەقیقەتی لە هەندێ ناحاڵی شاردووەتەوە، بەڵگەی بۆ ئەم وتەیە هێناوەتەوە كە گوایە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە دەستەواژەی كورت و ناڕوون (مُجْمَل) قسەی لەگەڵ ئوممەتەكەی بكردایە، ئەوە بە شتێك قسەی كردووە لەگەڵیان سوودیان پێنەگەیەنێ، ئەوە تەنها گومانە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو بەكۆمەڵ بیست و ئەوەندە پلە چاكترە لەوەی بەتەنها نوێژ بكات.

ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ: (بِضْع) وشەیەكی كورت و ناڕوونە، چونكە (بِضْع) بەكار دێت بۆ ژمارەیەك لە نێوان سێ بۆ دە، وە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی كردۆتەوە لە فەرموودەكەی ئیبنو مەسعود نوێژی بەكۆمەڵ بیست و پێنج پلە چاكترە، نەیفەرمووە بیست و پێنج پلە زیاتر نییە، وە لە فەرموودەكەی ئیبنو عومەر ڕایگەیاندووە نوێژی بەكۆمەڵ بیست و حەوت پلە چاكترە.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ وَالْفَجْرِ فِي الْجَمَاعَةِ وَالْبَيَانِ أَنَّ صَلَاةَ الْفَجْرِ فِي الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ فِي الْجَمَاعَةِ، وَأَنَّ فَضْلَهَا فِي الْجَمَاعَةِ ضِعْفَيْ فَضْلِ الْعِشَاءِ فِي الْجَمَاعَةِ

**١٤٧٣-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ»[1].

---

(١) صحيح.

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئەنجامدانی نوێژی عیشا و بەیانی بەکۆمەڵ، وە ڕوونکردنەوەی کە نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ چاکترە لە نوێژی عیشا بەکۆمەڵ، وە فەزڵ و گەورەیی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ دوو ئەوەندەی فەزڵی نوێژی عیشایە بەکۆمەڵ

واتە: عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژی عیشا بەکۆمەڵ بکات، وەکوو ئەوە وایە تا نیوەی شەو شەونوێژی کردبێت، وە هەر کەسێك نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات وەکوو ئەوە وایە بە درێژایی شەو شەونوێژی کردبێت.

## بَابُ ذِكْرِ اجْتِمَاعِ مَلَائِكَةِ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةِ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ

١٤٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِهِ: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ الإسراء، قَالَ: «تَشْهَدُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ مُجْتَمِعًا فِيهَا»[١].

## باسی کۆبوونەوەی فریشتەی شەو و ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا

واتە: ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾، فەرموویەتی: فریشتەی شەو و فریشتەی ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆ دەبنەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْحَضِّ عَلَى شُهُودِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ وَلَوْ لَمْ يَقْدِرِ الْمَرْءُ عَلَى شُهُودِهِمَا إِلَّا حَبْوًا عَلَى الرُّكَبِ

١٤٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَلَوْ عَلِمُوا مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[٢].

---

(١) صحيح من حديث أبي هريرة.

(٢) صحيح.

## باسی هاندان لەسەر ئامادەبوونی نوێژی عیشا و بەیانی، ئەگەر بەندە نەیتوانی ئامادەیان بێت بەسکەخشێش بێت هەر بچێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بیانزانیبایە چەندە خێر و پاداشت لە نوێژی عیشا و بەیانیاندا هەیە، بۆیان دەچوون ئەگەر بەسکەخشێش بووایە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ مَا كَثُرَ مِنَ الْعَدَدِ فِي الصَّلَاةِ جَمَاعَةً كَانَتِ الصَّلَاةُ أَفْضَلَ

**١٤٧٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَصِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، حَدِّثْنِي أَعْجَبَ حَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: صَلَّى لَنَا - أَوْ صَلَّى بِنَا - رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْفَجْرِ، ثُمَّ الْتَفَتَ، فَقَالَ: أَشَاهِدٌ فُلَانٌ؟ قُلْنَا: لَا، وَلَمْ يَشْهَدِ الصَّلَاةَ قَالَ: أَشَاهِدٌ فُلَانٌ؟ قُلْنَا: لَا، وَلَمْ يَشْهَدِ الصَّلَاةُ، فَقَالَ: إِنَّ أَثْقَلَ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلَاةُ الْعِشَاءِ وَصَلَاةُ الْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، إِنَّ صَفَّ الْمُقَدَّمِ عَلَى مِثْلِ صَفِّ الْمَلَائِكَةِ، وَلَوْ تَعْلَمُونَ فَضِيلَتَهُ لَابْتَدَرْتُمُوهُ، وَإِنَّ صَلَاتَكَ مَعَ رَجُلٍ أَزْبَى مِنْ صَلَاتِكَ وَحْدَكَ، وَصَلَاتُكَ مَعَ رَجُلَيْنِ أَزْبَى مِنْ صَلَاتِكَ مَعَ رَجُلٍ، وَمَا كَانَ أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی نوێژ بەکۆمەڵ تا زیاتر بێت لە ڕووی ژمارە ئەوە نوێژەکە چاکترە و پاداشتی زیاترە

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو بەصیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە گەیشتم بە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ، وتم: فەرموودەیەکی سەرسوڕهێنەرم بۆ باس بکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێت لێ بووبێت، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین -یان پێ کردین- پاشان ئاوڕی دایەوە، فەرمووی: ئایا فلان ئامادەیە؟ وتمان: نەخێر، ئامادەی نوێژ نەبوو، فەرمووی: ئایا فلان ئامادەیە؟ وتمان: نەخێر، ئامادەی نوێژ نەبوو، فەرمووی: بەڕاستی گرانترین و قورسترین نوێژ لەسەر دووڕووەکان نوێژی خەوتنان و نوێژی بەیانییە، ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێکیان

---

(١) إسناده حسن.

تێدایە بە سکەخشێش بووایە بۆی دەهاتن (بۆ ئەنجامدانیان بەکۆمەڵ لە مزگەوت)، بەڕاستی ڕیزی پێشەوە لەسەر شێوەی ڕیزی فریشتەکانە، ئەگەر بتانزانیایە چ پاداشتێکی تێدایە ئەوە دەستپێشخەریتان دەکرد، بێگومان نوێژکردنت لەگەڵ یەك کەس خێر و پاداشتی زیاترە لەوەی بەتەنها نوێژ بکەیت، وە نوێژکردنت لەگەڵ دوو کەس خێر و پاداشتی زیاترە لەوەی لەگەڵ یەك کەس نوێژ بکەیت، جا تا زۆرتر بێت لەلای خوا ﷻ خۆشەویستترە.

**١٤٧٧**- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصُّبْحَ، فَقَالَ: «أَشَاهِدٌ فُلَانٌ؟» فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: «وَمَا كَانَ أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[١].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی کرد، فەرمووی: ئایا فلان ئامادەیە؟ -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وە فەرمووی: جا تا زۆرتر بێت لەلای خوا خۆشەویستترە.

## بَابُ أَمْرِ الْعُمْيَانِ بِشُهُودِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ وَإِنْ خَافَ الْأَعْمَى هَوَامَّ اللَّيْلِ وَالسِّبَاعِ إِذَا شَهِدَ الْجَمَاعَةَ

**١٤٧٨**- عَنِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ الْمَدِينَةَ كَثِيرَةُ الْهَوَامِّ وَالسِّبَاعِ قَالَ: «تَسْمَعُ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: «فَحَيَّ هَلًا»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە نابینا بە ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ، ئەگەرچی نابینا ترسا لە جڕوجانەوەری شەو و دڕندەکان

واتە: ئیبنو ئوم مەکتوم ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی شاری مەدینە جڕوجانەوەر و مێرووی زیانبەخش و دڕندەی زۆرە، فەرمووی: گوێت لە: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) دەبێت، وتم: بەڵێ، فەرمووی: دەبێ بەدەمیەوە بچیت.

---

(١) حديث حسن.

(٢) إسناده معلول.

## بَابُ أَمْرِ الْعُمْيَانِ بِشُهُودِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ، وَإِنْ كَانَتْ مَنَازِلُهُمْ نَائِيَةً عَنِ الْمَسْجِدِ، لَا يُطَاوِعُهُمْ قَائِدُوهُمْ بِإِتْيَانِهِمْ إِيَّاهُمُ الْمَسَاجِدَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ شُهُودَ الْجَمَاعَةِ فَرِيضَةٌ لَا فَضِيلَةٌ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُقَالَ: لَا رُخْصَةَ لِلْمَرْءِ فِي تَرْكِ الْفَضِيلَةِ

**١٤٧٩-** عَنِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَقْبَلَ النَّاسَ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ فَقَالَ: «لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آتِيَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَتَخَلَّفُونَ عَنْ هَذِهِ الصَّلَاةِ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ»، فَقَامَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَقَدْ عَلِمْتَ مَا بِي، وَلَيْسَ لِي قَائِدٌ قَالَ: «أَتَسْمَعُ الْإِقَامَةَ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «فَاحْضُرْهَا، وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ»(١).

## باسی فەرمانکردن بە نابیناکان بە ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ، ئەگەرچی ماڵەکانیان دووریش بێت لە مزگەوت و کەسێك نەبێت ڕەوانەیان بکات و بیانهێنێ بۆ مزگەوت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی نوێژی بەکۆمەڵ فەرزە نەك سوننەت، چونکە دروست نییە بوترێ: مۆڵەت نادرێ بە بەندە واز لە سوننەت بهێنێ

واتە: ئیبنو ئوممو مەکتوم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی عیشا ڕووی کردە خەڵکەکە، فەرمووی: بەڕاستی هات بە خەیاڵمدا بچم بۆ گیان ئەوانەی لەم نوێژە دوا دەکەون ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی تۆ دەزانی حاڵی من چۆنە کەسێك نییە بمهێنێ بۆ نوێژ، فەرمووی: ئایا گوێت لە بانگ دەبێ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی ﷺ: ئامادەی بە، مۆڵەتی پێنەدا.

**١٤٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي شَيْخٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ شَاسِعُ الدَّارِ، وَلِي قَائِدٌ فَلَا يُلَازِمُنِي فَهَلْ لِي مِنْ رُخْصَةٍ؟ قَالَ: «تَسْمَعُ النِّدَاءَ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «مَا أَجِدُ لَكَ مِنْ رُخْصَةٍ»(٢).

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئوممو مەکتوم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکی بەساڵاچوو و نابینام و ماڵم دوورە، کەسێك نییە بمهێنێ بۆ مزگەوت، ئایا

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

مۆڵەتم هەیە نەیەم بۆ مزگەوت؟ فەرمووی: ئایا گوێت لە بانگ دەبێت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی ﷺ: هیچ مۆڵەتێك بەدی ناکەم بۆت.

## بَابٌ فِي التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ شُهُودِ الْجَمَاعَةِ

**١٤٨١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَجْلَانَ ﭭ وَغَيْرِهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ فِتْيَانِي فَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَآمُرَ فِتْيَانًا فَيَتَخَلَّفُوا إِلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الصَّلَاةِ فَيُحَرِّقُونَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَلَوْ عَلِمَ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يُدْعَى إِلَى عَظْمٍ، إِلَى ثَرِيدٍ أَيْ لَأَجَابَ»[(١)].

## باسی هەڕەشەکردن لە ئامادەنەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ

واتە: ئەبو هورەیرە و ئیبنو عەجلان و ﭭ جگە لە ئەویش دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی هات بە خەیاڵمدا فەرمان بەو گەنجانەی دەوروبەرم بکەم قامەتی نوێژ بکەن، وە فەرمان بکەم بەکۆمەڵە گەنجێکی دیکە دوا بکەون و بچن بۆ لای ئەو پیاوانەی لە نوێژی (بەکۆمەڵ) دوا دەکەون (نایەن) ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنن، ئەگەر یەکێك لە ئەوان بیزانیبایە بانگ دەکرێ بۆ سەرید (تێکوشەو نان) بەدەمیەوە دەچوو.

**١٤٨٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَّا خَبَرُ ابْنِ عَجْلَانَ الَّذِي أَرْسَلَهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ فَإِنَّمَا رَوَاهُ ابْنُ عَجْلَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. أَخبرنَا أَبُو طَاهِرٍ، نَا أَبُو بَكْرٍ، نَاهُ بُنْدَارٌ، حَدَّثَنِي صَفْوَانُ وَأَبُو عَاصِمٍ، قَالَا: ثَنَا ابْنُ عَجْلَانَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[(٢)].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: بەڵام فەرموودەکەی ئیبنو عەجلان کە ئیبنو عویەینە بە (مُرسل) هێناویەتی، بێگومان ئیبنو عەجلان گێڕاویەتەوە لە باوکیەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﭬ لە پێغەمبەرەوە ﷺ. ئەبو تاهیر هەواڵێ پێ داین ئەبو بەکر بۆی باس کردین، بوندار بۆی باس کردین، صەفوان و ئەبو عاصم بۆیان باس کردم وتیان: ئیبنو عجلان بۆی باس کردین، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ تَخْوِيفِ النِّفَاقِ عَلَى تَارِكِ شُهُودِ الْجَمَاعَةِ

**١٤٨٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلَّا مُنَافِقٌ بَيِّنٌ نِفَاقُهُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ[١].

### باسی ئەو كەسەی واز لە نوێژی بەكۆمەڵ دەهێنێ مەترسی دووڕوویی لێ دەكرێ

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: بێگومان لای ئێمە هیچ كەسێك دوا نەدەكەوت لە نوێژی بەكۆمەڵ مەگەر كەسێك بەئاشكرا دووڕوو بووایە، بێگومان پیاوی وا هەبوو دوو كەس دەهاتنە ژێر باڵی تا لە ڕیزەكە دەوەستێنرا.

## بَابُ ذِكْرِ أَثْقَلِ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ وَتَخَوُّفِ النِّفَاقِ عَلَى تَارِكِ شُهُودِ الْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ فِي الْجَمَاعَةِ

**١٤٨٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَثْقَلَ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلَاةُ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ وَالْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، وَإِنِّي لَأَهِمُّ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيُصَلِّيَ، ثُمَّ آخُذُ حُزَمَ النَّارِ فَأُحَرِّقُ عَلَى أُنَاسٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الصَّلَاةِ بُيُوتَهُمْ»[٢].

### باسی قورسترین نوێژ لەسەر دووڕووەكان، وە مەترسی دووڕوویی لەسەر ئەو كەسەی ئامادەی نوێژی عیشا و بەیانی نابێت بەكۆمەڵ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گرانترین و قورسترین نوێژ لەسەر دووڕووەكان نوێژی عیشا و نوێژی بەیانییە، ئەگەر بیانزانیبایە چ پاداشتێكی تێدایە بە سكەخشێش بووایە بۆی دەهاتن، بەڕاستی هات بە خەیاڵمدا فەرمان بكەم بە پیاوێك نوێژ بۆ خەڵكەكە بكات، پاشان باوەشە دارێك هەڵبگرم ماڵی خەڵكانێكی پێ بسوتێنم كە دوا دەكەون لە نوێژی بەكۆمەڵ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٤٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ، كَانَ يَقُولُ: كُنَّا إِذَا فَقَدْنَا الْإِنْسَانَ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ وَالصُّبْحِ أَسَأْنَا بِهِ الظَّنَّ[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: ئێمە ئەگەر کەسێکمان نەبینیبایە لە نوێژی عیشا و بەیانی گومانی خراپمان بۆی دەبرد.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ فِي الْقُرَى وَالْبَوَادِي وَاسْتِحْوَاذِ الشَّيْطَانِ عَلَى تَارِكِهَا

١٤٨٦- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمَرِيِّ قَالَ: قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﵁: أَيْنَ مَسْكَنُكَ؟ قُلْتُ قَرْيَةٌ دُونَ حِمْصَ قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ ثَلَاثَةِ نَفَرٍ فِي قَرْيَةٍ، وَلَا بَدْوٍ، فَلَا تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلَاةُ إِلَّا اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ، فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ، فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ»[٢].

## باسی هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە نوێژی بەکۆمەڵ لە خەڵکی لادێ و دەشتنشین، وە شەیتان زاڵ دەبێت بەسەر ئەو کەسەی وازی لێ دەهێنێ

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەی یەعمەری دەڵێ: ئەبو دەڕداء ﵁ پرسیاری لێ کردم وتی: شوێنی نیشتەجێبوونت لەکوێیە؟ وتم: لە دێیەکە نزیك حیمص، ئەبو دەڕداء وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر سێ کەس لە دێیەکدا یان دەشتاییەکدا قامەتی نوێژیان بۆ نەکرێ حەتمەن شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریاندا و فریویان دەدات، دەست بگرە بە نوێژی بەکۆمەڵەوە، چونکە بەڕاستی گورگ مەڕێك دەخوات لە ڕان جیا بووبێتەوە.

## بَابُ صَلَاةِ الْمَرِيضِ فِي مَنْزِلِهِ جَمَاعَةً إِذَا لَمْ يُمْكِنْهُ شُهُودُهَا فِي الْمَسْجِدِ لِعِلَّةٍ حَادِثَةٍ

١٤٨٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: وُثِيَتْ رِجْلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَاهُ جَالِسًا فِي حُجْرَةٍ لَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ غُرْفَةٌ قَالَ: فَصَلَّى جَالِسًا، فَقُمْنَا خَلْفَهُ فَصَلَّيْنَا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

قَالَ: «إِذَا صَلَّيْتُ جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا، وَإِذَا صَلَّيْتُ قَائِمًا صَلُّوا قِيَامًا، وَلَا تَقُومُوا كَمَا تَقُومُ فَارِسُ لِجَبَّارِيهَا وَمُلُوكِهَا»[١].

## باسی نوێژخوێن نوێژی خۆی لە ماڵەوە بکات ئەگەر نەیتوانی لە مزگەوت ئەنجامی بدات لەبەر هۆکارێك

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: قاچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارێکی هەبوو، ڕۆیشتین بۆ خزمەتی بینیمان دانیشتبوو لە ژوورەکەیدا ژوورێکی دیکەش لەپێشیەوە بوو، (لە سەردەمی کۆندا ژوور هەبوو لەنێو ژووردا) وتی: بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێمەیش لە پشتیەوە وەستاین نوێژمان کرد، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژم کرد ئێوەیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەپێوە نوێژم کرد ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن، بەپێوە مەوەستن وەکوو چۆن فارسەکان بۆ دەسەڵاتدار و پاشاکانیان دەوەستن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْمَرِيضِ فِي تَرْكِ شُهُودِ الْجَمَاعَةِ

١٤٨٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَخْرُجْ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثًا، فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّى بِالنَّاسِ، فَرَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ الْحِجَابَ فَمَا رَأَيْنَا مَنْظَرًا أَعْجَبَ إِلَيْنَا مِنْهُ، حَيْثُ وَضَحَ لَنَا وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَوْمَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ تَقَدَّمْ، وَأَرْخَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الْحِجَابَ فَلَمْ نُوَصَّلْ إِلَيْهِ حَتَّى مَاتَ ﷺ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ أَنَّ الْإِشَارَةَ الْمَفْهُومَةَ مِنَ النَّاطِقِ قَدْ تَقُومُ مَقَامَ الْمَنْطِقِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَفْهَمَ الصِّدِّيقَ بِالْإِشَارَةِ إِلَيْهِ أَنَّهُ أَمَرَهُ بِالْإِمَامَةِ فَاكْتَفَى بِالْإِشَارَةِ إِلَيْهِ عِنْدَ النُّطْقِ بِأَمْرِهِ بِالْإِقَامَةِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەت دراوە بە نەخۆش ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نەبێت

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ نەهات بۆ نێومان، قامەتی نوێژ کرا، ئەبو بەکر چوو نوێژ بۆ خەڵك بکات، پێغەمبەر ﷺ پەردەکەی لادا دیمەنێکمان نەبینی بوو ئەوەندەی بینینی ڕوخساری (پێغەمبەر ﷺ) لەلامان خۆشتر بێت، جا کاتێك ڕوخساری پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەرکەوت و، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ ئەبو بەکر کرد پێش بکەوێت، دواتر پەردەکەی دادایەوە ئیدی نەگەیشتینە خزمەتی تا کۆچی دوایی کرد ﷺ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە کە پێشتر باسم کردووە ئاماژەی تێگەیەنراو لەلایەن کەسێکەوە هەندێ جار لە جێگای قسەکردنە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە ئاماژە ئەبو بەکری تێگەیاند کە پێشنوێژی بکات، ئەویش تەنها ئەو ئاماژەی بەس بوو لە جیاتی قسەکردن بۆ ئەوەی پێشنوێژی بکات.

## بَابُ فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الْجَمَاعَةِ مُتَوَضِّيًا وَمَا يُرْجَى فِيهِ مِنَ الْمَغْفِرَةِ

**١٤٨٩-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ مَشَى إِلَى صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ فَصَلَّاهَا مَعَ الْإِمَامِ، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆیشتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بە دەستنوێژەوە، هەروەها ئەوەیشی ئومێد دەکرێ تیایدا لە لێخۆشبوون

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت بەچاکی، پاشان بچێت بۆ نوێژی فەرز، لەگەڵ پێشنوێژ نوێژەکەی بکات، خوا ﷻ لە گوناهەکانی خۆش دەبێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ حَطِّ الْخَطَايَا وَرَفْعِ الدَّرَجَاتِ بِالْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ مُتَوَضِّيًا

**١٤٩٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ أَحَدِكُمْ فِي جَمَاعَةٍ تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ وَحْدَهُ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ بِبِضْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، وَذَلِكَ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ لَا يُرِيدُ غَيْرَهَا، لَمْ يَخْطُ خُطْوَةً إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ»[١].

## باسی سڕینەوەی گوناه و بەرزبوونەوەی پلەوپایە بە ڕێکردن بۆ مزگەوت بەدەستنوێژەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژی هەر یەکێك لە ئێوە بەکۆمەڵ پاداشتی زیاترە لەوەی نوێژەکەی بەتەنها لە ماڵی خۆی و لە بازاڕەکەی بکات بە بیست و ئەوەندە پلە، ئەگەر دەستنوێژی گرت بەچاکترین شێوە، پاشان چوو بۆ مزگەوت، مەبەستی هیچ نەبێت جگە لە نوێژ، هەر هەنگاوێك بنێت خوا بەهۆیەوە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و گوناهێکی دەسڕێتەوە، هەتا دەچێتە نێو مزگەوتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ فَرَحِ الرَّبِّ تَعَالَى بِمَشْيِ عَبْدِهِ إِلَى الْمَسْجِدِ مُتَوَضِّيًا

**١٤٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَتَوَضَّأُ أَحَدُكُمْ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ وَيُسْبِغُهُ، ثُمَّ يَأْتِي الْمَسْجِدَ لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ فِيهِ، إِلَّا تَبَشْبَشَ اللَّهُ إِلَيْهِ كَمَا يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغَائِبِ بِطَلْعَتِهِ»[٢].

## باسی پێخۆشبوونی پەروەردگار بە ڕێکردنی بەندەکەی بۆ مزگەوت بەدەستنوێژەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت بەچاکی پاشان بچێت بۆ مزگەوت مەبەستی هیچ نەبێت جگە لە نوێژ، حەتمەن

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.




خوا بەڕەحم و میهرەبانی خۆی ڕووی تێ دەکات وەکوو چۆن کەسوکاری نادیارێك بە دەرکەوتنی دڵخۆش دەبن و ڕووی تێ دەکەن و پێشوازی لێ دەکەن.

## بَابُ ذِكْرِ كِتَابَةِ الْحَسَنَاتِ بِالْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ

**١٤٩٢-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا تَطَهَّرَ الرَّجُلُ، ثُمَّ مَرَّ إِلَى الْمَسْجِدِ يَرْعَى الصَّلَاةَ، كَتَبَ لَهُ كَاتِبُهُ، أَوْ كَاتِبَاهُ - بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الْمَسْجِدِ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، وَالْقَاعِدُ يَرْعَى لِلصَّلَاةِ كَالْقَانِتِ، وَيُكْتَبُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، مِنْ حَيْثُ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ حَتَّى يَرْجِعَ»[1].

## باسی نووسینی چاکەکان بەهۆی ڕێکردن بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژ

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، فەرموویەتی: ئەگەر پیاو دەستنوێژی گرت، پاشان چوو بۆ مزگەوت بە مەبەستی نوێژکردن، ئەوە نووسەرەکەی -یان دوو نووسەرەکەی- (سەر شانی) بۆ هەر هەنگاوێکی کە دەینێت بۆ مزگەوت دە پاداشت دەنووسن، وە ئەو کەسەیشی دانیشتووە (لەنێو مزگەوت) چاوەڕوانی نوێژ دەکات پاداشتی ئەو کەسەی هەیە کە نوێژ دەکات، وە لە نوێژخوێنان دەنووسرێ، لەو کاتەی دەردەچێ لە ماڵەکەی تا دەگەڕێتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ كِتَابَةِ الصَّدَقَةِ بِالْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ

**١٤٩٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ نَفْسٍ كُتِبَ عَلَيْهَا الصَّدَقَةُ كُلَّ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ، فَمِنْ ذَلِكَ: أَنْ تَعْدِلَ بَيْنَ الِاثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَأَنْ تُعِينَ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ وَتَحْمِلَهُ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَتُمِيطُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ، وَمِنْ ذَلِكَ أَنْ تُعِينَ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ وَتَحْمِلَهُ عَلَيْهَا، وَتَرْفَعَ مَتَاعَهُ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خُطْوَةٍ تَمْشِي بِهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی نووسینی خێر و صەدەقە بە ڕێکردن بۆ نوێژ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو گیانێك لەسەری نووسراوە گشت ڕۆژێك كە خۆری تێدا هەڵدێت خێر و صەدەقە بكات، لەوانە: نێوانی دوو كەس چاك بكەیت خێر و صەدەقەیە، یارمەتی كەسێك بدەیت لەسەر وڵاخەكەی و بیخەیتە سەری خێر و صەدەقەیە، هەروەها پیسایيەك لەسەر ڕێگا لابدەیت خێر و صدەقەیە، وە لەوانە یارمەتی كەسێك بدەیت لەسەر وڵاخەكەی و بیخەیتە سەری و كەلوپەلەكەیشی بخەیتە سەری بۆی خێر و صەدەقەیە، وە وشەیەكی جوان و پاك خێر و صەدەقەیە، هەر هەنگاوێكیش كە دەینێیت بۆ مزگەوت خێر و صەدەقەیە.

**١٤٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خُطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ».[١]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وشەیەكی جوان و پاك خێر و صەدەقەیە، هەر هەنگاوێكیش كە دەینێیت بۆ مزگەوت خێر و صەدەقەیە.

## بَابُ ضَمَانِ اللَّهِ الْغَادِي إِلَى الْمَسْجِدِ وَالرَّائِحَ إِلَيْهِ

**١٤٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، مَرَّ بِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى بَابِهِ يُشِيرُ بِيَدِهِ، كَأَنَّهُ يُحَدِّثُ نَفْسَهُ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: مَا شَأْنُكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ تُحَدِّثُ نَفْسَكَ؟ قَالَ: وَمَا لِي أَيُرِيدُ عَدُوُّ اللَّهِ أَنْ يُلْهِيَنِي عَنْ كَلَامٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تُكَابِدُ دَهْرَكَ الْآنَ فِي بَيْتِكَ أَلَّا تَخْرُجَ إِلَى الْمَجْلِسِ فَتُحَدِّثَ، فَأَنَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَانَ ضَامِنًا عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ عَادَ مَرِيضًا كَانَ ضَامِنًا عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ أَوْ رَاحَ كَانَ ضَامِنًا عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ دَخَلَ عَلَى إِمَامٍ يَعُودُهُ كَانَ ضَامِنًا عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ جَلَسَ فِي بَيْتِهِ لَمْ يَغْتَبْ أَحَدًا بِسُوءٍ كَانَ ضَامِنًا عَلَى اللَّهِ، فَيُرِيدُ عَدُوُّ اللَّهِ أَنْ يُخْرِجَنِي مِنْ بَيْتِي إِلَى الْمَجْلِسِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی خوا ﷻ زەمانەتی ئەو کەسەی کردووە کە بەیانییان دەچێت بۆ مزگەوت یان هەر کاتێکی دیکە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عەمر تێپەڕی بە لای موعازی کوڕی جەبەل، لەلای دەرگاکەی وەستا بوو بە دەستی ئاماژەی دەکرد، هەر وەکوو چۆن لەبەر خۆیەوە قسە بکات، عەبدوڵا پێی وت: ئەوە چیتە ئەی باوکی عەبدوڕەحمان لەبەر خۆتەوە قسە دەکەی؟ وتی: ئەی بۆ نا، ئایا دوژمنی خوا (شەیتان) دەیەوێت سەرقاڵم بکات لە قسەیەك کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، (کەچی ئەو) دەڵێ: ئایا لە ئێستاوە تاکو کۆتایی تەمەنت هەر لە ماڵەوە دادەنیشیت و ناچیتە نێو کۆڕ و مەجلیس قسە وباس بکەی!! (موعاز وتی): من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك جیهاد و تێکۆشان بکات لە ڕێی خوادا ئەوە زامنە لەسەر خوا، هەر کەسێکیش سەردانی نەخۆشێك بکات ئەوە زامنە لەسەر خوا، هەر کەسێکیش بەیانی یان ئێوارە بچێت بۆ مزگەوت ئەوە زامنە لەسەر خوا، هەر کەسێکیش سەردانی کاربەدەستێك بکات (کاتێ کە نەخۆش دەکەوێت) و ڕێزی لێ بگرێ ئەوە زامنە لەسەر خوا، هەر کەسێکیش لە ماڵەکەی خۆیدا دابنیشێ لە پاشملە باسی کەس نەکات بەخراپە ئەوە زامنە لەسەر خوا. جا دوژمنی خوا دەیەوێت من لە ماڵ دەربکات بۆ نێو کۆڕ و مەجلیس.

## بَابُ ذِكْرِ مَا أَعَدَّ اللَّهُ مِنَ النُّزُلِ فِي الْجَنَّةِ لِلْغَادِي إِلَى الْمَسْجِدِ وَالرَّائِحِ إِلَيْهِ

**١٤٩٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ أَوْ رَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلًا فِي الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ»(١).

## باسی ئەو پلە وپایەی خوا ﷻ لە بەهەشت ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسەی بەیانیان و ئێواران دەچێ بۆ مزگەوت

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەیانی یان ئێوارە بچێت بۆ مزگەوت خوا ﷻ جێگایەکی بۆ دادەنێت لە بەهەشتدا، تا بەیانی یان ئێوارە بچێت بۆ مزگەوت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ كِتَابَةِ أَجْرِ الْمُصَلِّي بِالْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ

**١٤٩٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَى كُلِّ مِنَ الْإِنْسَانِ صَلَاةٌ كُلَّ يَوْمٍ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: هَذَا مِنْ أَشَدِّ مَا أَتَيْتَنَا بِهِ قَالَ: أَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ، وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَلَاةٌ، وَحَمْلُكَ عَنِ الضَّعِيفِ صَلَاةٌ، وَإِنْحَاؤُكَ الْقَذَرَ عَنِ الطَّرِيقِ صَلَاةٌ، وَكُلُّ خُطْوَةٍ تَخْطُوهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَلَاةٌ»[1].

### باسی نووسینی پاداشتی نوێژکەر بە ڕێکردن بۆ مزگەوت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کەسێك لەسەریەتی هەموو ڕۆژێك نوێژ بکات، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: ئەمە گرانترین شتە بۆمانت هێناوە، فەرمووی: فەرمانکردنت بە چاکە و ڕێگریکردنت لە خراپە نوێژە، یارمەتی لاوازێك بدەیت نوێژە، پیساییەك لە ڕێگا لابەیت نوێژە، هەر هەنگاوێك بینێیت بۆ نوێژ نوێژە.

## بَابُ فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ فِي الظَّلَامِ بِاللَّيْلِ

**١٤٩٨-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَبْشَرِ الْمَشَّاءُونَ فِي الظَّلَامِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[2].

### باسی فەزڵ و گەورەیی ڕێکردن بۆ نوێژ لە تاریکایی شەو

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مژدە بۆ ئەو کەسانەی بەتاریکایی دەچن بۆ مزگەوت بەوەی ڕووناکییەکی تەواویان بۆ هەیە لە ڕۆژی دوایی.

**١٤٩٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظَّلَامِ بِالنُّورِ التَّامِّ»[3].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) حديث حسن.

(٣) حديث حسن.

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مژدە بدە بەو کەسانەی بەتاریکایی دەچن بۆ مزگەوت بە ڕووناکیەکی تەواو (لە ڕۆژی دوایی).

## بَابُ فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الْمَسَاجِدِ مِنَ الْمَنَازِلِ الْمُتَبَاعِدَةِ مِنَ الْمَسَاجِدِ لِكَثْرَةِ الْخُطَا

**١٥٠٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ بَيْتُهُ أَقْصَى بَيْتٍ بِالْمَدِينَةِ، فَكَانَ لَا تُخْطِئُهُ الصَّلَاةُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَوَجَّعْتُ لَهُ، فَقُلْتُ: يَا فُلَانُ، لَوْ إِنَّكَ اشْتَرَيْتَ حِمَارًا يَقِيكَ الرَّمَضَ، وَيَرْفَعُكَ مِنَ الْمَوْقِعِ، وَيَقِيكَ هَوَامَّ الْأَرْضِ، فَقَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ بَيْتِيَ مُطَنَّبٌ بِبَيْتِ مُحَمَّدٍ ﷺ قَالَ: فَحَمَلْتُ بِهِ حَمْلًا حَتَّى أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ قَالَ: فَدَعَاهُ فَسَأَلَهُ، فَذَكَرَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، وَذَكَرَ أَنَّهُ يَرْجُو فِي أَمْرِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لَكَ مَا احْتَسَبْتَ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕێکردن بۆ مزگەوت لەو ماڵانەی کە دوورن لە مزگەوت، لەبەر هەنگاوانی زۆر

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە ئەنصارەکان ماڵەکەی لە ئەوپەڕی مەدینە بوو هیچ نوێژێکی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەدەست نەدەچوو، منیش بەزەییم پێدا هاتەوە، وتم: ئەی فڵانە کەس، خۆزگە گوێدرێژێکت دەکڕی تا بتپارێزێ لە گەرمای زەوی و بەرزت بکاتەوە لە ڕێکردن و بتپارێزێ لە جڕوجانەوەر و مێرووی سەر زەوی، وتی: سوێند بە خوا من پێم خۆش نییە ماڵم لە تەنیشتی ماڵی موحەممەد ﷺ بێت، (چونکە من چاوەڕوان دەکەم خوا بۆ هەموو هەنگاوەکانم بۆ مزگەوت خێر و پاداشتم بۆ بنووسێ)، وتی: قسەکەی ئەو پیاوەم هەڵگرت تا هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، ئەویش بانگی کرد و پرسیاری لێ کرد، کابرا هەمان قسەی دووبارە کردەوە، باسی کرد کە ئومێدی خێر و پاداشت دەکات لەو هەنگاوانەی کە دەینێت بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوەی چاوەڕوانی دەکەیت لە پاداشت بۆت ئەژمار دەکرێت.

---

(١) صحيح.

**١٥٠١-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ«إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ إِلَيْهَا مَمْشًى، فَأَبْعَدُهُمْ، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْإِمَامِ فِي جَمَاعَةٍ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الَّذِي يُصَلِّيهَا، ثُمَّ يَنَامُ»[1].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو کەسەی گەورەترین پاداشتی دەست دەکەوێت لە نوێژدا دوورترینیانە کە بەپیادە دێت بۆ مزگەوت، ئەو کەسەیشی چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا ئەنجامی دەدات لەگەڵ پێشنوێژ پاداشتی گەورەترە لەوەی نوێژەکەی دەکات و پاشان دەخەوێت (واتە: چاوەڕوانی جەماعەت ناکات).**

## بَابُ الشَّهَادَةِ بِالْإِيمَانِ لِعُمَّارِ الْمَسَاجِدِ بِإِتْيَانِهَا وَالصَّلَاةِ فِيهَا

**١٥٠٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا عَلَيْهِ بِالْإِيمَانِ، قَالَ اللَّهُ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴿١٨﴾ ﴾التوبة»[2].

## باسی شایەتیدان بە ئیمان بۆ ئەو کەسەی ماڵی خوا ئاوەدان دەکاتەوە بە هاتنی بۆی و نوێژکردنی تیایدا

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکتان بینی بەردەوام هاتوچۆی مزگەوت دەکات ئەوە شایەتی ئیمانی بۆ بدەن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴿١٨﴾ ﴾ واتە: بەڕاستی کەسێك مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە کە بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هێنابێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ فَضْلِ إِيطَانِ الْمَسَاجِدِ لِلصَّلَاةِ فِيهَا

**١٥٠٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُوَطِّنُ الرَّجُلُ الْمَسَاجِدَ لِلصَّلَاةِ إِلَّا تَبَشْبَشَ اللَّهُ بِهِ مِنْ حِينِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ كَمَا يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغَائِبِ بِغَائِبِهِمْ إِذَا قَدِمَ عَلَيْهِمْ»[١].

## باسی فەزڵی دیاریکردنی شوێنێك لەنێو مزگەوت بۆ نوێژکردن تیایدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك جێگایەك دیاری بکات لەنێو مزگەوت بۆ نوێژکردن، حەتمەن خوا بەڕەحم و میهرەبانی خۆی ڕووی تێ دەکات وەکوو چۆن کەسوکاری نادیار کاتێ نادیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ نێویان بەدڵێکی خۆشەوە ڕووی تێدەکەن و پێشوازی لێ دەکەن. (تێبینی: دیاریکردنی جێگایەك لەنێو مزگەوت بۆ پەرستش و یادی خوا لەنێو مزگەوت دروستە، ئیبنو حیبان لە صەحیحەکەیدا دەڵێ: هۆکاری سەرزەنشتکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کەسێك شوێنێك بۆ خۆی دیاری بکات نوێژی تێدا نەکات و یادی خوای تێدا نەکات، پێم وایە قەدەغەکردنەکە بۆ ئەوە هاتووە مرۆڤ شوێنێك لەنێو مزگەوت تایبەت بکات لەو جێگایە زیاتر نوێژ نەکات، خوا زاناترینە).

## بَابُ فَضْلِ الْجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ انْتِظَارًا لِصَلَاةٍ، وَذِكْرِ صَلَاةِ الْمَلَائِكَةِ عَلَيْهِ وَدُعَائِهِمْ لَهُ مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ أَوْ يُحْدِثْ فِيهِ

**١٥٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ لَا يَنْهَزُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ، لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ، فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ كَانَ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتِ الصَّلَاةُ هِيَ تَحْبِسُهُ، وَالْمَلَائِكَةُ يُصَلُّونَ عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، فَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ فِيهِ»[٢].

---

(١) إسناده معلول.

(٢) صحيح.

**باسی فەزڵ و گەورەیی دانیشتن لەنێو مزگەوت بە مەبەستی چاوەڕوانی نوێژ، وە باسی صەڵاواتی فریشتەکان لەسەری و نزاکردنیان بۆی تا ئازاری کەسێك نەدات تیایدا یان بێ دەستنوێژ نەبێت تیایدا**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت پاشان هات بۆ مزگەوت، هیچ شتێك نەیجوڵاند جگە لە نوێژ، مەبەستی هیچ نەبوو جگە لەنوێژ، جا ئەگەر چووە نێو مزگەوتەوە ئەوە لە نوێژدایە هەتا نوێژ دەیبەستێتەوە، هەروەها فریشتەکانیش صەڵاوات دەدەن لەسەری هەر یەکێکتان تا لەو جێگایەی بمێنێتەوە کە نوێژی تێدا کردووە، دەڵێن: ئەی خوایە لێی خۆش بە ئەی خوایە ڕەحمی پێ بکە، خوایە تەوبەی لێ وەربگرە، تا لە جێگاکەی ئازاری کەس نەدات و بێدەستنوێژ نەبێت.

**بَابُ الْأَمْرِ بِالسَّكِينَةِ فِي الْمَشْيِ إِلِي الصَّلَاةِ، وَالنَّهْيِ عَنِ السَّعْيِ إِلَيْهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الِاسْمَ الْوَاحِدَ قَدْ يَقَعُ عَلَى فِعْلَيْنِ يُؤْمَرُ بِأَحَدِهِمَا، وَيُزْجَرُ عَنِ الْآخَرِ بِالِاسْمِ الْوَاحِدِ «إِذِ اللَّهُ قَدْ أَمَرَنَا بِالسَّعْيِ إِلَى صَلَاةِ الْجُمُعَةِ، يُرِيدُ الْمُضِيَّ إِلَيْهَا، وَالرَّسُولُ الْمُصْطَفَى ﷺ زَجَرَ عَنِ السَّعْيِ إِلَى الصَّلَاةِ، وَهُوَ الْعَجَلَةُ فِي الْمَشْيِ فَالسَّعْيُ الْمَأْمُورُ بِهِ فِي الْكِتَابِ إِلَى صَلَاةِ الْجُمُعَةِ غَيْرُ السَّعْيِ الَّذِي زَجَرَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي إِتْيَانِ الصَّلَاةِ، وَهَذَا اسْمٌ وَاحِدٌ لِفِعْلَيْنِ، أَحَدُهُمَا فَرْضٌ، وَالْآخَرُ مَنْهِيٌّ عَنْهُ»**

**١٥٠٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ ائْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَمْشُونَ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا»[1].

**باسی فەرمانکردن بە هێمنی و لەسەرخۆیی بۆ ئەو کەسەی بەپیادە دەچێت بۆ نوێژ، قەدەغەکردنیش لە پەلەپەلکردن لە هاتنیدا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی یەك ناو بۆ دوو کردار بەکار دێت، فەرمان بە یەکێکیان دەکرێت و قەدەغەش لەوی دیکەیان دەکرێ بە یەك ناو، چونکە خوا فەرمانی پێ**

---

(١) صحيح.

**کردووین بە (السَّعْي) بۆ نوێژی هەینی، مەبەستی ڕۆیشتنە بۆ نوێژی هەینی، پێغەمبەریش ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە (السَّعْي) بۆ نوێژ، ئەویش پەلەکردنە لە کاتی ڕێکردن، جا ئەو (السَّعْي)یەی کە فەرمانی پێ کراوە لە قورئاندا بۆ نوێژی هەینی ئەو (السَّعْي)ە نییە کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە هاتن بۆ مزگەوت، ئەوەش یەك ناوە بۆ دوو کردار، یەکەمینیان فەرزە ئەوی دیکەیان قەدەغەی لێ کراوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قامەت بۆ نوێژ کرا پەلەپەل مەکەن لە کاتی هاتنتاندا، بەڵکوو بەهێمنی و لەسەرخۆیی بچن بۆ نوێژ، ئەوەی گەیشتن پێی نوێژ بکەن، ئەوەیشی لەدەستتان چوو تەواوی بکەن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْخُرُوجِ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ الْأَذَانِ، وَقَبْلَ الصَّلَاةِ

**١٥٠٦-** عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ الْمُحَارِبِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ، فَقَامَ رَجُلٌ فَخَرَجَ، فَقَالَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ[1].

### باسی سەرزەنشتکردن لە دەرچوون لە مزگەوت دوای بانگ و پێش نوێژکردن

واتە: ئەبو شەعسائی موحاریبی دەڵێ: ئێمە لەگەڵ ئەبو هورەیرە ﷺ بووین لە مزگەوت، بانگبێژ بانگی دا، پیاوێك هەستا لە مزگەوت چووە دەرەوە، وتی: ئەو پیاوە سەرپێچی باوکی قاسمی ﷺ کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ أَحَقُّ النَّاسِ بِالْإِمَامَةِ

**١٥٠٧-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا في السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ فِي الْهِجْرَةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِنًّا»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی لەپێشترین کەس بە پێشنوێژی

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شارەزاترینی نێو خەڵکی بە کتێبی خوا پێشنوێژییان بۆ دەکات، ئەگەر لە خوێندنی قورئاندا یەکسان بوون، ئەوە شارەزاترینیان بە سوننەت پێش دەخرێ، ئەگەر لە سوننەتیشدا یەکسان بوون، ئەوەیان پێش دەخرێت کە لە پێش هەموویان هیجرەتی کردووە، ئەگەر لە هیجرەتیشدا یەکسان بوون، ئەوە بەتەمەنترینیان پێش دەخرێت.

**١٥٠٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانُوا ثَلَاثَةً فَلْيَؤُمَّهُمْ أَحَدُهُمْ، وَأَحَقُّهُمْ بِالْإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ»(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون با یەکێکیان پێشنوێژی بکات، وە شیاوترینیان بە پێشنوێژی ئەوەیانە قورئانی زۆرتر لەبەر بێت.

## بَابُ اسْتِحْقَاقِ الْإِمَامَةِ بِالِازْدِيَادِ مِنْ حِفْظِ الْقُرْآنِ، وَإِنْ كَانَ غَيْرُهُ أَسَنَّ مِنْهُ وَأَشْرَفَ

**١٥٠٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْثًا وَهُمْ نَفَرٌ، فَدَعَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟» فَاسْتَقْرَأَهُمْ حَتَّى مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ وَهُوَ مِنْ أَحْدَثِهِمْ سِنًّا قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ يَا فُلَانُ؟» قَالَ: مَعِي كَذَا وَكَذَا، وَسُورَةُ الْبَقَرَةِ قَالَ: «مَعَكَ سُورَةُ الْبَقَرَةِ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: اذْهَبْ، فَأَنْتَ أَمِيرُهُمْ، فَقَالَ رَجُلٌ هُوَ مِنْ أَشْرَفِهِمْ: وَالَّذِي كَذَا وَكَذَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا مَنَعَنِي أَنْ أَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ إِلَّا خَشْيَةَ أَنْ لَا أَقُومَ بِهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَلَّمِ الْقُرْآنَ فَاقْرَأْهُ، وَارْقُدْ؛ فَإِنَّ مَثَلَ الْقُرْآنِ لِمَنْ تَعَلَّمَهُ فَقَرَأَهُ وَقَامَ بِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ مَحْشُوٍّ مِسْكًا، يَفُوحُ رِيحُهُ عَلَى كُلِّ مَكَانٍ، وَمَنْ تَعَلَّمَهُ وَرَقَدَ وَهُوَ فِي جَوْفِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ أُوكِئَ عَلَى مِسْكٍ»(٢).

## باسی شیاوترین کەس بە سەرکردایەتی و پێشەوایەتیکردن ئەو کەسەیە قورئانی زۆری لەبەر بێت، ئەگەر چی جگە لە ئەویش لەو گەورەتر و بەڕێز و ناودارتر بن

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراوێکی نارد چەند کەسێك بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن، فەرمووی: چیتان لەبەرە لە قورئان؟ داوای لێ کردن قورئانی بۆ بخوێنن تا گەیشت بە پیاوێکیان ئەو گەنجترینیان بوو، فەرمووی: ئەی فڵان چەندە قورئانت لەبەرە؟ وتی: فڵان و فڵانم لەبەرە و سورەتی بەقەرەیش، فەرمووی: سورەتی بەقەرەشت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: برۆ تۆ ئەمیریانیت، پیاوێك پیاوماقوڵترینیان بوو وتی: سوێند بەوە و بەوە ئەی پێغەمبەری خوا هیچ ڕێگری لێ نەکردووم فێری قورئان ببم ئەوە نەبێ ترساوم پێی هەڵنەستم (کاری پێ نەکەم یان دەوری نەکەمەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فێری قورئان ببە و بیخوێنە و بەسەریدا بخەوە (ئەمە کینایەیە لەسەر کارپێنەکردنی یان دەورنەکردنەوەی) چونکە نموونەی قورئان بۆ ئەو کەسەی فێری دەبێت و پاشان دەیخوێنێت و پێی هەڵدەستێ (کاری پێ دەکات یان دەوری دەکاتەوە) وەکوو نموونەی قاپێکی میسکە پڕ کرابێت بە میسك بۆنی بڵاو ببێتەوە بەسەر هەموو شوێنێکدا، هەر کەسێکیش فێری بوو پێی هەڵنەسێت و لێی بێئاگا بێت، قورئانیش لە سنگیدا بێت وەکوو قاپێکی میسك وایە سەرقاپی نرابێت.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِحْقَاقِ الْإِمَامَةِ بِكِبَرِ السِّنِّ إِذَا اسْتَوَوْا فِي الْقِرَاءَةِ، وَالسُّنَّةِ، وَالْهِجْرَةِ

**١٥١٠-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَا وَصَاحِبٌ لِي، فَلَمَّا أَرَدْنَا الْإِقْفَالَ قَالَ لَنَا: إِ«ذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَأَذِّنَا، ثُمَّ أَقِيمَا، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا»[١].

## باسی شیاوترین کەس بۆ پێشنویژی گەورەترینیانە لە تەمەندا، ئەگەر لە قورئانخوێندن و شارەزایی لە سوننەت و هیجرەتکردن وەکو یەك بوون

واتە: مالکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ من و هاوەڵێکم کاتێ ویستمان لە غەزا بگەڕێینەوە، پێمانی فەرموو: ئەگەر کاتی نوێژ هات ئەوە بانگ بدەن، پاشان قامەت بکەن، پاشان با کامەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِمَامَةِ الْمَوْلَى الْقُرَشِيَّ إِذَا كَانَ الْمَوْلَى أَكْثَرَ جَمْعًا لِلْقُرْآنِ خَبَرُ النَّبِيِّ ﷺ: «يَؤُمُّهُمْ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ» دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمَوْلَى إِذَا كَانَ أَقْرَأَ مِنَ الْقُرَشِيِّ فَهُوَ أَحَقُّ بِالْإِمَامَةِ

**١٥١١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ الْمُهَاجِرِينَ، لَمَّا قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، نَزَلُوا إِلَى جَنْبِ قُبَاءَ، حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، أَمَّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا، مِنْهُمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الْأَسْدِ[١].

## باسی پێشنوێژیکردنی مەولا بۆ قورەشی، ئەگەر قورئانی زۆرتر لەبەر بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەیان زۆرتر قورئانی لەبەر بێت پێشنوێژییان دەکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەولا ئەگەر شارەزاتر بوو لە قورئاندا ئەوە لەپێشترە بە پێشنوێژی لە کەسێکی قورەشی

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کۆچکەران کاتێ هاتن بۆ مەدینە، لە تەنیشتی قوباء باریان ڕاخست، کاتی نوێژ هات، سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە پێشنوێژی بۆ کردن، ئەو قورئانی لە هەموویان زیاتر لەبەر بوو، عومەری کوڕی خەتاب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەدیش لەنێویان بوون.

## بَابُ إِبَاحَةِ إِمَامَةِ غَيْرِ الْمُدْرِكِ الْبَالِغِينَ إِذَا كَانَ غَيْرُ الْمُدْرِكِ أَكْثَرَ جَمْعًا لِلْقُرْآنِ مِنَ الْبَالِغِينَ

**١٥١٢-** عَنْ أَيُّوبٍ عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عَلَى حَاضِرٍ، فَكَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا رَاجِعِينَ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَدْنُو مِنْهُمْ، فَأَسْمَعُ حَتَّى حَفِظْتُ قُرْآنًا قَالَ: وَكَانَ النَّاسُ يَنْتَظِرُونَ بِإِسْلَامِهِمْ فَتْحَ مَكَّةَ، فَلَمَّا فُتِحَتْ، جَعَلَ الرَّجُلُ يَأْتِيهِ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا وَافِدُ بَنِي فُلَانٍ، وَجِئْتُكَ بِإِسْلَامِهِمْ، فَانْطَلَقَ أَبِي بِإِسْلَامِ قَوْمِهِ، فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً»، قَالَ: فَنَظَرُوا وَأَنَا لَعَلَى حُوَاءٍ، فَمَا وَجَدُوا فِيهِمْ أَحَدًا أَكْثَرَ قُرْآنًا مِنِّي، فَقَدَّمُونِي وَأَنَا غُلَامٌ، فَصَلَّيْتُ بِهِمْ وَعَلَيَّ بُرْدَةٌ لِي، فَكُنْتُ إِذَا رَكَعْتُ أَوْ سَجَدْتُ فَتَبْدُو عَوْرَتِي، فَلَمَّا صَلَّيْنَا تَقُولُ لَنَا عَجُوزٌ دَهْرِيَّةٌ: غَطُّوا عَنَّا اسْتَ قَارِئِكُمْ قَالَ: فَقَطَعُوا لِي قَمِيصاً قَالَ: أَحْسَبُهُ قَالَ: مِنْ مَعْقِدِ النَّحْرَيْنِ، فَذَكَرَ أَنَّهُ فَرِحَ بِهِ فَرَحاً شَدِيداً[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ڕێگە دراوە بەوکەسەی کە هێشتا باڵغ نەبووە پێشنوێژی بۆ ئەو کەسانە بکات کە باڵغ بوون، ئەگەر قورئانی لە هەموویان زیاتر لەبەر بوو**

واتە: ئەیوب دەگێڕێتەوە، عەمری کوڕی سەلەمە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە جێگایەك نیشتەجێ بووین ئاوی لێ بوو کاروانسەرا بەهۆی ئاوەکەوە لایان دەدا بۆ پشوودان، جا کاروانییەکان کە لەلای پێغەمبەر ﷺ دەگەڕانەوە بە لاماندا تێدەپەڕین، منیش لێیان نزیك دەبوومەوە، گوێم لێ دەگرتن تا بەشێك لە قورئانم لەبەر کرد، وتی: خەڵکەکە چاوەڕوانی ئازادکردنی مەککەیان دەکرد بۆ ئەوەی موسوڵمان بن، جا کاتێ مەککە ئازاد کرا، هەر پیاوێك دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا من نوێنەری نەوەکانی فلانم، هاتووم هەواڵی موسوڵمانبوونیانت پێ بدەم، باوکیشم ڕۆیشت هەواڵی موسوڵمانبوونی قەومەکەی خۆی پێدا، کاتێ گەڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کامەتان قورئانی زۆرتر لەبەرە ئەو پێش بخەن بۆ پێشنوێژی، وتی: تەماشایان کرد منیش لەوانە بووم کە لە کاروانییەکانەوە فێری قورئان ببووبووم، کەسێکیان نەبینییەوە لەنێو خۆیاندا لە من زیاتر قورئانی لەبەر بێت، پێشیان خستم، من منداڵ بووم (لە تەمەنی حەوت بۆ هەشت ساڵ) نوێژم بۆ کردن پارچە قوماشێکم دابوو بە خۆمدا، کاتێ ڕکووع یان سوژدەم دەبرد عەورەتم دەردەکەوت، کاتێ نوێژمان کرد پیرەژنێکی بەساڵاچوو وتی: سمتی قورئان خوێنەکەتان داپۆشن، وتی: پارچە کراسێکیان بۆم بڕی، وتی: پێم وایە وتی: کراسی بەحرەین بوو (شارێکە دەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە)، باسی کرد ئەو زۆر پێی دڵخۆش بوو.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَ لِلِابْنِ إِمَامَةَ أَبِيهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ النَّبِيِّ ﷺ: يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ».**

**باسی بەڵگە لەسەر دژی وتەی ئەو کەسەی پێی باش نییە منداڵ پێشنوێژی باوکی بکات، ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی زۆرترین قورئانی لەبەرە پێشنوێژی بۆ قەومەکە دەکات**

## بَابُ التَّغْلِيظِ عَلَى الْأَئِمَّةِ فِي تَرْكِهِمْ إِتْمَامَ الصَّلَاةِ، وَتَأْخِيرِهِمُ الصَّلَاةَ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ صَلَاةَ الْإِمَامِ قَدْ تَكُونُ نَاقِصَةً، وَصَلَاةَ الْمَأْمُومِ تَامَّةً، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ صَلَاةَ الْمَأْمُومِ مُتَّصِلَةٌ بِصَلَاةِ الْإِمَامِ، إِذَا فَسَدَتْ صَلَاةُ الْإِمَامِ، فَسَدَتْ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ، زَعَمَ»

**١٥١٣-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَمَّ النَّاسَ فَأَصَابَ الْوَقْتَ وَأَتَمَّ الصَّلَاةَ فَلَهُ وَلَهُمْ، وَمَنِ انْتَقَصَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَعَلَيْهِ وَلَا عَلَيْهِمْ»[١].

**باسی هەڕەشەکردن لە پێشەواکان لەوەی نوێژ بەتەواوی نەکەن و لە کاتی خۆی دوای بخەن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەندێ جار نوێژی پێشنوێژ ناتەواوە و نوێژی نوێژخوێنەکان تەواوە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە نوێژی نوێژخوێن پەیوەستە بە نوێژی پێشنوێژەوە، ئەگەر نوێژی پێشنوێژ بەتاڵ بوو نوێژی نوێژخوێنەکانی پشتەوەشی بەتاڵ دەبێت، ئەوە تەنها گومانێکە و هیچی دیکە**

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد لە کاتی خۆیدا و نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام دا ئەوە بۆ ئەو و بۆ ئەوانە، هەر کەسێکیش کەموکوڕی تێدا بکات ئەوە (پێشنوێژی) لەسەری دەکەوێت و لەسەر (نوێژخوێنەکان) ناکەوێت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ انْتِظَارِ الْإِمَامِ إِذَا أَبْطَأَ، وَأَمْرِ الْمَأْمُومِينَ أَحَدَهُمْ بِالْإِمَامَةِ

**١٥١٤-** عَنْ حَمْزَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَخَلَّفَ، فَتَخَلَّفَ مَعَهُ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ قَالَ: قَالَ: فَانْتَهَيْنَا إِلَى النَّاسِ وَقَدْ صَلَّى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَكْعَةً، فَلَمَّا أَحَسَّ بِجِيئَةِ النَّبِيِّ ﷺ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ صَلِّ، فَلَمَّا قَضَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ الصَّلَاةَ وَسَلَّمَ، قَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمُغِيرَةُ فَأَكْمَلَا مَا سَبَقَهُمَا[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ قَدْ يَغْلَطُ فِيهَا مَنْ لَا يَتَدَبَّرُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ، وَلَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ وَالْفِقْهَ، زَعَمَ بَعْضُ مَنْ يَقُولُ بِمَذْهَبِ الْعِرَاقِيِّينَ أَنَّ مَا أَدْرَكَ مَعَ الْإِمَامِ آخِرَ صَلَاتِهِ، أَنَّ فِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَالْمُغِيرَةَ إِنَّمَا قَضَيَا الرَّكْعَةَ الْأُولَى؛ لِأَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ إِنَّمَا سَبَقَهُمَا بِالْأُولَى، لَا بِالثَّانِيَةِ، وَكَذَلِكَ ادَّعُوا فِي قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا، فَزَعَمُوا أَنَّ فِيهِ دَلَالَةً عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا يَقْضِي أَوَّلَ صَلَاتِهِ لَا آخِرَهَا، وَهَذَا التَّأْوِيلُ مَنْ تَدَبَّرَ الْفِقْهَ عَلِمَ أَنَّ هَذَا التَّأْوِيلَ خِلَافُ قَوْلِ أَهْلِ الصَّلَاةِ جَمِيعًا، إِذْ لَوْ كَانَ الْمُصْطَفَى ﷺ وَالْمُغِيرَةُ بَعْدَ سَلَامِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَضَيَا الرَّكْعَةَ الْأُولَى الَّتِي فَاتَتْهُمَا لَكَانَا قَدْ قَضَيَا رَكْعَةً بِلَا جِلْسَةٍ وَلَا تَشَهُّدٍ، إِذِ الرَّكْعَةُ الَّتِي فَاتَتْهُمَا وَكَانَتْ أَوَّلَ صَلَاةِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ كَانَتْ رَكْعَةً بِلَا جِلْسَةٍ، وَلَا تَشَهُّدٍ، وَفِي اتِّفَاقِ أَهْلِ الصَّلَاةِ أَنَّ الْمُدْرِكَ مَعَ الْإِمَامِ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ يَقْضِي رَكْعَةً بِجِلْسَةٍ وَتَشَهُّدٍ وَسَلَامٍ، مَا بَانَ وَصَحَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَقْضِ الرَّكْعَةَ الْأُولَى الَّتِي لَا جُلُوسَ فِيهَا وَلَا تَشَهُّدَ وَلَا سَلَامَ، وَإِنَّهُ قَضَى الرَّكْعَةَ الثَّانِيَةَ الَّتِي فِيهَا جُلُوسٌ وَتَشَهُّدٌ وَسَلَامٌ، وَلَوْ كَانَ مَعْنَى قَوْلِهِ ﷺ: وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا، مَعْنَاهُ: أَنِ اقْضُوا مَا فَاتَكُمْ كَمَا ادَّعَاهُ مَنْ خَالَفَنَا فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ كَانَ عَلَى مَنْ فَاتَتْهُ رَكْعَةٌ مِنَ الصَّلَاةِ مَعَ الْإِمَامِ أَنْ يَقْضِيَ رَكْعَةً بِقِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسَجْدَتَيْنِ بِغَيْرِ جُلُوسٍ وَلَا تَشَهُّدٍ وَلَا سَلَامٍ، وَفِي اتِّفَاقِهِمْ مَعَنَا أَنَّهُ يَقْضِي رَكْعَةً بِجُلُوسٍ وَتَشَهُّدٍ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ الْجُلُوسَ وَالتَّشَهُّدَ وَالسَّلَامَ مِنْ حُكْمِ الرَّكْعَةِ الْأَخِيرَةِ، لَا مِنْ حُكْمِ الْأُولَى، فَمَنْ فَهِمَ الْعِلْمَ وَعَقَلَهُ، وَلَمْ يُكَابِرْ عَلِمَ أَنْ لَا تَشَهُّدَ وَلَا جُلُوسَ لِلتَّشَهُّدِ، وَلَا سَلَامَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الصَّلَاةِ».

## باسی مۆڵەت دراوە چاوەڕوانی پێشنوێژ نەکرێ ئەگەر دوا کەوت، وە نوێژخوێنان یەکێك بکەنە پێشنوێژی خۆیان

واتە: حەمزەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ جارێکیان دوا کەوت، موغیرەی کوڕی شوعبەیش لەگەڵی دوا کەوت، -دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد - وتی: کە گەیشتینە لای خەڵکەکە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف یەك ڕکاتی کردبوو، کاتێ هەستی کرد بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ ویستی بێتە دواوە، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆی کرد نوێژی خۆت بکە، کاتێ عەبدوڕەحمان نوێژی تەواو کرد و سەلامی دایەوە، پێغەمبەر ﷺ و موغیرە هەستانەوە ئەوەی پێشیان کەوتبوو تەواویان کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە هەندێ کە لەوانەی کە سەرنجی نادات و لە زانست و فیقە تێ ناگات تووشی هەڵە دەبێت، هەندێك لەوانەی کە شوێنی مەزهەبی

عێراقییەکان کەوتووە وا گومان دەبات ئەوەی بگات بە ئیمام لە کۆتا ڕکاتی نوێژەکەی، ئەو دەستەواژەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و موغیرە ڕکاتی یەکەمیان تەواو کرد، چونکە عەبدوڕەحمان یەکەم ڕکات پێشیان کەوت نەك دووەم ڕکات، بەهەمان شێوە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا)، واتە: ئەوەیشی لە دەستتان چووە تەواوی بکەن. پێیان وایە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یەکەمینی نوێژەکەی تەواو دەکات نەك کۆتاییەکەی، هەر کەسێك سەرنجی فیقهی دابێت دەزانێت ئەم لەیەکدانەوەیە پێچەوانەی هەموو نوێژخوێنانە بەگشتی، چونکە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ و موغیرە دوای سەلامدانەوەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف یەکەم ڕکاتیان تەواو بکردایە کە لە دەستیان چوو ئەوە ڕکاتێکیان تەواو دەکرد بەبێ دانیشتن و تەحیات، چونکە ئەو ڕکاتەی لە دەستیان چوو یەکەم ڕکاتی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو دانیشتن و تەحیاتی تێدا نەبوو، ئەهلی نوێژخوێنان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی بگاتە یەك ڕکات لەگەڵ پێشنوێژ لە نوێژی بەیانی ئەوە ڕکاتێك تەواو دەکات بە دانیشتن و تەحیات و سەلامدانەوە، ڕوون و ئاشکرایە پێغەمبەر ﷺ ڕکاتی یەکەمی تەواو نەکرد بەبێ دانیشتن و بەبێ تەحیات و بەبێ سەلامدانەوە، بێگومان ئەو ڕکاتی دووەمی تەواو کرد کە دانیشتن و تەحیات و سەلامدانەوەی تێدایە، جا ئەگەر فەرموودەکە: (وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا)، مانای ئەوە بووایە: ئەوەی لە دەستان چووە ئەوە تەواو بکەن، وەك ئەو کەسەی پێچەوانەی ئێمەی کردووە لەم مەسەلەدا بانگەشە دەکات، ئەوە پێویست بوو لەسەر ئەو کەسەی ڕکاتێکی لە نوێژەکەی لە دەست داوە لەگەڵ ئیمام ئەوە ڕکاتێکی تەواو بکردایە بە وەستان و ڕکووع و دوو سوژدە بەبێ دانیشتن و تەحیات و سەلامدانەوە، بەڵام بۆچوونی ئێمە ئەوەیە دەبێت یەك ڕکات تەواو بکات بە دانیشتن و تەحیات، ڕوون بۆیەوە جێگیر بوو کە بەڕاستی تەحیات و دانیشتن و سەلامدانەوە لە حوکمی ڕکاتی کۆتاییە، نەك لە حوکمی ڕکاتی یەکەم، هەر کەسێك لە زانست تێگەیشتبێت و بەعەقڵ وەریگرتبێت و لووتبەرز نەبێت ئەوە زانیویەتی لە ڕکاتی یەکەم تەحیات و دانیشتن و سەلامدانەوە نییە.




## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي صَلَاةِ الْإِمَامِ الْأَعْظَمِ خَلْفَ مَنْ أَمَّ النَّاسَ مِنْ رَعِيَّتِهِ، وَإِنْ كَانَ الْإِمَامُ مِنَ الرَّعِيَّةِ يَؤُمُّ النَّاسَ بِغَيْرِ إِذْنِ الْإِمَامِ الْأَعْظَمِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ فِي إِمَامَةِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ

١٥١٥- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، أَنَّ الْمُغِيرَةِ بْنَ شُعْبَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةَ تَبُوكَ قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ حَتَّى نَجِدَ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ فَصَلَّى لَهُمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الْأَخِيرَةَ، فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُتِمُّ صَلَاتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ صَلَاتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ ثُمَّ قَالَ: أَحْسَنْتُمْ، - أَوْ قَالَ: أَصَبْتُمْ -، يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلُّوا الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الصَّلَاةَ إِذَا حَضَرَتْ وَكَانَ الْإِمَامُ الْأَعْظَمُ غَائِبًا عَنِ النَّاسِ أَوْ مُتَخَلِّفًا عَنْهُمْ فِي سَفَرٍ، فَجَائِزٌ لِلرَّعِيَّةِ أَنْ يُقَدِّمُوا رَجُلًا مِنْهُمْ يَؤُمُّهُمْ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ حَسَّنَ فِعْلَ الْقَوْمِ أَوْ صَوَّبَهُ إِذْ صَلَّوَا الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا بِتَقْدِيمِهِمْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ لِيَؤُمَّهُمْ، وَلَمْ يَأْمُرْهُمْ بِانْتِظَارِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَّا إِذَا كَانَ الْإِمَامُ الْأَعْظَمُ حَاضِرًا فَغَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَؤُمَّهُمْ أَحَدٌ بِغَيْرِ إِذْنِهِ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ زَجَرَ عَنْ أَنْ يُؤَمَّ السُّلْطَانُ بِغَيْرِ أَمْرِهِ.

## باسی مۆڵەت دراوە پێشەوای گەورە لەپشت کەسێك لە خەڵکەکەی خۆی نوێژ بکات، ئەگەرچی پێشنوێژ لە خەڵکەکە بەبێ مۆڵەتی پێشەوای گەورە نوێژی بۆ کردن ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی موغیرەی کوڕی شوعبە دەربارەی پێشنوێژی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بەڵگەیە

واتە: عوڕوەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە، موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ هەواڵی پێ داوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی تەبوکی کرد، موغیرە وتی: لەگەڵی هاتم تا گەیشتین بە خەڵکەکە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان پێش خستبوو، نوێژی بۆ کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە یەکێك لە دوو ڕکاتەکەی نوێژی بەیانی، ڕکاتی کۆتایی لەگەڵ خەڵکەکە کرد، کاتێ عەبدوڕەحمان سەلامی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە نوێژەکەی تەواو بکات، موسوڵمانان پەشۆکان و زۆر تەسبیحاتیان کرد (چونکە پێشی پێغەمبەر ﷺ کەوتبوون)، کاتێ پێغەمبەر ﷺ

---

(١) صحيح.

نوێژەکەی تەواو کرد، ڕووی تێکردن، پاشان فەرمووی: چاکتان کرد، یان فەرمووی: بەڕاستی پێکاتان، خۆزگەی پێ خواستن کە لە کاتی خۆیدا نوێژیان کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی ئەگەر کاتی نوێژ هات پێشەوای گەورە نادیار بوو یان لە گەشتێك بوو و دوا کەوت، دروستە بۆ خەڵکەکە کەسێك لە خۆیان پێش بخەن تا پێشنوێژییان بۆ بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ کردەوەی خەڵکەکەی پێ باش بوو یان بە ڕاست و دروستی زانی کە نوێژیان لە کاتی خۆیدا کرد، بەوەی عەبدوڕەحمانیان پێش خست پێشنوێژییان بۆ بکات، فەرمانی پێ نەکردن چاوەڕوانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بەڵام ئەگەر پێشەوای گەورە ئامادە بوو، ئەوە دروست نییە هیچ کەس بەبێ مۆڵەتی ئەو پێشنوێژی بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە بەبێ فەرمانی فەرماندە کەسێکی دیکە پێشنوێژی بکات.

**١٥١٦-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَلَا تَؤُمَّنَّ رَجُلًا فِي سُلْطَانِهِ وَلَا فِي أَهْلِهِ وَلَا تَجْلِسْ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ»[١].

واتە: ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با پیاوێك پێشنوێژی نەکات بۆ پیاوێك لە شوێنی دەسەڵاتەکەی، یان لەنێو کەسوکارەکەی، وە دانەنیشێ لەسەر جێگای خاوەن ماڵ تا مۆڵەتی پێ نەدات.

## بَابُ إِمَامَةِ الْمَرْءِ السُّلْطَانَ بِأَمْرِهِ، وَاسْتِخْلَافِ الْإِمَامِ رَجُلًا مِنَ الرَّعِيَّةِ إِذَا غَابَ عَنْ حَضْرَةِ الْمَسْجِدِ الَّذِي يَؤُمُّ النَّاسَ فِيهِ فَتَكُونُ الْإِمَامَةُ بِأَمْرِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ «فِي أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِلَالًا إِذَا حَضَرَتِ الْعَصْرُ وَلَمْ يَأْتِ أَنْ يَأْمُرَ أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ»

**١٥١٧-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَتَاهُمْ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ قَالَ لِبِلَالٍ: «يَا بِلَالُ، إِذَا حَضَرَتِ الْعَصْرُ وَلَمْ آتِ فَمُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» - وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ -، وَذَكَرَ فِي الْخَبَرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَ فَقَامَ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ: امْضِ فِي صَلَاتِكَ[٢].

---

(١) صحيح، هذا المتن جزء من حديث طويل تقدم جزء منه في حديث (١٥٠٧).

(٢) صحيح.

## باسی کاربەدەست کەسێك بکات بە پێشنوێژ و خۆی لە پشتیەوە نوێژ بکات، هەروەها کەسێك دیاری بکات کاتێ خۆی ئامادە نەبوو لە مزگەوت پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات، جا پێشنوێژی دەبێت بە فەرمانی ئەو بێت، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو حازم لە سەهلی کوڕی سەعدەوە لەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بیلال کرد ئەگەر کاتی نوێژی عەسر هات و نەگەڕایەوە، با فەرمان بە ئەبو بەکر بکات پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: شەڕ و ئاژاوە لەنێو نەوەکانی عەمری کوڕی عەوف ڕووی دا، ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان هات بۆ نێویان بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوانیان، پاشان بە بیلالی وت: ئەی بیلال، ئەگەر کاتی نوێژی عەسر هات و من نەهاتمەوە ئەوە فەرمان بە ئەبو بەکر ﷺ بکە با نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، - دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- لە فەرموودەکەدا ئەوەیشی باس کرد پێغەمبەر ﷺ لە پشت ئەبو بەکرەوە وەستا و ئاماژەی بۆی کرد، بەردەوام بە لەسەر نوێژەکەت.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِمَامَةِ الْمَرْءِ مَنْ يَكْرَهُ إِمَامَتَهُ

**١٥١٨-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ دِينَارٍ الْهُذَلِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةٌ لَا تُقْبَلُ مِنْهُمْ صَلَاةٌ، وَلَا تَصْعَدُ إِلَى السَّمَاءِ، وَلَا تُجَاوِزُ رُءُوسَهُمْ: رَجُلٌ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَرَجُلٌ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ وَلَمْ يُؤْمَرْ، وَامْرَأَةٌ دَعَاهَا زَوْجُهَا مِنَ اللَّيْلِ فَأَبَتْ عَلَيْهِ»[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی کەسێك پێشنوێژی خەڵکێك بکات پێیان ناخۆش بێت

واتە: عەتائی کوڕی دیناری هوزەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن نوێژیان لێ وەرناگیرێ و بەرز نابێتەوە بۆ ئاسمان و لەسەریان تێناپەڕێ: پیاوێك پێشنوێژی بۆ خەڵکێك بکات پێیان ناخۆش بێت، پیاوێکیش نوێژ لەسەر تەرمێك بکات و فەرمانی پێ نەکرابێت، ئافرەتێکیش مێردەکەی شەو بانگی بکات بۆ سەرجێی یاخی بێت لێی.

---

(١) إسناده ضعيف.

**١٥١٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يَرْفَعُهُ يَعْنِي: مِثْلَ هَذَا[١].

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ ڕەفعی كردووە، واتە: بەهەمان شێوەی فەرموودەكەی پێشوو.**

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِمَامَةِ الزَّائِرِ

**١٥٢٠-** عَنْ بُدَيْلِ بْنِ مَيْسَرَةَ الْعُقَيْلِيِّ، عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ يُكْنَى أَبَا عَطِيَّةَ، قَالَ: أَتَانَا مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَقِيلَ لَهُ: تَقَدَّمْ قَالَ: لِيَؤُمَّكُمْ رَجُلٌ مِنْكُمْ، فَلَمَّا صَلَّوْا قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا زَارَ الرَّجُلُ الْقَوْمَ فَلَا يَؤُمَّهُمْ، وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ»[٢].

## باسی قەدەغەكردن لە پێشنوێژیكردنی ئەو كەسەی سەردانی دەكات

**واتە: بەدیلی كوڕی مەیسەرەی عوقەیلی دەگێڕێتەوە، لە پیاوێكی خۆیانەوە كە نازناوی ئەبو عەتییە بوو، وتی: مالیكی كوڕی حوەیریس ﷺ هات بۆ لامان، پاشان كاتی نوێژ هات پێی وترا: پێش كەوە، وتی: با پیاوێك لە خۆتان پێش بكەوێ، كاتێ نوێژیان تەواو كرد وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر پیاوێك سەردانی قەومێكی كرد با پێشنوێژییان بۆ نەكات، بەڵكوو پیاوێك لە خۆیان پێشنوێژییان بۆ بكات.**

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قِيَامِ الْإِمَامِ
## عَلَى مَكَانٍ أَرْفَعَ مِنْ مَكَانِ الْمَأْمُومِينَ لِتَعْلِيمِ النَّاسِ الصَّلَاةَ

**١٥٢١-** عَنْ سَهْلٍ ﷺ، أَنَّهُ جَاءَهُ نَفَرٌ يَتَمَارَوْنَ فِي الْمِنْبَرِ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ، وَمَنْ عَمِلَهُ، فَقَالَ سَهْلٌ: أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْرِفُ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ، وَمَنْ عَمِلَهُ، وَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوَّلَ يَوْمٍ قَامَ عَلَيْهِ، أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى فُلَانَةَ قَالَ: إِنَّهُ لَيُسَمِّيهَا يَوْمَئِذٍ، وَنَسِيتُ اسْمَهَا: أَنْ مُرِي غُلَامَكِ النَّجَّارَ يَعْمَلْ لِي أَعْوَادًا أُكَلِّمُ النَّاسَ عَلَيْهَا، فَعَمِلَ هَذِهِ الثَّلَاثَ الدَّرَجَاتِ مِنْ طَرْفَاءِ الْغَابَةِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ عَلَيْهِ فَكَبَّرَ، فَكَبَّرَ النَّاسُ خَلْفَهُ، ثُمَّ رَكَعَ، وَرَكَعَ النَّاسُ، ثُمَّ رَفَعَ، وَنَزَلَ الْقَهْقَرَى، ثُمَّ سَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلَاتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، وَتَعَلَّمُوا صَلَاتِي[٣].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## باسی مۆڵەت دراوە بە پێشنوێژ لە جێگایەك پێشنوێژی بکات بەرزتر بێت لە جێگای نوێژخوێنەکان بۆ ئەوەی خەڵکی فێری نوێژ بکات

واتە: سەهل ﷺ دەگێڕێتەوە، چەند کەسێك هاتن بۆ لای مشتومڕیان بوو لەسەر ئەوەی کە مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ، دارەکەی لەچی بووە؟ کێیش دروستی کردووە، سەهل وتی: سوێند بە خوا من دەزانم دارەکەی لە چی دارێك بووە و کێیش دروستی کردووە، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی یەکەم ڕۆژ لەسەری وەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای ئافرەتێك وتی: ئەو ڕۆژە ناوی ئافرەتەکەی هێنا بەڵام من ناوەکەیم بیر چوو: کە فەرمان بکات بە کوڕە نەجارەکەی، بەدار شتێکم بۆ دروست بکات لەسەری دابنیشم کاتێ قسە بۆ خەڵکی دەکەم، ئەو سێ پلیکانەی بۆ دروست کرد لە داری دارستانەکەی دەوروبەری مەدینە، بێگومان بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەرەکە (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی کرد، خەڵکەکەیش لە پشتیەوە تەکبیریان کرد، پاشان ڕکووعی برد، خەڵکەکەیش لە پشتیەوە ڕکووعیان برد، پاشان سەری بەرزکردەوە، پاشان دابەزی و هاتە دواوە، ئینجا سوژدەی برد لە خوارووی مینبەرەکە، پاشان گەڕایەوە (بۆ سەر پلیکانەی مینبەرەکە)، کاتێ لێ بۆیەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئەی خەڵکینە بۆیە ئەمەم کرد تا پەیڕەویم بکەن و فێری نوێژی من بن.

**١٥٢٢-** عَنْ أَبِي حَازِمٍ، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَلَمْ يَقُلْ: إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، وَتَعَلَّمُوا صَلَاتِي[١].

واتە: ئەبو حازم گێڕایەوەو باسی فەرموودەکەی کرد، بەڵام نەیوت: بۆیە ئەمەم کرد تا پەیڕەویم بکەن و فێری نوێژی من بن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ قِيَامِ الْإِمَامِ عَلَى مَكَانٍ أَرْفَعَ مِنَ الْمَأْمُومِينَ إِذَا لَمْ يُرِدْ تَعْلِيمَ النَّاسِ

**١٥٢٣-** عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا حُذَيْفَةُ ﷺ عَلَى دُكَّانٍ مُرْتَفِعٍ، فَسَجَدَ عَلَيْهِ، فَجَبَذَهُ أَبُو مَسْعُودٍ، فَتَابَعَهُ حُذَيْفَةُ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: أَلَيْسَ قَدْ نُهِيَ عَنْ هَذَا؟ فَقَالَ لَهُ حُذَيْفَةُ: أَلَمْ تَرَنِي قَدْ تَابَعْتُكَ؟[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح موقوف له حكم المرفوع.

## باسی قەدەغەكردن لەوەی پێشنوێژ لە جێگایەك نوێژ بكات بەرزتر بێت لە شوێنی نوێژخوێنەكان، ئەگەر مەبەستی فێركردنی خەڵك نەبوو

واتە: هەمام دەڵێ: حوزەیفە ﷺ نوێژی بۆ كردین لەسەر شوێنێكی بەرز سوژدەی لەسەری برد، ئەبو مەسعود ڕایكێشا ئەبو حوزەیفەیش شوێنی كەوت، كاتێ نوێژی تەواو كرد، ئەبو مەسعود وتی: ئایا ڕێگری نەكراوە لەمە؟ حوزەیفە پێی وت: ئایا منت نەبینی شوێنت كەوتم؟

## بَابُ إِيذَانِ الْمُؤَذِّنِ الْإِمَامَ بِالصَّلَاةِ

**١٥٢٤**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَصَلَّى يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى[(١)].

## باسی ئاگاداركردنەوەی پێشنوێژ لەلایەن بانگدەرەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لەلای مەیمونەی پورم خەوتم، پێغەمبەر ﷺ نوێژی كرد ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت، پاشان ڕاكشاو خەوت تاكو پرخەی دەهات، پاشان بانگدەر هات بۆ لای ئاگاداری كردەوە بۆ نوێژ، ئەویش دەرچوو نوێژی كرد.

## بَابُ انْتِظَارِ الْمُؤَذِّنِ الْإِمَامَ بِالْإِقَامَةِ

**١٥٢٥**- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ مُؤَذِّنُ النَّبِيِّ ﷺ يُؤَذِّنُ، ثُمَّ يُمْهِلُ، فَإِذَا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَقْبَلَ أَخَذَ فِي الْإِقَامَةِ[(٢)].

## باسی بانگدەر چاوەڕوانی پێشنوێژ بكات بۆ قامەتكردن

واتە: جابری كوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: بانگدەری پێغەمبەر ﷺ بانگی دەدا، پاشان ئەندازەیەك دەمایەوە، كاتێ پێغەمبەری ﷺ ببینایە دەركەوت دەستی دەكرد بە قامەت.

---

(١) صحيح.

(٢) أسناده حسن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ قِيَامِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ قَبْلَ رُؤْيَتِهِمْ إِمَامَهُمْ

**١٥٢٦-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي»[١].

## باسی قەدەغەكردن لە هەستانی خەڵك بۆ نوێژ پێش ئەوەی پێشنوێژ ببینن

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كاتێ قامەت كرا بۆ نوێژ هەڵمەستن تا دەمبینن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي كَلَامِ الْإِمَامِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الْإِقَامَةِ، وَالْحَاجَةُ تَبْدُو لِبَعْضِ النَّاسِ

**١٥٢٧-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَرَجُلٌ يُنَاجِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى[٢].

## باسی ڕێگە دراوە بە پێشنوێژ لەدوای قامەت قسە بكات، ئەگەر پێویستی كرد

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: قامەت بۆ نوێژ كرا پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی دەكرد تا هاوەڵەكانی خەویان لێ كەوت، پاشان هەستا نوێژی كرد.

## بَابُ ذِكْرِ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ لِلْأَئِمَّةِ بِالرَّشَادِ

**١٥٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ أَرْشِدِ الْأَئِمَّةَ، وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ»[٣].

## باسی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێشەواكان بۆ ژیری و دانایی و ڕاستی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیمام زەمانەتكارە (واتە: پێویستە لەسەری پارێزگاری لە نوێژی نوێژخوێنەكان بكات لە بەتاڵبوون و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

کەموکوڕی لە پایەکان و ژمارەی ڕکاتەکاندا نەکات)، وە بانگدەر متمانەپێکراوە (واتە: پێویستە بزانێت لە چی کاتێکدا بانگ دەدات بۆ نوێژ چونکە خەڵکی بە بانگی ئەو نوێژەکانیان دەکەن، هەروەها بە بانگی ئەو ڕۆژوو دەشکێنن)، خوایە پێشەواکان ژیر و دانا بکە (پێشنوێژی بۆ نوێژخوێنەکان بکەن بەچاکترین شێوە) وە لە بانگدەرانیش خۆش بە.

**١٥٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ بِمِثْلِهِ[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، وەکوو فەرموودەکەی پێشوو.**

**١٥٣٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَلَمْ يَذْكُرَا الْأَعْمَشَ فِي الْإِسْنَادِ[٢].

**واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.**

**١٥٣١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤَذِّنُونَ أُمَنَاءُ، وَالْأَئِمَّةُ ضُمَنَاءُ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ وَسَدِّدِ الْأَئِمَّةَ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بانگدەرەکان متمانەپێکراون (واتە: پێویستە بزانن لە چی کاتێکدا بانگ دەدەن بۆ نوێژ چونکە خەڵکی بە بانگی ئەوان نوێژەکانیان دەکەن، هەروەها بە بانگی ئەوان ڕۆژوو دەشکێنن)، ئیمامەکانیش زەمانەتکارن (واتە: پێویستە لەسەریان پارێزگاری لە نوێژی نوێژخوێنەکان بکەن لە بەتاڵبوون و کەموکوڕی لە پایەکان و ژمارەی ڕکاتەکاندا نەکەن) خوایە لە بانگدەران خۆش بە و ئیمامەکانیش دامەزراو بکەی لەسەر ڕاستی، سێ جار.**

---

(١) أخرجه: أحمد ٣٨٢/٢، وأبو داود (٥١٨)، والبيهقي ٤٣٠/١-٤٣١، من طريق عبدالله بن نمير بهذا الإسناد.
أخرجه: أحمد ٢٣٢/٢، ومن طريقه أبو داود (٥١٨) عن محمد بن فضيل، عن الأعمش، عن رجل، عن أبي صالح، به.
قال سفيان الثوري: ((لم يسمع الأعمش هذا الحديث من أبي صالح))، انظر: **التخليص الحبير** (٥١٢/١)، وانظر الحديث (١٥٢٨).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**١٥٣٢-** عَنْ حيوة عن نَافعِ بْنِ سُلَيْمَانَ بِمِثْلِهِ سَوَاءً[١].

واته: لەم ڕێگایەشەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو هێناویەتی.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ قِيَامِ الْمَأْمُومِينَ خَلْفَ الْإِمَامِ وَمَا فِيهِ مِنَ السُّنَنِ

## بَابُ قِيَامِ الْمَأْمُومِ الْوَاحِدِ عَنْ يَمِينِ الْإِمَامِ إِذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهُمَا أَحَدٌ

**١٥٣٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَلَمَّا كَانَ بَعْضُ اللَّيْلِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فَأَتَى شَنًّا مُعَلَّقًا فَتَوَضَّأَ وَضُوءًا خَفِيفًا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ وَصَنَعْتُ مِثْلَ الَّذِي صَنَعَ، ثُمَّ قُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَحَوَّلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّى مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى[٢].

## کۆباسی وەستانی نوێژخوێنەکان لەپشت ئیمام، وە ئەوەشی تیایدایە لە سوننەتەکان

## باسی وەستانی یەک نوێژخوێن لە لای ڕاستی پێشنوێژ، ئەگەر کەسی دیکەیان لەگەڵ نەبێت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: شەو لەلای پورم مەیمونە مامەوە، کاتێ بەشێکی شەو تێپەڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژکردن، هات بۆ لای جەوەنەیەکی هەڵواسراو دەستنوێژێکی سووکی گرت، پاشان هەستا نوێژی کرد، منیش هەستام وەکوو ئەو دەستنوێژم گرت، پاشان لەلای چەپی ڕاوەستام، من هێنایە لای ڕاستی خۆی، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت نوێژی کرد، پاشان ڕاکشا و خەوت تا دەیپرخاند، پاشان بانگدەر هات بۆ لای ئاگاداری کردەوە بۆ نوێژ، دواتر دەرچوو نوێژی کرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمَأْمُومَ يَقُومُ خَلْفَ الْإِمَامِ «يَنْتَظِرُ مَجِيءَ غَيْرِهِ فَإِنْ فَرَغَ الْإِمَامُ مِنَ الْقِرَاءَةِ، وَأَرَادَ الرُّكُوعَ قَبْلَ مَجِيءِ غَيْرِهِ، تَقَدَّمَ فَقَامَ عَنْ يَمِينِ الْإِمَامِ»

١٥٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَتَتَبَّعْتُ كَيْفَ يُصَلِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَجِئْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، وَقَالَ: فَأَخَذَنِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو كەسەی وا گومان دەبات نوێژخوێن لەپشت پێشنوێژ دەوەستێ و چاوەڕوانی كەسێكی دیكە دەكات، ئەگەر پێشنوێژ قورئانخوێندنی تەواو كرد و ویستی بچێتە ڕكووع، كەس نەهات ئەوە دەچێتە پێشەوە لەلای ڕاستی پێشنوێژ دەوەستێ

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: شەو لەلای پورم مەیمونە مامەوە، ورد بوومەوە تا بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژ دەكات، پاشان هەستا نوێژی دەكرد، منیش هەستام لە تەنیشتی لەلای چەپیەوە وەستام، وتی: گرتمی و لەلای ڕاستی وەستاندمی.

## بَابُ قِيَامِ الِاثْنَيْنِ خَلْفَ الْإِمَامِ

١٥٣٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ، فَجِئْتُهُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ عَنْ يَسَارِهِ، فَنَهَانِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ جَاءَ صَاحِبٌ لِي فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُخَالِفًا بَيْنَ طَرَفَيْهِ[٢].

## باسی وەستانی دوو كەس لەپشت پێشنوێژ

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی ئێوارەی كرد، منیش هاتم بۆ لای لە تەنیشتی لەلای چەپیەوە وەستام، قەدەغەی لێ كردم خستمیە لای ڕاستیەوە، پاشان هاوەڵێكم هات لە پشتیەوە ڕیزمان بەست، پێغەمبەری

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح من غير طريق شرحبيل.

خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین بە یەك پارچە قوماشەوە هەردوو چەمکەکەی بە پێچەوانە دابوو بەسەر شانیدا. (واتە: لای ڕاستی دابوو بە لای چەپدا و لای چەپیشی دابوو بە لای ڕاستیدا).

## بَابُ تَقَدُّمِ الْإِمَامِ عِنْدَ مَجِيءِ الثَّالِثِ إِذَا كَانَ مَعَ الْمَأْمُومِ الْوَاحِدِ

**١٥٣٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَا، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَوَجَدْنَاهُ قَائِمًا يُصَلِّي عَلَيْهِ إِزَارٌ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ وَقَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، فَصَبَبْتُ لَهُ وَضُوءًا، فَتَوَضَّأَ فَالْتَحَفَ بِإِزَارِهِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، وَأَتَى آخَرُ فَقَامَ عَنْ يَسَارِهِ، فَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ، فَصَلَّى ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِالْوِتْرِ(١).

## باسی پێشکەوتنی پێشنوێژ
## لە کاتی هاتنی کەسی سێیەم، ئەگەر لەگەڵ یەك نوێژخوێندا بوو

واتە: عەمری کوڕی سەعید دەڵێ: چووم بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ من و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان بینمان نوێژی دەکرد پۆشاکەکەی خوارەوەی جەستەی دابوو بە خۆیدا، -باسی هەندێك لە فەرموودەکەی کرد- وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتین، بۆ هەندێ پێویستی خۆی دەرچوو، ئاوی دەستنوێژم کرد بە دەستیدا، دەستنوێژی گرت پۆشاکەکەی بەشی خوارەوەی پێچا بە خۆیەوە، منیش لەلای چەپی وەستام، خستمیە لای ڕاستی، ئینجا یەکێکی دیکە هات لەلای چەپی وەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە پێشەوە نوێژی دەکرد، ئێمەیش نوێژمان لەگەڵی کرد، سیازدە ڕکاتی کرد بە ویتریشەوە.

## بَابُ إِمَامَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ الْوَاحِدَ، وَالْمَرْأَةَ الْوَاحِدَةَ

**١٥٣٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قال: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ النَّبِيِّ ﷺ وَعَائِشَةُ خَلْفَنَا تُصَلِّي مَعَنَا، وَأَنَا إِلَى جَنْبِ النَّبِيِّ ﷺ أُصَلِّي مَعَهُ(٢).

---

(١) صحيح من غير طريق شرحبيل.

(٢) صحيح.

## باسی پیاوێك پێشنوێژی یەك پیاو و یەك ئافرەت بكات

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لە تەنیشتی پێغەمبەر ﷺ نوێژم كرد عائیشەیش لە پشتمانەوە نوێژی لەگەڵمان دەكرد، من لە تەنیشتی پێغەمبەر ﷺ نوێژم دەكرد لەگەڵی.

## بَابُ إِمَامَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ الْوَاحِدَ، وَالْمَرْأَتَيْنِ

**١٥٣٨-** عَنْ مُوسى بن أَنَسٍ عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ هُوَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأُمُّهُ وَخَالَتُهُ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ أَنَسًا عَنْ يَمِينِهِ، وَأُمَّهُ وَخَالَتَهُ خَلْفَهُمَا(١).

## باسی پیاوێك پێشنوێژی یەك پیاو و دوو ئافرەت بكات

واتە: موسای كوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ، كە خۆی و پێغەمبەری خوا ﷺ و دایكی و پووری بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ كردن، ئەنەسی لە لای ڕاستی دانا، دایكی و پوریشی لە پشتیەوە دانا.

## بَابُ إِمَامَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ وَالْغُلَامَ غَيْرَ الْمُدْرِكِ وَالْمَرْأَةَ الْوَاحِدَةَ

**١٥٣٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ أَنَا وَيَتِيمٌ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ وَصَلَّتْ أُمِّي خَلْفَنَا(٢).

## باسی پیاوێك پێشنوێژی یەك پیاو و منداڵێك و یەك ئافرەت بكات

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من و منداڵێكی هەتیو لەپشت پێغەمبەر ﷺ نوێژمان كرد، دایكیشم لە پشتی ئێمەوە نوێژی كرد.

**١٥٤٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ بِمِثْلِهِ(٣).

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: وەكوو فەرموودەكەی پێشوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ إِجَازَةِ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ عَنْ يَمِينِ الْإِمَامِ إِذَا كَانَتِ الصُّفُوفُ خَلْفَهُمَا

**١٥٤١-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ قَالَ: مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ - فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ، وَقَالُوا فِي الْحَدِيثِ - وَأَذَّنَ وَأَقَامَ، وَأَمَرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: جِيئُونِي بِإِنْسَانٍ أَعْتَمِدُ عَلَيْهِ، فَجَاءُوا بِبَرِيرَةَ وَرَجُلٍ آخَرَ، فَاعْتَمَدَ عَلَيْهِمَا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَأُجْلِسَ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، فَذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَنَحَّى، فَأَمْسَكَهُ حَتَّى فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ[١].

## باسی ڕێگە دراوە نوێژخوێن لەلای ڕاستی پێشنوێژ نوێژ بکات، ئەگەر ڕیزەکان لە پشتیەوە بوون

واتە: سالمی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت، دواتر بێهۆش بوو، پاشان بەهۆش هاتەوە، فەرمووی: کاتی نوێژ هاتووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: فەرمان بکەن بە بیلال با بانگ بدات، فەرمانیش بکەن بە ئەبو بەکر با نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، -باسی فەرموودەکەیان کرد، لە فەرموودەکەدا وتیان- بانگی دا و قامەتیشی کرد، فەرمانیشیان کرد بە ئەبو بەکر نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، پاشان بەهۆش هاتەوە، فەرمووی: کاتی نوێژ هاتووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: کەسێکم بۆ بهێنن بچێتە ژێر شانم، بەریرە و پیاوێکی دیکەیان هێنا، شانی دایە ژێریان، پاشان دەرچوو بۆ نوێژ، لە تەنیشتی ئەبو بەکر دانیشێنرا ئەبو بەکریش دەهاتە دواوە، ئەویش گرتی تا لە نوێژەکەی بۆیەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ قَبْلَ تَكْبِيرِ الْإِمَامِ

**١٥٤٢-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلَاةِ وَيَقُولُ: «اسْتَوُوا، وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ»، قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: فَأَنْتُمُ الْيَوْمَ أَشَدُّ اخْتِلَافًا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانكردن بە ڕێكخستنی ڕیزەكان پێش (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی پێشنوێژ

واتە: ئەبو مەسعود عوقبەی كوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی نوێژ دەستی دەهێنا بە شانماندا و دەیفەرموو: ڕیزەكانتان ڕێك بخەن، (لەنێو نوێژ) جیاوازی مەكەن، (با هیچ یەكێتان لە ڕیزەكە نەچێتە پێشی ئەوی دیكە) دوایی دڵەكانتان دەگۆڕێ، ئەبو مەسعود وتی: ئێوە ئەمڕۆ ئەوپەڕی جیاوازیتان هەیە.

## بَابُ فَضْلِ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ، وَالْإِخْبَارُ بِأَنَّهَا مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ

**١٥٤٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ؛ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕێكخستنی ڕیزەكان، وە هەواڵدان بەوەی ڕێكخستنی ڕیزەكان لە تەواوی نوێژدایە

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕیزەكانتان ڕێك بخەن، چونكە ڕێكخستنی ڕیزەكان لە تەواوی نوێژدایە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِتْمَامِ الصُّفُوفِ الْأُولَى اقْتِدَاءً بِفِعْلِ الْمَلَائِكَةِ عِنْدَ رَبِّهِمْ

**١٥٤٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟» قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ قَالَ: «يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ، وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ»[٢].

## باسی فەرمانكردن بە تەواوكردنی ڕیزی یەكەم وەكو پەیڕەوكردنی كردەوەی فریشتەكان لە خزمەت پەروەردگاریان

واتە: جابری كوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئایا ڕیز نابن وەكوو چۆن فریشتەكان ڕیز دەبن لە خزمەتی پەروەردگاریان؟ (كاتێ هەڵدەستن بۆ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

پەرستشی خوا، یان لە لای عەرشی خوا) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا فریشتەکان چۆن ڕیز دەبن لە خزمەتی پەروەردگاریان؟ فەرمووی: ڕیزی یەکەم تەواو دەکەن، پاشان ڕیزەکەیان دەگەیەنن بە یەکدی هەتا بۆشایی لە نێوانیاندا نەبێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْمُحَاذَاةِ بَيْنَ الْمَنَاكِبِ وَالْأَعْنَاقِ فِي الصَّفِّ

١٥٤٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «رُصُّوا صُفُوفَكُمْ، وَقَارِبُوا بَيْنَهَا، وَحَاذُوا بِالْأَعْنَاقِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرَى الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مِنْ خِلَلِ الصَّفِّ كَأَنَّهَا الْحَذَفُ». قَالَ مُسْلِمٌ: يَعْنِي النَّقَدَ الصِّغَارَ، النَّقَدُ الصِّغَارُ: أَوْلَادُ الْغَنَمِ[١].

### باسی فەرمانکردن بە نزیککردنەوەی شانەکان و ملەکان لە یەکدییەوە لەنێو ڕیزدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شانتان بگەیەنن بە یەکدی وە ریزەکانتان لە یەکدی نزیك بکەنەوە ( بەجۆرێ جێگای ڕیزێکی دیکە نەبێتەوە لە نێوان ڕیزەکانتاندا، تا شەیتان نەتوانێ بە نێوانیاندا تێپەڕ بێت)، ملیشتان لە ئاستی یەکدی بێت، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە من شەیتان دەبینم دەچێتە نێو بۆشایی و ناڕێکی ڕیزەوە هەر وەکوو بەرخۆلە وایە. موسلیم وتی: (الْحَذَف)، واتە: (النَّقَدَ)ی بچووك، (النَّقَدَ)ی بچووکیش: بێچوی مەڕە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِأَنْ يَكُونَ النَّقْصُ وَالْخَلَلُ فِي الصَّفِّ الْآخِرِ

١٥٤٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُتَقَدِّمَ، فَإِنْ كَانَ نَقْصًا فَلْيَكُنْ فِي الْمُؤَخَّرِ»[٢].

### باسی فەرمانکردن بەوەی کەموکوڕی و کەلێن بخرێتە ڕیزی کۆتایی

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕیزی پێشەوە تەواو بکەن، ئەگەر ناتەواوی هەبوو با لە ڕیزی کۆتایی بێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٥٤٧- عَنْ شُعْبَةَ بِمِثْلِهِ قَالَ: أَتِمُّوا الصَّفَّ الْأَوَّلَ وَالثَّانِيَ، فَإِنْ كَانَ خَلَلٌ فَلْيَكُنْ فِي الثَّالِثِ[١].

واتە: وە لە ڕێگایەکی دیکەشەوە هاتووە لە شوعبەوە، فەرمووی: ڕیزی یەکەم و دووەم تەواو بکەن، ئەگەر کەموکوڕییەك هەبوو با لە ڕیزی سێیەم بێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِسَدِّ الْفُرَجِ فِي الصُّفُوفِ

١٥٤٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِذَا قُمْتُمْ فَاعْدِلُوا صُفُوفَكُمْ، وَسُدُّوا الْفُرَجَ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە پڕکردنەوەی بۆشاییەکان لەنێو ڕیزەکان

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێ هەستان بۆ نوێژ ڕیزەکانتان ڕێك بخەن، بۆشاییەکانیش پڕ بکەنەوە، چونکە من لە پشتمەوە دەتانبینم.

## بَابُ فَضْلِ وَصْلِ الصُّفُوفِ

١٥٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ»[٣].

## باسی فەزڵ و گەورەیی بەیەکگەیاندن و پڕکردنەوەی ڕیزەکان

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ڕیزێك بگەیەنێت بەوی دیکە خوا دەیگەیەنێت، ئەوەشی بیپچڕێنێت خوا دەیپچڕێنێت (واتە: هەر کەسێك ڕیزێك پڕ بکاتەوە، خوا بە چاکەی خۆی ڕەحمی لێ دەکات)، هەر کەسێکیش بۆشایی بخاتە نێو ڕیزێکەوە (بەغەیبەت بێت یان بەربەست)، خوا ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی لێ دەپچڕێنێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.



## بَابُ ذِكْرِ صَلَاةِ الرَّبِّ، وَمَلَائِكَتِهِ عَلَى وَاصِلِ الصُّفُوفِ

١٥٥٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ»[١].

## باسی صەلاواتی پەروەردگار، هەروەها فریشتەکانیشی لەسەر ئەوانەی ڕیزەکان پڕ دەکەنەوە

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا و فریشتەکانی صەلاوات دەدەن لەسەر ئەوانەی ڕیزەکان دەگەیەنن بە یەکدی.

(تێبینی: صەلاواتی خوا ﷻ واتە: لێخۆشبوونی، صەلاواتی فریشتەکان واتە: داوای لێخۆشبوونیان).

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ تَخَوُّفًا لِمُخَالَفَةِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ بَيْنَ الْقُلُوبِ

١٥٥١- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِينَا إِذَا قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ فَيَمْسَحُ عَوَاتِقَنَا وَصُدُورَنَا، وَيَقُولُ: «لَا تَخْتَلِفْ صُدُورُكُمْ فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ»[٢].

## باسی هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە ڕێکخستنی ڕیزەکان، لەبەر ئەوەی خوا جیاوازی نەخاتە نێوان دڵەکان

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهات بۆ لامان کاتێ هەستابایین بۆ نوێژ دەستی دەهێنا بە شان و سنگماندا، دەیفەرموو: جیاوازی مەکەن بە هاتنەپێش و چوونەدواوە لە ڕیزەکان، دوایی دڵەکانتان دەگۆڕێ، بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەلاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

**١٥٥٢-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِينَا فَيَمْسَحُ عَلَى عَوَاتِقِنَا وَصُدُورِنَا وَيَقُولُ: «لَا تَخْتَلِفْ صُفُوفُكُمْ، فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ، أَوِ الصُّفُوفِ الْأُوَلِ»[١].

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهات بۆ لامان (کاتێ هەستابایین بۆ نوێژ) دەستی دەهێنا بە شان و سنگماندا، دەیفەرموو: جیاوازی مەکەن لە ڕیزەکانتان (بە هاتنەپێش و چوونەدواوە)، دوایی دڵەکانتان دەگۆڕێ، بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەلاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم، یان ڕیزەکانی یەکەم.

## بَابُ فَضْلِ الصَّفِّ الْأَوَّلِ وَالْمُبَادَرَةِ إِلَيْهِ

**١٥٥٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَصِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: عُدْنَا أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ عَلَى مِثْلِ صَفِّ الْمَلَائِكَةِ وَلَوْ تَعْلَمُونَ فَضِيلَتَهُ لَابْتَدَرْتُمُوهُ»[٢].

## باسی فەزڵی ڕیزی یەکەم و دەستپێشخەریکردن بۆی

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو بەصیر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: سەردانی ئوبەی کوڕی کەعبمان ﷺ کرد (کاتێ کە نەخۆش بوو) باسی فەرموودەیەکی بۆ کردین کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕیزی پێشەوە لەسەر شێوەی ڕیزی فریشتەکانە ئەگەر دەتانزانی بە فەزڵ و چاکەی ئەو ڕیزە ئەوە دەستپێشخەریتان بۆی دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الِاسْتِهَامِ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ

**١٥٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ لَاسْتَهَمُوا عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) حديث حسن.

(٣) صحيح.

## باسی تیروپشککردن لەسەر ڕیزی یەکەم

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە چی خێر و پاداشت لە بانگدان و ڕیزی یەکەمدا هەیە (ئینجا دەستیان نەکەوتایە جگە لەوەی تیروپشکی بۆ بکەن)، تیروپشکیان بۆ دەکرد.

١٥٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ يَعْلَمُونَ أَوْ تَعْلَمُونَ مَا فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ مَا كَانَتْ إِلَّا قُرْعَةً»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بیانزانیایە یان بتانزانیایە چی خێر و پاداشتێك لە ڕیزی یەکەمدا هەیە، ئەوە تیروپشکیان بۆ دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ صَلَوَاتِ الرَّبِّ وَمَلَائِكَتِهِ عَلَى وَاصِلِي الصُّفُوفِ الْأُوَلِ

١٥٥٦- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ، فَيَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا أَوْ صُدُورَنَا وَيَقُولُ: «لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ» قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ». وَحَسِبْتُهُ قَالَ: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ»[٢].

## باسی صەلاواتی پەروەردگار، هەروەها فریشتەکانیشی لەسەر ئەوانەی ڕیزی یەکەم پڕ دەکەنەوە

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە ڕیزەکە لە تەنیشتێکەوە بۆ تەنیشتێکی دیکە دەستی دەهێنا بە شانمان یان سنگمان، وە دەیفەرموو: جیاوازی مەکەن (بە هاتنەپێش و چوونەدواوە لە ڕیزەکان)، دوایی دڵەکانتان دەگۆڕێ. وتی: وە دەیفەرموو: بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەلاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم. وە پێم وایە فەرمووی: قوڕئان بڕازێننەوە بە دەنگەکانتان.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ صَلَاةِ الرَّبِّ عَلَى الصُّفُوفِ الْأُوَلِ وَمَلَائِكَتِهِ

**١٥٥٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي نَاحِيَةَ الصَّفِّ وَيُسَوِّي بَيْنَ صُدُورِ الْقَوْمِ وَمَنَاكِبِهِمْ وَيَقُولُ: «لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الْأُوَلِ»[١].

## باسی صەلاواتی پەروەردگار فریشتەكانی لەسەر ئامادەبووانی ڕیزی یەكەمی نوێژ

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە تەنیشتێكی ڕیزەكە نێوانی سنگ و شانی خەڵكەكەی ڕێك دەخست و دەیفەرموو: جیاوازی مەكەن (بە هاتنەپێش و چوونەدواوە لە ڕیزەكان)، دوایی دڵەكانتان دەگۆڕێ، بەڕاستی خوا و فریشتەكان صەلاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەكەم.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِغْفَارِ النَّبِيِّ ﷺ لِلصَّفِّ الْمُقَدَّمِ وَالثَّانِي

**١٥٥٨-** عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَغْفِرُ لِلصَّفِّ الْمُقَدَّمِ ثَلَاثًا، وَلِلثَّانِي مَرَّةً[٢].

## باسی داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕیزی یەكەم و دووەم

واتە: عیربازی كوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار داوای لێخۆشبوونی بۆ ڕیزی یەكەم دەكرد، جارێكیش بۆ ڕیزی دووەم.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي التَّخَلُّفِ عَنِ الصَّفِّ الْأَوَّلِ

**١٥٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ أَقْوَامٌ مُتَخَلِّفُونَ عَنِ الصَّفِّ الْأَوَّلِ حَتَّى يَجْعَلَهُمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي النَّارِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## باسی هەڕەشەکردن لە دواکەوتن لە ڕیزی یەکەم

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەڵکانێك هەن بەردەوام لە ڕیزی یەکەم دوا دەکەون تا خوا لەنێو ئاگر دایاندەنێت.

**١٥٦٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَرَأَى نَاسًا فِي مُؤَخَّرِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «مَا يُؤَخِّرُكُمْ؟ لَا يَزَالُ أَقْوَامٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ ﷻ، تَقَدَّمُوا فَأْتَمُّوا بِي، وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە خەڵکانێکی بینی لەنێو مزگەوت لەدواوەوە بوون، فەرمووی: بۆچی لەدواوەن؟ بەردەوام خەڵکانێك خۆیان دوا دەخەن تا خوا ﷻ دوایان دەخات، بێنە پێشەوە پەیوەست بن بە منەوە، با دوای ئێوەیش پەیوەست بێت بە ئێوەوە.

## بَابُ ذِكْرِ خَيْرِ صُفُوفِ الرِّجَالِ، وَخَيْرِ صُفُوفِ النِّسَاءِ

**١٥٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا»[٢].

## باسی چاکترین ڕیزی پیاوان و خراپترین ڕیزی ئافرەتان

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینی ڕیزی پیاوان یەکەمینێتی، خراپترینیشیان کۆتاییەکەیەتی، وە چاکترین ڕیزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی، خراپترینیشیان یەکەمینێتی.

**١٥٦٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَخَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ الْمُقَدَّمُ، وَشَرُّهَا الْمُؤَخَّرُ، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ الْمُؤَخَّرُ، وَشَرُّهَا الْمُقَدَّمُ، يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، إِذَا سَجَدَ الرِّجَالُ فَاحْفَظْنَ أَبْصَارَكُنَّ»، قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ: مِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: مِنْ ضِيقِ الْإِزَارِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینی ڕیزی پیاوان ڕیزی پێشەوەیە، خراپترینیشیان کۆتاییەکەیەتی، وە چاکترین ڕیزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی، خراپترینیشیان پێشەوەیەتی، ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، ئەگەر پیاوان سوژدەیان برد چاوتان بپارێزن، بە عەبدوڵلام وت: بۆچی؟ وتی: بەهۆی تەسکی پۆشاکی بەشی خوارەوەی پیاوان.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ قِيَامِ الْمَأْمُومِ فِي مَيْمَنَةِ الصَّفِّ

١٥٦٣- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ حِينَ انْصَرَفَ: «رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ»[1].

## باسی چاکتر وایە نوێژخوێن لەلای ڕاستی ڕیزەوە بوەستێ

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێ لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان دەکرد پێمان خۆش بوو لەلای ڕاستیەوە بین، وە گوێم لێی بوو کاتێ نوێژی تەواو دەکرد دەیفەرموو: پەروەردگارم لە سزای خۆت بمپارێزی ئەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

١٥٦٤- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ يُعْجِبُنَا أَنْ نُصَلِّيَ مِمَّا يَلِي يَمِينَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؛ لِأَنَّهُ كَانَ يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ عَنْ يَمِينِهِ[2].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: ئێمە زۆر حەزمان دەکرد لە لای ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بکەین، چونکە ئەو سەرەتا بەلای ڕاستیدا سەلامی ئەدایەوە.

١٥٦٥- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ حِينَ انْصَرَفَ: «رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێ لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان بکردایە پێمان خۆش بوو لەلای ڕاستیەوە بین، وە گوێم لێی بوو کاتێ نوێژی تەواو دەکرد دەیفەرموو: پەروەردگارم لە سزای خۆت بمپارێزی ئەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

## بَابُ فَضْلِ تَلْيِينِ الْمَنَاكِبِ فِي الْقِيَامِ فِي الصُّفُوفِ

**١٥٦٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُكُمْ أَلْيَنُكُمْ مَنَاكِبَ فِي الصَّلَاةِ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕێکخستنی شانەکان لە کاتی وەستان لە ڕیزەکان

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاکترینتان ئەو کەسەتانە لە نوێژدا شانی بداتە پاڵ شانی هاوەڵەکەی (بۆ ئەوەی کەلێن و بۆشایی دروست نەبێت لە نێوان ڕیزەکان) یان: چاکترینتان ئەو کەسەیە هێمنترین و لەسەرخۆترین و ملکەچترینتان بێت لەنێو نوێژدا.

## بَابُ طَرْدِ الْمُصْطَفِّينَ بَيْنَ السَّوَارِي عَنْهَا

**١٥٦٧-** عَنْ معاويةَ بن قُرَّةَ عَن أبيه قُرَّةَ قَالَ: كُنَّا نُنْهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَيْنَ السَّوَارِي، وَنُطْرَدُ عَنْهَا طَرْدًا[٢].

## باسی دەرکردنی ئەوانەی لە نێوان پایەکاندا ڕیزیان بەستووە بۆ نوێژ

واتە: موعاویەی کوڕی قورە دەگێڕێتەوە لە قورەی باوکیەوە دەڵێ: ئێمە ڕێگریمان لێ دەکرا لە نوێژکردن لە نێوان پایەکاندا، وە دەردەکراین لێی بەدەرکردن.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الِاصْطِفَافِ بَيْنَ السَّوَارِي

١٥٦٨- عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ مَحْمُودٍ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ فَزَحَمَنَا إِلَى السَّوَارِي، فَقَالَ: كُنَّا نَتَّقِي هَذَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## باسی قەدەغەکردن لە ڕیزبەستن لە نێوان پایەکاندا

واتە: عەبدولحەمیدی کوڕی مەحمود دەڵێ: لە تەنیشتی ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ نوێژم کرد، لە نێوان پایەکاندا ڕیزمان بەست، وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆمان لەمە دەپاراست.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ وَالْبَيَانُ أَنَّ صَلَاتَهُ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ غَيْرُ جَائِزَةٍ، يَجِبُ عَلَيْهِ اسْتِقْبَالُهَا، وَأَنَّ قَوْلَهُ: لَا صَلَاةَ لَهُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْعَرَبَ تَنْفِي الِاسْمَ عَنِ الشَّيْءِ لِنَقْصِهِ عَنِ الْكَمَالِ

١٥٦٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ - وَكَانَ أَحَدَ الْوَفْدِ - قَالَ: صَلَّيْنَا خَلْفَهُ يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ فَقَضَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ، فَرَأَى رَجُلًا فَرْدًا يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ، فَوَقَفَ عَلَيْهِ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ حَتَّى قَضَى صَلَاتَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: اسْتَقْبِلْ صَلَاتَكَ، فَلَا صَلَاةَ لِفَرْدٍ خَلْفَ الصَّفِّ[2].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی نوێژخوێن بەتەنها لەپشت ڕیزەوە بوەستێ، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی نوێژکردنی لەپشت ڕیزەوە بەتەنها نادروستە پێویستە لەسەری دووبارەی بکاتەوە، وە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: (لَا صَلَاةَ لَهُ)، واتە: نوێژی بۆ نییە. لەو شێوازەیە کە دەڵێین: عەرەب نێو ڕەت دەکاتەوە لە شتێك لەبەر ئەوەی کەموکوڕی تێدایە و تەواو نییە

واتە: عەلی کوڕی شەیبان دەگێڕێتەوە، -کە یەکێك بوو لە نوێنەرەکان- وتی: (هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ) لە پشتیەوە نوێژمان کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تەواو کرد، پیاوێکی بینی بەتەنها نوێژی دەکرد لەپشت ڕیزەکەوە، پێغەمبەری خوا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ﷺ لەسەری وەستا تا پیاوەکە نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان پێی فەرموو: نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە، چونکە نوێژ بەتەنها دروست نییە لەپشت ڕیزەوە.

**١٥٧٠-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي أَخْبَارِ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ: رَأَى رَجُلًا صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الصَّلَاةَ وَاحْتَجَّ بَعْضُ أَصْحَابِنَا وَبَعْضُ مَنْ قَالَ بِمَذْهَبِ الْعِرَاقِيِّينَ فِي إِجَازَةِ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ بِمَا هُوَ بَعِيدُ الشَّبَهِ مِنْ هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ، احْتَجُّوا بِخَبَرِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ صَلَّى وَامْرَأَةٌ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَعَلَهُ عَنْ يَمِينِهِ، وَالْمَرْأَةَ خَلْفَ ذَلِكَ، فَقَالُوا: إِذَا جَازَ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَقُومَ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهَا، جَازَ صَلَاةُ الْمُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ وَهَذَا الِاحْتِجَاجُ عِنْدِي غَلَطٌ؛ لِأَنَّ سُنَّةَ الْمَرْأَةِ أَنْ تَقُومَ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهَا إِذَا لَمْ تَكُنْ مَعَهَا امْرَأَةٌ أُخْرَى، وَغَيْرُ جَائِزٍ لَهَا أَنْ تَقُومَ بِحِذَاءِ الْإِمَامِ وَلَا فِي الصَّفِّ مَعَ الرِّجَالِ، وَالْمَأْمُومُ مِنَ الرِّجَالِ إِنْ كَانَ وَاحِدًا، فَسُنَّتُهُ أَنْ يَقُومَ عَنْ يَمِينِ إِمَامِهِ، وَإِنْ كَانُوا جَمَاعَةً قَامُوا فِي صَفٍّ خَلْفَ الْإِمَامِ حَتَّى يَكْمُلَ الصَّفُّ الْأَوَّلُ، وَلَمْ يَجُزْ لِلرَّجُلِ أَنْ يَقُومَ خَلْفَ الْإِمَامِ وَالْمَأْمُومُ وَاحِدٌ، وَلَا خِلَافَ بَيْنَ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ هَذَا الْفِعْلَ لَوْ فَعَلَهُ فَاعِلٌ - فَقَامَ خَلْفَ إِمَامٍ وَمَأْمُومٍ قَدْ قَامَ عَنْ يَمِينِهِ - خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِنْ كَانُوا قَدِ اخْتَلَفُوا فِي إِيجَابِ إِعَادَةِ الصَّلَاةِ، وَالْمَرْأَةُ إِذَا قَامَتْ خَلْفَ الصَّفِّ وَلَا امْرَأَةَ مَعَهَا وَلَا نِسْوَةَ فَاعِلَةٌ مَا أُمِرَتْ بِهِ وَمَا هُوَ سُنَّتُهَا فِي الْقِيَامِ، وَالرَّجُلُ إِذَا قَامَ فِي الصَّفِّ وَحْدَهُ فَاعِلٌ مَا لَيْسَ مِنْ سُنَّتِهِ، إِذْ سُنَّتُهُ أَنْ يَدْخُلَ الصَّفَّ فَيَصْطَفَّ مَعَ الْمَأْمُومِينَ، فَكَيْفَ يَكُونُ أَنْ يُشَبَّهَ مَا زُجِرَ الْمَأْمُومُ عَنْهُ - مِمَّا هُوَ خِلَافُ سُنَّتِهِ فِي الْقِيَامِ - بِفِعْلِ امْرَأَةٍ فَعَلَتْ مَا أُمِرَتْ بِهِ مِمَّا هُوَ سُنَّتُهَا فِي الْقِيَامِ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهَا؟ فَالْمُشَبِّهُ الْمَنْهِيَّ عَنْهُ بِالْمَأْمُورِ بِهِ مُغَفَّلٌ بَيِّنُ الْغَفْلَةِ مُشَبِّهٌ بَيْنَ فِعْلَيْنِ مُتَضَادَّيْنِ، إِذْ هُوَ مُشَبِّهٌ مَنْهِيًّا عَنْهُ بِمَأْمُورٍ بِهِ، فَتَدَبَّرُوا هَذِهِ اللَّفْظَةَ يَبِنْ لَكُمْ بِتَوْفِيقِ خَالِقِنَا حُجَّةُ مَا ذَكَرْنَا. وَزَعَمَ مُخَالِفُونَا مِنَ الْعِرَاقِيِّينَ فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ أَنَّ الْمَرْأَةَ لَوْ قَامَتْ فِي الصَّفِّ مَعَ الرِّجَالِ حَيْثُ أُمِرَ الرَّجُلُ أَنْ يَقُومَ أَفْسَدَتْ صَلَاةَ مَنْ عَنْ يَمِينِهَا، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهَا، وَالْمُصَلِّي خَلْفَهَا، وَالرَّجُلُ مَأْمُورٌ عِنْدَهُمْ أَنْ يَقُومَ فِي الصَّفِّ مَعَ الرِّجَالِ، فَكَيْفَ يُشَبَّهُ فِعْلُ امْرَأَةٍ - لَوْ فَعَلَتْ أَفْسَدَتْ صَلَاةَ ثَلَاثَةٍ مِنَ الْمُصَلِّينَ - بِفِعْلِ مَنْ هُوَ مَأْمُورٌ بِفِعْلِهِ؟ إِذَا فَعَلَهُ لَا يُفْسِدُ فِعْلُهُ صَلَاةَ أَحَدٍ[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی وابیصەی کوڕی مەعبەد هاتووە: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەتەنها لەپشت ڕیزەکەوە نوێژی دەکرد، فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە. هەندێ لە هاوەڵانی ئێمە و هەندێ لەوانەی شوێنی مەزهەبی

---

(١) حديث حسن.

عێراقییەکان کەوتوون بەڵگەیان هێناوەتەوە بە دروستی نوێژی نوێژخوێن لەپشت ڕیزەکەوە بەتەنها کە لێکچواندنی ئەو فەرموودە لەم مەسەلە دوورە، هەروەها فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیکیان کردووەتە بەڵگە کە ئەو و ئافرەتێك لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژیان کرد، ئەوی لەلای ڕاستی دانا، ئافرەتەکەیش لەپشت ئەوەوە. وتوویانە: ئەگەر دروست بێت بۆ ئافرەت بەتەنها لەپشت ڕیزەکەوە بوەستێ، دروستیشە پیاو بەتەنها لەپشت ڕیزەکە بوەستێ، ئەم کردن بە بەڵگەیە لەلای من هەڵەیە، چونکە شێوازی ئافرەت وایە دەبێ بەوشێوەیە بەتەنها لەپشت ڕیزەکەوە بێت، ئەگەر ئافرەتێکی دیکەی لەگەڵ نەبوو، دروست نییە بۆی لە تەنیشتی پێشنوێژ بوەستێ، هەروەها لە ڕیز لەگەڵ پیاوانیش، وە نوێژخوێن لە پیاوان ئەگەر بەتەنها بوو شێوازی وایە دەبێ لەلای ڕاستی پێشنوێژەکەی بوەستێت، ئەگەر کۆمەڵیش بوون لەپشت پێشنوێژەوە ڕیز دەبەستن تا ڕیزی یەکەم تەواو دەبێت، دروست نییە بۆ پیاو لەپشت پێشنوێژ بوەستێ ئەگەر تەنها نوێژخوێنێك لەلای ڕاستی بوو، جیاوازی نییە لە نێوان زانایان ئەم کردارە ئەگەر بکەرێك پێی هەستێت -لەپشت پێشنوێژ بوەستێ و نوێژخوێنێکیش لەلای ڕاستی پێشنوێژ بێت- پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، ئەگەرچی جیاوازییان هەیە لە پێویستبوونی دووبارەکردنەوەی نوێژەکە، ئافرەتیش ئەگەر لەپشت ڕیزەکە وەستا ئافرەتی دیکەی لەگەڵ نەبوو، ئەوە ئەو کردەوەیەکی کردووە کە فەرمانی پێکراوە و کاری خۆیەتی دەبێت لە وەستانی نوێژدا هەر ئەوە بکات، بەڵام پیاو ئەگەر لە ڕیزەکە بەتەنها وەستا کردەوەیەکی کردووە لە شێوازی ئەو نییە، چونکە شێوازی ئەو ئەوەیە بچێتە نێو ڕیزی نوێژخوێنان لەگەڵ ئەوان ڕیز ببەستێت، چۆن دەبێت نوێژخوێنی پیاو بشوبهێنێ بەوەی قەدەغەی لێ کراوە -کە پێچەوانەی وەستانی ئەوە لەنێو نوێژ- بە کردەوەی ئافرەتێك کە فەرمانی خۆی جێبەجێ کردووە و شێوازی ئەو بەوشێوەیە لەپشت ڕیزەوە بەتەنها بوەستێت؟ جا شوبهێنەری (پیاو) قەدەغەی لێ کراوە خۆی بشوبهێنی بە فەرمانپێکراو (ئافرەت) بێئاگاییە دوو شتی دژیەکی بە یەکدی شوبهاندووە، چونکە ئەو شوبهێنەرێکی قەدەغە لێ کراوە بە کەسێك کە فەرمانی پێ کراوە، سەرنجی ئەم دەستەواژەیە بدەن بەپشتیوانی خوا بەڵگەی ئەوانەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە باسمان کرد. ئەوانەی پێچەوانەی ئێمەن لە عێراقییەکان لەم بابەتەدا پێیان

وایە ئافرەت ئەگەر لەگەڵ پیاوان بوەستێ لە ڕیزی نوێژدا وەكوو چۆن پیاو فەرمانی پێ كراوە بوەستێت، ئەوە ئافرەتەكە نوێژی ئەوەی لای ڕاستی و لای چەپی بەتاڵ دەكاتەوە، هەروەها ئەوەیشی لە پشتیەوە نوێژ دەكات، پیاو فەرمانی پێ كراوە لەگەڵ پیاوان لە ڕیزدا بوەستێ، ئیدی چۆن كردەوەی ئافرەتێك -ئەگەر ئەو كردەوە بكات نوێژی سێ كەس بەتاڵ دەكاتەوە لە نوێژخوێنان- دەشوبهێنرێ بە كردەوەی پیاوێك فەرمانی پێ كراوە بە ئەنجامدانی؟ چونكە كردەوەی ئەو نوێژی كەس بەتاڵ ناكاتەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي رُكُوعِ الْمَأْمُومِ قَبْلَ اتِّصَالِهِ بِالصَّفِّ، وَدَبِيبِهِ رَاكِعًا حَتَّى يَتَّصِلَ بِالصَّفِّ فِي رُكُوعِهِ

**١٥٧١**- عَنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﵄ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ لِلنَّاسِ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ وَالنَّاسُ رُكُوعٌ فَلْيَرْكَعْ حِينَ يَدْخُلُ، ثُمَّ لِيَدُبَّ رَاكِعًا حَتَّى يَدْخُلَ فِي الصَّفِّ؛ فَإِنَّ ذَلِكَ السُّنَّةُ، قَالَ عَطَاءٌ: وَقَدْ رَأَيْتُهُ هُوَ يَفْعَلُ ذَلِكَ(١).

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژخوێن ڕكووع ببات پێش ئەوەی بگات بە ڕیزەكە، وە بە دەم ڕكووعبردنەوە بچێت تا دەگاتە ڕیزەكە

واتە: عەتاء دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە عەبدوڵای كوڕی زوبەیر ﵄ بوو لەسەر مینبەر بە خەڵكی دەوت: ئەگەر یەكێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە و خەڵكەكەیش لە ڕكووعدا بوون، با كاتێ دەچێتە ژوورەوە ڕكووع ببات، بە دەم ڕكووعەوە لەسەرخۆ بچێت تا دەگاتە نێو ڕیزەكە، چونكە ئەوە سوننەتە، عەتاء وتی: بینیم ئەو ئەوەی دەكرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ أُولِي الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى أَحَقُّ بِالصَّفِّ الْأَوَّلِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَمَرَ بِأَنْ يَلُوهُ

**١٥٧٢**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَهَيْشَاتِ الْأَسْوَاقِ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ئەو کەسانەی خاوەن عەقڵ و ژیرین لەپێشترن بە ڕیزی یەکەم، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە لێیەوە نزیک ببنەوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با خاوەن عەقڵ و ژیرەکانتان نزیك ببێتەوە لێم (لە ڕیزی نوێژ)، پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، جیاوازی مەکەن (بە هاتنەپێش و چوونەدواوە لە ڕیزەکان)، دوایی دڵەکانتان دەگۆڕێ، وە خۆتان بپارێزن لە فیتنەو تێکەڵاوی نێو بازاڕ.

**١٥٧٣**- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا بِالْمَدِينَةِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ قَائِمٌ أُصَلِّي، فَجَبَذَنِي رَجُلٌ مِنْ خَلْفِي جَبْذَةً، فَنَحَّانِي وَقَامَ مَقَامِي قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا عَقَلْتُ صَلَاتِي، فَلَمَّا انْصَرَفَ فَإِذَا هُوَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ، فَقَالَ: يَا فَتَى، لَا يَسُؤْكَ اللَّهُ، إِنَّ هَذَا عَهْدٌ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَيْنَا أَنْ نَلِيَهُ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَقَالَ: هَلَكَ أَهْلُ الْعُقْدَةِ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ - ثَلَاثًا - ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ مَا عَلَيْهِمْ آسَى، وَلَكِنْ آسَى عَلَى مَنْ أَضَلُّوا، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ تَعْنِي بِهَذَا؟ قَالَ: الْأُمَرَاءُ[١].

واتە: قەیسی کوڕی عوبادە دەڵێ: لە کاتێکدا من لە مزگەوتی (مەدینە بووم) لە ڕیزی پێشەوە نوێژم دەکرد، پیاوێك لە پشتمەوە ڕایکێشام بەتوندی دووری خستمەوە (خستمیە ڕیزی دواتر)، پاشان خۆی چووە جێگاکەم، وتی: سوێند بە خوا نەمزانی چۆن نوێژەکەم تەواو کرد (بەهۆی بیرکردنەوەم لەو ڕەفتارە)، کاتێ لێبۆیەوە دەرکەوت ئەو پیاوە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ بوو، وتی: ئەی گەنج، خوا خراپت بۆ نەکات، ئەمە پەیمانێکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئێمە لە نزیکی نوێژ بکەین، پاشان ڕووی کردە قیبلە و سێ جار وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە کاربەدەستان لەنێو چوون، پاشان وتی: سوێند بە خوا خەم بۆ کاربەدەستان ناخۆم (چونکە ئەوان ئەهلی ستەمن)، بەڵکوو خەم بۆ ئەوانە دەخۆم کە شوێنیان کەوتن و گومڕا بوون، وتم: ئەی باوکی یەعقوب مەبەستت چی بوو لە خاوەن (أَهْلُ الْعَقْدِ)؟ وتی: کاربەدەستان و دەسەڵاتدارەکان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي شَقِّ أُولِي الْأَحْلَامِ، وَالنَّهْيِ لِلصُّفُوفِ إِذَا كَانُوا قَدِ اصْطَفُّوا عِنْدَ حُضُورِهِمْ لِيَقُومُوا فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ

**١٥٧٤-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصْلِحُ بَيْنَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَقَدَّمَ النَّاسَ وَأَنْ يَؤُمَّهُمْ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَخَرَقَ الصُّفُوفَ حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ[١].

## باسی مۆڵەت دراوە بە کەسانی خاوەن عەقڵ و ژیری ڕیزەکان ببڕن، ئەگەر ڕیزیان بەستبوو لە کاتی ئامادەبوونیان، بۆ ئەوەی لە ڕیزی یەکەم ڕاوەستن

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوان نەوەکانی عەمری کوڕی عەوف، پاشان کاتی نوێژ هات، بانگدەر هات بۆ لای ئەبو بەکر فەرمانی پێ کرد پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەنێو ڕیزەکاندا هات تا لە ڕیزی پێشەوە وەستا.

## بَابُ أَمْرِ الْمُؤْمِنِينَ بِالِاقْتِدَاءِ بِالْإِمَامِ، وَالنَّهْيِ عَنْ مُخَالَفَتِهِمْ إِيَّاهُ

**١٥٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى فَكَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَلَا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ، فَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَلَا تَبْتَدِرُوا قَبْلَهُ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە باوەڕداران پەیڕەوی پێشنوێژ بکەن، وە قەدەغەکردن لەوەی پێچەوانەی بکەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیمام بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی بکرێت، ئەگەر نوێژی کرد و تەکبیری کرد، تەکبیر بکەن، وە ئەگەر ڕکووعی برد ڕکووع ببەن، جیاوازی مەکەن بەسەریدا، ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئێوەیش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، وە ئەگەر سوژدەی برد ئێوەیش سوژدە ببەن، هەرگیز پێشی مەکەون.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ مُبَادَرَةِ الْمَأْمُومِ الْإِمَامَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالرُّكُوعِ، وَالسُّجُودِ

**١٥٧٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا يَقُولُ: «لَا تُبَادِرُوا الْإِمَامَ، إِذَا كَبَّرَ الْإِمَامُ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، وَلَا تُبَادِرُوا الْإِمَامَ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی نوێژخوێن پێشی پێشنوێژ بکەوێت بە تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ) و ڕکووع و سوژدە

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردین و دەیفەرموو: دەستپێشخەری پێشنوێژ مەکەن، ئەگەر پێشنوێژ تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی کرد ئێوەیش تەکبیر بکەن، وە ئەگەر ڕکووعی برد ئێوەیش ڕکووع ببەن، وە ئەگەر وتی: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾، بڵێن: (آمِينَ)، وە ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، دەستپێشخەری پێشنوێژ مەکەن لە ڕکووع و سوژدە.

## بَابِ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْمَأْمُومَ إِنَّمَا يُكَبِّرُ بَعْدَ فَرَاغِ الْإِمَامِ مِنَ التَّكْبِيرِ لَا يَكُونُ مُكَبِّرًا حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ التَّكْبِيرِ، وَيُتِمَّ الرَّاءَ الَّتِي هِيَ آخِرُ التَّكْبِيرِ، وَالْفَرْقُ بَيْنَ قَوْلِهِ: إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَبَيْنَ قَوْلِهِ: وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، إِذِ اسْمُ الْمُكَبِّرِ لَا يَقَعُ عَلَى الْإِمَامِ مَا لَمْ يُتِمَّ التَّكْبِيرَ، وَاسْمُ الرَّاكِعِ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ إِذَا اسْتَوَى رَاكِعًا، وَكَذَلِكَ اسْمُ السَّاجِدِ يَقَعُ عَلَيْهِ إِذَا اسْتَوَى جَالِسًا

**١٥٧٧**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِذَا قَالَ الْإِمَامُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقُولُوا: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده معلول.

**باسی ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەوەی نوێژخوێن كاتێ تەكبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ) دەكات، پێشنوێژ تەكبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ) تەواو بكات، جا (اللَّهُ أَكْبَر)ی بۆ حیساب نییە، هەتا پێشنوێژ (اللَّهُ أَكْبَر) تەواو نەكات، پیتی (الرَّاءَ) كە دەكەوێتە كۆتایی (اللَّهُ أَكْبَرُ) تەواو بكات، وە جیاوازیش لە نێوان فەرموودەكەی: (إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا) و لە نێوان فەرموودەی: (وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا)، چونكە ناوی (اللَّهُ أَكْبَر)كەر بەسەر پێشنوێژ ساغ نابێتەوە تا (اللَّهُ أَكْبَر)ەكە تەواو نەكات، بەڵام ناوی ڕكووعبەر ساغ دەبێتەوە بەسەریدا ئەگەر لە ڕكووع ڕێك بۆیەوە، بەهەمان شێوە ناوی سوژدەبەریش ساغ دەبێتەوە بەسەریدا ئەگەر لە سوژدەدا ڕێك بۆیەوە**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پێشنوێژ وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، بڵێن: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، وە ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، بڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ).

## بَابُ سُكُوتِ الْإِمَامِ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَبَعْدَ تَكْبِيرَةِ الِافْتِتَاحِ

**١٥٧٨**- عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ سَمُرَةَ بْنَ جُنْدُبٍ، وَعِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ ﷺ تَذَاكَرَا، فَحَدَّثَ سَمُرَةُ، أَنَّهُ حِفْظَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَكْتَتَيْنِ: سَكْتَةً إِذَا كَبَّرَ، وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَتِهِ عِنْدَ رُكُوعِهِ[1].

## باسی بێدەنگبوونی پێشنوێژ پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە، وە دوای (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی دابەستنی نوێژ

واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، سەمورەی كوڕی جوندوب و عیمڕانی كوڕی حوصەین ﷺ پێكەوە قسەیان دەكرد، سەمورە باسی كرد ئەو دوو جار بێدەنگبوونی (لەنێو نوێژ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەر كردووە، بێدەنگبوونێك كاتێ (اللَّهُ أَكْبَر)ی دەكرد بۆ دابەستنی نوێژ، بێدەنگبوونێكیش كاتێ سورەتی فاتیحەی تەواو دەكرد پێش ڕكووعبردنی.

---

(١) صحیح.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ اسْمَ السَّاكِتِ قَدْ يَقَعُ عَلَى النَّاطِقِ سِرًّا إِذَا كَانَ سَاكِتًا عَنِ الْجَهْرِ بِالْقَوْلِ «إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ دَاعِيًا خَفِيًّا فِي سَكْتِهِ عَنِ الْجَهْرِ بَيْنَ التَّكْبِيرَةِ الْأُولَى، وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ»

**١٥٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ سَكَتَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، فَقُلْتُ لَهُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَرَأَيْتَ سُكَاتَكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، أَخْبِرْنِي مَا هُوَ؟ قَالَ: أَقُولُ: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطِيئَتِي كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ أَنْقِنِي مِنْ خَطَايَايَ كَالثَّوْبِ الْأَبْيَضِ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ»[١].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی بەکارهێنانی ناوی بێدەنگبوون، هەندێ جار بۆ قسەکردنێکی شاراوە بەکار دێت، ئەگەر بێدەنگ بوو لەوەی بەدەنگی بەرز قسە بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بێدەنگبوونی لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی یەکەم و لە نێوان قوڕئانخوێندندا بەبێدەنگی دەپاڕایەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ (اللَّهُ أَكْبَر)ی بکردایە بۆ دابەستنی نوێژ، لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی دابەستنی نوێژ و لە نێوان قوڕئانخوێندندا بێدەنگ دەبوو، پێم وت: باوکم و دایکم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ لە کاتی بێدەنگبوونت لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی دابەستنی نوێژ و لە نێوان قوڕئانخوێندندا چی ئەڵێیت؟ فەرمووی: ئەڵێم: خوایە نێوانی من و هەڵەکانم دوور بخەرەوە، وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستووەتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە هەڵەکانم وەکوو چۆن جلی سپی پاك دەکرێتەوە لە پیسی، خوایە بمشۆرە لە هەڵەکان بە بەفر و ئاو و تەرزە.

## بَابُ تَطْوِيلِ الْإِمَامِ الرَّكْعَةَ الْأُولَى مِنَ الصَّلَوَاتِ لِيَتَلَاحَقَ الْمَأْمُومُونَ

**١٥٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُطِيلُ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ مِنَ الْفَجْرِ وَالظُّهْرِ، فَكُنَّا نَرَى أَنَّهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لِيَتَأَدَّى النَّاسُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی پێشنوێژ ڕکاتی یەکەمی درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی نوێژخوێنان فریای بکەون**

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە لەباوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم ڕکاتی نوێژی بەیانی و نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە، ئێمە پێمان وا بوو ئەوەی دەکرد بۆ ئەوەی خەڵکی فریای ڕکاتی یەکەم بکەون.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ خَلْفَ الْإِمَامِ، وَإِنْ جَهَرَ الْإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ «وَالزَّجْرِ عَنْ أَنْ يَزِيدَ الْمَأْمُومُ عَلَى قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ إِذَا جَهَرَ الْإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ»

**١٥٨١-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ، فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنِّي لَأَرَاكُمْ تَقْرَؤُونَ وَرَاءَ إِمَامِكُمْ؟» قَالَ: قُلْنَا: أَجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، هَذًّا، قَالَ: «فَلَا تَفْعَلُوا إِلَّا بِأُمِّ الْكِتَابِ؛ فَإِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا»[1].

**باسی قورئانخوێندن لەپشت پێشنوێژ، ئەگەرچی پێشنوێژ بەدەنگی بەرزیش قورئانی خوێند، وە سەرزەنشتکردن لەوەی نوێژخوێن لە سورەتی فاتیحە زیاتر بخوێنێ، ئەگەر پێشنوێژ بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند**

واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین، قورئانخوێندنی ئێمە لەسەری گران بوو (چونکە کاتێ هەست دەکەی کەسانێك لەدوای تۆوە قورئان دەخوێنینن سەرقاڵ دەبی و لێت تێك دەچێ)، کاتێ نوێژی تەواو کرد فەرمووی: من دەبینم ئێوە لەپشت ئیمامەکەتانەوە قورئان دەخوێنن؟ وتی: وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەپەلە دەیخوێنین، فەرمووی: هیچ مەخوێنن جگە لەسورەتی فاتیحە نەبێت، چونکە بەڕاستی نوێژی ئەو کەسە (تەواو) نییە سورەتی فاتیحە نەخوێنێت.

## بَابُ تَأْمِينِ الْمَأْمُومِ عِنْدَ فَرَاغِ الْإِمَامِ مِنْ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي يَجْهَرُ فِيهَا الْإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ، وَإِنْ نَسِيَ إِمَامٌ وَجَهِلَ، وَلَمْ يُؤَمِّنْ

**١٥٨٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا يَقُولُ: «إِذَا كَبَّرَ الْإِمَامُ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَرَأَ ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا آمِينَ»[١].

## باسی (آمینَ) کردنی نوێژخوێن لە کاتی تەواوبوونی پێشنوێژ لە خوێندنی سورەتی فاتیحە، لەنێو ئەو نوێژەی کە پێشنوێژ بەدەنگی بەرز قورئانی تێدا دەخوێنێ، ئەگەرچی پێشنوێژ بیری چوو (آمینَ) بکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردین و دەیفەرموو: ئەگەر پێشنوێژ تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی کرد، ئەوجار ئێوەیش تەکبیر بکەن، وە ئەگەر ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، خوێند، ئێوەیش بڵێن: (آمِینَ).

## بَابُ فَضْلِ تَأْمِينِ الْمَأْمُومِ إِذَا أَمَّنَ إِمَامُهُ «رَجَاءَ مَغْفِرَةِ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِ الْمُؤْمِنِ إِذَا وَافَقَ تَأْمِينُهُ الْمَلَائِكَةَ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَلَى الْإِمَامِ الْجَهْرَ بِالتَّأْمِينِ إِذَا جَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ لِيُسْمِعَ الْمَأْمُومَ تَأْمِينَهُ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَأْمُرَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَأْمُومَ بِالتَّأْمِينِ إِذَا أَمَّنَ إِمَامُهُ، وَلَا سَبِيلَ لَهُ إِلَى مَعْرِفَةِ تَأْمِينِ الْإِمَامِ إِذَا أَخْفَى الْإِمَامُ التَّأْمِينَ» عَلَى الْإِمَامِ الْجَهْرَ بِالتَّأْمِينِ إِذَا جَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ لِيُسْمِعَ الْمَأْمُومَ تَأْمِينَهُ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَأْمُرَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَأْمُومَ بِالتَّأْمِينِ إِذَا أَمَّنَ إِمَامُهُ، وَلَا سَبِيلَ لَهُ إِلَى مَعْرِفَةِ تَأْمِينِ الْإِمَامِ إِذَا أَخْفَى الْإِمَامُ التَّأْمِينَ

**١٥٨٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەزڵ و گەورەیی (آمینَ) کردنی نوێژخوێن ئەگەر پێشنوێژەکەی (آمین)ی کرد، بە ئومێدی لێخۆشبوون لە گوناهەکانی پێشووی، ئەگەر (آمینَ)ەکەی یەکانگیر بۆیەوە لەگەڵ (آمینَ)ی فریشتەکان، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەر پێشنوێژ بەدەنگی بەرز (آمینَ) بکات، ئەگەر بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند، تا (آمین) کردنەکەی بدات بە گوێی نوێژخوێنەکان، چونکە دروست نییە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بکات بە نوێژخوێن (آمین) بکات، ئەگەر پێشنوێژەکەی (آمین)ی کردبوو، وە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ زانینی (آمین) کردنی پێشنوێژ، ئەگەر پێشنوێژ (آمین) کردنەکەی شاردەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر پێشنوێژ (آمِین)ی کرد ئێوەیش (آمِین) بکەن، هەر کەسێك ئامینکردنەکەی یەکانگیر بێتەوە لەگەڵ ئامینکردنی فریشتەکان، ئەوا لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

## بَابُ ذِكْرِ إِجَابَةِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ فَرَاغِ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ

١٥٨٤- عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ ﷺ، فَلَمَّا انْفَتَلَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَنَا فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلَاتَنَا، فَقَالَ: «فَإِذَا كَبَّرَ الْإِمَامُ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ اللَّهُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنْ بَابِ تَأْمِينِ الْمَأْمُومِ عِنْدَ فَرَاغِ الْإِمَامِ مِنْ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَإِنْ لَمْ يُؤَمِّنْ إِمَامُهُ جَهْلًا أَوْ نِسْيَانًا.

## باسی وەڵامدانەوەی پەروەردگاری بەرز و مەزن لە کاتی تەوابوونی سوورەتی فاتیحە

واتە: حیتانی کوڕی عەبدوڵای ڕەقاشی دەڵێ: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ نوێژی بۆ کردین، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین، سوننەتەکانی بۆ ڕوون کردینەوە و نوێژەکانیشی فێر کردین و فەرمووی: ئەگەر پێشنوێژ

---

(١) صحيح.

تەکبیر (الله أکبر)ی کرد ئێوەیش تەکبیر بکەن، وە ئەگەر وتی: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝﴾، ئێوەیش بڵێن: (آمِينَ) خوا خۆشی دەوێن.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لە بەشی (آمِينَ) کردنی نوێژخوێنە لە کاتی تەواوبوونی پێشنوێژ لە سورەتی فاتیحە، ئەگەرچی پێشنوێژ (آمِينَ) نەکات بەنەزانی بێت یان بیرچوونەوە.

## بَابُ ذِكْرِ حَسَدِ الْيَهُودِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى تَأْمِينِهِمْ

**١٥٨٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ يَهُودِيٌّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَعَلَيْكَ». قَالَتْ عَائِشَةُ: فَهَمَمْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، فَعَرَفْتُ كَرَاهِيَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِذَلِكَ، فَسَكَتُّ، ثُمَّ دَخَلَ آخَرُ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ»، فَهَمَمْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ فَعَرَفْتُ كَرَاهِيَةَ النَّبِيِّ ﷺ لِذَلِكَ، ثُمَّ دَخَلَ الثَّالِثُ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قُلْتُ: وَعَلَيْكَ السَّامُ وَغَضَبُ اللَّهِ وَلَعْنَتُهُ إِخْوَانَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِيرِ، أَتُحَيُّونَ رَسُولَ اللَّهِ بِمَا لَمْ يُحَيِّهِ اللَّهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفُحْشَ وَالتَّفَحُّشَ قَالُوا قَوْلًا، فَرَدَدْنَا عَلَيْهِمْ، إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ حُسَّدٌ، وَإِنَّهُمْ لَا يَحْسُدُونَا عَلَى شَيْءٍ كَمَا يَحْسُدُونَا عَلَى السَّلَامِ، وَعَلَى آمِينَ»[(١)].

### باسی حەسوودی و ئیرەییبردنی جوولەکە بە مسوڵمان لەسەر (آمِينَ) کردنیان

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: جولەکەیەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: (السَّامُ عَلَيْكَ)، واتە: مردن لەسەرت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر تۆش. عائیشە وتی: ویستم قسە بکەم، بەڵام زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆشە، بۆیە بێدەنگ بووم، پاشان یەکێکی دیکە هات بۆ خزمەتی وتی: (السَّامُ عَلَيْكَ)، واتە: مردن لەسەرت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر تۆش، تێگەیشتم لە وتەکەی ویستم قسە بکەم، زانیم پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە بێدەنگ بووم، پاشان سێیەم کەس هاتە ژوورەوە وتی: (السَّامُ عَلَيْكَ)، واتە: مردن لەسەرت، ئیدی خۆم پێ ڕانەگیرا و وتم: مردن و خەشم و قین و نەفرینی خوا لەسەرت ئەی برای مەیمون و بەرازەکان، ئایا بەشێوەیەك سڵاو لە پێغەمبەری خوا دەکەن کە خوا بەوشێوەیە سڵاوی لێ نەکردووە؟ پێغەمبەری خوا

---

(١) صحيح.

ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ حەزی لە زمانپیسی و کردەوەی ناپەسەند و خراپ نییە، ئەوان قسەیەکیان کرد، ئێمەیش وەڵامان دانەوە، بەڕاستی جوولەکەکان خەڵکانێکی حەسوودن، ئەوان لەسەر هیچ شتێك حەسوودیان پێ نابەن ئەوەندەی لەسەر سەلام و لەسەر ئامینکردن حەسوودیان پێ دەبەن.

## بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ اللَّهُ ﷻ خَصَّ نَبِيَّهُ ﷺ بِالتَّأْمِينِ «فَلَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا مِنَ النَّبِيِّينَ قَبْلَهُ، خَلَا هَارُونَ حِينَ دَعَا مُوسَى، فَأَمَّنَ هَارُونُ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ»

**١٥٨٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جُلُوسًا، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ أَعْطَانِي خِصَالًا ثَلَاثَةً»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: وَمَا هَذِهِ الْخِصَالُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَعْطَانِي صَلَاةً فِي الصُّفُوفِ وَأَعْطَانِي التَّحِيَّةَ، إِنَّهَا لَتَحِيَّةُ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَأَعْطَانِي التَّأْمِينَ وَلَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا مِنَ النَّبِيِّينَ قَبْلُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ اللَّهُ أَعْطَى هَارُونَ، يَدْعُو مُوسَى وَيُؤَمِّنُ هَارُونُ»(١).

## باسی ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ تایبەت کرد بە (آمينَ) کردن، بە هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی پێش ئەوی نەبەخشی، جگە لە هارِوون نەبێت کاتێ موسا (علیه السلام) نزای کرد، هارِوونیش (آمينَ)ی کرد

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین فەرمووی: بەڕاستی خوا سێ شتی پێبەخشیوم، پیاوێك لەوانەی دانیشتبوون وتی: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نوێژی پێبەخشیم بەڕیزبەستن (وەکوو ڕیزی فریشتەکان)، سڵاویشی پێبەخشیم، بێگومان ئەوە سڵاوی ئەهلی بەهەشتە، ئامینکردنیشی پێبەخشیم بە هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی پێش منی نەبەخشیوە ئەوە نەبێت خوا بەخشیە هارِوون، موسا نزای دەکرد هارِوونیش ئامینی دەکرد.

## بَابُ السُّنَّةِ فِي جَهْرِ الْإِمَامِ بِالْقِرَاءَةِ، وَاسْتِحْبَابِ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ جَهْرًا بَيْنَ الْمُخَافَتَةِ، وَبَيْنَ الْجَهْرِ الرَّفِيعِ

**١٥٨٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ جَهَرَ بِالْقُرْآنِ، فَكَانَ الْمُشْرِكُونَ إِذَا

---

(١) إسناده ضعيف.

سَمِعُوا سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ، وَمَنْ جَاءَ بِهِ فَقَالَ اللَّهُ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ الإسراء: ١١٠، أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ فَيَسُبُّونَ الْقُرْآنَ ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ الإسراء: ١١٠، عَنْ أَصْحَابِكَ، فَلَا يَسْمَعُونَ، ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء: ١١٠[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ أَنَّ الِاسْمَ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ أَجْزَاءِ الشَّيْءِ ذِي الْأَجْزَاءِ وَالشُّعَبِ، قَدْ أَوْقَعَ اللَّهُ ﷻ اسْمَ الصَّلَاةِ عَلَى الْقِرَاءَةِ فِيهَا فَقَطْ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ الإسراء: ١١٠، أَرَادَ الْقِرَاءَةَ فِيهَا، وَلَيْسَ الصَّلَاةَ كُلَّهَا، الْقِرَاءَةُ فِيهَا فَقَطْ.

## باسی سوننەتی خوێندنی قورئان لەلایەن پێشنوێژەوە بەدەنگی بەرز، وە چاكتر وایە دەنگ بەرزكردنەوەكە نە زۆر بەرز بێ و نە زۆر نزم بێ

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ سەبارەت بە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾، دەڵێ: ئەم دەقە دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی بەنهێنی دەكرد لە مەككە، كاتێ نوێژی بۆ هاوەڵانی بكردایە دەنگی بەرز دەكردەوە، (واتە: قورئانی بەدەنگی بەرز دەخوێند)، هاوبەشدانەران كاتێ گوێیان لە دەنگی دەبوو جنێویان بە قورئان دەدا، هەروەها بەوەش دایبەزاندووەتە سەری و ئەوەیشی هێناویەتی، خوا بە پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرموو: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾، واتە: دەنگت بەرز مەكەرەوە بە قورئانخوێندنت، هاوبەشدانەران گوێیان لێی دەبێت و جنێو بە قورئان دەدەن: ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾، واتە: هێندە بەنهێنیش مەیخوێنە هاوەڵانت گوێبیستی نەبن، ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا﴾، واتە: بەڵكوو لە نێوان ئەو بڵندكردن و نەوییە قورئان بخوێنە.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوەیە كە لە كتێبی (الْإِيمَانِ) باسم كردووە، هەندێ جار ناو بەكار دەهێنرێ بۆ هەندێ لە بەشەكانی ئەو شتەی كە چەندەها بەش و لق و پۆی هەیە، هەندێ جار خوا ناوی نوێژی بەكار هێناوە تەنها مەبەستی پێی قورئانخوێندنە لەنێویدا، ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾، مەبەستی قورئانخوێندنە لەنێو نوێژدا، نەك هەموو نوێژ، بەڵكوو تەنها قورئانخوێندن تیایدا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ مُخَافَتَةِ الْإِمَامِ الْقِرَاءَةَ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِبَاحَةِ الْجَهْرِ بِبَعْضِ الْآيِ أَحْيَانًا فِيمَا يُخَافِتُ بِالْقِرَاءَةَ فِي الصَّلَاةِ

١٥٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ، وَرُبَّمَا أَسْمَعَنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَيُطِيلُ الرَّكْعَةَ الْأُولَى[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ، وَفِي خَبَرِ خَبَّابٍ: كُنَّا نَعْرِفُ قِرَاءَةَ النَّبِيِّ ﷺ بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ، دَلِيلٌ عَلَى أَنَّهُ كَانَ يُخَافِتُ بِالْقِرَاءَةِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ خَرَّجْتُ خَبَرَهُمَا فِي كِتَابِ الصَّلَاةِ فِي أَبْوَابِ الْقِرَاءَةِ.

## باسی پێشنوێژ قورئان بەدەنگی نزم دەخوێنێ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، وە ڕێگە دراوە جار جار هەندێ ئایەت بەدەنگی بەرز بخوێنێ لەو نوێژانەی بەدەنگی نزم قورئانیان تێدا دەخوێنێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەڕۆدا قورئانی دەخوێند، جار جار هەندێ ئایەتی بەدەنگی بەرز دەخوێند، ڕکاتی یەکەمیشی درێژ دەکردەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی سابیت هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لێوەکانی دەجوڵاندەوە، وە لە فەرموودەکەی خەبابیشدا هاتووە: ئێمە بە جوڵاندنەوەی ڕیشی دەمانزانی پێغەمبەر ﷺ قورئانی دەخوێند. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی نزم قورئانی دەخوێند لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا. فەرموودەکەیانم باس کردووە لە پەڕتووکی (الصَّلَاةِ) لە بەشەکانی قورئانخوێندن.

## بَابُ جَهْرِ الْإِمَامِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

١٥٨٩- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی پێشنوێژ لە نوێژی ئێوارە دەنگی بەرز دەکاتەوە بە قورئانخوێندن

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژی ئێوارە سورەتی (الطُّور)ی دەخوێند.

## بَابُ جَهْرِ الْإِمَامِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ

**١٥٩٠-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فِي عِشَاءِ الْآخِرَةِ، فَمَا سَمِعْتُ أَحْسَنَ قِرَاءَةً مِنْهُ ﷺ(١).

## باسی دەنگ بەرزکردنەوەی پێشنوێژ لە نوێژی بەیانیدا بە قورئانخوێندن

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژی خەوتنان ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ ﴾ ی دەخوێند، لە هیچ کەس گوێم لێ نەبوو ئەوەندەی ئەو ﷺ بەجوانی خوێندبێتی.

## بَابُ جَهْرِ الْإِمَامِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ

**١٥٩١-** عن زياد بن علاقة عن عمه عَنْ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ بِسُورَةِ ق فَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ: ﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴿١٠﴾ ﴾ق(٢).

## باسی پێشنوێژ لە نوێژی بەیانی دەنگی بەرز دەکاتەوە بە قورئانخوێندن

واتە: زیادی کوڕی عەلاقە دەگێڕێتەوە، لە مامیەوە، قوتبەی کوڕی مالیك ﷺ گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی سورەتی (ق)ی دەخوێند، دواتر گوێم لێ بوو ﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴿١٠﴾ ﴾ی دەخوێند.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يَجْهَرُ فِي الْأُولَيَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ، وَالْأُولَيَيْنِ مِنَ الْعِشَاءِ «لَا فِي جَمِيعِ الرَّكَعَاتِ كُلِّهَا، مِنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ مُسْنَدًا، وَلَا أَخَالُ، وَإِنَّمَا خَرَّجْتُ هَذَا الْخَبَرَ فِي هَذَا الْكِتَابِ إِذْ لَا خِلَافَ بَيْنَ أَهْلِ الْقِبْلَةِ فِي صِحَّةِ مَتْنِهِ، وَإِنْ لَمْ يَثْبُتِ الْخَبَرُ مِنْ جِهَةِ الْإِسْنَادِ الَّذِي نَذْكُرُهُ»**

**١٥٩٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ، إِذْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: أَحَدًا كَلِّمَهُ، فَذَكَرَ حَدِيثَ الْمِعْرَاجِ بِطُولِهِ، وَقَالَ: ثُمَّ نُودِيَ أَنَّ لَكَ بِكُلِّ صَلَاةٍ عَشْرًا قَالَ: فَهَبَطْتُ، فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ عَنْ كَبِدِ السَّمَاءِ نَزَلَ جِبْرِيلُ فِي صَفٍّ مِنَ الْمَلَائِكَةِ، فَصَلَّى بِهِ، وَأَمَرَ النَّبِيَّ ﷺ أَصْحَابَهُ، فَصَفُّوا خَلْفَهُ، فَائْتَمَّ بِجِبْرِيلَ، وَائْتَمَّ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بِالنَّبِيِّ ﷺ، فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعًا، يُخَافِتُ الْقِرَاءَةَ، ثُمَّ تَرَكَهُمْ حَتَّى تَصَوَّبَتِ الشَّمْسُ وَهِيَ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، نَزَلَ جِبْرِيلُ فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعًا يُخَافِتُ فِيهِنَّ الْقِرَاءَةَ، فَائْتَمَّ النَّبِيُّ ﷺ بِجِبْرِيلَ، وَائْتَمَّ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بِالنَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ تَرَكَهُمْ، حَتَّى إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ نَزَلَ جِبْرِيلُ فَصَلَّى بِهِمْ ثَلَاثًا، يَجْهَرُ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَيُخَافِتُ فِي وَاحِدَةٍ، ائْتَمَّ النَّبِيُّ ﷺ بِجِبْرِيلَ، وَائْتَمَّ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بِالنَّبِيِّ ﷺ، إِذَا غَابَ الشَّفَقُ نَزَلَ جِبْرِيلُ فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ: يَجْهَرُ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَيُخَافِتُ فِي اثْنَتَيْنِ، ائْتَمَّ النَّبِيُّ ﷺ بِجِبْرِيلَ، وَائْتَمَّ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بِالنَّبِيِّ ﷺ، فَبَاتُوا حَتَّى أَصْبَحُوا، نَزَلَ جِبْرِيلُ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ يُطِيلُ فِيهِنَّ الْقِرَاءَةَ»[١].

**باسی فەرموودەیەکی ڕوون و شیکراوە کە پێغەمبەر ﷺ تەنها لە دوو ڕکاتی یەکەمینی ئێوارە و دوو ڕکاتی یەکەمینی عیشا بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند نەك لە هەموو ڕکاتەکانی ئێوارە و عیشا، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، پێم وانییە، لەبەر ئەوەش ئەم فەرموودەم لەم کتێبەدا هێناوە، چونکە لە نێوانی ئەهلی قیبلە هیچ جیاوازییەك نییە لە تەواوی مەتنەکەی، ئەگەرچی لە ڕووی سەنەدەوە جێگیر نەبێت**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە کاتێکدا من لە نێوان ڕوکن و مەقامی (ئیبراهیم)دا بووم، لەپڕ گوێم لێی بوو دەیوت: کەسێك قسەی لەگەڵ کرد[٢]، -دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی میعراجی کرد- وتی: پاشان

---

(١) حديث ضعيف.

(٢) پێم وایە ئەم دەستەواژەیە تێگەیشتن لێی ئاڵۆزە، پێ دەچێت لە بنچینەدا شتێکی لێ پەڕیبێت.

بانگ كرا بۆ هەر نوێژێك (لە پێنج فەڕزەكە) پاداشتی دە نوێژت بۆ هەیە، فەرمووی: دواتر دابەزیم، كاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا جبریل دابەزی لەنێو ڕیزێك لە فریشتەكان نوێژی بە پێغەمبەر ﷺ كرد، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە هاوەڵانی لە پشتیەوە ڕیزیان بەست، پێغەمبەر ﷺ شوێنی جبریل كەوت، هاوەڵەكانی پێغەمبەریش ﷺ شوێنی پێغەمبەر ﷺ كەوتن، چوار ڕكات نوێژی پێ كردن، بەدەنگی نزم قوڕئانی دەخوێند، پاشان وازی لێ هێنان تا خۆر دابەزی و هێشتا ڕوون و ڕووناك بوو، جبریل دابەزی چوار ڕكات نوێژی بۆ كردن، قوڕئانی بەدەنگی نزم دەخوێند، پێغەمبەریش ﷺ شوێنی جبریل كەوت، هاوەڵەكانی پێغەمبەریش ﷺ شوێنی پێغەمبەر ﷺ كەوتن، پاشان وازی لێ هێنان، تا كاتێ خۆر ئاوا بوو، جبریل دابەزی سێ ڕكات نوێژی (ئێوارەی) پێ كردن، لە دوو ڕكاتی یەكەم بەدەنگی بەرز قوڕئانی خوێند، لە ڕكاتەكەی كوتایی بەنهێنی خوێندی، پێغەمبەر ﷺ شوێنی جبریل كەوت، هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ شوێنی پێغەمبەر ﷺ كەوتن، كاتێ سوورایی قەراغ خۆرئاوا نەما جبریل دابەزی چوار ڕكات نوێژ پێ كردن، لە دوو ڕكاتی یەكەمین دەنگی بەرز كردەوە، لە دوو ڕكاتەكەی دیكەش دەنگی نزم كردەوە، پێغەمبەر ﷺ شوێنی جبریل كەوت، هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ شوێنی پێغەمبەر ﷺ كەوتن، ئینجا خەوتن تا بەیانی بۆیەوە، جبریل دابەزی دوو ڕكات نوێژی بۆ كردن درێژی كردەوە بەقوڕئانخوێندن.

## بَابُ الْأَمْرِ بِمُبَادَرَةِ الْإِمَامِ الْمَأْمُومَ بِالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

**١٥٩٣**- عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ ﷺ، فَلَمَّا جَلَسَ فِي آخِرِ صَلَاتِهِ قَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: أُقِرَّتِ الصَّلَاةُ بِالْبِرِّ وَالزَّكَاةِ، فَلَمَّا انْفَتَلَ أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ قَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا تَدْرُونَ مَا تَقُولُونَ فِي صَلَاتِكُمْ؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَنَا فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلَاتَنَا، فَقَالَ: «إِذَا صَلَّيْتُمْ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ الْإِمَامُ كَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾ [الفاتحة: ٧]، فَقُولُوا: آمِينَ يُجِبْكُمُ اللَّهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: فَتِلْكَ بِتِلْكَ، فَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ فَاسْجُدُوا؛ فَإِنَّ الْإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ: فَتِلْكَ بِتِلْكَ[1].

---

(١) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يُرِيدُ أَنَّ الْإِمَامَ يَسْبِقُكُمْ إِلَى الرُّكُوعِ فَيَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، فَتَرْفَعُونَ أَنْتُمْ رُءُوسَكُمْ مِنَ الرُّكُوعِ بَعْدَ رَفْعِهِ، فَتَمْكُثُونَ فِي الرُّكُوعِ، فَهَذِهِ الْمَكْثَةُ فِي الرُّكُوعِ بَعْدَ رَفْعِ الْإِمَامِ الرَّأْسَ مِنَ الرُّكُوعِ بِتِلْكَ السَّبْقَةِ الَّتِي سَبَقَكُمْ بِهَا الْإِمَامُ إِلَى الرُّكُوعِ، وَكَذَلِكَ السُّجُودُ».

## باسی فەرمانکردن بەوەی ئیمام پێش نوێژخوێن ڕکووع و سوژدە ببات

واتە: حیتانی کوڕی عەبدوڵای ڕەقاشی دەڵێ: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ نوێژی بۆ کردین، کاتێ لە کۆتایی نوێژەکەی دانیشت، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: نوێژ لەگەڵ چاکە و زەکاتدا بەیەکەوە هاتوون و دانی پێدانراوە؟ کاتێ ئەبو موسای ئەشعەری سەلامی دایەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی: کامەتان ئەو قسەیەی کرد؟ ئایا نازانن چی دەڵێن لە نوێژەکانتاندا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و نوێژ و سوننەتەکانی فێر کردین و فەرمووی: ئەگەر نوێژتان کرد ڕیزەکانتان ڕێك بخەن، وە با یەکێکتان پێشنوێژیتان بۆ بکات، ئەگەر پێشنوێژ تەکبیری (الله أکبر)ی کرد تەکبیر بکەن، وە ئەگەر وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝﴾، ئێوەیش بڵێن: (آمِینَ) خوا خۆشی دەوێن. وە ئەگەر تەکبیری کرد و ڕکووعی برد ئێوەش تەکبیر بکەن و ڕکووع ببەن، چونکە ئیمام پێش ئێوە دەچێتە ڕکووع و پێش ئێوەیش سەر بەرز دەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بە ئەوە، وە ئەگەر تەکبیری کرد و سوژدەی برد ئێوەش تەکبیر بکەن و سوژدە ببەن، چونکە ئیمام پێش ئێوە سوژدە دەبات و پێش ئێوەیش سەر بەرز دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بە ئەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: مەبەستی ئەوەیە پێشنوێژ پێشتان دەکەوێت بۆ ڕکووع، پێش ئێوە ڕکووع دەبات، ئێوەش دوای بەرزبوونەوەی ئەو سەرتان بەرز دەکەنەوە لە ڕکووع، ئەندازەیەك لە ڕکووعدا دەمێننەوە، ئەو ماوەیەی کە لە ڕکووع مانەوە لەدوای سەربەرزکردنەوەی پێشنوێژ لە ڕکووع بەرانبەرە بەوەی پێشنوێژ لە ڕکووع پێشتان کەوت، بەهەمان شێوە سوژدەیش.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ مُبَادَرَةِ الْإِمَامِ الْمَأْمُومَ بِالرُّكُوعِ، وَالْإِخْبَارِ بِأَنَّ الْإِمَامَ مَا سَبَقَ الْمَأْمُومَ فِي الرُّكُوعِ، أَدْرَكَهُ الْمَأْمُومُ بَعْدَ رَفْعِ الْإِمَامِ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ

**١٥٩٤-** عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنِّي قَدْ بَدِنْتُ، فَلَا تُبَادِرُونِي بِالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، فَإِنَّكُمْ مَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا رَكَعْتُ تُدْرِكُونِي بِهِ إِذَا رَفَعْتُ، وَمَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا سَجَدْتُ تُدْرِكُونِي بِهِ إِذَا رَفَعْتُ»(١).

## باسی ڕێگریكردن لەوەی نوێژخوێن لە كاتی ڕكووع پێشی پێشنوێژ بكەوێت، وە هەواڵدان بەوەی پێشنوێژ هەرچۆنێك پێشی نوێژخوێن بكەوێت لە ڕكووعدا، ئەوە نوێژخوێن پێی دەگاتەوە، دوای ئەوەی پێشنوێژ سەری بەرز دەكاتەوە لە ڕكووع

واتە: موعاویە ﷺ وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: من بەساڵا چووم و قورس بووم، پێشم مەكەون بە ڕكووع و بە سوژدەبردن، چونكە من هەرچۆنێك پێشی ئێوە بكەوم كاتێ ڕكووعم برد پێم دەگەنەوە كاتێ سەرم بەرز كردەوە، وە هەرچۆنێك پێشی ئێوە بكەوم كاتێ كە سوژدەم برد پێم دەگەنەوە كاتێ سەرم بەرز كردەوە لە سوژدە.

## بَابُ ذِكْرِ الْوَقْتِ الَّذِي فِيهِ الْمَأْمُومُ مُدْرِكًا لِلرَّكْعَةِ إِذَا رَكَعَ إِمَامُهُ قَبْلَ

**١٥٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلَاةِ فَقَدْ أَدْرَكَهَا قَبْلَ أَنْ يُقِيمَ الْإِمَامُ صُلْبَهُ»(٢).

## باسی ئەو كاتەی كە نوێژخوێن دەگات بە ڕكاتێكدا، ئەگەر پێشنوێژەكەی پێش ئەو چووە ڕكووع

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك بگات بە یەك ڕكاتی نوێژدا ئەوە گەیشتووە بەو نوێژەكەدا، ئەگەر پێش ئەوەی پێشنوێژ پشتی ڕاست بكاتەوە (لە ڕكووع نوێژخوێن پێی بگات).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح من غير طريق قرة.

## بَابُ رَفْعِ الْإِمَامِ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَبْلَ الْمَأْمُومِ

**١٥٩٦-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي مُوسَى ﷺ: فَإِنَّ الْإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «فَتِلْكَ بِتِلْكَ»(١).

## باسی هەستانەوەی پێشنوێژ لە ڕکووع پێش نوێژخوێن

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو موسادا ﷺ هاتووە: بێگومان پێشنوێژ پێش ئێوە ڕکووع دەبات و پێش ئێوەیش سەر بەرز دەکاتەوە لە ڕکووع، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بە ئەوە (مەبەستی ئەوەیە پێشنوێژ پێشتان دەکەوێت بۆ ڕکووع، پێش ئێوە ڕکووع دەبات، ئێوەش دوای هەستانەوەی ئەو هەڵدەستنەوە لە ڕکووع، ئەندازەیەك لە ڕکووعدا دەمێننەوە، ئەو ماوەیە کە لە ڕکووع مانەوە لەدوای سەربەرزکردنەوەی پێشنوێژ لە ڕکووع بەرانبەرە بەوەی پێشنوێژ لە ڕکووع پێشتان کەوت، بەهەمان شێوە سوژدەیش).

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَحْمِيدِ الْمَأْمُومِ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، وَرَجَاءُ مَغْفِرَةِ ذُنُوبِهِ إِذَا وَافَقَ تَحْمِيدُهُ تَحْمِيدَ الْمَلَائِكَةِ

**١٥٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ الْأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَا الْأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي، إِنَّمَا الْإِمَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِذَا وَافَقَ قَوْلُ أَهْلِ الْأَرْضِ قَوْلَ أَهْلِ السَّمَاءِ غُفِرَ لَهُ مَا مَضَى مِنْ ذَنْبِهِ، وَيَهْلِكُ كِسْرَى وَلَا كِسْرَى بَعْدُ، وَيَهْلِكُ قَيْصَرُ وَلَا وَقَيْصَرَ مِنْ بَعْدِهِ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەرمانکردن بەوەی نوێژخوێن ستاییشی پەروەردگاری بکات بە وتنی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ) لە کاتی سەر بەرزکردنەوەی لە ڕکووع، وە ئومێدی لێخۆشبوونی گوناهەکانی ئەگەر ستاییشکردنەکەی لەگەڵ ستاییشی فریشتەکان یەکانگیر بۆیەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك گوێڕایەڵیم بکات ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەر کەسێکیش سەرپێچیم بکات ئەوە سەرپێچی خوای کردووە، وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی فەرماندەکەی بکات ئەوە گوێڕایەڵی منی کردووە، هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرماندەکەی بکات ئەوە سەرپێچی منی کردووە، بێگومان پێشەوا قەڵغانە، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئەوە بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، ئەگەر وتەی خەڵکی سەر زەوی و خەڵکی ئاسمانەکان ڕێك بۆیەوە ئەوە لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووردرێ، وە کیسرایش لەنێو دەچێ و لەدوای ئەو کیسرایەکی دیکە نایەت، قەیصەریش لەنێو دەچێت و لەدوای ئەو قەیصەرێکی دیکە نایەت.

## بَابُ مُبَادَرَةِ الْإِمَامِ الْمَأْمُومَ بِالسُّجُودِ، وَثُبُوتِ الْمَأْمُومِ قَائِمًا، وَتَرْكِهِ الِانْحِنَاءَ لِلسُّجُودِ حَتَّى يَسْجُدَ إِمَامُهُ

**١٥٩٨-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ نَزَلْ قِيَامًا حَتَّى نَرَاهُ قَدْ سَجَدَ(١).

**باسی پێشنوێژ پێشی نوێژخوێن دەکەوێ بە سوژدەبردن، وە نوێژخوێن بەپێوە دەوەستێ و ناچەمێتەوە بۆ سوژدە تا پێشنوێژەکەی سوژدە نەبات**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع ئێمە بەپێوە دەوەستاین تا دەمانبینی سوژدەی بردووە.

---

(١) صحیح.

١٥٩٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَحْنِ أَحَدُنَا ظَهْرَهُ حَتَّى نَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدِ اسْتَوَى سَاجِدًا[1].

واتە: عەمری کوڕی حورەیس ﷺ دەڵێ: لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد، کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع هیچ یەکێك لە ئێمە پشتی نەدەچەماندەوە تا دەمانبینی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێك بووەتەوە لە سوژدەدا.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي مُبَادَرَةِ الْمَأْمُومِ الْإِمَامَ بِرَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ السُّجُودِ

١٦٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ مُحَمَّدٌ ﷺ، أَوْ أَبُو الْقَاسِمِ عَلَيْهِ السَّلَامُ: «أَمَّا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ؟»[2].

## باسی هەڕەشەکردن لەوەی نوێژخوێن سەری بەرز بکاتەوە لە سوژدە پێش پێشنوێژ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: موحەممەد ﷺ یان باوکی قاسم ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو کەسەی پێش پێشنوێژ سەری بەرز دەکاتەوە ناترسێ خوا ﷻ سەری بگۆڕێ بۆ سەری گوێدرێژ.

## بَابُ ذِكْرِ إِدْرَاكِ الْمَأْمُومِ مَا فَاتَهُ مِنْ سُجُودِ الْإِمَامِ بَعْدَ رَفْعِ الْإِمَامِ رَأْسَهُ

١٦٠١- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي مُوسَى ﷺ: فَإِنَّ الْإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَفِي خَبَرِ مُعَاوِيَةَ: وَمَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا سَجَدْتُ تُدْرِكُونِي بِهِ إِذَا رَفَعْتُ[3].

## باسی نوێژخوێن دەگات بەوەی لە دەستی داوە لە سوژدەی پێشنوێژ، دوای ئەوەی کە پێشنوێژ سەری بەرز دەکاتەوە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو موسادا ﷺ هاتووە: بێگومان پێشنوێژ پێش ئێوە سوژدە دەبات و پێش ئێوەیش سەر بەرز دەکاتەوە لە سوژدە، ئەوە بە ئەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(مەبەستی ئەوەیە پێشنوێژ پێشتان دەكەوێت بۆ سوژدە، پێش ئێوە سوژدە دەبات، ئێوەش دوای بەرزبوونەوەی ئەو سەرتان بەرز دەكەنەوە لە سوژدە، ئەندازەیەك لە سوژدە دەمێننەوە، ئەو ماوەیە كە لە سوژدە مانەوە لەدوای سەربەرزكردنەوەی پێشنوێژ لە سوژدە بەرانبەرە بەوەی پێشنوێژ لە سوژدە پێشتان كەوت)، وە لە فەرموودەكەی موعاویەشدا هاتووە: هەرچەندە من پێشتان بكەومەوە كە سوژدە دەبم ئەوا ئێوە حەتمەن پێم دەگەنەوە كاتێ كە هەڵدەستمەوە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ مُبَادَرَةِ الْمَأْمُومِ الْإِمَامَ بِالْقِيَامِ وَالْقُعُودِ

١٦٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، وَانْصَرَفَ مِنَ الصَّلَاةِ، وَأَقْبَلَ إِلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي إِمَامُكُمْ، فَلَا تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلَا بِالسُّجُودِ، وَلَا بِالْقِيَامِ وَلَا بِالْقُعُودِ، وَلَا بِالِانْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ خَلْفِي، وَايْمُ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»، قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا رَأَيْتَ؟ قَالَ: «رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ»[١].

## باسی قەدەغەكردن لەوەی نوێژخوێن پێشی پێشنوێژ بكەوێت لە كاتی هەستانەوە و دانیشتن

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی بۆ كردین و لە نوێژەكەی بۆیەوە، پاشان ڕووی تێكردین و فەرمووی: من ئیمامی ئێوەم، پێشم مەكەون لە ڕكووع و سوژدە و لە هەستانەوە و دانیشتن و لە تەواوكردنی نوێژەكانتان، چونكە من لە پێشم و لە دواوەم دەتانبینم، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەوەی من بینیم ئێوەش بتانبینایە كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان، وتی: وتمان: چیت بینیوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەهەشت و ئاگرم بینی.

---

(١) صحيح.

## بَابُ افْتِتَاحِ الْإِمَامِ الْقِرَاءَةَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيةِ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي يَجْهَرُ فِيهَا مِنْ غَيْرِ سَكْتٍ فِيهَا

١٦٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَهَضَ فِي الثَّانِيةِ اسْتَفْتَحَ بِـ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَلَمْ يَسْكُتْ[١].

## باسی پێشنوێژ لە ڕکاتی دووەمی نێو ئەو نوێژەی دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوە ڕاستەوخۆ دەست دەکات بە خوێندنی سوڕەتی فاتیحە، بەبێ بێدەنگبوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایەوە بۆ ڕکاتی دووەم لەنێو نوێژ، بە (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) دەستی پێ دەکرد و هیچ بێدەنگ نەدەبوو.

## بَابُ تَخْفِيفِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ مَعَ الْإِتْمَامِ

١٦٠٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَخَفَّ النَّاسِ صَلَاةً فِي تَمَامٍ[٢].

## باسی پێشنوێژ نوێژەکەی ئاسان بکات لەگەڵ ئەوەدا هەموو مەرجەکانیشی بەتەواوی جێبەجێ بکات

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئاسانترین و پوختترین بوو لەگەڵ جێبەجێکردنی ڕکووع و سوژدە و هەموو پایەکانی نێو نوێژ بەتەواوی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ تَطْوِيلِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ مَخَافَةَ تَنْفِيرِ الْمَأْمُومِينَ، وَقُنُوتِهِمْ

١٦٠٥- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَشَدَّ غَضَبًا فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ، يومئذ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ مِنْكُمْ لَمُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لەوەی پێشنوێژ نوێژەکەی درێژ بکاتەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك خەڵکی دووربخاتەوە و بێئومێدیان بکات

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دوا دەکەوم لە نوێژی بەیانی لەبەر ئەوەی فڵانە کەس نوێژەکەمان بۆ درێژ دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ هەستایە سەر پێ، پێغەمبەرم ﷺ نەبینیوە لە هیچ ئامۆژگارییەکدا ئەوەندەی ئەو ڕۆژە تورە بووبێ، فەرمووی: ئەی خەڵکینە بەڕاستی لەنێو ئێوەدا کەسانێك هەن خەڵکی دوور دەخەنەوە، جا هەرکەسێکتان نوێژی بۆ خەڵکی کرد با سووکی بکاتەوە چونکە کەسانی لاواز و پیر و خاوەنپێداویستییان تێدایە.

## بَابُ قَدْرِ قِرَاءَةِ الْإِمَامِ الَّذِي لَا يَكُونُ تَطْوِيلًا

**١٦٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا بِالتَّخْفِيفِ، وَيَؤُمُّنَا بِالصَّافَّاتِ[١].

## باسی ئەندازەی قورئانخوێندنی پێشنوێژ کە درێژ نییە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین نوێژ بەسووکی ئەنجام بدەین، پێشنوێژیشی بۆ دەکردین بە سوڕەتی (الصَّافَّات).

**١٦٠٧-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ قَالَ: كَانَ أَبِي قَدْ تَرَكَ الصَّلَاةَ مَعَنَا، قُلْتُ: مَا لَكَ لَا تُصَلِّي مَعَنَا؟ قَالَ: إِنَّكُمْ تُخَفِّفُونَ الصَّلَاةَ قُلْتُ: فَأَيْنَ قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ فِيكُمُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ؟ قَالَ: قَدْ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ ذَلِكَ، ثُمَّ صَلَّى بِنَا ثَلَاثَةَ أَضْعَافِ مَا تُصَلُّونَ[٢].

واتە: ئیبراهیمی تەیمی دەڵێ: باوکم وازی لە نوێژکردن هێنا لەگەڵمان، وتم: ئەوە چیتە بۆچی نوێژمان لەگەڵ ناکەی؟ وتی: ئێوە نوێژ بەکورتی ئەنجام ئەدەن، وتم: ئەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: بەڕاستی لاواز و پیر و خاوەنپێداویستییان تێدایە. لە کوێ؟ وتی: گوێم لێ بوو عەبدوڵای کوڕی مەسعودیش ﷺ ئەوەی دەوت، پاشان نوێژی بۆ کردین سێ ئەوەندەی ئەوەی ئێوە بوو.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ تَقْدِيرِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ بِضُعَفَاءِ الْمَأْمُومِينَ، وَكِبَارِهِمْ، وَذَوِي الْحَوَائِجِ مِنْهُمْ

١٦٠٨- عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ فَقَالَ: كَانَ آخِرُ مَا عَهِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ بَعَثَنِي عَلَى الطَّائِفِ فَقَالَ: يَا عُثْمَانُ تَجَوَّزْ فِي الصَّلَاةِ، وَاقْدُرِ النَّاسَ بِأَضْعَفِهِمْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَذَا الْحَاجَةِ[١].

## باسی پێشنوێژ دەبێ ڕەچاوی لاواز و بە تەمەن و خاوەنپێداویستیەکان بکات لە نوێژەکەیدا

واتە: موتەڕیف دەڵێ: چووم بۆ لای عوسمانی کوڕی ئەبو لعاص ﷺ وتی: کۆتا جار کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ طائیف فەرمووی: ئەی عوسمان نوێژ کورت بکەرەوە، بەپێی توانای لاوازترینیان نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی پیر و لاواز و نەخۆش و خاوەنپێداویستییان تێدایە.

## بَابُ تَخْفِيفِ الْإِمَامِ الْقِرَاءَةَ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لِبَعْضِ الْمَأْمُومِينَ

١٦٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ مَعَ أُمِّهِ فَيَقْرَأُ بِالسُّورَةِ الْقَصِيرَةِ أَوِ الْخَفِيفَةِ[٢].

## باسی پێشنوێژ نوێژەکەی کورت دەکات لە کاتی دەرکەوتنی هەندێ پێویستی نوێژخوێنەکانی

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ دەبوو ئەو منداڵەی کە لەگەڵ دایکیتی دەگریێت، ئەوا سوڕەتی کورت یان سوڕەتی ئاسانی دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَخْفِيفِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لِبَعْضِ الْمَأْمُومِينَ بَعْدَ مَا قَدْ نَوَى إِطَالَتَهَا

١٦١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنِّي لَأَدْخُلُ فِي الصَّلَاةِ فَأُرِيدُ إِطَالَتَهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي، مِمَّا أَعْلَمُ مِنْ وَجْدِ أُمِّهِ مِنْ بُكَائِهِ»(١).

## باسی مۆڵەت دراوە بە پێشنوێژ نوێژەکەی کورت بکاتەوە لەبەر پێویستییەك بۆ هەندێ لە نوێژخوێنەکانی بێتە پێشەوە، دوای ئەوەی نییەتی هێناوە درێژی بکاتەوە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی من دەچمە نێو نوێژەوە دەمەوێ درێژی بکەمەوە، کاتێ گوێم لە گریانی منداڵ دەبێ کورت و ئاسانی دەکەمەوە، لەوەی دەیزانم دایکی بەهۆیەوە بێتاقەت و سەرقاڵ دەبێت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي خُرُوجِ الْمَأْمُومِ مِنْ صَلَاةِ الْإِمَامِ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لَهُ مِنْ أُمُورِ الدُّنْيَا إِذَا طَوَّلَ الصَّلَاةَ

١٦١١- عَنْ سفيان حدَّثَنا عَمْرو بن دِينَار قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى قَوْمِهِ، فَيَؤُمُّهُمْ، فَأَخَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَرْجِعُ مُعَاذٌ يَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَتَنَحَّى رَجُلٌ وَصَلَّى نَاحِيَةً، ثُمَّ خَرَجَ فَقَالُوا: مَا لَكَ يَا فُلَانُ؟ نَافَقْتَ؟ قَالَ: مَا نَافَقْتُ، وَلَآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَلَأُخْبِرَنَّهُ قَالَ: فَذَهَبَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ مُعَاذًا يُصَلِّي مَعَكَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا، وَإِنَّكَ أَخَّرْتَ الْعِشَاءَ الْبَارِحَةَ، ثُمَّ جَاءَ يَؤُمُّنَا فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَإِنَّمَا نَحْنُ أَصْحَابُ نَوَاضِحَ، وَإِنَّمَا نَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفَتَّانٌ أَنْتَ يَا مُعَاذُ؟» اقْرَأْ بِسُورَةِ كَذَا، وَسُورَةِ كَذَا، فَقُلْنَا لِعَمْرٍو: إِنَّ أَبَا الزُّبَيْرِ يَقُولُ: سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ، وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ؟ فَقَالَ: هُوَ نَحْوُ هَذَا»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەت دراوە بە نوێژخوێن لە نوێژی پێشنوێژ (بەکۆمەڵ) دەربچێت لەبەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی دنیا بۆی بێتە پێش، ئەگەر نوێژەکەی درێژ کردەوە

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، عەمری کوڕی دینار وتی: گوێم لێ بوو جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەیوت: موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی پێشنوێژی بۆ دەکردن، شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دوا خست (موعازی کوڕی جەبەلیش لەگەڵیدا نوێژ کرد)، پاشان موعاز گەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی پێشنوێژییان بۆ بکات، سەرەتا بە سوڕەتی بەقەڕە دەستی کرد بە قورئانخوێندن، پیاوێك خۆی کەنار خست و لە لایەکی مزگەوتەکە نوێژی خۆی کرد، پاشان ڕۆیشت، وتیان: ئەوە چیتە ئەی فڵانە کەس دووڕوو بوویت؟ وتی: نەخێر دووڕوو نەبووم، دەبێت بچم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ بدەم، وتی: هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ موعاز نوێژت لەگەڵ دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە پێشنوێژیمان بۆ دەکات، وە تۆ دوێنی نوێژی عیشات دوا خست، ئینجا گەڕایەوە بۆ لامان پێشنوێژی بۆ کردین، دەستی پێ کرد بەخوێندنی سوڕەتی بەقەڕە، بەڕاستی ئێمە خەڵکی خاوەنکارین بەدەستەکانی خۆمان کار دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز: ئایا تۆ دەتەوێ ببیتە مایەی فیتنە؟ فڵان سوڕەت و فڵان سوڕەت بخوێنە. بە عەمرمان وت: ئەبو زوبەیر وتی: سوڕەتی: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ) و (وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ)؟ وتی: هاوشێوەی ئەوانە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِائْتِمَامِ أَهْلِ الصُّفُوفِ الْأَوَاخِرِ بِأَهْلِ الصُّفُوفِ الْأُوَلِ

**١٦١٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا، فَقَالَ: «تَقَدَّمُوا، وَائْتَمُّوا بِي، وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ، وَلَا يَزَالُ الْقَوْمُ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ»[1].

## باسی فەرمانکردن بەوەی ڕیزەکانی دواوە شوێنی ڕیزی یەکەم بکەون

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی هاوەڵەکانی دوا کەوتن لە نوێژ، بۆیە فەرمووی: وەرنە پێش بۆ ڕیزی یەکەم و شوێنی من بکەون، وە

---

(١) صحیح.

با ئەوانەی دوای ئێوەش شوێنی ئێوە بکەون، خەڵکانێك هەن بەردەوام دوا دەکەون تا خوا دوایان دەخات.

## بَابُ أَمْرِ الْمَأْمُومِ بِالصَّلَاةِ جَالِسًا إِذَا صَلَّى إِمَامُهُ جَالِسًا

**١٦١٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْإِمَامَ أَمِينٌ، أَوْ أَمِيرٌ، فَإِنْ صَلَّى قَاعِدَاً، فَصَلُّوا قُعُودًا، وَإِنْ صَلَّى قَائِمَاً فَصَلُّوا قِيَامَاً[١].

## باسی فەرمانکردن بە نوێژخوێن بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەگەر ئیمامەکەی بە دانیشتنەوە نوێژی کرد

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: بەڕاستی ئیمام متمانەپێکراوە یان ئەمیرە، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەیش بەپێوە نوێژ بکەن.

## بَابُ أَمْرِ الْمَأْمُومِ بِالْجُلُوسِ بَعْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةَ قَائِمًا إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِدًا

**١٦١٤-** عن هِشام بن عروةَ حدثني أبي عن عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّاسَ دَخَلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَصَلَّى بِهِمْ جَالِسًا، فَصَلَّوْا قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، وَقَالَ: «إِنَّمَا الْإِمَامُ لِيُؤْتَمُّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە نوێژخوێن دابنیشێت دوای ئەوەی بەپێوە نوێژی دابەستبوو، ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم لە عائیشەوە ﷺ، خەڵکانێك هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو، بە دانیشتنەوە نوێژی بۆ کردن، ئەوانیش بەپێوە نوێژیان کرد، ئاماژەی بۆ کردن دانیشن، وە فەرمووی:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئیمام بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی بکرێ، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەیش بەپێوە نوێژ بکەن، ئەگەر ڕکووعی برد ئێوەیش ڕکووع ببەن، ئەگەر سوژدەی برد ئێوەیش سوژدە ببەن، ئەگەر سەری بەرز کردەوە ئێوەیش سەرتان بەرز بکەنەوە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صَلَاةِ الْمَأْمُومِ قَائِمًا خَلْفَ الْإِمَامِ قَاعِدًا

**١٦١٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَسًا بِالْمَدِينَةِ، فَصَرَعَهُ عَلَى جِذْمِ نَخْلَةٍ، فَانْفَكَّتْ قَدَمُهُ، فَأَتَيْنَاهُ نَعُودُهُ، فَوَجَدْنَاهُ فِي مَشْرُبَةٍ لِعَائِشَةَ يُسَبِّحُ جَالِسًا، فَقُمْنَا خَلْفَهُ، وَأَشَارَ إِلَيْنَا، فَقَعَدْنَا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ: «إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا، وَإِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَلَا تَفْعَلُوا كَمَا تَفْعَلُ أَهْلُ فَارِسَ بِعُظَمَائِهَا»[١].

## باسی قەدەغەکردن لەوەی نوێژخوێن بەپێوە لەپشت پێشنوێژێکەوە نوێژ بکات، لە کاتێکدا پێشنوێژەکە بە دانیشتنەوە نوێژ بکات

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە سواری ئەسپێك بوو، دواتر خستیە خوارەوە کەوت بەسەر بنەدارخورمایەکدا، ئێسکی قاچی لە جێی خۆی دەرچوو، ئێمەیش هاتین بۆ سەردانی بینیمان لە ژوورەکەی عائیشە بوو بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، ئێمەیش لە پشتیەوە وەستاین بۆ نوێژ، بەدەستی ئاماژەی بۆ کردین، دانیشتین، کاتێ نوێژی تەواو کرد فەرمووی: ئەگەر ئیمام بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد بەپێوە نوێژ بکەن، بەوشێوە مەکەن وەك چۆن فارسەکان لەگەڵ گەورەکانیاندا دەیان کرد (فارسەکان بەپێوە لەبەردەم پاشاکانیان دەوەستان ئەوانیش دانیشتبوون).

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ تَأَوَّلَهَا بَعْضُ الْعُلَمَاءِ نَاسِخَةً لِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَأْمُومَ بِالصَّلَاةِ جَالِسًا إِذَا صَلَّى إِمَامُهُ جَالِسًا

**١٦١٦-** عَن الأعْمَشِ عَن إبراهيمَ عَن الأسودِ عَن عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ جَاءَهُ بِلَالٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، وَمَتَى يَقُمْ مَقَامَكَ يَبْكِ، فَلَا يَسْتَطِيعُ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ قَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ- ثَلَاثَ مَرَّاتٍ- فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ، قَالَتْ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَوَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ خِفَّةً، فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلَاهُ تَخُطَّانِ فِي الْأَرْضِ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِهِ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ مَكَانَكَ قَالَ: فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، فَجَلَسَ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَأْتَمُّ بِالنَّبِيِّ ﷺ، وَالنَّاسُ يَأْتَمُّونَ بِأَبِي بَكْرٍ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِ هَذَا حَدِيثُ وَكِيعٍ وَقَالَ فِي حَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا، وَأَبُو بَكْرٍ قَائِمًا[(١)].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ: إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ الْمَرِيضُ جَالِسًا صَلَّى مَنْ خَلْفَهُ قِيَامًا إِذَا قَدَرُوا عَلَى الْقِيَامِ، وَقَالُوا: خَبَرُ الْأَسْوَدِ وَعُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ نَاسِخٌ لِلْأَخْبَارِ الَّتِي تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهَا فِي أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ أَصْحَابَهُ بِالْجُلُوسِ إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ جَالِسًا. قَالُوا: لِأَنَّ تِلْكَ الْأَخْبَارَ عِنْدَ سُقُوطِ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْفَرَسِ وَهَذَا الْخَبَرَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ قَالُوا: وَالْفِعْلُ الْآخَرُ نَاسِخٌ لِمَا تَقَدَّمَ مِنْ فِعْلِهِ وَقَوْلِهِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّ الَّذِي عِنْدِي فِي ذَلِكَ - وَاللَّهَ أَسْأَلُ الْعِصْمَةَ وَالتَّوْفِيقَ - أَنَّهُ لَوْ صَحَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ هُوَ الْإِمَامَ فِي الْمَرَضِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ لَكَانَ الْأَمْرُ عَلَى مَا قَالَتْ هَذِهِ الْفِرْقَةُ مِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ، وَلَكِنْ لَمْ يَثْبُتْ عِنْدَنَا ذَلِكَ؛ لِأَنَّ الرُّوَاةَ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي هَذِهِ الصَّلَاةِ عَلَى فِرَقٍ ثَلَاثٍ.

## باسی چەند فەرموودەیەك هەندێ لە زانایان پێیان وایە فەرمانەكەی پێغەمبەری ﷺ هەڵوەشاندووەتەوە كە فەرمانی كردووە نوێژخوێن بەدانیشتەوە نوێژ بكات، ئەگەر پێشنوێژەكەی بە دانیشتنەوە نوێژی كرد

واتە: ئەعمەش دەگێڕێتەوە لە ئیبڕاهیم لە ئەسوەد لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش كەوت، بەو نەخۆشییەی كە تیایدا كۆچی دوایی كرد،

---

(١) صحيح.

بیلال هات بۆ لای ئاگاداری کردەوە بۆ نوێژ، فەرمووی: فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، هەر کاتێ بچێتە جێگای تۆ دەگری، ناتوانێت، ئەگەر فەرمانت بکردایە بە عومەر نوێژ بۆ خەڵکی بکات چاکتر بوو، فەرمووی: فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات -سێ جار دووبارەی کردەوە- ئێوە وەکوو ئافرەتانی دەوروبەری یوسفن، عائیشە ﵂ وتی: ناردمان بەدوای ئەبو بەکردا نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، پێغەمبەر ﷺ هەستی کرد هێزی بۆ هاتووەتەوە و جەستەی باشتر بووە، هاتە دەرەوە دەستی لەسەر شانی دوو کەس بوو، قاچەکانیشی بە زەویدا دەخشا، کاتێ ئەبو بەکر هەستی پێ کرد، ویستی بێتە دواوە، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد لەجێگای خۆت بمێنەرەوە، وتی: پێغەمبەر ﷺ هات لە تەنیشتی ئەبو بەکرەوە دانیشت، جا ئەبو بەکر شوێنی پێغەمبەر ﷺ کەوت، (واتە: پێغەمبەر ﷺ ئیمام بوو) خەڵکەکەش شوێنی ئەبو بەکر کەوتبوون. تا ئێرە فەرموودەی وەکیعە، وە لە فەرموودەکەی ئەبو موعاویە هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ئەبو بەکریش بەپێوە ڕاوەستا بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: خەڵکانێك لە فەرموودەناسان دەڵێن: ئەگەر پێشنوێژ نەخۆش بوو نوێژی کرد ئەوانەی لە دوایەوەن بەپێوە نوێژ دەکەن ئەگەر توانییان بەپێوە بوەستن، وە وتوویانە حوکمی فەرموودەکەی ئەسوەد و عورۆە لە عائیشەوە هەڵوەشێنەرەوەی ئەو فەرموودانەیە کە لەپێشەوە باسمان کرد دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد. وتوویانە ئەو فەرموودانە لە کاتی کەوتنی پێغەمبەر ﷺ بوو بەسەر ئەسپەکەوە، ئەم فەرموودەیەش لە کاتی نەخۆشییەکەی بوو کە پێیەوە کۆچی دوایی کرد، وتوویانە: ئەو کردارەی دوا کەوتووە هەڵوەشێنەرەوەی کردار و گوفتارەکەی پێشوویەتی.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەوەی لەلای منە -داوای پارێزراوی و سەرکەوتن لە خوا دەکەم- ئەگەر ئەو فەرموودە ڕاست بێت کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خۆی پێشنوێژ بووە لەو نەخۆشییەی کە پێیەوە کۆچی دوایی کرد، ئەوە ڕای ئەو کۆمەڵە لە فەرموودەناسان پەسەندترە، بەڵام ئەوە لەلای ئێمە جێگیر نەبووە، چونکە گێڕەرەوەکان جیاوازییان هەیە لەو نوێژە، لەسەر سێ ڕاوبۆچوون.

**١٦١٧-** فَفِي خَبَرِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، وَخَبَرِ الْأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ الْإِمَامَ، وَقَدْ رُوِيَ بِمِثْلِ هَذَا الْإِسْنَادِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: مِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ: كَانَ أَبُو بَكْرٍ الْمُقَدَّمَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ الْمُقَدَّمَ بَيْنَ يَدَيْ أَبِي بَكْرٍ(١).

**واتە: لە فەرموودەکەی هیشام لە باوکی لە عائیشەوە ﵂ (فەرموودەی ژمارە ١٦١٤)، وە فەرموودەکەی ئەعمەش لە ئیبڕاهیم لە ئەسوەدەوە (فەرموودەی ژمارە ١٦١٦) هاتووە: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژ بووە، بەهەمان شێوەی ئەم سەنەدە گێڕدراوەتەوە لە عائیشە، دەڵێ: هەندێ لە خەڵکەکە دەڵێ: ئەبو بەکر لەپێشەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هەندێکیشیان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەپێشەوەی ئەبو بەکر بوو.**

**١٦١٨-** عَن شُعبة عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الأَسْوَدِ عَائِشَةَ ﵂(٢).

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە لە ئەعمەش لە ئیبڕاهیم لە ئەسوەد لە عائیشەوە ﵂، (فەرموودەی ژمارە ١٦١٧ کە دەڵێ: هەندێ لە خەڵکەکە دەڵێ: ئەبو بەکر لەپێشەوەی پێغەمبەر ﷺ بوو، هەندێکیشیان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەپێشەوەی ئەبو بەکر بوو).**

**١٦١٩-** عَنْ مَسروقِ بنِ الأجدَعِ عَن عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، صَلَّى بِالنَّاسِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّفِّ(٣).

**واتە: مەسڕوقی کوڕی ئەجدەع دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂، ئەبو بەکر نوێژی بۆ خەڵك کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لە ڕیزەکەدا بوو.**

**١٦٢٠-** عَنْ مَسروقٍ عَن عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، صَلَّى بِالنَّاسِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّفِّ خَلْفَهُ(٤).

**واتە: مەسڕوق دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂، ئەبو بەکر نوێژی بۆ خەڵك کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لە ڕیزەکەدا بوو لە پشتیەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**١٦٢١- عَنْ عُبَيدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ صَلَّى بِالنَّاسِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّفِّ خَلْفَهُ**[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَمْ يَصِحَّ الْخَبَرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ هُوَ الْإِمَامَ فِي الْمَرَضِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي كَانَ هُوَ فِيهَا قَاعِدًا، وَأَبُو بَكْرٍ وَالْقَوْمُ قِيَامٌ؛ لِأَنَّ فِي خَبَرِ مَسْرُوقٍ، وَعُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ الْإِمَامَ، وَالنَّبِيَّ ﷺ مَأْمُومٌ، وَهَذَا ضِدُّ خَبَرِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، وَخَبَرِ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الْأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ، عَلَى أَنَّ شُعْبَةَ بْنَ الْحَجَّاجِ قَدْ بَيَّنَ فِي رِوَايَتِهِ عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ مِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ: كَانَ أَبُو بَكْرٍ الْمُقَدَّمَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمِنْهُمْ مَنْ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ الْمُقَدَّمَ بَيْنَ يَدَيْ أَبِي بَكْرٍ، وَإِذَا كَانَ الْحَدِيثُ الَّذِي بِهِ احْتَجَّ مَنْ زَعَمَ أَنَّ فِعْلَهُ الَّذِي كَانَ فِي سَقْطَتِهِ مِنَ الْفَرَسِ، وَأَمْرَهُ ﷺ بِالِاقْتِدَاءِ بِالْأَئِمَّةِ وَقُعُودِهِمْ فِي الصَّلَاةِ إِذَا صَلَّى إِمَامُهُمْ قَاعِدًا، مَنْسُوخٌ غَيْرُ صَحِيحٍ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، فَغَيْرُ جَائِزٍ لِعَالِمٍ أَنْ يَدَّعِيَ نَسْخَ مَا قَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْأَخْبَارِ الْمُتَوَاتِرَةِ بِالْأَسَانِيدِ الصِّحَاحِ مِنْ فِعْلِهِ وَأَمْرِهِ بِخَبَرٍ مُخْتَلَفٍ فِيهِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ زَجَرَ عَنْ هَذَا الْفِعْلِ الَّذِي ادَّعَتْهُ هَذِهِ الْفِرْقَةُ فِي خَبَرِ عَائِشَةَ الَّذِي ذَكَرْنَا أَنَّهُ مُخْتَلَفٌ فِيهِ عَنْهَا، وَأَعْلَمَ أَنَّهُ فِعْلُ فَارِسَ وَالرُّومِ بِعُظَمَائِهَا، يَقُومُونَ وَمُلُوكُهُمْ قُعُودٌ، وَقَدْ ذَكَرْنَا هَذَا الْخَبَرَ فِي مَوْضِعِهِ، فَكَيْفَ يَجُوزُ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَا قَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الزَّجْرِ عَنْهُ اسْتِنَانًا بِفَارِسَ وَالرُّومِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَصِحَّ عَنْهُ ﷺ الْأَمْرُ بِهِ وَإِبَاحَتُهُ بَعْدَ الزَّجْرِ عَنْهُ؟ وَلَا خِلَافَ بَيْنَ أَهْلِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَخْبَارِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ صَلَّى قَاعِدًا وَأَمَرَ الْقَوْمَ بِالْقُعُودِ، وَهُمْ قَادِرُونَ عَلَى الْقِيَامِ، لَوْ سَاعَدَهُمُ الْقَضَاءُ، وَقَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَأْمُومِينَ بِالِاقْتِدَاءِ بِالْإِمَامِ وَالْقُعُودِ إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِدًا، وَزَجَرَ عَنِ الْقِيَامِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِدًا، وَاخْتَلَفُوا فِي نَسْخِ ذَلِكَ، وَلَمْ يَثْبُتْ خَبَرٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ بِنَسْخِ مَا قَدْ صَحَّ عَنْهُ ﷺ مِمَّا ذَكَرْنَا مِنْ فِعْلِهِ وَأَمْرِهِ، فَمَا صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَاتَّفَقَ أَهْلُ الْعِلْمِ عَلَى صِحَّتِهِ يَقِينٌ، وَمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَلَمْ يَصِحَّ فِيهِ خَبَرٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ شَكٌّ، وَغَيْرُ جَائِزٍ تَرْكُ الْيَقِينِ بِالشَّكِّ، وَإِنَّمَا يَجُوزُ تَرْكُ الْيَقِينِ بِالْيَقِينِ. فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ غَيْرُ مُنْعِمِ الرَّوِيَّةِ: كَيْفَ يَجُوزُ أَنْ يُصَلِّيَ قَاعِدًا مَنْ يَقْدِرُ عَلَى الْقِيَامِ؟ قِيلَ لَهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ: يَجُوزُ ذَلِكَ أَنْ يُصَلِّيَ بِأَوْلَى الْأَشْيَاءِ أَنْ يَجُوزَ بِهِ، وَهِيَ سُنَّةُ النَّبِيِّ ﷺ، أَمَرَ بِاتِّبَاعِهَا، وَوَعَدَ الْهُدَى عَلَى اتِّبَاعِهَا، فَأَخْبَرَ أَنَّ طَاعَتَهُ ﷺ طَاعَتُهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَقَوْلُهُ كَيْفَ يَجُوزُ لِمَا قَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الْأَمْرُ بِهِ، وَثَبَتَ فِعْلُهُ لَهُ - بِنَقْلِ الْعَدْلِ عَنِ الْعَدْلِ مَوْصُولًا إِلَيْهِ بِالْأَخْبَارِ الْمُتَوَاتِرَةِ - جَهْلٌ مِنْ قَائِلِهِ

---

(١) إسناده صحيح.

وَقَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ جَمِيعِ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْأَخْبَارِ الْأَمْرُ بِالصَّلَاةِ قَاعِدًا إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِدًا، وَثَبَتَ عِنْدَهُمْ أَيْضًا أَنَّهُ ﷺ صَلَّى قَاعِدًا بِقُعُودِ أَصْحَابِهِ لَا مَرَضَ بِهِمْ، وَلَا بِأَحَدٍ مِنْهُمْ. وَادَّعَى قَوْمٌ نَسْخَ ذَلِكَ، فَلَمْ تَثْبُتْ دَعْوَاهُمْ بِخَبَرٍ صَحِيحٍ لَا مُعَارِضَ لَهُ، فَلَا يَجُوزُ تَرْكُ مَا قَدْ صَحَّ مِنْ أَمْرِهِ ﷺ، وَفِعْلِهِ فِي وَقْتٍ مِنَ الْأَوْقَاتِ، إِلَّا بِخَبَرٍ صَحِيحٍ عَنْهُ، يَنْسَخُ أَمْرَهُ ذَلِكَ وَفِعْلَهُ. وَوُجُودُ نَسْخِ ذَلِكَ بِخَبَرٍ صَحِيحٍ مَعْدُومٌ، وَفِي عَدَمِ وُجُودِ ذَلِكَ بُطْلَانُ مَا ادَّعَتْ، فَجَازَتِ الصَّلَاةُ قَاعِدًا إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِدًا اقْتِدَاءً بِهِ عَلَى أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ وَفِعْلِهِ، وَاللَّهُ الْمُوَفِّقُ لِلصَّوَابِ.

**واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂، ئەبو بەکر نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد پێغەمبەری خواش ﷺ لە ڕیزەکەی پشتیەوە بوو.**

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەیەکی تەواو نەهاتووە سەبارەت بەوەی پێغەمبەر ﷺ لەو نەخۆشییەی کە پێیەوە کۆچی دوایی کرد لەو نوێژەی کە تیایدا دانیشتبوو پێشنوێژ بووبێت و خەڵکەکەیش بەپێوە بن، چونکە لە فەرموودەکەی مەسرووق و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا لە عائیشەوە (فەرموودەی ژمارە ١٦١٩ - ١٦٢٠ -١ ١٦٢١) هاتووە: ئەبو بەکر پێشنوێژ بووە و پێغەمبەریش ﷺ نوێژخوێن بوو، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەکەی هیشامە لە باوکی لە عائیشەوە، وە فەرموودەکەی ئەسوەد لە عائیشەوە (فەرموودەی ژمارە ١٦١٧)، بەڵام شوعبەی کوڕی حەجاج ڕوونی کردۆتەوە لە ڕیوایەتەکەیدا لە ئەعمەش لە ئەسوەد لە عائیشەوە (فەرموودەی ژمارە ١٦١٧-١٦١٨) دەڵێ: هەندێ لە خەڵکەکە دەڵێ: ئەبو بەکر لە پێشەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هەندێکیشیان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوەی ئەبو بەکر بوو. جا ئەگەر ئەو کەسەی وا گومان دەبات ئەو کردەوەی پێغەمبەرە ﷺ کە لە ئەسپەکە کەوتە خوارەوە و فەرمانی کرد بە نوێژخوێنان شوێنی پێشەواکانیان بکەون و (ئەگەر پێشەواکان دانیشتن) ئەوانیش دابنیشن لەنێو نوێژ حوکمەکەی هەڵوەشێنرابێتەوە (نەسخ کرابێتەوە) تەواو نییە لە ڕووی گواستنەوە وە (النَّقْلِ)، بۆیە دروست نییە بۆ هیچ زانایەك بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی دەقێك بکات کە بە فەرموودەی (الْمُتَوَاتِر) و بە چەندین سەنەدی ڕاست و دروست هاتووە بە کرداری پێغەمبەر ﷺ و فەرمانکردنیشی بە فەرموودەیەك جیاوازی تێدایە، لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لەو کردەوەی کە ئەم کۆمەڵە بانگەشەی بۆ دەکەن لە فەرموودەکەی عائیشە کە

باسمان کرد ئەو فەرموودە جیاوازی تێدایە، وە ڕایگەیاندووە ئەوە کردەوەی فارس و ڕۆمەکانە بەرانبەر بە گەورەکانیان، (واتە: نوێژخوێن بەپێوە نوێژ بکات و پێشنوێژ بەدانیشتنەوە) ئەوان بەپێوە دەوەستان پاشاکانیشیان دادەنیشتن، ئەم فەرموودەمان لە شوێنی خۆیدا باس کرد (فەرموودەی ژمارە ١٦١٥)، ئیدی چۆن دروستە فەرمان بە شتێك بکرێ کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە، وەکوو شوێنکەوتنی فارس و ڕومەکان، بەبێ ئەوەی بەڕاست و دروستی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێت دوای سەرزەنشتکردنی ڕێگەی پێدابێت؟ هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان شارەزایان کە پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد و فەرمانیشی کرد بە خەڵکەکە بە دانیشتنەوە نویژ بکەن، لە کاتێکدا ئەوان توانایان هەبوو لەسەر وەستان بەپێوە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە نوێژخوێنان شوێنی پێشنوێژ بکەون، وە دانیشن ئەگەر پێشنوێژ دانیشت، وە سەرزەنشتی کردووە لە وەستان لەنێو نوێژ ئەگەر پێشنوێژ دانیشتبوو، وە جیاوازییان هەیە لە هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ئەوە، فەرموودەیەکیش نەهاتووە لە ڕووی گواستنەوە و جێگیر بێت بە هەڵوەشاندنەوە ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەڕاست و دروستی هاتووە لە کرداری و فەرمانی، هەر فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەتەواوی هاتبێت زانایان یەکدەنگ بووبن لەسەر تەواوی و ڕاست و دروستی، ئەوە دڵنیاییە، لە هەر فەرموودەیەکیش جیاوازییان هەبێت و فەرموودەیەکی تەواو دروست لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتبێت، ئەوە گومانە، دروست نییە واز لە دڵنیایی بهێنرێ بە گومان، بەڵکوو دروستە واز لە دڵنیایی بهێنرێ بە دڵنیایی، ئەگەر کەسێك شارەزای ڕیوایەت نەبوو وتی: چۆن دەبێت کەسێك توانای هەبێت بەپێوە بوەستێ و بە دانیشتنەوە نوێژ بکات؟ پێی دەوترێ بە ویستی خوا: دروستە چونکە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی و بەڵێنی هیدایەتی داوە لەسەر شوێنکەوتنی، هەواڵی داوە گوێڕایەڵیکردنی ئەو ﷺ گوێڕایەڵی خوایە ﷻ، وە ئەگەر بڵێ: چۆن دروستە، لە کاتێکدا بە ڕاست و دروستی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە -بە گواستنەوەی کەسی دادپەروەر لە کەسی دادپەروەر و گەیەنراوە بە پێغەمبەر ﷺ بە فەرموودەی (الْمُتَوَاتِرَ) فەرمانی پێ کردووە و بە کردەوەش کردوویەتی - نەفامییە لە خاوەنەکەیەوە، چونکە بێگومان لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە بە تەواوی و ڕاست

و دروستی لەلای هەموو زانایانی فەرموودەناس، فەرمانی کردووە نوێژخوێن بە دانیشتنەوە نوێژ بکات ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، بەهەمان شێوە لەلایان جێگیر بووە پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد هاوەڵەکانیشی بە دانیشتنەوە و نەخۆش نەبوون، خەڵکێك بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ئەوە دەکەن، بانگەشەکەیان جێگیر نەبووە بە فەرموودەیەکی تەواو فەرموودەکەیەکی دیکە دژی نەبێت، دروست نییە لە کاتێك لە کاتەکان واز لە فەرمانێکی پێغەمبەر ﷺ و کردارێکی بهێنرێ مەگەر بە فەرموودەیەکی تەواو لە ئەوەوە، فەرمان و کردەوەکەی هەڵبووەشێنێتەوە. وە بوونی هەڵوەشاندنەوەی ئەو فەرموودە بە فەرموودەیەکی ڕاست و دروست بوونی نییە، وە لە نەبوونی فەرموودەیەکی ڕاست و دروست بەتاڵ و پووشی ئەو بانگەشەیە دەردەخات، بۆیە نوێژکردن بە دانیشتنەوە دروستە ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، وەکوو شوێنکەوتنی، لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و کردارەکانی، خوا یارمەتیدەرە بۆ ڕاستییەکان.

## بَابُ إِدْرَاكِ الْمَأْمُومِ الْإِمَامَ سَاجِدًا، وَالْأَمْرِ بِالِاقْتِدَاءِ بِهِ فِي السُّجُودِ، وَأَنْ لَا يَعْتَدَّ بِهِ إِذِ الْمُدْرِكِ لِلسَّجْدَةِ إِنَّمَا يَكُونُ بِإِدْرَاكِ الرُّكُوعِ قَبْلَهَا

**١٦٢٢-** عَنْ يَحْيَى بْن أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي الْعِتَابِ وَابْنُ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جِئْتُمْ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا، وَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا، وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ، فَإِنِّي كُنْتُ لَا أَعْرِفُ يَحْيَى بْنَ أَبِي سُلَيْمَانَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: نَظَرْتُ فَإِذَا أَبُو سَعِيدٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ قَدْ رَوَى عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ هَذَا أَخْبَارًا ذَوَاتَ عَدَدٍ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ فَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي بَيَّنْتُ فِي مَوَاضِعَ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْعَرَبَ تَنْفِي الِاسْمَ عَنِ الشَّيْءِ لِنَقْصِهِ عَنِ الْكَمَالِ وَالتَّمَامِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنْ صَحَّ عَنْهُ الْخَبَرُ، أَرَادَ

---

(١) إسناده ضعيف.

بِقَوْلِهِ: فَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا: أَيْ: لَا تَعُدُّوهَا سَجْدَةً تُجْزِئُ مِنْ فَرْضِ الصَّلَاةِ، لَمْ يُرِدْ: لَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا، لَا فَرْضًا وَلَا تَطَوُّعًا.

**باسی کاتێ نوێژخوێن دەگات بە پێشنوێژ لە سوژدەدا، فەرمان کراوە شوێنی بکەوێت لە سوژدەدا، وە نابێت ئەو سوژدەیە بە ڕکاتێك حیساب بکات، چونکە کاتێك سوژدەکەی بۆ ئەژمار دەکرێت کە فریای ڕکووعەکە بکەوێت پێش سوژدەکە**

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو سولەیمان دەگێڕێتەوە لە یەزیدی کوڕی ئەبو عەتاب و ئیبنو مەقبوری لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هاتن ئێمە لە سوژدەدا بووین، ئێوەیش سوژدە ببەن، ئەو سوژدە بە هیچ مەژمێرن، (واتە: لەگەڵی سوژدە ببەن و بە ڕکاتێك مەیژمێرن) هەر کەسێکیش گەیشت بە ڕکاتێکدا ئەوە گەیشتووە بە نوێژدا.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە، چونکە من نازانم یەحیای کوڕی ئەبو سولەیمان دادپەروەرە یان لەکەدارە.

ئەبو بەکر دەڵێ: تەماشام کرد بینیم ئەبو سەعید مەولای نەوەکانی هیشام چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە یەحیای کوڕی ئەبو سولەیمان.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (فَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا)، لەو شێوازەیە کە لە چەندین شوێنی کتێبەکەماندا ڕوونمان کردۆتەوە بێگومان عەرەب خودی شتەکە ڕەت دەکاتەوە لەبەر ئەوەی کەموکوڕی تێدایە و تەواو نییە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت پێغەمبەریش ﷺ مەبەستی لە وتەکەی: (فَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا)، واتە: بە ڕکاتێکی فەڕز حیسابی مەکەن، مەبەستی: (فَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا)، ئەوە نەبووە نە بە فەڕز حیسابی بۆ بکەن نە بە زیادە.

**بَابُ إِجَازَةِ الصَّلَاةِ الْوَاحِدَةِ بِإِمَامَيْنِ أَحَدُهُمَا بَعْدَ الْآخَرِ مِنْ غَيْرِ حَدَثِ الْأَوَّلِ، إِذَا تَرَكَ الْأَوَّلُ الْإِمَامَةَ بَعْدَ مَا قَدْ دَخَلَ فِيهَا، فَيَتَقَدَّمُ الثَّانِي فَيُتِمُّ الصَّلَاةَ مِنَ الْمَوْضِعِ الَّذِي كَانَ انْتَهَى إِلَيْهِ الْأَوَّلُ، وَإِجَازَةِ صَلَاةِ الْمُصَلِّي يَكُونُ إِمَامًا فِي بَعْضِ الصَّلَاةِ مَأْمُومًا فِي بَعْضِهَا، وَإِجَازَةِ ائْتِمَامِ الْمَرْءِ بِإِمَامٍ قَدْ تَقَدَّمَ افْتِتَاحَ الْمَأْمُومِ الصَّلَاةَ قَبْلَ إِمَامِهِ**

**١٦٢٣-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، فَحَانَتِ الصَّلَاةُ، وَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: أَتُصَلِّي بِالنَّاسِ فَأُقِيمَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ فِي الصَّلَاةِ، فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ، فَصَفَّقَ النَّاسُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لَا يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنِ امْكُثْ مَكَانَكَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَيْهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذْ أَمَرْتُكَ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمُ التَّصْفِيقَ؟» مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ؛ فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ. هَذَا حَدِيثُ يُونُسَ بْنِ عَبْدِ الْأَعْلَى[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا سُبِّحَ بِهِ فَجَائِزٌ لَهُ أَنْ يَلْتَفِتَ إِلَى الْمُسَبِّحِ لِيَعْلَمَ الْمُصَلِّي الَّذِي نَابَ الْمُسَبِّحَ، فَيَفْعَلَ مَا يَجِبُ عَلَيْهِ.

**باسی ڕێگە دراوە یەك نوێژ بە دوو پێشنوێژ ئەنجام بدرێ، یەكێكیان بە دوای ئەودا بێت بەبێ ئەوەی یەكەم بێ دەستنوێژ بوو بێت، ئەگەر یەكەم وازی لە پێشنوێژی هێنا دوای ئەوەی كە چووەتە نێویەوە، دووەم پێش بكەوێت و نوێژەكەی تەواو بكات لەو جێگایەی یەكەم كۆتایی پێهێنا، دروستە بۆ نوێژخوێن لە بەشێك لە نوێژەكەی پێشنوێژ بێت و لە بەشێكی دیكەشی نوێژخوێن، دروستە بەندە شوێنی نوێژخوێنێك بكەوێت كە نوێژی دابەستووە پێش پێشنوێژەكەی**

واتە: سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ نێو نەوەكانی عەمری كوڕی عەوف بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوانیانەوە، (بەهۆی ئەوەی كێشەیەك كەوتبووە نێوانیان) كاتی نوێژ هات، بانگبێژ هات بۆ لای ئەبو بەكر وتی: ئایا نوێژ دەكەی بۆ خەڵكەكە قامەتت بۆ بكەم؟ وتی: بەڵێ، ئەبو بەكر نوێژی كرد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هات خەڵكەكەیش لەنێو نوێژدا بوون لە ڕیزەكەدا وەستا، خەڵكەكە چەپڵەیان لێدا، ئەبو بەكر لە نوێژدا لای نەدەكردەوە، بەڵام كاتێ زۆربەی خەڵكەكە چەپڵەیان لێدەدا، لای كردەوە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی

---

(١) صحيح.

(ویستی بێته دواوه)، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کرد لە جێگای خۆت بمێنەرەوە، ئەبو بەکر دەستەکانی بەرز کردەوە و سوپاسی خوای کرد لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد، ئینجا ئەبو بەکر هاتە دواوە تا لەگەڵ ڕیزەکەدا ڕێك بۆیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێشکەوت و نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تەواو کرد، فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر چی ڕێگری لێ کردی لە شوێنی خۆت نەمایتەوە کاتێ من فەرمانم پێ کردی؟ ئەبو بەکر وتی: بۆ کوڕەکەی ئەبو قوحافە نییە لە پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بکات، پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو: ئەوە چییە بینیم زۆر چەپڵەتان لێدا؟ ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی بۆ دروست بوو لەنێو نوێژەکەیدا، با (سبحان الله) بکات، چونکە ئەگەر (سبحان الله)ی کرد لای لێ دەکرێتەوە، بێگومان چەپڵە بۆ ئافرەتانە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژخوێن ئەگەر (سبحان الله)ی بۆ کرا دروستە بۆی ئاوڕ بداتەوە لەوکەسەی (سبحان الله)ی بۆی کردووە، تا نوێژخوێن بزانێ بۆچی (سبحان الله)ی بۆ کراوە، ئەوەی پێویستە لەسەری ئەنجامی بدات.

## بَابُ اسْتِخْلَافِ الْإِمَامِ الْأَعْظَمِ فِي الْمَرَضِ بَعْضَ رَعِيَّتِهِ لِيَتَوَلَّى الْإِمَامَةَ بِالنَّاسِ

**١٦٢٤-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ قَالَ: مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟» قُلْنَا: نَعَمْ قَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟» قُلْنَا: نَعَمْ قَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّ أَبِي رَجُلٌ أَسِيفٌ، فَلَوْ أَمَرْتَ غَيْرَهُ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟» قُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، قَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّ أَبِي رَجُلٌ أَسِيفٌ، فَلَوْ أَمَرْتَ غَيْرَهُ، فَقَالَ: إِنَّكُنَّ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ، مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَمَرُوا بِلَالًا فَأَذَّنَ، وَأَقَامَ، وَأَمَرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ؟» قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: جِيئُونِي بِإِنْسَانٍ أَعْتَمِدُ عَلَيْهِ، فَجَاءُوا بِبَرِيرَةَ، وَرَجُلٍ آخَرَ، فَاعْتَمَدَ عَلَيْهِمَا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَأُجْلِسَ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، فَذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَنَحَّى، فَأَمْسَكَهُ حَتَّى فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی پێشەوای گەورەی مسوڵمان کاتێ نەخۆش بوو دروستە کەسێك لە خەڵکەکەی بسپێرێ بۆ ئەوەی پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات

واتە: سالمی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت، دواتر بێهۆش کەوت، پاشان بەهۆشی خۆی هاتەوە فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: فەرمان بە بیلال بکەن با بانگ بدات، وە فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، پاشان بێهۆش بوو، پاشان بەهۆشی خۆی هاتەوە فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: فەرمان بە بیلال بکەن با بانگ بدات، وە فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، پاشان بێهۆش بوو، پاشان بەهۆشی خۆی هاتەوە، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، خۆزگە فەرمانت بە کەسێکی دیکە بکردایە، پاشان بەهۆشی خۆی هاتەوە، فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: فەرمان بە بیلال بکەن با بانگ بدات، وە فەرمان بە ئەبو بەکر بەکەن پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، عائیشە وتی: بەڕاستی باوکم کەسێکی دڵناسکە، خۆزگە فەرمانت بە کەسێکی دیکە بکردایە، فەرمووی: ئێوە وەکوو ئافرەتانی دەوروبەری یوسفن، فەرمان بە بیلال بکەن با بانگ بدات، وە فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، پاشان بێهۆش کەوت، فەرمانیان کرد بیلال بانگی دا و قامەتی نوێژی کرد، وە فەرمانیان کرد بە ئەبو بەکر نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، پاشان بەهۆشی خۆی هاتەوە، فەرمووی: قامەت بۆ نوێژ کرا؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: کەسێکم بۆ بێنن شان لەسەری دانێم، بەریڕەیان بۆی هێنا لەگەڵ پیاوێکی دیکە شانی لەسەریان دانا، پاشان دەرچوو بۆ نوێژ، لە تەنیشتی ئەبو بەکر دانیشێنرا، ئەبو بەکر هاتە دواوە، ئەویش ﷺ گرتی تا نوێژەکەی تەواو کرد.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِخْلَافِ الْإِمَامِ عِنْدَ الْغَيْبَةِ عَنْ حَضْرَةِ الْمَسْجِدِ الَّذِي هُوَ إِمَامُهُ عِنْدَ الْحَاجَةِ تَبْدُو لَهُ

١٦٢٥- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ وَخُرُوجِهِ إِلَى بَنِي عَمْرٍو لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ قَالَ لِبِلَالٍ: إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَلَمْ آتِ فَمُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ[١].

## باسی پێشنوێژ ئەگەر کارێکی هەبوو دوور کەوتەوە لە مزگەوت کەسێکی دیکە لە جێگای خۆ دادەنێ

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعد ﷺ هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ) کاتێ دەرچوو بۆ لای نەوەکانی عەمر بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوانیان، بە بیلالی فەرموو: ئەگەر کاتی نوێژ هات و من نەهاتمەوە فەرمان بکە بە ئەبو بەکر با نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِاقْتِدَاءِ بِالْمُصَلِّي الَّذِي يَنْوِي الصَّلَاةَ مُنْفَرِدًا، وَلَا يَنْوِي إِمَامَةَ الْمُقْتَدِي بِهِ

١٦٢٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ لَنَا حَصِيرٌ نَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ، وَيَتَحَجَّرُهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَيُصَلِّي فِيهِ، فَتَتَبَّعَ لَهُ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، فَعَلِمَ بِهِمْ، فَقَالَ: اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ؛ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَكَانَ أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَيْهِ مَا دِيمَ عَلَيْهِ وَإِنْ قَلَّ، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژدابەستن لەپشت کەسێکەوە تەنها نوێژی بۆ خۆی دابەستێت، نییەتی ئەوەشی نەبێ کەسێك لەگەڵی نوێژ دادەبەستێ

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: حەسیرێکمان هەبوو بە ڕۆژ ڕامان دەخست، بە شەویش پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد بە ژوورێك و نوێژی تێدا دەکرد، خەڵکانێك لە موسوڵمان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

دەچوون بۆ لای (پێغەمبەر ﷺ) ولە پشتیەوە نوێژیان دەكرد، پێی زانین و فەرمووی: هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە كردەوە ئەنجامی بدەن، چونكە بەڕاستی خوا بێزار نابێ تا ئێوە بێزار دەبن، وە چاكترین كردەوە لە لای خوا بەردەوامبوونە لەسەری ئەگەرچی كەمیش بێت، وە ئەگەر نوێژێكی بكردایە جێگیری دەكرد.

**١٦٢٧-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي بَعْضِ حُجَرِهِ، فَجَاءَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِمَكَانِهِمْ تَجَوَّزَ فِي صَلَاتِهِ، ثُمَّ دَخَلَ الْبَيْتَ فَصَلَّى مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ خَرَجَ، فَعَلَ ذَلِكَ مِرَارًا، فَلَمَّا أَصْبَحُوا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَلَّيْنَا بِصَلَاتِكَ اللَّيْلَةَ وَنَحْنُ نُحِبُّ أَنْ تَبْسُطَ قَالَ: عَمْدًا فَعَلْتُ ذَلِكَ(١).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە یەكێك لە ژوورەكانی نوێژی كرد، خەڵكانێك لە موسوڵمانان هاتن لە پشتیەوە نوێژیان دابەست، كاتێ هەستی كرد بەوەی شوێنەكەیان تەنگە نوێژەكەی زوو تەواو كرد، پاشان چووە ماڵەوە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت نوێژی كرد، پاشان هاتە دەرەوە، چەند جارێك ئەوەی كرد، كاتێ ڕۆژیان كردەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم شەو لەپشت تۆوە نوێژمان كرد پێمان خۆش بوو درێژی بكەیتەوە، فەرمووی: بەئەنقەست ئەوەم كرد.

## بَابُ افْتِتَاحِ غَيْرِ الطَّاهِرِ الصَّلَاةَ نَاوِيًا الْإِمَامَةَ وَذِكْرُهُ أَنَّهُ غَيْرُ طَاهِرٍ بَعْدَ الِافْتِتَاحِ، وَتَرْكُهُ الِاسْتِخْلَافَ عِنْدَ ذَلِكَ لِيَنْتَظِرَ الْمَأْمُومُونَ رُجُوعَهُ بَعْدَ الطَّهَارَةِ فَيَؤُمُّهُمْ

**١٦٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ قِيَامًا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلَّاهُ ذَكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ، فَأَوْمَأَ إِلَيْنَا وَقَالَ: مَكَانَكُمْ، ثُمَّ دَخَلَ فَاغْتَسَلَ فَخَرَجَ فَصَلَّى بِنَا(٢).

**باسی پێشنوێژ بەلەشگرانی نوێژ بۆ خەڵك دابەستێت، دوای نوێژ دابەستن بیری بكەوێتەوە لەشی گرانە، هیچ كەسێك لە جێگای خۆی دانەنێت تا نوێژخوێنەكان چاوەڕوانی گەڕانەوەی بكەن، دوای خۆشۆردنی دێتەوە پێشنوێژییان بۆ دەكات**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: قامەتی نوێژ کرا و ڕیزەکان ڕێك خران بەپێوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ نێومان، کاتێ لە شوێنی نوێژەکەی وەستا بیری کەوتەوە لەشی گرانە، ئاماژەی بۆ کردین و فەرمووی: لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، پاشان چووە ژوورەوە خوی شۆرد و هاتە دەرەوە، ئینجا نوێژی بۆ کردین.

**١٦٢٩-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ أَوْمَأَ إِلَيْهِمْ أَنْ مَكَانَكُمْ، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَصَلَّى بِهِمْ[١].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دابەست پاشان (بیری کەوتەوە کە بێدەستنوێژە بۆیە) ئاماژەی بۆ کردن لە جێگای خۆتان بمێننەوە، پاشان چووە ژوورەوە، پاشان هاتە دەرەوە سەری ئاوی لی دەتکا، ئینجا نوێژی بۆ کردن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي خُصُوصِيَّةِ الْإِمَامِ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَ الْمَأْمُومِينَ خِلَافَ الْخَبَرِ غَيْرِ الثَّابِتِ الْمَرْوِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ قَدْ خَانَهُمْ إِذَا خَصَّ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَهُمْ

**١٦٣٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ سَكَتَ هُنَيْهَةً، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِأَبِي وَأُمِّي، مَا تَقُولُ فِي سُكُوتِكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ؟ قَالَ: أَقُولُ: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ»[٢].

## باسی مۆڵەتدان لەوەی پێشنوێژ بەتایبەت بۆ خۆی بپاڕێتەوە جگە لە نوێژخوێنەکان، پێچەوانەی ئەو فەرموودەی کە نەچەسپاوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: (أَنَّهُ قَدْ خَانَهُمْ إِذَا خَصَّ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَهُمْ)، واتە: ئەگەر بەتایبەت بۆ خۆی بپاڕێتەوە جگە لە نوێژخوێنەکان ئەوە خیانەتی لێکردوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی بکردایە بۆ دابەستنی نوێژ، کەمێك بێدەنگ دەبوو، وتم: باوکم و دایکم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بێدەنگبوونت لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی دابەستنی نوێژ و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لە نێوان قورئانخوێندندا چی دەڵێی؟ فەرمووی: ئەڵێم: خوایە نێوانی من و هەڵەکانم دوور بخەرەوە، وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستووەتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە هەڵەکانم وەکوو چۆن جلی سپی پاك دەکرێتەوە لە پیسی، خوایە بمشۆرە لە هەڵەکان بە بەفر و ئاو و تەرزە.

**١٦٣١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ فِي افْتِتَاحِ النَّبِيِّ ﷺ الصَّلَاةَ مِنْ هَذَا الْبَابِ. وَهَذَا بَابٌ طَوِيلٌ، قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ لە دابەستنی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لەم بەشەیە. ئەوەش بەشێکی دووردرێژە لە کتێبی (الْكَبِير) باسم کردووە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ جَمَاعَةً فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي قَدْ جُمِعَ فِيهِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُمْ يُصَلُّونَ فُرَادَى إِذَا صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ جَمَاعَةً مَرَّةً

**١٦٣٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّكُمْ يَتَّجِرُ عَلَى هَذَا؟» قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَصَلَّى مَعَهُ[2].

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژکردن بەکۆمەڵ لەنێو ئەو مزگەوتەی کە بەکۆمەڵ نوێژی تێدا دەکرێ، بەپێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات ئەگەر یەك جار بەکۆمەڵ نوێژ کرا دەبێت بەتەنها نوێژ بکەن

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کردبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کامەتان بازرگانی بەسەر ئەو پیاوەدا دەکات (واتە: نوێژی لەگەڵ دەکات بەکۆمەڵ)؟ وتی: پیاوێك لە خەڵکەکە هەستا لەگەڵی نوێژی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ ائْتِمَامِ الْمُصَلِّي فَرِيضَةً بِالْمُصَلِّي نَافِلَةً، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ مِنَ الْعِرَاقِيِّينَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَأْتَمَّ الْمُصَلِّي فَرِيضَةً بِالْمُصَلِّي نَافِلَةً

**١٦٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلَاةَ[١].

## باسی ڕێگه دراوە ئەو کەسەی نوێژی فەڕز دەکات لەپشت ئەو کەسەوە نوێژ دابەستێت کە نوێژی سوننەت دەکات، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات لە عێراقییەکان دروست نییە ئەو کەسەی نوێژی فەڕز دەکات لەپشت ئەو کەسەوە نوێژ دابەستێت کە نوێژی سوننەت دەکات

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە و پێشنوێژی بۆ قەومەکەی دەکرد.

**١٦٣٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ، فَرَجَعَ ذَاتَ يَوْمٍ فَصَلَّى بِهِمْ، وَصَلَّى خَلْفَهُ فَتًى مِنْ قَوْمِهِ، فَلَمَّا طَالَ عَلَى الْفَتَى صَلَّى وَخَرَجَ، فَأَخَذَ بِخِطَامِ بَعِيرِهِ، وَانْطَلَقُوا، فَلَمَّا صَلَّى مُعَاذٌ ذُكِرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَنِفَاقٌ، لَأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ مُعَاذٌ بِالَّذِي صَنَعَ الْفَتَى، فَقَالَ الْفَتَى: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يُطِيلُ الْمُكْثَ عِنْدَكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُطَوِّلُ عَلَيْنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفَتَّانٌ أَنْتَ يَا مُعَاذُ؟»، وَقَالَ لِلْفَتَى: كَيْفَ تَصْنَعُ يَا ابْنَ أَخِي إِذَا صَلَّيْتَ؟ قَالَ: أَقْرَأُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَأَسْأَلُ اللَّهُ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، وَإِنِّي لَا أَدْرِي، مَا دَنْدَنَتُكَ وَدَنْدَنَةُ مُعَاذٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي وَمُعَاذٌ حَوْلَ هَاتَيْنِ أَوْ نَحْوَ ذِي»، قَالَ: قَالَ الْفَتَى: وَلَكِنْ سَيَعْلَمُ مُعَاذٌ إِذَا قَدِمَ الْقَوْمُ وَقَدْ خَبَرُوا أَنَّ الْعَدُوَّ قَدْ دَنَوْا قَالَ: فَقَدِمُوا قَالَ: فَاسْتُشْهِدَ الْفَتَى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ لِمُعَاذٍ: «مَا فَعَلَ خَصْمِي وَخَصْمُكَ؟» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَدَقَ اللَّهَ، وَكَذَبْتُ، اسْتُشْهِدَ[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خەوتنانی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە نوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ڕۆژێك گەڕایەوە نوێژی بۆ كردن، گەنجێكیش لە قەومەكەی لە پشتیەوە نوێژی كرد، كاتێ نوێژەكەی درێژ كردەوە گەنجەكە نوێژی كرد و دەرچوو ڕەشمەی وشترەكەی گرت، كاتێ موعاز نوێژی كرد ئەوەی بۆ باس كرا، وتی: بەڕاستی ئەوە دووڕووە، پێغەمبەری خوای ﷺ لێ ئاگادار دەكەمەوە، دواتر هەواڵی پێدا بەوەی ئەو گەنجە كردی، گەنجەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زۆر لەلای تۆ دەمێنێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناومان نوێژەكەی لەسەرمان درێژ دەكاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا تۆ دەتەوێ ببیتە مایەی فیتنە ئەی موعاز، بە گەنجەكەیشی فەرموو: ئەی برازام كاتی نوێژ دەكەی چی دەڵێی؟ وتی: سوڕەتی فاتیحە دەخوێنم، پاشان داوای بەهەشت لە خوا دەكەم و پەنای پێ دەگرم لە ئاگر. بەڕاستی من نە لە نزای تۆ تێدەگەم نە لە نزای موعاز، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من و موعاز لە نێوانی ئەو دووانەدا نزا دەكەین. (واتە: لە نێوان داوای بەهەشت و پەناگرتن بە خوا لە ئاگر نزا دەكەین)، گەنجەكە وتی: لە داهاتوودا موعاز دەزانێ (من دووڕووم یان نا) كاتێ خەڵكەكە هاتن، جا هەواڵیان دا دوژمن نزیك بووەتەوە، خەڵكەكەیش هاتن، گەنجەكە شەهید كرا، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە بە موعازی فەرموو: ئەو گەنجەی ناكۆكی من و تۆ بوو چی كرد؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا ڕاستی فەرموو، منیش درۆم كرد، ئەو شەهید بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ مُعَاذًا كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَرِيضَةً لَا تَطَوُّعًا كَمَا ادَّعَى بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ

١٦٣٥- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ بِتَمَامِهَا، بَيَّنْتُ فِيهَا أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَنَّهُ صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ تَطَوُّعًا، وَصَلَّوْا خَلْفَهُ فَرِيضَةً لَهُمْ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ تَطَوُّعًا، وَلَهُمْ فَرِيضَةً.

## باسی ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەوەی موعاز لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی فەرزی دەكرد نەك سوننەت، وەكو بەشێك لە زانایانی عێراق بانگەشەی بۆ دەكەن

---

(١) صحيح.

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: موعاز لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خەوتنانی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە نوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم بابەتەم بەتەواوی باس کرد، تیایدا فەرموودەکانی پێغەمبەرم ﷺ ڕوون کردەوە دەربارەی نوێژی ترس، ئەو نوێژی سوننەتی کرد بە یەکێك لەو دوو کۆمەڵە، هاوەڵەکانیشی لە پشتیەوە نوێژی فەرزیان کرد، نوێژەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ بووە سوننەت بۆ ئەوانیش بوو بە فەرز.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ مُنْفَرِدًا عِنْدَ تَأْخِيرِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ جَمَاعَةً

**١٦٣٦-** عَنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعَلْقَمَةُ عَلَى ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَقَالَ: أَصَلَّى هَؤُلَاءِ خَلْفَكُمْ؟ قُلْنَا: لَا قَالَ: فَقُومُوا فَصَلُّوا، فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ خَلْفَهُ، فَأَخَذَ بِأَيْدِينَا وَأَقَامَ أَحَدَنَا عَنْ يَمِينِهِ، وَالْآخَرَ عَنْ شِمَالِهِ، فَصَلَّى بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ، فَجَعَلَ إِذَا رَكَعَ يُشَبِّكُ أَصَابِعَهُ، وَجَعَلَهَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: كَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهَا سَتَكُونُ أُمَرَاءُ يُمِيتُونَ الصَّلَاةَ، يَخْنِقُونَهَا إِلَى شَرَقِ الْمَوْتَى، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلْيُصَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، وَلْيَجْعَلْ صَلَاتَهُ مَعَهُمْ سُبْحَةً»[١].

### باسی فەرمانکردن بە ئەنجامدانی نوێژ بەتەنها کاتێ پێشنوێژ نوێژی دوا خست

واتە: ئەسوەد دەڵێ: من و عەلقەمە ڕۆیشتین بۆ لای ئیبنو مەسعود ﷺ وتی: ئایا ئەوانە نوێژیان کرد لە پشتتانەوە؟ وتمان نەخێر. وتی: هەستن نوێژ بکەن، هەستاین لە پشتیەوە نوێژ بکەین، دەستی هەردووکمانی گرت یەکێکمانی لای ڕاستی دانا و ئەوی دیکەش لەلای چەپی، نوێژی کرد بەبێ بانگ و قامەت، کاتێ ڕکووعی ببردایە پەنجەکانی دەکرد بەنێو یەکدا و دەیخستە نێوان هەردوو قاچی، وتی: کاتێ نوێژی کرد وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەمشێوەی دەکرد، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە لە داهاتوویەکی نزیکدا کۆمەڵە کاربەدەستێك پەیدا دەبن بەسەرتانەوە نوێژەکانیان لە کاتی خۆی هێند دوا دەخەن نزیك فەوتانی دەکەن (واتە: لە کاتی خۆیدا ئەنجامی نادەن)، هەر کەسێك لە ئێوە گەیشت بەو ڕۆژە، با لە کاتی خۆیدا نوێژەکەی بکات، وە با نوێژکردنەکەی بەکۆمەڵ لەگەڵیاندا بکات بە سوننەت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ جَمَاعَةً بَعْدَ أَدَاءِ الْفَرْضِ مُنْفَرِدًا عِنْدَ تَأْخِيرِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ، وَالْبَيَانِ أَنَّ الْأُولَى تَكُونُ فَرْضًا مُنْفَرِدًا، وَالثَّانِيَةَ نَافِلَةً فِي جَمَاعَةٍ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الصَّلَاةَ جَمَاعَةً هِيَ الْفَرِيضَةُ لَا الصَّلَاةُ مُنْفَرِدًا، وَالزَّجْرِ عَنْ تَرْكِ الصَّلَاةِ نَافِلَةً خَلْفَ الْإِمَامِ الْمُصَلِّي فَرِيضَةً، وَإِنْ أَخَّرَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا

**١٦٣٧-** عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ الْبَرَاءِ قَالَ: أَخَّرَ ابْنُ زِيَادٍ الصَّلَاةَ، فَأَتَانِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّامِتِ ﵁، فَأَلْقَيْتُ لَهُ كُرْسِيًّا، فَجَلَسَ عَلَيْهِ، فَذَكَرْتُ لَهُ صُنْعَ ابْنِ زِيَادٍ، فَعَضَّ عَلَى شَفَتَيْهِ، ثُمَّ ضَرَبَ يَدَهُ عَلَى فَخِذِي، وَقَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ أَبَا ذَرٍّ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَضَرَبَ فَخِذِي كَمَا ضَرَبْتُ فَخِذَكَ، وَقَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَضَرَبَ فَخِذِي، كَمَا ضَرَبْتُ فَخِذَكَ، وَقَالَ: «صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكَتْكَ مَعَهُمْ فَصَلِّ، وَلَا تَقُلْ: إِنِّي قَدْ صَلَّيْتُ فَلَا أُصَلِّي»[١].

## باسی فەرمانکردن بە نوێژی بەکۆمەڵ دوای ئەوەی بەتەنها نوێژەکەی کرد، کاتێ پێشنوێژ نوێژەکەی دوا خست، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی یەکەم نوێژ کە بەتەنها ئەنجامی داوە دەبێتە فەرز، دووەم نوێژیش کە بەکۆمەڵ کردوویەتی دەبێتە سوننەت، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات نوێژە بەکۆمەڵەکە دەبێتە فەرز نەك ئەو نوێژەی بەتەنها کردوویەتی، وە سەرزەنشتکردن لەوەی واز لە نوێژی سوونەت بهێنێ لەپشت پێشنوێژ کە نوێژی فەرز دەکات، ئەگەرچی نوێژی لە کاتی خۆی ئەنجام نەدا

واتە: ئەبو عالییەی بەڕاء دەڵێ: ئیبنو زیاد نوێژی دوا خست، عەبدوڵای کوڕی صامیت ﵁ هات بۆ لام کورسییەکم بۆی هێنا لەسەری دانیشت، ئەوەی زیاد کردی بۆیم باس کرد، لێوی خۆی گەست و دای بەسەر ڕانمدا و وتی: من پرسیارم کرد لە ئەبو زەڕ وەکوو چۆن پرسیارت لێ کردم، دای بەسەر ڕانمدا وەك چۆن دام بەسەر ڕانتدا، وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن پرسیارت لێ کردم، دای بەسەر ڕانمدا وەك چۆن دام بەسەر ڕانتدا، فەرمووی: لە کاتی خۆیدا نوێژەکانت ئەنجام بدە، ئەگەر دواتر بەوانیش گەشتی نوێژیان لەگەڵ بکە، مەڵێ: نوێژم کردووە نوێژ ناکەمەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الصَّلَاةِ جَمَاعَةً بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ مُنْفَرِدًا، فَتَكُونُ الصَّلَاةُ جَمَاعَةً لِلْمَأْمُومِ نَافِلَةً، وَصَلَاةُ الْمُنْفَرِدِ قَبْلَهَا فَرِيضَةً، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ: لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، نَهْيٌ خَاصٌّ لَا نَهْيٌ عَامٌّ

**١٦٣٨-** عَنْ يَزِيدِ بْنِ الْأَسْوَدِ الْعَامِرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَجَّتَهُ قَالَ: فَصَلَّيْتُ مَعَهُ صَلَاةَ الْفَجْرِ فِي مَسْجِدِ الْخَيْفِ يَعْنِي مَسْجِدَ مِنًى- فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ إِذَا هُوَ بِرَجُلَيْنِ فِي آخِرِ الْقَوْمِ وَلَمْ يُصَلِّيَا مَعَهُ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِهِمَا، فَأُتِيَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟ قَالَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كُنَّا قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا قَالَ: «فَلَا تَفْعَلَا إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا ثُمَّ أَتَيْتُمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ فَصَلِّيَا مَعَهُمْ، فَإِنَّهَا لَكُمْ نَافِلَةٌ»[1].

## باسی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بەتەنها، نوێژە بەکۆمەڵەکەش بۆ نوێژخوێن دەبێتە زیادە، ئەو نوێژەشی کە بەتەنها کردوویەتی دەبێتە فەرز. وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: نوێژ نییە دوای بەیانی تا خۆر دەکەوێت. قەدەغەکردنێکی تایبەتیە (خَاصٌّ) نەك قەدەغەکردنێکی گشتی (عَامٌّ)

واتە: یەزیدی کوڕی ئەسوەدی عامری رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی حەجکردنی بووم، وتی: لەگەڵیدا نوێژی بەیانیم کرد لە مزگەوتی (الْخَيْفِ)، واتە: لە مینا، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، دوو پیاو لە کۆتایی خەڵکەکەوە دانیشتبوون نوێژیان لەگەڵدا نەکرد، فەرمووی: ئەو دووانەم بۆ بانگ بکەن، هەردووکیانیان هێنا زۆر پەشۆکا بوون و ترسان، فەرمووی: چی ڕێگری لێکردن نوێژمان لەگەڵ نەکەن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە شوێنی خۆمان نوێژمان کرد. فەرمووی: شتی وا مەکەن، ئەگەر لە جێگاکانی خۆتان نوێژتان کرد، پاشان هاتن بۆ مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ دەکرا لەگەڵیاندا نوێژ بکەن، ئەوە بۆ ئێوە دەبێتە نوێژێکی زیادە.

---

(١) صحیح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ تَرْكِ الصَّلَاةِ جَمَاعَةً نَافِلَةً بَعْدَ الصَّلَاةِ مُنْفَرِدًا فَرِيضَةً

**١٦٣٩-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَيْفَ أَنْتَ إِذَا بَقِيتَ فِي قَوْمٍ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا؟ فَقَالَ لَهُ: صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِذَا أَدْرَكْتَهُمْ لَمْ يُصَلُّوا فَصَلِّ مَعَهُمْ، وَلَا تَقُلْ: إِنِّي قَدْ صَلَّيْتُ، فَلَا أُصَلِّي»[1].

## باسی قەدەغەکردن لەوەی واز لە نوێژی زیادە بهێنێ، بەکۆمەڵ دوای ئەوەی بەتەنها نوێژی فەرزی کرد

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ چی دەکەی ئەگەر لەنێو خەڵکێکدا مایتەوە نوێژیان دوا خست لە کاتی خۆی؟ (وتی: چی بکەم)؟ فەرمووی: لە کاتی خۆیدا نوێژەکەت بکە، ئەگەر پێیان گەیشتی نوێژیان نەکردبوو لەگەڵیاندا نوێژ بکەوە، مەڵێ من نوێژم کردووە، نوێژ ناکەم.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّلَاةَ الْأُولَى الَّتِي يُصَلِّيهَا الْمَرْءُ فِي وَقْتِهَا تَكُونُ فَرِيضَةً، وَالثَّانِيَة الَّتِي يُصَلِّيهَا جَمَاعَةً مَعَ الْإِمَامِ تَكُونُ تَطَوُّعًا، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الثَّانِيَة تَكُونُ فَرِيضَةً، وَالْأُولَى نَافِلَةً، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَ إِذَا أَخَّرَ الْعَصْرَ فَعَلَى الْمَرْءِ أَنْ يُصَلِّيَ الْعَصْرَ فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ يَتَنَفَّلُ مَعَ الْإِمَامِ، وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ: وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، نَهْيٌ خَاصٌّ لَا نَهْيٌ عَامٌّ

**١٦٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّكُمْ سَتُدْرِكُونَ أَقْوَامًا يُصَلُّونَ الصَّلَاةَ لِغَيْرِ وَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتُمُوهُمْ فَصَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ لِلْوَقْتِ الَّذِي تَعْرِفُونَ، ثُمَّ صَلُّوا مَعَهُمْ، وَاجْعَلُوهَا سُبْحَةً»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی یەکەم نوێژ کە بەندە لە ماڵی خۆی دەیکات لە کاتی خۆیدا نوێژە فەرزەکەیە، دووەم نوێژیش کە بەکۆمەڵ دەیکات لەگەڵ پێشنوێژ دەبێتە سوننەت، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات دووەم نوێژ دەبێتە فەرز و یەکەم دەبێتە زیادە، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێشنوێژ ئەگەر نوێژی عەسری دوا خست ئەوە پێویستە لەسەر بەندە نوێژی عەسر لە کاتی خۆیدا بکات، پاشان بەزیادە لەگەڵ پێشنوێژ ئەنجامی بدات، لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: نوێژ نییە دوای عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت، قەدەغەکردنێکی تایبەتە (خَاصٌّ) نەك قەدەغەکردنێکی گشتی (عَامٌّ)**

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێدەچێت ئێوە بگەن بە خەڵکانێك لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان نەکەن، ئەگەر پێیان گەیشتن، ئەوە لە ماڵی خۆتان لە کاتی خۆیدا نوێژەکەتان بکەن، پاشان لەگەڵ ئەوانیش نوێژ بکەن، ئەو نوێژە دەبێتە سوننەت.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِعَادَةِ الصَّلَاةِ عَلَى نيية الْفَرْضِ

**١٦٤١-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ مَوْلَى مَيْمُونَةَ قَالَ: أَتَيْتُ عَلَى ابْنَ عُمَرَ ﷺ وَهُوَ قَاعِدٌ عَلَى الْبَلَاطِ وَالنَّاسُ فِي الصَّلَاةِ، فَقُلْتُ: أَلَا تُصَلِّي؟ قَالَ: قَدْ صَلَّيْتُ، قُلْتُ: أَلَا تُصَلِّي مَعَهُمْ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تُصَلُّوا صَلَاةً فِي يَوْمٍ مَرَّتَيْنِ»[١].

**باسی قەدەغەکردن لە دووبارەکردنەوەی نوێژ بە نییەت و نیازی فەرز**

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار مەولای مەیمونە دەڵێ: هاتم بۆ لای ئیبنو عومەر ﷺ لە (الْبَلَاطِ) (بلاط: شوێنێکە نزیك مەدینە خەڵکی نوێژیان تێدا دەکرد) دانیشتبوو، خەڵکەکەیش نوێژیان دەکرد، وتم: ئایا نوێژ ناکەی؟ وتی: من نوێژم کردووە، وتم: ئایا نوێژ ناکەی لەگەڵیان؟ وتی: من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە ڕۆژێکدا دوو جار یەك نوێژی فەرز مەکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْمُدْرِكِ وِتْرًا مِنْ صَلَاةِ الْإِمَامِ، وَجُلُوسِهِ فِي الْوِتْرِ مِنْ صَلَاتِهِ اقْتِدَاءً بِالْإِمَامِ

**١٦٤٢-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ ﷺ يَقُولُ: عَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَعَدَلْتُ مَعَهُ، فَأَنَاخَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَبَرَّزُ، فَسَكَبْتُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الْإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ كَفَّهُ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ حَسَرَ عَنْ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فَأَخْرَجَهُمَا مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَهُمَا إِلَى الْمِرْفَقِ، فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ رَكِبَ، فَأَقْبَلْنَا نَسِيرُ حَتَّى نَجِدَ النَّاسَ فِي الصَّلَاةِ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَرَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَفَّ مَعَ الْمُسْلِمِينَ فَصَلَّى وَرَاءَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ الرَّكْعَةَ الثَّانيية، ثُمَّ سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُتِمُّ صَلَاتَهُ، فَفَزِعَ الْمُسْلِمُونَ، وَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، لِأَنَّهُمْ سَبَقُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالصَّلَاةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُمْ: أَحْسَنْتُمْ، أَوْ أَصَبْتُمْ[١].

### باسی ئەو کەسەی دەگات بە یەك ڕكات لەگەڵ پێشنوێژ، دەبێ شوێنی پێشنوێژ بکەوێ لەو یەك ڕکاتەدا دابنیشێ بۆ تەحیات

واتە: عوڕوەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە باوکی ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبوك لە کاروانییەکە لای دا منیش لەگەڵیدا لام دا پێش بەرەبەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی یەخدا و چوو لە دەشتایی سەرئاو بکات، (پاشان هاتەوە بۆ لام)، لە قاپەکەدا ئاوم کرد بە دەستەکانیدا، لەپی دەستی شۆرد، پاشان ڕوخساری شۆرد، پاشان هەردوو قۆڵی جوبەکەی تەسك بوو دەستەکانی لەژێر جوبەکەیەوە دەرکرد و تا ئانیشکەکانی شۆرد، وە مەسحی سەری کرد، پاشان دەستنوێژی گرت لەسەر خوفەکانی، پاشان سوار وشترەکەی بوو، کەوتینە ڕێ هەتا گەیشتین بە خەڵکەکە لەنێو نوێژدا بوون، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان پێشخستبوو، ڕکاتێکی پێ تەواو کردبوون لە نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیان ڕاوەستا لەگەڵ موسوڵمانان ڕیزی بەست لەپشت عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ڕکاتی دووەمی لە نوێژی بەیانی کرد، پاشان عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف

---

(١) صحيح.

سەلامی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە نوێژەکەی تەواو بکات، موسوڵمانان پەشۆکان و زۆر تەسبیحاتیان کرد، چونکە پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوون بە نوێژکردن، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە پێیانی فەرموو: چاکتان کرد، یان بەڕاستی پێکاتان.

## بَابُ إِمَامَةِ الْمُسَافِرِ الْمُقِيمِينَ، وَإِتْمَامِ الْمُقِيمِينَ صَلَاتَهُمْ بَعْدَ فَرَاغِ الْإِمَامِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ، وَإِنَّمَا خَرَّجْتُ هَذَا الْخَبَرَ فِي هَذَا الْكِتَابِ، لِأَنَّ هَذِهِ مَسْأَلَةٌ لَا يَخْتَلِفُ الْعُلَمَاءُ فِيهَا

١٦٤٣- عَنْ عَلِيِ بْنِ زَيْدٍ عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَامَ شَابٌّ إِلَى عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: فَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ، فَسَأَلَهُ عَنْ صَلَاةِ السَّفَرِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا الْفَتَى يَسْأَلُنِي عَنْ أَمْرٍ، وَإِنِّي أَحْبَبْتُ أَنْ أُحَدِّثَكُمُوهُ جَمِيعًا: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزَوَاتٍ، فَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى يَرْجِعَ الْمَدِينَةَ، وَحَجَجْتُ مَعَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ إِلَّا رَكْعَتَيْنِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْمَدِينَةِ، أَقَامَ بِمَكَّةَ زَمَنَ الْفَتْحِ ثَمَانِيَة عَشَرَ لَيْلَةً يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ لِأَهْلِ مَكَّةَ: صَلُّوا أَرْبَعًا، فَإِنَّا قَوْمٌ سَفَرٌ، وَغَزَوْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَحَجَجْتُ مَعَهُ، فَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ حَتَّى يَرْجِعَ، وَحَجَجْتُ مَعَ عُمَرَ حَجَّاتٍ، فَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ حَتَّى يَرْجِعَ، وَصَلَّاهَا عُثْمَانُ سَبْعَ سِنِينَ مِنْ إِمَارَتِهِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْحَجِّ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْمَدِينَةِ ثُمَّ صَلَّاهَا بَعْدَهَا أَرْبَعًا. ثُمَّ قَالَ: هَلْ بَيَّنْتُ لَكُمْ؟ قُلْنَا: نَعَمْ»[١].

## باسی گەشتیار پێشنوێژی دانیشتووی شوێنەکە بکات و دانیشتووانیش نوێژەکەیان تەواو بکەن دوای تەواوبوونی پێشنوێژ، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعان، بۆیە ئەم فەرموودەیەم لەم کتێبەدا هێنا، چونکە ئەم بابەتە زانایان جیاوازییان تیایدا نییە

واتە: عەلی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە، لە ئەبو نەزرەوە دەڵێ: گەنجێك هەستا چوو بۆ لای عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ، وتی: ڕەشمەی وشترەکەی گرت، پرسیاری لێ کرد دەربارەی نوێژی سەفەر، ئەویش ئاوڕی لێ داینەوە، وتی: ئەم گەنجە پرسیارم

---

(١) إسناده ضعيف.

لێ دەکات لە شتێك پێم خۆشە بۆ هەمووتانی باس بکەم، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری چەندین جەنگ و داستانم کردووە، نوێژی نەدەکرد دوو ڕکات دوو ڕکات نەبێت تا دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، وە حەجیشم لەگەڵی کرد نوێژی نەدەکرد دوو ڕکات نەبێت تا دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، لە سەردەمی ئازادکردنی مەککە هەژدە شەو لە مەککە مایەوە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان بە خەڵکی مەککەی دەفەرموو: چوار ڕکات نوێژ بکەن، چونکە ئێمە لە سەفەرداین، وە لەگەڵ ئەبو بەکریش بەشداری جەنگم کرد و حەجیشم لەگەڵی کرد نوێژی نەدەکرد دوو ڕکات نەبێت تا دەگەڕایەوە، لەگەڵ عومەریش چەندین جار حەجم کرد، نوێژی نەدەکرد دوو ڕکات نەبێت تا دەگەڕایەوە، وە عوسمانیش بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە دەسەڵاتی دوو ڕکاتی دەکرد لە حەجدا تا دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، پاشان دوای ئەوە چوار ڕکاتی کرد، ئینجا وتی: ئایا بۆتانم ڕوون کردەوە؟ وتمان: بەڵێ.

## بَابُ الْمَسْبُوقِ بِبَعْضِ الصَّلَاةِ، وَالْأَمْرِ بِاقْتِدَائِهِ بِالْإِمَامِ فِيمَا يُدْرِكُ، وَإِتْمَامِهِ مَا سُبِقَ بِهِ بَعْدَ فَرَاغِ الْإِمَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**١٦٤٤-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ سَمِعَ جَلَبَةً، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكُمْ؟» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلَاةِ قَالَ: «فَلَا تَفْعَلُوا، إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي، وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا»[١].

## باسی ئەو کەسەی فریای هەندێ لە نوێژەکەی نەکەوتووە کە دەگاتە پێشنوێژ، پێویستە شوێنی پێشنوێژ بکەوێت لەوەی پێی دەگات، وە ئەویشی لێی دوا کەوتووە دوای تەواوبوونی پێشنوێژ لە نوێژەکەی تەواوی بکات

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە نوێژمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگەدەنگی کۆمەڵە پیاوێك بوو، (کاتێ نوێژی تەواو کرد) فەرمووی: ئەوە چیتان بوو؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەمان کرد بۆ نوێژ، فەرمووی: پەلە مەکەن، ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ هەڵمەسن تا دەمبینن، وە با هێمنی و لەسەرخۆییتان

---

(١) صحيح.

پێوە دیار بێت، ئەوەی گەیشتن پێی نوێژ بکەن، (لەگەڵ پێشنوێژ) ئەوەیشی پێشتان کەوت تەواوی بکەن.

## بَابُ الْمَسْبُوقِ بِوِتْرٍ مِنْ صَلَاةِ الْإِمَامِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا سَجْدَتَيِ السَّهْوِ عَلَيْهِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ، عَلَى مَذْهَبِهِمْ فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ تَكُونُ سَجْدَتَا الْعَمْدِ، لَا سَجْدَتَا السَّهْوِ، إِذِ الْمَأْمُومُ إِنَّمَا يَتَعَمَّدُ الْجُلُوسَ فِي الْوِتْرِ مِنْ صَلَاتِهِ اقْتِدَاءً بِإِمَامِهِ إِذْ كَانَ لِلْإِمَامِ شَفْعٌ، وَلَهُ وِتْرٌ، وَتَكُونُ سَجْدَتَا السَّهْوِ عَلَى أَصْلِهِمْ لِمَا يَجِبُ عَلَى الْمَرْءِ فِعْلُهُ، لَا لِمَا يَسْهُو فَيَفْعَلَ مَا لَيْسَ لَهُ فِعْلُهُ عَلَى الْعَمْدِ

١٦٤٥- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: خَصْلَتَانِ لَا أَسْأَلُ عَنْهُمَا أَحَدًا بَعْدَمَا قَدْ شَهِدْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّا كُنَّا مَعَهُ فِي سَفَرٍ، فَبَرَزَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ جَاءَ فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَجَانِبَيْ عِمَامَتِهِ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ قَالَ: وَصَلَاةُ الْإِمَامِ خَلْفَ الرَّجُلِ مَعَ رَعِيَّتِهِ، وَشَهِدْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَاحْتَبَسَ عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَقَامُوا الصَّلَاةَ، وَقَدَّمُوا ابْنَ عَوْفٍ فَصَلَّى بِهِمْ بَعْضَ الصَّلَاةِ وَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَصَلَّى خَلْفَ ابْنِ عَوْفٍ مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلَاةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ ابْنُ عَوْفٍ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَضَى مَا سُبِقَ بِهِ[1].

**باسی کەسێك دەگاتە نوێژی بەکۆمەڵ، پێشنوێژ پێشی کەوتووە بە ڕکاتێکی تاك، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سوژدەی سەهووی لەسەر نییە، پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە سوژدەی سەهووی لەسەر پێویستە، بەپێی مەزهەبی ئەوان لەم بابەتەدا دوو سوژدە سەهووەکە دەبێتە سوژدەی ئەنقەست نەك سوژدەی سەهوو، نوێژخوێن بۆیە بەئەنقەست دادەنیشێت لەو نوێژەی کە تاکە، چونکە شوێنی پێشنوێژەکەی کەوتووە، ئەگەر پێشنوێژ لە ڕکاتی جووتدا بوو، نوێژخوێنیش لە ڕکاتی تاك بوو، ئەوکات دوو سوژدەی سەهووەکە لەسەر بنەمای ئەوان پێویستە لەسەر بەندە ئەنجامی بدات، نەك لەبەر ئەوەی سەهوو دەکات سوژدەی سەهوو دەبات بۆ ئەو کردەوەی بە ئەنقەست نەیکردووە**

---

(١) صحيح.

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: دوو خەصڵەت هەیە پرسیار لە کەس ناکەم دەربارەیان دوای ئەوەی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی: ئێمە لەگەڵیدا بووین لە گەشتێك، ڕۆیشت بۆ چۆڵەوانییەك بۆ سەرئاوکردن، پاشان هاتەوە دەستنوێژی گرت و مەسحی پێشەسەر و هەردوو تەنیشتی عەمامەکەی کرد، مەسحیشی لەسەر خوفەکانی کرد، فەرمووی: نوێژکردنی پێشەوا لەپشت یەکێك لە ژێردەستەکانی، (خەصلەتی دووەم) وە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە گەشتێك، کاتی نوێژ هات، پێغەمبەر ﷺ لە پێش چاویان دیار نەما، ئەوانیش نوێژیان دابەست و ئیبنو عەوفیان پێش خست، ئەویش بەشێك لە نوێژەکەی بۆ کردن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاتەوە لەپشت ئیبنو عەوفەوە نوێژی دابەست، ئەوەی مابوو لە نوێژەکە، کاتێ ئیبنو عەوف سڵاوی دایەوە، پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە ئەوەی پێشی کەوتبوو تەواوی کرد.

**١٦٤٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَأْتُوهَا وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ، فَصَلُّوا مَا أَدْرَكْتُمْ، وَأَتِمُّوا مَا فَاتَكُمْ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ بەهێمنی و لەسەرخۆیی بۆی بچن، ئەوەی گەیشتن پێی نوێژ بکەن، (لەگەڵ پێشنوێژ) ئەوەیشی پێشتان کەوت تەواوی بکەن (لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ).

## بَابُ تَلْقِينِ الْإِمَامِ إِذَا تَعَايَا، أَوْ تَرَكَ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ

**١٦٤٧-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَرَكَ آيَةً، وَفِي الْقَوْمِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نُسِّيتَ آيَةَ كَذَا وَكَذَا، أَوْ نُسِخَتْ؟ قَالَ: «نُسِّيتُهَا»[٢].

### باسی بیرخستنەوەی پێشنوێژ ئەگەر بیری چوو، یان شتێکی لە قوڕئان نەخوێند

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی کرد ئایەتێکی بیر چوو، ئوبەی کوڕی کەعبیش لەنێو خەڵکەکە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایەتی فڵان و فڵانت بیر چوو یان نەسخ کرایەوە، فەرمووی: بیرم چووەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٦٤٨- عَنْ مِسْوَرِ بْنِ يَزِيدَ الْأُسَيْدِيِّ ﷺ، قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصَّلَاةِ، فَتَرَكَ شَيْئًا لَمْ يَقْرَأْهُ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَرَكْتَ آيَةَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: «فَهَلَّا أَذْكَرْتُمُونِيهَا». فَقَالَ: كُنْتُ أُرَاهَا نُسِخَتْ[١].

واتە: میسوەری کوڕی یەزیدی ئوسەیدی ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بووم لەنێو نوێژدا قورئانی دەخوێند، شتێکی جێهێشت و نەیخوێند، پیاوێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایەتی فڵان و فڵانت بیر چوو؟ فەرمووی: ئەی بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە. وتی: من وام زانی نەسخ کراوەتەوە.

## بَابُ وَضْعِ الْإِمَامِ نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ

١٦٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَصَلَّى الصُّبْحَ، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ[٢].

### باسی پێشنوێژ کاتێ نوێژی کرد نەعلەکانی لەلای چەپی دادەنێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: لەساڵی ئازادکردنی مەککە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، نوێژی بەیانی کرد، نەعلەکانی داکەند و لەلای چەپی داینا.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْعُذْرِ الَّذِي يَجُوزُ فِيهِ تَرْكُ إِتْيَانِ الْجَمَاعَةِ
## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْمَرِيضِ فِي تَرْكِ إِتْيَانِ الْجَمَاعَةِ

١٦٥٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ الْمُسْلِمِينَ بَيْنَمَا هُمْ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ مِنْ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِهِمْ، لَمْ يَفْجَأْهُمْ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ كَشَفَ سِتْرَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلَاةِ ثُمَّ تَبَسَّمَ فَضَحِكَ، فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ وَظَنَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُرِيدُ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الصَّلَاةِ، وَقَالَ أَنَسٌ: وَهَمَّ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يَفْتَتِنُوا فِي صَلَاتِهِمْ فَرَحًا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَتِمُّوا صَلَاتَكُمْ، ثُمَّ دَخَلَ الْحُجْرَةَ وَأَرْخَى السِّتْرَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## کۆباسی ئەو بیانوانەی کە دروستە
## نوێژخوێن بەهۆیانەوە نەچێت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ

## باسی مۆڵەتدان بە نەخۆش لە نەڕۆیشتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنصاڕی ﷺ دەگێڕێتەوە، لە کاتێدا موسوڵمانان لە نوێژی بەیانیدا بوون لە ڕۆژی دوو شەممە، ئەبو بەکریش نوێژی بۆ دەکردن، لەپڕ پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لادا و تەماشای کردن لە نوێژدا بوون ڕیزیان بەستبوو، بزەیەکی پێکەنینی کرد، ئەبو بەکر بەپشتا هاتە دواوە بۆ ئەوەی بگاتە ڕیزەکە، گومانی برد کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت دەرچێت بۆ نوێژکردن، ئەنەس وتی: موسوڵمانان خەریك بوو لە خۆشیدا نوێژەکەیان لێ تێك بچێت کاتێ پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردن نوێژەکەتان تەواو بکەن، پاشان چووە نێو ژوورەکەیەوە، پەردەکەی دادا لە نێوان خۆی و ئەواندا، لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ عِنْدَ حُضُورِ الْعَشَاءِ

**١٦٥١**- عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[1].

## باسی مۆڵەت دراوە لە کاتی
## ئامادەبوونی خواردن واز لە نوێژی بەکۆمەڵ بهێنرێ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خواردن ئامادە بوو و قامەت بۆ نوێژیش کرا، ئەوە دەست بە خواردنەکە بکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ إِذَا كَانَ الْمَرْءُ حَاقِنًا

**١٦٥٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْأَرْقَمِ ﷺ كَانَ يُسَافِرُ، فَيَصْحَبُهُ قَوْمٌ يَقْتَدُونَ بِهِ قَالَ: وَكَانَ يُؤَذِّنُ لِأَصْحَابِهِ وَيَؤُمُّهُمْ قَالَ: فَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ يَوْمًا، ثُمَّ قَالَ: يَؤُمُّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمُ الْخَلَاءَ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلَاءِ»[1].

## باسی مۆڵەت دراوە نوێژی بەکۆمەڵ نەکات ئەگەر بەندە تەنگەتاو بوو

واتە: هیشامی کوڕی عوڕوە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، عەبدوڵای کوڕی ئەڕقەم ﷺ گەشتی دەکرد، خەڵکێك هاوەڵیان دەکرد و پەیڕەوییان دەکرد، وتی: بانگی بۆ هاوەڵەکانی دەدا و پێشنوێژی بۆ دەکردن، وتی: ڕۆژێك بانگدرا بۆ نوێژ، پاشان وتی: با یەکێکتان پێشنوێژیتان بۆ بکات، چونکە گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی سەرئاو بکات و لەو کاتەشدا قامەت بۆ نوێژ کرا، با سەرەتا سەرئاو بکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْعُمْيَانِ الْجَمَاعَةَ فِي الْأَمْطَارِ، وَالسُّيُولِ

**١٦٥٣-** عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ - وَهُوَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنَ الْأَنْصَارِ - أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي قَدْ أَنْكَرْتُ بَصَرِي، وَإِنِّي أُصَلِّي بِقَوْمِي، فَإِذَا كَانَتِ الْأَمْطَارُ سَالَ الْوَادِي الَّذِي بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ، فَلَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ آتِيَ مَسْجِدَهُمْ فَأُصَلِّيَ بِهِمْ، فَوَدِدْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَّكَ تَأْتِي فَتُصَلِّي فِي بَيْتِي أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سَأَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، قَالَ عِتْبَانُ بْنُ مَالِكٍ: فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ فَاسْتَأْذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟ قَالَ: فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى نَاحِيَةِ الْبَيْتِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكَبَّرَ، فَقُمْنَا فَصَفَفْنَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَأَجْلَسْنَاهُ عَلَى خَزِيرٍ صَنَعْنَاهُ لَهُ قَالَ: فَثَابَ رِجَالٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ حَوْلَنَا حَتَّى اجْتَمَعَ فِي الْبَيْتِ رِجَالٌ ذَوُو عَدَدٍ، فَقَالَ: أَيْنَ مَالِكُ بْنُ الدُّخَيْشِنِ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: ذَلِكَ مُنَافِقٌ لَا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﷺ قَالَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَقُلْ لَهُ ذَلِكَ، أَلَا تَرَاهُ قَدْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، يُرِيدُ بِذَلِكَ وَجْهَ

---

(١) صحيح.

اللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، إِنَّا نَرَى وَجْهَهُ وَنَصِيحَتَهُ إِلَى الْمُنَافِقِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ»(١).

## باسی مۆڵەتدان بەوەی کوێر واز لە نوێژی بەکۆمەڵ بهێنێ لە کاتی باران و لافاو

واتە: عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاڕی ﷺ -کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری جەنگی بەدری کردبوو- دەگێڕێتەوە، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من چاوم لەدەست داوە و پێشنوێژی بۆ قەومەکەم دەکەم، کاتێ باران ببارێ ئاوی چەم دێت و شیوەکان پڕ دەبن بەربەست دروست دەبێ لە نێوان ماڵی من و ماڵی ئەواندا، منیش ناتوانم بچم بۆ مزگەوتەکەیان و نوێژیان بۆ بکەم، پێم خۆش بوو تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریف بێنی بێی لە ماڵەکەمدا نوێژ بکەی تا بیکەم بە نوێژگە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشە ئەوە دەکەم، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، عیتبان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی کردەوە کاتێ خۆر بەرز بۆیەوە لەگەڵ ئەبو بەکردا هاتن، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتی کرد مۆڵەتم پێی دا دانەنیشت تا هاتە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: چی شوێنێکت پێخۆشە لە ماڵەکەتدا نوێژی تێدا بکەم؟ وتی: ئاماژەم بۆ تەنیشتێکی ماڵەکەم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا تەکبیری نوێژی کرد و ئێمەیش لە پشتیەوە ڕیزمان بەست، دوو ڕکات نوێژی کرد و پاشان سڵاوی دایەوە، دواتر گیرمان دا و دامانیشاند لەسەر شلەیەك گۆشتی وردکراومان تێکردبوو بۆی، وتی: پیاوانێك لە دراوسێیەکانی دەوروبەرمان هاتن تا خەڵکێکی زۆر لە ماڵەکەدا کۆبوونەوە، (یەکێك لە ئەوان) وتی: مالیکی کوڕی دوخەیشین لە کوێیە؟ هەندێکیان وتی: ئەوە دووڕووە نە خوای خۆش دەوێ نە پێغەمبەرەکەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی: پێی مەڵێ دووڕوو ئایا نابینی دەڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوایە، وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترینن، ئێمە بە ئاڕاستەکردنی و قسەکانی وامان دەبینی لە دووڕووەکانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ حەرامی کردووە لەسەر ئاگر هەر کەسێك بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) مەبەستی پێی تەنها خوا بێت.

---

(١) صحیح.

**١٦٥٤-** عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنِّي قَدْ أَنْكَرْتُ بَصَرِي، وَإِنَّ السُّيُولَ تَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَ مَسْجِدِ قَوْمِي، وَلَوَدِدْتُ أَنَّكَ جِئْتَ وَصَلَّيْتَ فِي بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مَسْجِدًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»[١].

واتە: عیتبانی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: من چاوم لەدەست داوە و پێشنوێژی بۆ قەومەکەم دەکەم، ئاوی چەم دێت و شیوەکان پڕ دەبن بەربەست دروست دەبێ لە نێوان ماڵی من و مزگەوتی قەومەکەم، پێم خۆش بوو تۆ (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) تەشریف بێنی بێی لە ماڵەکەمدا نوێژ بکەی تا بیکەم بە نوێژگە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە ئەوە دەکەم، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْكِ الْجَمَاعَةِ فِي السَّفَرِ، وَالْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ وَالْبَارِدَةِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى لَوْ حُمِلَ الْخَبَرُ عَلَى ظَاهِرِهِ كَانَ شُهُودُ الْجَمَاعَةِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ وَالْبَارِدَةِ مَعْصِيَةً، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ

**١٦٥٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّهُ نَادَى بِالصَّلَاةِ، ثُمَّ قَالَ: صَلُّو فِي رِحَالِكُمْ، ثُمَّ حَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ وَالْبَارِدَةِ فِي السَّفَرِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ - فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ وَالْبَارِدَةِ - تَحْتَمِلُ مَعْنَيَيْنِ: أَحَدُهُمَا: أَنْ تَكُونَ اللَّيْلَةُ مَطِيرَةً وَبَارِدَةً جَمِيعًا. وَتَحْتَمِلُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ اللَّيْلَةَ الْمَطِيرَةَ، وَاللَّيْلَةَ الْبَارِدَةَ أَيْضًا، وَإِنْ لَمْ تَجْتَمِعِ الْعِلَّتَانِ جَمِيعًا فِي لَيْلَةٍ وَاحِدَةٍ. وَخَبَرُ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ دَالٌّ عَلَى أَنَّهُ أَرَادَ أَحَدَ الْمَعْنَيَيْنِ - كَانَتِ اللَّيْلَةُ مَطِيرَةً أَوْ كَانَتْ بَارِدَةً.

## باسی ڕێگە دراوە لە سەفەر واز لە نوێژی بەکۆمەڵ بهێنێ، وە فەرمان کراوە لە بارگەکانی خۆیان نوێژ بکەن لە شەوێکی باراناوی و سەرمادا، بەباسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوخت نەك درێژ و تێروتەسەل، ئەگەر بە ڕواڵەتەکەی لەیەك بدرێتەوە ئەوە ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ لە شەوێکی باراناوی و سەرمادا سەرپێچییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە لە بارگەکانی خۆیان نوێژ بکەن

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، ئەو بانگی دا بۆ نوێژ، وتی: لە بارگە و شوێنەكانی خۆتان نوێژ بكەن، پاشان گێڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی لە شەوێكی باراناوی و سەرمادا دەكرد لە سەفەردا.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە -لە شەوێكی باراناوی و سەرمادا- دوو مانا لەخۆ دەگرێت: یەكەمینیان: دەبێت ئەو شەوە باراناوی و سەرما بێت پێكەوە، وە پێدەچێت مەبەستی پێی شەوێكی باراناوی، هەروەها شەوێكی سەرما بێت، ئەگەرچی هەردوو هۆكارەكە پێكەوە كۆ نەبنەوە لە یەك شەودا. وە فەرموودەكەی حەمادی كوڕی زەید بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەستی پێی یەكێك لەو دووانە -شەوێكی باراناوی یان سەرما بوو-.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْكِ الْجَمَاعَةِ فِي السَّفَرِ فِي اللَّيْلَةِ الْمُظْلِمَةِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَارِدَةً، وَلَا مَطِيرَةً بِمِثْلِ اللَّفْظِ الَّذِي ذَكَرْتُ فِي الْبَابِ قَبْلُ

**١٦٥٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كُنَّا إِذَا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَكَانَتْ لَيْلَةٌ ظَلْمَاءُ أَوْ لَيْلَةٌ مَطِيرَةٌ أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَوْ نَادَى: مُنَادِيهِ: أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[1].

## باسی ڕێگە دراوە بە نەڕۆیشتن بۆ نوێژی بەكۆمەڵ لە سەفەر لە شەوێكی تاریك، ئەگەرچی نە سارد بێت و نە باراناوی بێت، بەهەمان شێوەی ئەو دەستەواژەی لە باسی پێشوو باسم كرد

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ئێمە كاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووایەن لە گەشتێكدا ئەو شەوە تاریك بووایە یان باراناوی، بانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دەدا، یان بانگبێژەكەی بانگی دەدا: لە بارگە و شوێنەكانی خۆتان نوێژ بكەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْكِ الْجَمَاعَةِ فِي السَّفَرِ، وَالْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ فِي الْمَطَرِ الْقَلِيلِ غَيْرِ الْمُؤْذِي بِمِثْلِ اللَّفْظِ الَّذِي ذَكَرْتُ قَبْلُ

**١٦٥٧-** عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ قَالَ: خَرَجْتُ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ إِلَى الْمَسْجِدِ صَلَاةَ الْعِشَاءِ، فَلَمَّا رَجَعْتُ اسْتَفْتَحْتُ، فَقَالَ أَبِي ﷺ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: أَبُو مَلِيحٍ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَأَصَابَتْنَا سَمَاءٌ لَمْ تَبُلَّ أَسْفَلَ نِعَالِنَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ[١].

## باسی ڕێگە دراوە بە نەڕۆیشتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، وە فەرمان کراوە لە بارگەکانی خۆیان نوێژ بکەن، لە بارانی کەمی بێزیان بەهەمان شێوەی ئەو دەستەواژەی پێشوو باسم کرد

واتە: باوكی مەلیح دەڵێ: لەشەوێكی تاریكدا چووم بۆ مزگەوت بۆ نوێژی عیشا، كاتێ گەڕامەوە دام لە دەرگا، باوكم ﷺ وتی: ئەوە كێیە؟ وتیان: باوكی مەلیحە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە سەردەمی حودەیبیە باران باری ژێر نەعلەكانمانی تەڕ نەكرد، بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی كرد: لە بارگە و شوێنەكانی خۆتان نوێژ بكەن.

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ، وَتَرْكِ الْجَمَاعَةِ فِي الْيَوْمِ الْمَطِيرِ فِي السَّفَرِ مِثْلَ اللَّفْظَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ قَبْلَ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ حُكْمَ النَّهَارِ فِي إِبَاحَةِ تَرْكِ الصَّلَاةِ فِي الْجَمَاعَةِ فِي الْمَطَرِ كَحُكْمِ اللَّيْلِ سَوَاءٌ

**١٦٥٨-** عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَصَابَتْنَا السَّمَاءُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الصَّلَاةُ فِي الرِّحَالِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ڕێگە دراوە نوێژ لە بارگە و شوێنەکاندا بکرێت، وە واز لە نوێژی بەکۆمەڵ بهێنرێ لە ڕۆژێکی باراناوی لە سەفەردا، هەروەکو لە پێشەوە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی حوکمی ڕۆژ لە ڕێگەپێدانی وازهێنان لە نوێژی بەکۆمەڵ لە کاتی باران هەمان حوکمی شەوی هەیە وەکو یەك**

واتە: باوکی مەلیح دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی حونەین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین باران دایگرتین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ لە بارگە و شوێنەکانی خۆتان بکەن.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصِّي لِلَّفْظَةِ الْمُخْتَصَرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا مِنْ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِذَلِكَ أَمْرُ إِبَاحَةٍ لَا أَمْرُ عَزْمٍ، يَكُونُ مُتَعَدِّيهِ عَاصِيًا إِنْ شَهِدَ الصَّلَاةَ جَمَاعَةً فِي الْمَطَرِ**

**١٦٥٩**- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَمُطِرْنَا، فَقَالَ: لِيُصَلِّ مَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فِي رَحْلِهِ[١].

**باسی فەرموودەیەك درێژەپێدەری دەستەواژە کورتەکەی پێشووە کە لە پێشەوە باسم کرد، لە فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بە نوێژکردن لە بارگەکان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەوە فەرمانێکە بۆ ڕێگەپێدان نەك بۆ فەرمانکردن و جەختکردنەوە کە ئەوەی بیبەزێنێ سەرپێچی کردووە، ئەگەر بەشداری نوێژی بەکۆمەڵی کرد لە باراندا**

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، بارانمان بۆ باری، فەرمووی: کێی لە ئێوە دەیەوێت با لە بارگەی خۆی نوێژ بکات.

---

(١) صحیح.

## بَابُ إِتْيَانِ الْمَسَاجِدِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ الْمُظْلِمَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ فِي مِثْلِ تِلْكَ اللَّيْلَةِ أَمْرُ إِبَاحَةٍ لَهُ لَا حَتْمٌ

**١٦٦٠-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قُلْتُ: وَاللَّهِ لَوْ جِئْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ فَأَتَيْتُهُ، فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلًا فِي قِصَّةِ الْعَرَاجِينَ قَالَ: ثُمَّ هَاجَتِ السَّمَاءُ مِنْ تِلْكَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ بَرَقَتْ بَرْقَةٌ، فَرَأَى قَتَادَةَ بْنَ النُّعْمَانِ، فَقَالَ: «مَا السُّرَى يَا قَتَادَةُ؟» فَقَالَ: عَلِمْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّ شَاهِدَ الصَّلَاةِ اللَّيْلَةَ قَلِيلٌ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَشْهَدَهَا قَالَ: «فَإِذَا صَلَّيْتَ فَاثْبُتْ حَتَّى أَمُرَّ بِكَ»، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَعْطَاهُ الْعُرْجُونَ، فَقَالَ: «خُذْ هَذَا، فَسَيُضِيءُ لَكَ أَمَامَكَ عَشْرًا، وَخَلْفَكَ عَشْرًا، فَإِذَا دَخَلْتَ بَيْتَكَ فَرَأَيْتَ سَوَادًا فِي زَاوِيَةِ الْبَيْتِ فَاضْرِبْهُ قَبْلَ أَنْ تَكَلَّمَ؛ فَإِنَّهُ الشَّيْطَانُ، قَالَ: فَفَعَلَ، فَنَحْنُ نُحِبُّ هَذِهِ الْعَرَاجِينَ لِذَلِكَ»[1].

## باسی هاتن بۆ مزگەوتەکان لە شەوێکی باراناوی تاریکدا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە نوێژ لە شوێنی نیشتەجێبوون لە شەوێکی وەکو ئەو شەوە فەرمانێکە بە مەبەستی ڕێگەپێدان نەك حەتمی

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: کاتێ ئەبو هوڕەیرە ﷺ کۆچی دوایی کرد وتم: سوێند بە خوا دەبێ بچم بۆ لای ئەبو سەعیدی خودری، چووم بۆ لای، بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد سەبارەت بە چیرۆکی پەلە دارخورماکان، وتی: پاشان ئاسمان لەو شەوەدا هەژا و هەور دروست بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێژی عیشا هەورەکە چەخماخەی دا، قەتادەی کوڕی نوعمانی بینی فەرمووی: چییە بەم شەوە دەرچووی ئەی قەتادە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زانیم ئەمشە و ئامادەبووانی نوێژ کەمن، پێم خۆش بوو ئامادەی بم، فەرمووی: ئەگەر نوێژت تەواو کرد لە شوێنی خۆتبە بمێنەوە تا دێم بۆ لات، کاتێ نوێژی تەواو کرد پەلە دارخورمایەکی پێدا، فەرمووی: ئەوە بگرە، دە (هەنگاو) پێش خۆت و دە (هەنگاو) دوای خۆت ڕووناك دەکات، جا کاتێ چوویتە ماڵەکەتەوە تارماییەکی ڕەشت بینی لە گۆشەی ماڵەکەت، لێی دە پێش ئەوەی قسە بکات، چونکە بەڕاستی ئەوە شەیتانە، وتی: ئەویش ئەوەی کرد، بۆیە ئێمە ئەو پەلە دارخورمایانەمان خۆش دەوێ.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِتْيَانِ الْجَمَاعَةِ لِآكِلِ الثُّومِ

**١٦٦١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ يَعْنِي الثُّومَ- فَلَا يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ»[1].

**باسی قەدەغەکردن لە هاتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسەی سیری خواردووە**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەر فەرمووی: هەر کەسێك لەم درەختە بخوات -واتە: سیر- با نەیەت بۆ مزگەوتەکانمان.

**١٦٦٢-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الْبَقْلَةِ فَلَا يُؤْذِينَا بِهَا فِي مَسْجِدِنَا هَذَا»[2].

واتە: عوبادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە، لە مامیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لەم دانەوێڵەیەی خوارد (سیر)، با بەهۆیەوە ئازارمان نەدات لەنێو مزگەوتەکانمان.

## بَابُ تَوْقِيتِ النَّهْيِ عَنْ إِتْيَانِ الْجَمَاعَةِ لِآكِلِ الثُّومِ

**١٦٦٣-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَفَلَ تُجَاهَ الْقِبْلَةِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَتَفْلَتُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَمَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الْبَقْلَةِ الْخَبِيثَةِ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا»[3].

**باسی کاتی قەدەغەکردن**
**لە هاتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسەی سیری خواردووە**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەرەورووی قیبلە تف بکات لە ڕۆژی قیامەتدا دێت تفەکەی بە نێوان هەردوو چاویەتی، هەر کەسێکیش لەم دانەوێڵە پیسەی (سیر) خوارد با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِتْيَانِ الْمَسَاجِدِ لِآكِلِ الثُّومِ

**١٦٦٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، زَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ»[١].

### باسی قەدەغەکردن لە هاتن
### بۆ مزگەوتەکان بۆ ئەو کەسەی سیری خواردووە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سیر یان پیازی خوارد با لێمان دوور بکەوێتەوە، یان لە مزگەوتەکانمان دوور بکەوێتەوە و لە ماڵەکەی دابنیشێ.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِتْيَانِ الْجَمَاعَةِ لِآكِلِ الْكُرَّاثِ

**١٦٦٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ - الثُّومِ - ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: وَالْبَصَلِ وَالْكُرَّاثِ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا؛ فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الْإِنْسَانُ»[٢].

### باسی قەدەغە کردن لە هاتن
### بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسەی کەوەری خواردووە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لەم درەختەی خوارد -سیر- پاشان دوای ئەوە فەرمووی: پیاز و کەوەر با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، چونکە بەڕاستی فریشتەکان بێزار دەبن لەوەی مرۆڤەکان پێی بێزار دەبن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْ إِتْيَانِ الْمَسَاجِدِ لِآكِلِهِنَّ نِيئًا غَيْرَ مَطْبُوخٍ

١٦٦٦- عَنْ مَعْدَانَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ مَا أَرَاهُمَا إِلَّا خَبِيثَتَيْنِ هَذَا الثُّومَ وَهَذَا الْبَصَلَ، وَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرَّجُلَ يُوجَدُ رِيحُهُ، فَيُؤْخَذُ بِيَدِهِ، فَيُخْرَجُ بِهِ إِلَى الْبَقِيعِ، وَمَنْ كَانَ آكِلَهُمَا فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخًا»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردن لە هاتن بۆ مزگەوتەکان لەبەر خواردنیانە بەکاڵی نەك بەکوڵاوی

واتە: مەعدان دەگێڕێتەوە، عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری بۆ خەڵك دا، پاشان وتی: ئەی خەڵکینە ئێوە لە دوو درەخت دەخۆن وا دەبینم هەردووکیان پیسن پیاز و سیر، من دەمبینی ئەو کەسەی بۆنی ئەوانەی لێ دەهات لەنێو مزگەوت، دەستی دەگیرا و دەردەکرا بۆ بەقیع، ئەگەر کەسێك هەر دەیخوات با بە ئاگر (بۆنەکەی) بکوژێت (واتە: بیکوڵێنێت).

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْ ذَلِكَ لِتَأَذِّي النَّاسِ بِرِيحِهِ لَا تَحْرِيمًا لِأَكْلِهِ

١٦٦٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: لَمْ نَعْدُ أَنْ فُتِحَتْ خَيْبَرُ، فَوَقَعْنَا فِي تِلْكَ الْبَقْلَةِ- الثُّومِ- فَأَكَلْنَا مِنْهَا أَكْلًا شَدِيدًا قَالَ: وَنَاسٌ جِيَاعٌ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَوَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرِّيحَ، فَقَالَ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ الْخَبِيثَةِ فَلَا يَقْرَبَنَّا فِي مَسْجِدِنَا»، فَقَالَ النَّاسُ: حُرِّمَتْ حُرِّمَتْ فَبَلَغَ ذَاكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ لَيْسَ لِي تَحْرِيمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ، وَلَكِنَّهَا شَجَرَةٌ أَكْرَهُ رِيحَهَا»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردن لە خواردنی (سیر و پیاز) لەبەر ئەوەیە خەڵك بە بۆنی بێزار دەبن، نەك خواردنی حەرام بێ

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: زۆری نەبرد خەیبەر ئازاد کرا، گەیشتین بەو دانەوێڵەیە -سیر- زۆرمان لێ خوارد، وتی: خەڵکەکە برسی بوون، پاشان چووین بۆ مزگەوت،

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە بۆنی سیرەکە کرد، فەرمووی: هەر کەسێك لەو درەختە پیسەی خواردووە با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، خەڵکەکە وتیان: حەرام کرا، حەرام کرا، ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: شتێك خوا حەلاڵی کردبێ، بۆ من نییە حەرامی بکەم، بەڵکوو ئەوە درەختێکە حەزم لە بۆنی نییە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْ ذَلِكَ لِتَأَذِّي الْمَلَائِكَةِ بِرِيحِهِ إِذِ النَّاسُ يَتَأَذَّوْنَ بِهِ

١٦٦٨- عَنْ جَابِرٍ ﷺ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ الْبَصَلِ وَالْكُرَّاثِ قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بِبَلَدِنَا يَوْمَئِذٍ الثُّومُ، فَقَالَ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا؛ فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الْإِنْسَانُ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردن لە خواردنی ئەو دانەوێڵانە بۆ ئەوەیە فریشتەکان بە بۆنی بێزار دەبن، وەکو چۆن خەڵك بە بۆنی بێزار دەبن

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە خواردنی پیاز و کەوەر، ئەوکاتە سیر لە وڵاتی ئێمەدا نەبوو، فەرمووی: هەر کەسێك لەو دارەی خوارد با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، چونکە فریشتەکان بێزار دەبن لەوەی مرۆڤەکان پێی بێزار دەبن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِتْيَانِ الْمَسْجِدِ لِآكِلِ الثُّومِ، وَالْبَصَلِ، وَالْكُرَّاثِ إِلَى أَنْ يَذْهَبَ رِيحُهُ

١٦٦٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ، ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الثُّومُ وَالْبَصَلُ وَالْكُرَّاثُ، وَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَشَدُّ ذَلِكَ كُلِّهِ الثُّومُ، أَفَتُحَرِّمُهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوهُ، وَمَنْ أَكَلَهُ مِنْكُمْ فَلَا يَقْرَبْ هَذَا الْمَسْجِدَ حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهُ مِنْهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی قەدەغەکردن لە هاتن بۆ مزگەوت بۆ ئەو کەسەی سیر و پیاز و کەوەر دەخوات تا بۆنەکەی دەڕوات

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی خواردنی سیر و پیاز و کەوەر کرا، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، توندترینی ئەوانە سیرە، ئایا حەرامی ناکەیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیخۆن، هەر کەسێك لەئێوە خواردی با نەیەتە ئەم مزگەوتەوە تا بۆنەکەی نامێنێ.

## بَابُ ذِكْرِ مَا خَصَّ اللَّهُ بِهِ نَبِيَّهُ ﷺ مِنْ تَرْكِ أَكْلِ الثُّومِ، وَالْبَصَلِ، وَالْكُرَّاثِ مَطْبُوخًا

**١٦٧٠-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَيْهِ بِطَعَامٍ مِنْ خَضِرَةٍ فِيهِ بَصَلٌ أَوْ كُرَّاثٌ، فَلَمْ يَرَ فِيهِ أَثَرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْكُلَ؟» فَقَالَ: لَمْ أَرَ أَثَرَكَ فِيهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْتَحِي مِنْ مَلَائِكَةِ اللَّهِ، وَلَيْسَ بِمُحَرَّمٍ»[1].

## باسی ئەوەی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ تایبەت کردووە لە وازهێنان لە خواردنی سیر و پیاز و کەوەر بەکوڵاوی

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنێکی بۆ نارد کە سەوزەی وەکوو پیاز و کەوەری تێدا بوو، ئەویش شوێنی دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ پێیەوە نەبینی لێی خواردبێت، بۆیە لێی نەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: چی شتێك ڕێگری لێ کردی نەیخۆی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شوێنی دەستی تۆم پێیەوە نەبینی لێی بخۆیت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من لە فریشتەکانی خوا شەرم دەکەم (کە بۆنی ئەو سەوزانە ئازاریان بدات) بەڵام حەرام نەکراوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خُصَّ بِتَرْكِ أَكْلِهِنَّ لِمُنَاجَاةِ الْمَلَائِكَةِ

**١٦٧١-** عَنْ أُمِّ أَيُّوبَ ﵂ قَالَتْ: نَزَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ، فَتَكَلَّفْنَا لَهُ طَعَامًا فِيهِ بَعْضُ الْبُقُولِ، فَلَمَّا وُضِعَ بَيْنَ يَدَيْهِ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: «كُلُوا، فَإِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ أُوذِيَ صَاحِبِي»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تایبەت کراوە بە وازهێنان لە خواردنی سیر و پیاز و کەوەر لەبەر قسەکردن لەگەڵ فریشتەکان

واتە: دایکی ئەیوب ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دابەزی بۆ لامان چێشتێکمان بۆ دروست کرد هەندێك لە سیر یان پیازی تێدا بوو، کاتێ لەپێشی دانرا بە هاوەڵانی فەرموو: ئێوە بخۆن، حاڵی من وەکوو هیچ یەکێك لەئێوە نییە، من لەوە دەترسم هاوەڵەکەم (جبریل) ئازار بدەم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي أَكْلِهِ عِنْدَ الضَّرُورَةِ وَالْحَاجَةِ إِلَيْهِ

**١٦٧٢-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁ قَالَ: أَكَلْتُ ثُومًا، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي بِرَكْعَةٍ، فَلَمَّا صَلَّى قُمْتُ أَقْضِي، فَوَجَدَ رِيحَ الثُّومِ، فَقَالَ: «مَنْ أَكَلَ هَذِهِ الْبَقْلَةَ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهَا»، فَلَمَّا قَضَيْتُ الصَّلَاةَ أَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ لِي عُذْرًا، نَاوِلْنِي يَدَكَ، فَوَجَدْتُهُ سَهْلًا، فَنَاوَلَنِي يَدَهُ، فَأَدْخَلْتُهَا مِنْ كُمِّي إِلَى صَدْرِي، فَوَجَدَهُ مَعْصُوبًا، فَقَالَ: إِنَّ لَكَ عُذْرًا[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە خواردنی سیر لە کاتی پێویست و پێویستبوون پێی

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێ: سیرم خوارد پاشان هاتم بۆ نوێژگەی پێغەمبەر ﷺ بینیم بە یەك ڕکات پێشم کەوتبوو، کاتێ نوێژی کرد، هەستامەوە نوێژەکەم تەواو بکەم، هەستی بە بۆنی سیر کرد، فەرمووی: هەر کەسێك لەم دانەوێڵەیەی خوارد با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێتەوە هەتا بۆنەکەی دەڕوات، کاتی نوێژم تەواو کرد

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

هاتم بۆ خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی من عوزر و بیانووم هەیە، دەستم بدەرێ دەستی پێ دام سوێند بە خوا بینیم دەستی ئاسان بوو خستمە نێو سەرقۆڵەکەمەوە بۆ سەر سنگم بینی بە پارچە پەڕۆیەك بەستراوە، فەرمووی: بەڕاستی تۆ بیانووت هەیە.

## بَابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بِالنَّهَارِ فِي الْجَمَاعَةِ ضِدُّ مَذْهَبِ مَنْ كَرِهَ ذَلِكَ

**١٦٧٣-** عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عِتْبَانُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ، فَاسْتَأْذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِكَ؟ قَالَ: فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى نَاحِيَةِ الْبَيْتِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرَ، فَقُمْنَا، فَصَفَفْنَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ(١).

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا بەکۆمەڵ بە پێچەوانەی ئەو مەزهەبەی پێی باش نییە

واتە: مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاڕی دەڵێ: عیتبانی کوڕی مالیك ﷺ پێمی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی کردەوە کاتێ خۆر بەرز بۆیەوە لەگەڵ ئەبو بەکردا هاتن، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتی کرد مۆڵەتم پێی دا دانەنیشت تا هاتە ژوورەوە پاشان فەرمووی: چی شوێنێکت پێ خۆشە لە ماڵەکەتدا نوێژی تێدا بکەم؟ وتی: ئاماژەم بۆ لایەکی ماڵەکەم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا تەکبیری نوێژی کرد و ئێمەیش هەستاین، لە پشتیەوە ڕیزمان بەست، دوو ڕکات نوێژی کرد و پاشان سڵاوی دایەوە.

## بَابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بِاللَّيْلِ فِي الْجَمَاعَةِ فِي غَيْرِ رَمَضَانَ ضِدَّ مَذْهَبِ مَنْ كَرِهَ ذَلِكَ

**١٦٧٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَا، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَوَجَدْنَاهُ قَائِمًا يُصَلِّي، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَقَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالسُّقْيَا أَوْ بِالْقَاحَةِ قَالَ: أَلَا رَجُلٌ يَنْطَلِقُ إِلَى حَوْضِ الْأَثَايَةِ فَيَمْدُرَهُ، وَيَنْزِعَ فِيهِ، وَيَنْزِعَ لَنَا فِي

---

(١) صحيح.

أَسْقِيَتِنَا حَتَّى نَأْتِيَهُ؟ فَقُلْتُ: أَنَا رَجُلٌ، وَقَالَ جَابِرُ بْنُ صَخْرٍ: أَنَا رَجُلٌ، فَخَرَجْنَا عَلَى أَرْجُلِنَا حَتَّى أَتَيْنَاهَا أَصِيلًا، فَمَدَرْنَا الْحَوْضَ، وَنَزَعْنَا فِيهِ، ثُمَّ وَضَعْنَا رُءُوسَنَا حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ أَقْبَلَ رَجُلٌ حَتَّى وَقَفَ عَلَى الْحَوْضِ، فَجَعَلَتْ نَاقَتُهُ تُنَازِعُهُ عَلَى الْحَوْضِ، وَجَعَلَ يُنَازِعُهَا زِمَامَهَا، ثُمَّ قَالَ: أَتَأْذَنَانِ ثَمَّ أَشْرَعُ؟ فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْنَا: نَعَمْ بِأَبِينَا أَنْتَ وَأُمِّنَا، فَأَرْخَى لَهَا، فَشَرِبَتْ حَتَّى ثَمِلَتْ، ثُمَّ قَالَ لَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: فَدَنَا حَتَّى أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِي بِالْعَرْجِ، فَخَرَجَ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، فَصَبَبْتُ لَهُ وَضُوءًا فَتَوَضَّأَ، فَالْتَحَفَ بِإِزَارِهِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ أَتَاهُ آخَرُ، فَقَامَ عَنْ يَسَارِهِ، فَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِالْوِتْرِ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِخْبَارُ ابْنِ عَبَّاسٍ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ - مِنْ هَذَا الْبَابِ.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت بەکۆمەڵ لە شەودا جگە لە ڕەمەزان، پێچەوانەی مەزهەبی ئەو کەسەی پێی باش نییە

واتە: عەمری کوڕی ئەبو سەعید دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ من و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان، بینیمان وەستا بوو نوێژی دەکرد، - دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- و وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتین تا گەیشتینە (السُّقْيَا): (یەکێك بوو لە بیرەکانی مەدینە، خاوەنەکەی مالیکی کوڕی نەزڕ بوو، باوکی ئەنەسی کوڕی مالیك) یان (الْقَاحَة): (کە جێگایەك بوو لە نێوان مەککە و مەدینەدا) فەرمووی: ئایا پیاوێك هەیە بچێت بۆ لای حەوزی (الْأَثَايَةِ) پاکی بکاتەوە و ئاو بکاتە نێو جەوەنەکانمان تا دەگەینە لای؟ وتم: من ئەو پیاوەم دەڕۆم، جابری کوڕی صەخریش وتی: من ئەو پیاوەم دەڕۆم، بەپیادە دەرچووین بە دوای عەسر گەیشتین، حەوزەکەمان پاك کردەوە ئاومان لێ دەرکرد، پاشان پشوومان دا تا شەو هات بەسەرماندا، پیاوێك هات تا لەسەر حەوزەکە وەستا، وشترەکەی دەیویست پێشی بکەوێت بۆسەر حەوزەکە، ئەویش ڕەشمەکەی دەگرت و نەیدەهێشت، پاشان فەرمووی: ئایا مۆڵەتم ئەدەن بچمە ئەوێ؟ بینیمان پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، وتمان: بەڵێ، دایك و باوکمان بەقوربانت بێت، ڕەشمەکەی شل کردەوە، ئاوی خوارد تا

---

(١) صحيح.

تێر بوو، پاشان جابری کوڕی عەبدوڵا پێیانی وت: نزیك بۆیەوە تا وشترەکەی لە جێگایەکی نەرم و فراوان لە (الْعَرْجِ) یەخ دا دواتر چوو بۆ سەرئاوکردن، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆی ئامادە کرد، ئینجا دەستنوێژی گرت، پۆشاکەکەی بەشی خوارەوە لەخۆی پێچا، منیش لەلای چەپی وەستام، بۆ نوێژکردن، ئەویش لەلای ڕاستی داینام، پاشان یەکێکی دیکە هات بۆ لای، لەلای چەپی وەستا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە پێشەوە نوێژی دەکرد، ئێمەیش لەگەڵی سیازدە ڕکاتمان کرد بە ویتریشەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: گێڕانەوەکەی ئیبنو عەباس: لەماڵ پوورم مەیمونە خەوتم پێغەمبەر ﷺ بە شەو نوێژی کرد. -لەم بەشەیە-.

## بَابُ الْوِتْرِ جَمَاعَةً فِي غَيْرِ رَمَضَانَ

**١٦٧٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، وَهِيَ خَالَتُهُ، فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ، حَتَّى انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَلَسَ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى فَفَتَلَهَا وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[1].

## باسی ویترکردن بەکۆمەڵ لە غەیری ڕەمەزان

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، شەو لەلای مەیمونە دایکی بڕواداران خەوت کە پوریەتی، وتی: ڕاکشام لە تەنیشتی پانی ڕاخەرەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ و خیزانەکەی لەسەر درێژاییەکەی ڕاکشان، خەوت تا نیوەی شەو یان کەمێ پێشتر یان کەمێ دوای نیوەی شەو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا لەخەو، دانیشت، بە دەستەکانی خەوی لەسەر ڕوخساری دەسڕی، پاشان دە ئایەتی کۆتایی سوڕەتی ئالی عیمرانی خوێند، پاشان هەستا چوو بۆ لای جەوەنەیەکی ئاوی هەڵواسراو، دەستنوێژی پێ گرت بەچاکترین دەستنوێژ، پاشان هەستا نوێژی کرد، ئیبنو عەباس وتی: لەلای تەنیشتیەوە وەستام،

(١) صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم گوێی ڕاستی گرتم بایدا، دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کورت و پوختی کرد، پاشان چوو نوێژی بەیانی کرد.

## جُمَّاعُ أَبْوَابُ صَلَاةِ النِّسَاءِ فِي الْجَمَاعَةِ

## بَابُ إِمَامَةِ الْمَرْأَةِ النِّسَاءَ فِي الْفَرِيضَةِ

**١٦٧٦-** عَنْ أُمِّ وَرَقَةَ ﵂، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «انْطَلِقُوا بِنَا نَزُورُ الشَّهِيدَةَ، وَأَذِنَ لَهَا أَنْ تُؤَذِّنَ لَهَا، وَأَنْ تَؤُمَّ أَهْلَ دَارِهَا فِي الْفَرِيضَةِ، وَكَانَتْ قَدْ جَمَعَتِ الْقُرْآنَ»[١].

## کۆباسی نوێژی ئافرەتان بەکۆمەڵ

## باسی پێشنوێژی ئافرەت بۆ ئافرەتان بۆ نوێژی فەرز

واتە: ئوممو وەڕەقە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بڕۆن با بچین سەردانی شەهیدە بکەین (دایکی وەڕەقەی کچی عەبدوڵای کوڕی نەوفەلی ئەنصاڕی)، وە مۆڵەتی پێ دا بانگدەرێك لە ماڵەکەیدا بانگی بۆ بدات، پێشنوێژی نوێژی فەرز بە خانەوادەکەی بکات، ئەو ئافرەتە قوڕئانی لەبەر کردبوو.

تێبینی: ئوممو وەڕەقە بۆیە ناو نرا بە شەهید چونکە لە جەنگی بەدر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم بدە بەشداری ئەم جەنگە بکەم لەگەڵت چارەسەری بریندارەکان بکەم بەڵکوو خوا پلەی شەهیدیم پێ ببەخشێت، فەرمووی: لە ماڵی خۆت بمێنەرەوە بێگومان خوا پلەی شەهیدیت پێ دەبەخشێت، بۆیە ناو نرا بە شەهید.

## بَابُ الْإِذْنِ لِلنِّسَاءِ فِي إِتْيَانِ الْمَسَاجِدَ

**١٦٧٧-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَتْ أَحَدَكُمُ امْرَأَتُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا يَمْنَعْهَا». وَقَالَ عَبْدُ الْجَبَّارِ: قَالَ سُفْيَانُ يَعْنِي بِاللَّيْلِ. وَقَالَ سَعِيدٌ: قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ نَافِعٌ: بِاللَّيْلِ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتان بۆ چوونە مزگەوتەکان

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ژنەکەی داوای مۆڵەتی لێ کرد (بە شەو) بچێت بۆ مزگەوت با ڕێگری لێ نەکات. عەبدولجەبار وتی: سوفیان وتی: واتە: بە شەو. سەعید وتی: سوفیان وتی: نافیع وتی: بە شەو.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ مَنْعِ النِّسَاءِ الْخُرُوجَ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِاللَّيْلِ

**١٦٧٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ بِاللَّيْلِ»[١].

## باسی قەدەغەکردن لە ڕێگریکردنی ئافرەتان بە شەو بچن بۆ مزگەوتەکان

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕێگری لە ئافرەتەکانتان مەکەن بە شەو بچن بۆ مزگەوتەکان.

## بَابُ الْأَمْرِ بِخُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى الْمَسَاجِدِ تَفِلَاتٍ

**١٦٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ وَلْيَخْرُجْنَ إِذَا خَرَجْنَ تَفِلَاتٍ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە ئافرەتان کاتێ دەچن بۆ مزگەوتەکان بۆنی خۆش لە خۆیان نەدەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕێگری مەکەن لە ئافرەتان بچن بۆ مزگەوتەکانی خوا، وە با کاتێ دەردەچن بۆنی خۆش لە خۆیان نەدەن.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ شُهُودِ الْمَرْأَةِ الْمَسْجِدَ مُتَعَطِّرَةً

١٦٨٠- عَنْ زَيْنَبَ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلَا تَمَسَّ طِيبًا»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئافرەت بۆنی خۆش بدات لەخۆی لە کاتی ئامادەبوونی لە مزگەوت

واتە: زەینەب خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئامادەی مزگەوت بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات.

**بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَعَطُّرِ الْمَرْأَةِ عِنْدَ الْخُرُوجِ لِيُوجَدَ رِيحُهَا وَتَسْمِيَةِ فَاعِلِهَا زَانِيَة، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الزَّانِي قَدْ يَقَعُ عَلَى مَنْ يَفْعَلْ فِعْلًا لَا يُوجِبُ ذَلِكَ الْفِعْلَ جَلْدًا وَلَا رَجْمًا، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّشْبِيهَ الَّذِي يُوجِبُ ذَلِكَ الْفِعْلَ إِنَّمَا يَكُونُ إِذَا اشْتَبَهَتِ الْعِلَّتَانِ لَا لِاجْتِمَاعِ الِاسْمِ، إِذِ الْمُتَعَطِّرَةُ الَّتِي تَخْرُجُ لِيُوجَدَ رِيحُهَا قَدْ سَمَّاهَا النَّبِيُّ ﷺ زَانِيَة، وَهَذَا الْفِعْلُ لَا يُوجِبُ جَلْدًا وَلَا رَجْمًا، وَلَوْ كَانَ التَّشْبِيهُ بِكَوْنِ الِاسْمِ عَلَى الِاسْمِ، لَكَانَتِ الزَّانِيَة بِالتَّعَطُّرِ يَجِبُ عَلَيْهَا مَا يَجِبُ عَلَى الزَّانِيَة بِالْفَرْجِ، وَلَكِنْ لَمَّا كَانَتِ الْعِلَّةُ الْمُوجِبَةُ لِلْحَدِّ فِي الزِّنَا الْوَطْءَ بِالْفَرْجِ لَمْ يَجُزْ أَنْ يُحْكَمَ لِمَنْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ زَانٍ، وَزَانِيَة بِغَيْرِ جِمَاعٍ بِالْفَرْجِ فِي الْفَرْجِ بِجَلْدٍ وَلَا رَجْمٍ**

١٦٨١- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِيَ زَانِيَة، وَكُلُّ عَيْنٍ زَانِيَة»[٢].

**باسی هەڕەشەکردن لەوەی ئافرەت بۆنی خۆش لە خۆی بدات بۆ ئەوەی بۆنی بکرێ، وە بکەرەکەی ناو دەنرێ بە زیناکار، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەندێ جار ناوی زینا بەسەر کەسێکدا دەچەسپێت کردەوەیەك دەکات ئەو کردەوە نە داری حەد و نە ڕەجم واجب ناکات، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو لێکچوواندنانەی کەوا ئەو کردەوە واجب دەکەن، لە کاتێکدا**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

**دەبێت ئەگەر هەردوو هۆکارەکە یەك بگرن نەك هەردوو ناوەکە، چونکە ئەو ئافرەتەی خۆی بۆنخۆش کردووە دەردەچێت بۆ ئەوەی هەست بە بۆنەکەی بکرێ، پێغەمبەر ﷺ ناوی لێ ناوە بە زیناکار، وە ئەم کردارە داری حەد و ڕەجم لەسەر خاوەنەکەی واجب ناکات، ئەگەر لەیەکچوواندنەکە بە بوونی ناو بووایە لەسەر ناو، ئەوە ئەو ئافرەتەی بە بۆنی خۆش ناوی زیناکار هەڵگرتووە هەمان حوکمی ئەو کەسەی لەسەر پێویست دەبوو کە بە داوێن زینای کردووە، بەڵام کاتێ هۆکاری پێویستبوونی سەپاندنی حەدی شەرعی لە زینادا بە داوێنە، ئەوە دروست نییە ئەو کەسەی ناوی زینای بەسەردا سەپاوە بەبێ جووتبوونی داوێن لەگەڵ داوێن داری حەدی لێ بدرێ یان ڕەجم بکرێ**

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکات پاشان تێپەڕ بێت بە لای خەڵکانێکدا، بۆ ئەوەی بۆنی ئەو بۆنە خۆشە بکەن کە لە خۆی داوە ئەوە زینای کردووە، هەر چاوێکیش (تەماشای ئافرەتێکی نامەحرەم بکات بەحەز و ئارەزووەوە) ئەوە زینای کردووە.

## بَابُ إِيجَابِ الْغُسْلِ عَلَى الْمُتَطَيِّبَةِ لِلْخُرُوجِ إِلَى الْمَسْجِدِ، وَنَفْيِ قَبُولِ صَلَاتِهَا إِنْ صَلَّتْ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ

١٦٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّتْ بِأَبِي هُرَيْرَةَ امْرَأَةٌ وَرِيحُهَا تَعْصِفُ، فَقَالَ لَهَا: إِلَى أَيْنَ تُرِيدِينَ يَا أَمَةَ الْجَبَّارِ؟ قَالَتْ: إِلَى الْمَسْجِدِ قَالَ: تَطَيَّبْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: فَارْجِعِي فَاغْتَسِلِي، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يُقْبَلُ اللَّهُ مِنَ امْرَأَةٍ صَلَاةً خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ وَرِيحُهَا تَعْصِفُ حَتَّى تَرْجِعَ فَتَغْتَسِلَ»[1].

## باسی پێویستە ئەو ئافرەتەی خۆی بۆن خۆش دەکات و دەچێت بۆ مزگەوت (پێش ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت) خۆی بشوات، ئەگەر پێش خۆشۆردن نوێژ بکات نوێژەکەی وەرناگیرێ

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك بەلای ئەبو هوڕەیرە تێپەڕ بوو بۆنی خۆشی لە خۆیدا بوو بە دەوروبەریدا بڵاو دەبۆیەوە، پێی وت: بۆ کوێ دەڕۆی ئەی بەندەی

---

(١) إسناده ضعيف.

خوای باڵادەست؟ وتی: بۆ مزگەوت، وتی: بۆنی خۆشت لە خۆت داوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: بگەڕێرەوە خۆت بشۆرە، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا نوێژ لە هیچ ئافرەتێك وەرناگرێ دەربچێت بۆ مزگەوت بۆنی (عەتر و گوڵاوی) بڵاو ببێتەوە تا دەگەڕێتەوە خۆی دەشوات.

**بَابُ اخْتِيَارِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا عَلَى صَلَاتِهَا فِي الْمَسْجِدِ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ السَّائِبَ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ، وَلَا أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ هَذَا الْخَبَرَ مِنِ ابْنِ عُمَرَ، وَلَا هَلْ سَمِعَ قَتَادَةُ خَبَرَهُ مِنْ مُوَرِّقٍ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ أَمْ لَا؛ بَلْ كَأَنِّي لَا أَشُكُّ أَنَّ قَتَادَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي الْأَحْوَصِ؛ لِأَنَّهُ أَدْخَلَ فِي بَعْضِ أَخْبَارِ أَبِي الْأَحْوَصِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَبِي الْأَحْوَصِ مُوَرِّقًا، وَهَذَا الْخَبَرُ نَفْسُهُ أَدْخَلَ هَمَّامٌ وَسَعِيدُ بْنُ بَشِيرٍ بَيْنَهُمَا مُوَرِّقًا**

**١٦٨٣**- عَنِ السَّائِبِ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ مَسَاجِدِ النِّسَاءِ قَعْرُ بُيُوتِهِنَّ»[١].

**باسی نوێژی ئافرەت لەماڵەوە چاکترە لە نوێژکردنی لە مزگەوت، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، چونکە من نازانم سائیبی مەولای ئوممو سەلەمە دادپەروەرە یان لەکەدارە، وە من زانیاریم نییە لەسەر ئەوەی حەبیبی کوڕی ئەبو سابت ئەم فەرموودەی لە ئیبنو عومەرەوە بیستووە یان نا،(فەرموودەی ژمارە ١٤٨٦) وە نازانم ئایا قەتادە فەرموودەکەی بیستووە لە مووەریق لە ئەبولئەحوصەوە یان نا، بەڵکوو من گومانم نییە قەتادە لە ئەبولئەحوصەوە نەیبیستووە، چونکە لە هەندێ لە فەرموودەکانی ئەبولئەحوەص مووەریقی خستووەتە نێوان خۆی و ئەبولئەحوەص، وە خودی ئەم فەرموودەیە هومام و سەعیدی کوڕی بەشیر مورەیقیان خستووەتە نێوان قەتادە و ئەبولئەحوەص**

واتە: سائیبی مەولای ئوممو سەلەمە دەگێڕێتەوە، لە ئوممو سەلەمەوە ﵂، خێزانی پێغەمبەر ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: چاکترینی مزگەوتی ئافرەتان نێو ماڵەکانیانە.

---

(١) إسناده ضعيف.

١٦٨٤- عَنِ حَبِيب بْنِ أَبِي ثَابِتٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ»، فَقَالَ ابْنٌ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: بَلَى وَاللَّهِ، لَنَمْنَعُهُنَّ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: تَسْمَعُنِي أُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتَقُولُ مَا تَقُولُ؟[1]

واتە: حەبیبی کوڕی ئەبو سابیت دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگری لە خێزانەکانتان مەکەن بچن بۆ مزگەوتەکان، بەڵام ماڵەکانیان بۆ ئەوان چاکترە، کوڕێکی عەبدوڵای کوڕی عومەر (کە ناوی بیلال بوو) بە عەبدوڵای کوڕی عومەری وت: بەڵێ، سوێند بە خوا ڕێگرییان لێ دەکەین، ئیبنو عومەر وتی: گوێت لێمە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ باس دەکەم کەچی ئەوە دەڵێی کە دەیڵێی؟

١٦٨٥- عَنْ هَمَّام عَنْ قَتَادَةَ عَنْ مُورِّقٍ عَن أَبِي الأَحْوَص عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمَرْأَةَ عَوْرَةٌ، فَإِذَا خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ، وَأَقْرَبُ مَا تَكُونُ مِنْ وَجْهِ رَبِّهَا وَهِيَ فِي قَعْرِ بَيْتِهَا».

واتە: هەمام دەگێڕێتەوە لە قەتادە لە موەریقەوە لە ئەبولئەحوەص لە عەبدوڵاوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئافرەت عەورەتە، ئەگەر دەرچوو شەیتان لەپێش چاوی پیاوان جوانی دەکات، وە نزیکترین کاتی لە پەروەردگاریەوە ئەو کاتەیە کە لەنێو ماڵەکەیدایە.

١٦٨٦- عَنِ الْمُعْتَمِرُ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ، وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ، وَإِنَّهَا لَا تَكُونُ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ أَقْرَبَ مِنْهَا فِي قَعْرِ بَيْتِهَا»[2].

واتە: موعتەمەر دەڵێ: گوێم لێ بوو باوکم دەیگێڕایەوە لە قەتادە لە ئەبولئەحوەص لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت عەورەتە، بێگومان ئەگەر دەرچوو شەیتان لەپێش چاوی پیاوان جوانی دەکات، وە نزیکترین کاتی لە خوا ئەو کاتەیە کە لەنێو ماڵەکەیدایە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٦٨٧- عَنْ سَعْدِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُوَرِّقٍ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ بِمِثْلِهِ[1].

واتە: سەعدی کوڕی بەشیر دەگێڕێتەوە لە قەتادە لە موەریق لە ئەبولئحەوەص لە عەبدوڵاوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموو.

## بَابُ اخْتِيَارِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا عَلَى صَلَاتِهَا فِي حُجْرَتِهَا، إِنْ كَانَ قَتَادَةُ سَمِعَ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ مُوَرِّقٍ

١٦٨٨- عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُوَرِّقٍ الْعِجْلِيِّ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا أَعْظَمُ مِنْ صَلَاتِهَا فِي حُجْرَتِهَا»[2].

## باسی ئافرەت لەنێو سووچی ماڵەکەیدا نوێژ بکات چاکترە لەوەی لە ژوورەکەیدا نوێژ بکات، ئەگەر قەتادە ئەم فەرموودەی بیستبێت لە موەریقەوە

واتە: هەمام دەگێڕێتەوە لە قەتادە لە موەریقی عجلی لە ئەبولئەحوەص لە عەبدوڵاوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لە سووچی ماڵەکەی نوێژ بکات گەورەترە بۆی لەوەی لە ژوورەکەیدا نوێژ بکات.

## بَابُ اخْتِيَارِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي حُجْرَتِهَا عَلَى صَلَاتِهَا فِي دَارِهَا، وَصَلَاتِهَا فِي مَسْجِدِ قَوْمِهَا عَلَى صَلَاتِهَا فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِنْ كَانَتْ صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ تَعْدِلُ أَلْفَ صَلَاةٍ فِي غَيْرِهَا مِنَ الْمَسَاجِدِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ: صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ، أَرَادَ بِهِ صَلَاةَ الرِّجَالِ دُونَ صَلَاةِ النِّسَاءِ

١٦٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُوَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَمَّتِهِ ﷺ، امْرَأَةِ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهَا جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُحِبُّ الصَّلَاةَ مَعَكَ، فَقَالَ: «قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكِ تُحِبِّينَ الصَّلَاةَ مَعِي، وَصَلَاتُكِ فِي بَيْتِكِ خَيْرٌ مِنْ صَلَاتِكِ فِي حُجْرَتِكِ، وَصَلَاتُكِ فِي حُجْرَتِكِ خَيْرٌ مِنْ صَلَاتِكِ فِي دَارِكِ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وَصَلَاتُكِ فِي دَارِكِ خَيْرٌ مِنْ صَلَاتِكِ فِي مَسْجِدِ قَوْمِكِ، وَصَلَاتُكِ فِي مَسْجِدِ قَوْمِكِ خَيْرٌ مِنْ صَلَاتِكِ فِي مَسْجِدِي، فَأَمَرَتْ، فَبُنِيَ لَهَا مَسْجِدٌ فِي أَقْصَى شَيْءٍ مِنْ بَيْتِهَا وَأَظْلَمِهِ، فَكَانَتْ تُصَلِّي فِيهِ حَتَّى لَقِيَتِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ»[١].

**باسی ئافرەت نوێژ لە ژوورەکەیدا بکات چاکترە لە نوێژکردنی لە ماڵەکەی، وە نوێژکردنی لە مزگەوتی کەسوکارەکەی چاکترە بۆی لە نوێژکردنی لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەرچی نوێژێك لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەرانبەرە بە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی دیکە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: نوێژێك لەم مزگەوتەی من چاکترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی دیکە. مەبەستی پێی نوێژی پیاوانە نەك ئافرەتان**

واتە: عەبدوڵای کوڕی سوەیدی ئەنصاڕی دەگێڕێتەوە لە پوریەوە ﷺ (خوشکی باوکی) خێزانی ئەبو حومەیدی ساعیدی ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من پێم خۆشە لەگەڵت نوێژ بکەم، فەرمووی: ئەزانم تۆ پێت خۆشە لەگەڵم نوێژ بکەی، بەڵام نوێژکردنت لە سووچی ماڵەکەت چاکترە لە نوێژکردنت لەنێو ژوورەکەت، وە نوێژکردنت لە ژوورەکەت چاکترە لە نوێژکردنت لەنێو ماڵەکەت، وە نوێژکردنت لە ماڵەکەت چاکترە لە نوێژکردنت لەنێو مزگەوتی کەسوکارەکەت، وە نوێژکردنت لەنێو مزگەوتی کەسوکارەکەت چاکترە لە نوێژکردنت لە مزگەوتەکەی من. ئەویش بڕیاری دا مزگەوتێکی بۆ دروست کرا لە سووچی ماڵەکەی و تاریکترین شوێنی، لەوێ نوێژی دەکرد تا کۆچی دوایی کرد.

## بَابُ اخْتِيَارِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي مَخْدَعِهَا عَلَى صَلَاتِهَا فِي بَيْتِهَا

١٦٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الْمَرْأَةِ فِي مَخْدَعِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهَا فِي بَيْتِهَا، وَصَلَاتُهَا فِي بَيْتِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهَا فِي حُجْرَتِهَا»[٢].

---

(١) حديث حسن.

(٢) صحيح.

## باسی ئافرەت لە ژوورە بچووکەکەی نوێژ بکات چاکترە بۆی نوێژ لە ماڵەکەیدا بکات

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی ئافرەت لە ژوورە بچووکەکەیدا چاکترە لە نوێژکردنی لەنێو ماڵەکەی، وە نوێژکردنی لە ماڵەکەی چاکترە لە نوێژکردنی لە حەوشەکەی.

تێبینی: (مَخْدَع): بریتییە لە ژوورێکی بچووك لەنێو ژوورێکی دیکەدا، تایبەتە بە ئافرەتەکە، شتە بەنرخەکانی خۆی لەوێ دادەنێت.

## بَابُ اخْتِيَارِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي أَشَدِّ مَكَانٍ مِنْ بَيْتِهَا ظُلْمَةً

١٦٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَبَّ صَلَاةٍ تُصَلِّيهَا الْمَرْأَةُ إِلَى اللَّهِ فِي أَشَدِّ مَكَانٍ فِي بَيْتِهَا ظُلْمَةً»[1].

## باسی چاکتر وایە ئافرەت تاریکترینی ژوورەکەی هەڵبژێری بۆ نوێژکردن

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خۆشەویستترین نوێژی ئافرەت بەلای خواوە ئەو نوێژەیەتی لە تاریکترین شوێنی ماڵەکەی ئەنجامی دەدا.

١٦٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحَبَّ صَلَاةٍ تُصَلِّيهَا الْمَرْأَةُ إِلَى اللَّهِ أَنْ تُصَلِّيَ فِي أَشَدِّ مَكَانٍ مِنْ بَيْتِهَا ظُلْمَةً»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خۆشەویستترین نوێژی ئافرەت بەلای خواوە ئەو نوێژەیەتی لە تاریکترین شوێنی ماڵەکەی ئەنجامی دەدا.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ فَضْلِ صُفُوفِ النِّسَاءِ الْمُؤَخَّرَةِ عَلَى الصُّفُوفِ الْمُقَدَّمَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صُفُوفَهُنَّ إِذَا كَانَتْ مُتَبَاعِدَةً عَنْ صُفُوفِ الرِّجَالِ كَانَتْ أَفْضَلَ

**١٦٩٣م**[١]- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا»[٢].

## باسی ڕیزی کۆتایی ئافرەتان چاکترە لە ڕیزی پێشەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ڕیزەکانیان تا لە ڕیزی پیاوان دوورتر بێت چاکترە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕیزی پیاوان لە نوێژدا یەکەمینییەتی، خراپترینیشیان کۆتاییەکەیەتی، چاکترینی ڕیزی ئافرەتان لە نوێژدا کۆتاییەکەیەتی، خراپترینیشیان یەکەمینیەتی.

## بَابُ أَمْرِ النِّسَاءِ بِخَفْضِ أَبْصَارِهِنَّ إِذَا صَلَّيْنَ مَعَ الرِّجَالِ إِذَا خِفْنَ رُؤْيَةَ عَوْرَاتِ الرِّجَالِ إِذَا سَجَدَ الرِّجَالُ أَمَامَهُنَّ

**١٦٩٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، إِذَا سَجَدَ الرِّجَالُ فَاحْفَظُوا أَبْصَارَكُنَّ»، قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ: مِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: «مِنْ ضِيقِ الْأُزُرِ»[٣].

## باسی فەرمانکردن بە ئافرەتان چاویان دابخەن کاتێ لەگەڵ پیاوان نوێژیان کرد، ئەگەر ترسان لەوەی عەورەتی پیاوان ببینن، ئەگەر پیاوان لەپێشیانەوە سوژدەیان برد

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ئەگەر پیاوان سوژدەیان برد چاوەکانتان بپارێزن، بە عەبدوڵام وت: بۆچی؟ وتی: لەبەر تەسکی پۆشاکی بەشی خوارەوە.

---

(١) لە نوسخەی عەرەبی ئەم کتێبە لە ڕیزبەندییەکە ژمارە (١٦٩٣) دوو جار دووبارە بۆتەوە، ئێمەش هەر لەسەر ئەوە دەڕۆین.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

١٦٩٤- عَنْ أَبِي عَاصِمٍ ﷺ، بِمِثْلِهِ، وَقَالَ: «فَاحْفَظُوا أَبْصَارَكُمْ مِنْ عَوْرَاتِ الرِّجَالِ». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

واتە: ئەبو عاصم ﷺ دەگێڕێتەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەكەی پێشوو، وە فەرمووی: چاوەكانتان بپارێزن لە عەوڕەتی پیاوان. دواتر باسی فەرموودەكەی كرد.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ رَفْعِ النِّسَاءِ رُءُوسَهُنَّ مِنَ السُّجُودِ، إِذَا صَلَّيْنَ مَعَ الرِّجَالِ قَبْلَ اسْتِوَاءِ الرِّجَالِ جُلُوسًا، إِذَا ضَاقَتْ أُزُرُهِمْ، فَخِيفَ أَنْ يَرَى النِّسَاءُ عَوْرَاتِهِمْ

١٦٩٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّ النِّسَاءُ يُؤْمَرْنَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ لَا يَرْفَعْنَ رُءُوسَهُنَّ حَتَّى يَأْخُذَ الرِّجَالُ مَقَاعِدَهُمْ مِنْ قَبَاحَةِ الثِّيَابِ[٢].

## باسی سەرزەنشتكردن لەوەی ئافرەتان لە سوژدە سەریان بەرز بكەنەوە، كاتێ نوێژ دەكەن لەگەڵ پیاوان پێش ئەوەی پیاوان ڕێك ببنەوە لە دانیشتن، ئەگەر پۆشاكی بەشی خوارەوەی پیاوان كورت و تەسك بوو، مەترسی ئەوە هەبوو ئافرەتان عەوڕەتیان ببینن

واتە: سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ فەرمانیان پێ دەكرا لە نوێژەكانیان سەربەرز نەكەنەوە تا پیاوان دادەنیشن، بەهۆی خراپی جلوبەرگەكانیان.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي قِيَامِ الْمَأْمُومِ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ إِذَا كَانَ خَلْفَهُ نِسَاءٌ، إِذَا أَرَادَ النَّظَرَ إِلَيْهِنَّ، أَوْ إِلَى بَعْضِهِنَّ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا نَظَرَ إِلَى مَنْ خَلْفَهُ مِنَ النِّسَاءِ لَمْ يُفْسِدْ ذَلِكَ الْفِعْلُ صَلَاتَهُ

١٦٩٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ تُصَلِّي خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَكَانَ بَعْضُ الْقَوْمِ يَتَقَدَّمُ فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ لِئَلَّا يَرَاهَا، وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخِّرِ، فَإِذَا رَكَعَ نَظَرَ مِنْ تَحْتِ إِبْطِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي شَأْنِهَا: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ الحجر[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف ومتنه منكر.

## باسی هەڕەشەکردن لەوەی نوێژخوێن لە ڕیزی دواوە بوەستێ، ئەگەر ئافرەتان لە پشتیەوە بوون، ئەگەر ویستی تەماشایان بکات یان تەماشای دانەیەکیان بکات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی نوێژخوێن ئەگەر تەماشای ئافرەتان بکات لە دوای خۆیەوە، ئەو کردەوەیە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: ئافرەتێکی زۆر جوان هەبوو لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، هەندێ لە خەڵکەکە پێش دەکەوتن بۆ ڕیزی یەکەمی نوێژەکە بۆ ئەوەی نەیبینن، هەندێکی دیکەش خۆیان دوا دەخست تا دەکەوتە ڕیزی دواوە، کاتێ بچووایەتە ڕکووع لە بنباڵیەوە تەماشای دەکرد، خوای گەورەش ئەم دەقەی دابەزاند: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾، واتە: سوێند بە خوا ئێمە ئاگادارین بەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون و سوێند بە خوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کە پاش ئێوە دێن.

١٦٩٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَالِكٍ، بِنَحْوِهِ[1].

واتە: عەمری کوڕی مالیك بەهەمان شێوە گێڕاویەتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْ مَنْعِ النِّسَاءِ الْمَسَاجِدَ كَانَ إِذْ كُنَّ لَا يُخَافُ فَسَادُهُنَّ فِي الْخُرُوجِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَظَنٌّ لَا بِيَقِينٍ

١٦٩٨- عَنْ عَمْرَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: لَوْ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ بَعْدَهُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسَاجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ؟ أَوَ مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردن لە ڕێگری ئافرەتان بۆ مزگەوتەکان ئەگەر مەترسی خراپبوونیان نەکرا لە دەرچوونیان بۆ مزگەوتەکان، ئەویش گومانە نەك دڵنیایی

---

(١) إسناده ضعيف ومتنه منكر.

(٢) صحيح.

واتە: عەمرە دەڵێ: گوێم لێ بوو عائیشە ﵂ دەیوت: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ببینایە لەدوای ئەو ئافرەتان چییان دەكرد (لە خۆڕازاندنەوە و خۆجوانكردن) ئەوە ڕێگری مزگەوتی لێ دەكردن، وەكوو چۆن ڕێگری لە ئافرەتانی نەوەكانی ئیسرائیل كرا، وتم: ئەوە چییە؟ ئایا ئافرەتانی نەوەكانی ئیسرائیل ڕێگرییان لێ كرا؟ وتی: بەڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ بَعْضِ أَحْدَاثِ نِسَاءِ بَنِي إِسْرَائِيلَ الَّذِي مِنْ أَجْلِهِ مُنِعْنَ الْمَسَاجِدَ

١٦٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ الدُّنْيَا فَقَالَ: «إِنَّ الدُّنْيَا خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَاتَّقُوهَا، وَاتَّقُوا النِّسَاءَ، ثُمَّ ذَكَرَ نِسْوَةً ثَلَاثًا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ: امْرَأَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ تُعْرَفَانِ، وَامْرَأَةً قَصِيرَةً لَا تُعْرَفُ، فَاتَّخَذَتْ رِجْلَيْنِ مِنْ خَشَبٍ، وَصَاغَتْ خَاتَمًا، فَحَشَتْهُ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ الْمِسْكِ، وَجَعَلَتْ لَهُ غُلْقًا، فَإِذَا مَرَّتِ الْمَسْجِدَ أَوْ بِالْمَلَأِ قَالَتْ بِهِ فَفَتَحَتْهُ»[1].

## باسی هەندێك لە ڕەفتاری ئافرەتانی نەوەكانی ئیسرائیل كە لەبەر ئەوە ڕێگری مزگەوتیان لێ كرا

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دنیای كرد و فەرمووی: بەڕاستی (ماڵ و سامانی) دنیا سەوز و شرینە، خۆتانی لێ بپارێزن، وە خۆتان لە ئافرەتان بپارێزن، پاشان باسی سێ ئافرەتی كرد لە نەوەكانی ئیسرائیل دووانیان درێژ بوون دەناسران و دانەیەكیان كورت بوو نەدەناسرا، هەستا دوو پێڵاوی لە دار دروست كرد، موستیلەیەكیشی دروست كرد خۆشترین بۆنی تێ كرد، كاتێ بەلای مزگەوت یان كۆمەڵێكدا تێپەڕ بووایە سەری موستیلەكەی دەكردەوە و بۆنەكەی بڵاو دەبۆیەوە.

١٧٠٠- عَنْ عَبدِ الرَّحمَنِ بْنِ يَزِيد أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، كَانَ إِذَا رَأَى النِّسَاءَ قَالَ: أَخِّرُوهُنَّ حَيْثُ جَعَلَهُنَّ اللَّهُ، وَقَالَ: إِنَّهُنَّ مَعَ بَنِي إِسْرَائِيلَ يَصْفُفْنَ مَعَ الرِّجَالِ، كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْبَسُ الْقَالِبَ فَتَطَالُ لِخَلِيلِهَا، فَسُلِّطَتْ عَلَيْهِنَّ الْحَيْضَةُ، وَحُرِّمَتْ عَلَيْهِنَّ الْمَسَاجِدُ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح موقوفاً.

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷛ ئەگەر ئافرەتانی ببینایە، دەیوت: بیانخەنە دواوە وەکوو چۆن خوا لەدوای پیاوانەوە دایناون، وە وتی: ئەوان لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیل لەگەڵ پیاوان ڕیزیان دەبەست، ئافرەتی وا هەبوو پێڵاوی بنبەرزی لەپێ دەکرد بۆ ئەوەی لەپێش چاو خۆشەویستەکەی دەرکەوێت، بۆیە حەیزیان بەسەردا زاڵ کرا و مزگەوتەکانیان لەسەر حەرام کرا.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِمَامَةِ الْمَمَالِيكِ الْأَحْرَارِ إِذَا كَانَ الْمَمَالِيكُ أَقْرَأَ مِنَ الْأَحْرَارِ

**١٧٠١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷛، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اجْتَمَعَ ثَلَاثَةٌ أَمَّهُمْ أَحَدُهُمْ، وَأَحَقُّهُمْ بِالْإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ وَخَبَرِ قَتَادَةَ عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَخَبَرِ أَوْسِ بْنِ ضَمْعَجٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْعَبِيدَ إِذَا كَانُوا أَقْرَأَ مِنَ الْأَحْرَارِ كَانُوا أَحَقَّ بِالْإِمَامَةِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَسْتَثْنِ فِي الْخَبَرِ حُرًّا دُونَ مَمْلُوكٍ.

## باسی مۆڵەتدان بەوەی کۆیلەکان پێشنوێژی ئازادەکان بکەن، ئەگەر کۆیلەکان قورئانیان زیاتر لەبەر بوو لە ئازادەکان

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس کۆبوونەوە با یەکێکیان پێشنوێژییان بۆ بکات، لەپێشترینیان قورئانخوێنترینیانە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرمووده و فەرموودەکەی قەتادە لە ئەبو نەزرە لە ئەبو سەعیدەوە، وە فەرموودەکەی ئەوسی کوڕی زەمعەج لە ئەبو مەسعودەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر کۆیلەکان قورئانیان زیاتر لەبەر بوو لە ئازادەکان ئەوە لەپێشترن بە پێشنوێژی، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکە ئازادی جیا نەکردۆتەوە لە کۆیلە.

## بَابُ الصَّلَاةِ جَمَاعَةً فِي الْأَسْفَارِ

**١٧٠٢-** عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ ﷛ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى أَكْثَرَ مَا كُنَّا وَآمَنَهُ رَكْعَتَيْنِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی نوێژی بەکۆمەڵ لە گەشتەکاندا

واتە: حاریسی کوڕی وەهبی خوزاعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا دوو ڕکات نوێژی (فەڕزی) بۆ کردین لە ئەوسا زیاتر لە ئاساییشدا بووین (مەبەستی ئەوەیە کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا دروستە).

## بَابُ الصَّلَاةِ جَمَاعَةً بَعْدَ ذَهَابِ وَقْتِهَا

**١٧٠٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنِ الصَّلَاةِ، حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ بِهَوِيٍّ مِنَ اللَّيْلِ، حَتَّى كُفِينَا، وَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾الأحزاب، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَالًا، فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ كَأَحْسَنِ مَا كَانَ يُصَلِّيهَا، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الْعَصْرَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ كَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ صَلَاةُ الْخَوْفِ ﴿فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾﴾ البقرة[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ خَرَّجْتُ إِمَامَةَ النَّبِيِّ ﷺ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ لَيْلَةَ نَامُوا عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ فِيمَا مَضَى مِنْ هَذَا الْكِتَابِ، وَهُوَ مِنْ هَذَا الْبَابِ أَيْضًا.

## باسی نوێژی بەکۆمەڵ دوای ڕۆیشتنی کاتەکەی

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەندەق گیردراین نەمانتوانی نوێژ بکەین، تا دوای ئێوارە بەشێك لە شەو تێپەڕ بوو، کاتێ خوا ئێمەی پاراست لە جەنگ، وەك فەرموویەتی: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾، واتە: خوا ﷻ ئیماندارانی لە جەنگ پاراست، بەڕاستی خوا هەمیشە بەهێزو بەدەسەڵاتە. پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی بیلالی کرد، قامەتی بۆ کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد وەکوو چۆن لە کاتی خۆیدا بەجوانترین شێوە دەیکرد، پاشان قامەتی بۆ کرد، نوێژی عەسری کرد وەکوو نیوەڕۆ، پاشان قامەتی بۆ کرد، نوێژی ئێوارەی کرد، وەکوو نوێژی پێشوو، پاشان قامەتی بۆ کرد، نوێژی عیشای کرد بەهەمان شێوە، پێش ئەوەی ئایەتی نوێژی ترس دابەزێت: ﴿فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾﴾، واتە: بەپیادە یان بەسواری.

---

(١) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان لەم کتێبەدا باسی پێشنوێژی پێغەمبەرم ﷺ کرد، لە نوێژی بەیانی دوای ئەوەی کە خۆرهەڵات ئەو شەوەی کە خەویان بەسەرداهات و بە ئاگانەهاتنەوە تا خۆر کەوت، ئەم باسەش لەم بەشەدا هەیە.

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْجَمَاعَةِ فِي السَّفَرِ

**١٧٠٤-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّهُمْ، خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ تَبُوكَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ قَالَ: فَأَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

### باسی کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەردا و ئەنجامدانیان بە کۆمەڵ

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی تەبووك دەرچوون، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشای کۆ دەکردەوە، وتی: ڕۆژێك نوێژی دوا خست، پاشان هاتە دەرەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد، پاشان چووە ژوورەوە، پاشان هاتە دەرەوە نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە کرد. دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْفَصْلِ بَيْنَ الْفَرِيضَةِ وَالتَّطَوُّعِ بِالْكَلَامِ أَوِ الْخُرُوجِ

**١٧٠٥-** عَنْ عُمَرَ بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: أَرْسَلَنِي نَافِعُ بْنُ جُبَيْرٍ إِلَى السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ أَسْأَلُهُ، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: نَعَمْ صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ مَعَ مُعَاوِيَةَ ﷺ، فَلَمَّا سَلَّمَ قُمْتُ أُصَلِّي، فَأَرْسَلَ إِلَيَّ فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ، إِلَّا أَنْ تَخْرُجَ أَوْ تَتَكَلَّمَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِذَلِكَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بە جیاکردنەوەی نوێژی فەڕز لە سوننەت بە قسەکردن یان دەرچوون

واتە: عومەری کوڕی عەتاء دەڵێ: نافیعی کوڕی جوبەیر ناردمی بۆ لای سائیبی کوڕی یەزید پرسیاری لێ بکەم، پرسیارم لێکرد وتی: بەڵێ لەگەڵ موعاویە ﷺ نوێژی هەینیم کرد لە ژوورێك کە لەنێو مزگەوتدا دروست کرابوو، کاتێ سەلامی دایەوە هەستام نوێژ بکەم، ناردی بە دوامدا منیش هاتم بۆ لای، وتی: ئەگەر نوێژی هەینیت کرد یەکسەر بە دوایدا نوێژی سوننەت مەکە تا دەردەچیت لەو جێگایە یان قسە دەکەیت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە کردووە.

## بَابُ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالتَّكْبِيرِ وَالذِّكْرِ عِنْدَ قَضَاءِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ

**١٧٠٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كُنْتُ أَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالتَّكْبِيرِ(١).

## باسی دەنگ بەرزکردنەوە بە (الله أكبر) و یادی خوا لە کاتی تەواوبوونی پێشنوێژ لە نوێژەکەی

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: من بە دەنگی تەکبیر (الله أكبر) دەمزانی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کردووە.

**١٧٠٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حِينَ يَنْصَرِفُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَكُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ(٢).

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەدوای نوێژە فەڕزەکان دەنگ بەرز دەکرایەوە بەیاد و زیکری خوا، ئیبنو عەباس وتی: من بەدەنگی زیکر و یادی خوا دەمزانی نوێژیان تەواو کردووە.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## بَابُ نِيةِ الْمُصَلِّي بِالسَّلَامِ مَنْ عَنْ يَمِينِهِ إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهِ إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَسَارِهِ

**١٧٠٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَشَارَ أَحَدُنَا إِلَى أَخِيهِ بِيَدِهِ، عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يَفْعَلُ هَذَا كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمُسٍ؟ إِنَّمَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ - أَوْ أَلَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا؟ وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَى أَخِيهِ مَنْ عَنِ يَمِينِهِ، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهِ»[١].

## باسی نییەتی نوێژخوێن بە سەلامکردن لەوەی لەلای ڕاستێتی، ئەگەر بەلای ڕاستیدا سەلامی دایەوە، وە ئەوەشی لەلای چەپێتی، ئەگەر بەلای چەپیدا سەلامی دایەوە

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێ لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان بکردایە، هەر یەکێکمان بەدەستی ئاماژەی دەکرد بۆ براکەی بەلای ڕاستی و بەلای چەپی، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد فەرمووی: ئەوە چییە دەبینم هی واتان هەیە دەستەکانتان بەرز کردۆتەوە ئێژی کلکی ڕەوە ئەسپن لە ترسی دڕندە هەڵهاتوون؟ تەنها ئەوەندە بەسە بۆ هەر یەکێکتان -یان ئەوەندە بەس نییە بۆ هەر یەکێکتان- بەوشێوەیە بکات؟ دەستەکانی خستە سەر ڕانی ڕاستی، بە پەنجەی ئاماژەی کرد، پاشان سەلامی کرد لەسەر براکەی ئەوەی لەلای ڕاستێتی و ئەوەیشی لەلای چەپێتی.

## بَابُ سَلَامِ الْمَأْمُومِ مِنَ الصَّلَاةِ عِنْدَ سَلَامِ الْإِمَامِ

**١٧٠٩-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ الْأَنْصَارِيُّ ﷺ، أَنَّهُ عَقَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَعَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ دَلْو مِنْ بِئْرٍ كَانَتْ فِي دَارِهِمْ فِي وَجْهِهِ، فَزَعَمَ مَحْمُودٌ أَنَّهُ سَمِعَ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيُّ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُنْتُ أُصَلِّي لِقَوْمِي بَنِي سَالِمٍ، فَكَانَ يَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ وَادٍ إِذَا جَاءَتِ الْأَمْطَارُ، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيَّ أَنْ أَجْتَازَهُ قِبَلَ مَسْجِدِهِمْ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنِّي قَدْ أَنْكَرْتُ مِنْ بَصَرِي، وَإِنَّ الْوَادِيَ الَّذِي

---

(١) صحيح.

يَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَ قَوْمِي يَسِيلُ إِذَا جَاءَتِ الْأَمْطَارُ، فَيَشُقُّ عَلَيَّ أَنْ أَجْتَازَهُ، فَوَدِدْتُ أَنَّكَ تَأْتِينِي فَتُصَلِّي مِنْ بَيْتِي مُصَلًّى أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سَأَفْعَلُ، فَغَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ بَعْدَ مَا امْتَدَّ النَّهَارُ، فَاسْتَأْذَنَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى قَالَ: أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ لَكَ فِي بَيْتِكَ؟ فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فِيهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكَبَّرَ، وَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، وَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ[1].

## باسی سەلامدانەوەی نوێژخوێن لە نوێژدا لە کاتی سەلامدانەوەی پێشنوێژ

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، -(ئەوکات تەمەنی پێنج ساڵ بوو)- بیری دێت پێغەمبەری خوا ﷺ پڕ دەمی ئاوی لەنێو سەتڵێکی هەڵواسراو لە ماڵەکەیان دەرهێنا و فووی پێ کرد بە ڕوخساریدا، مەحمود وتی: عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاری، کە یەکێك بوو لەوانەی بەشداری جەنگی بەدری کردبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، دەیوت: من پێشنوێژیم بۆ قەومەکەم نەوەکانی سالم دەکرد، شیوێك هەبوو لە نێوانمان کاتێ باران بباریبایە ئاوی شیوەکە دەبووە بەربەست نەمدەتوانی بچم بۆ مزگەوتەکەیان، جا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێم وت: من چاوم لەدەست داوە، بارانیش ئەگەر زۆر بباریێت شیوەکە دادەپۆشێ قورسە بەلامەوە لە ئاوەکە تێپەڕ بم، پێم خۆشە تەشریف بهێنی بۆ ماڵەکەم نوێژی تێدا بکەی تا بیکەم بە نوێژگە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە دەکەم. پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانییەکەی هات بۆ ماڵمان ئەبو بەکریشی لەگەڵ بوو، دوای ئەوەی خۆر بەرز بووبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتم پێ دا، دانەنیشت هەتا فەرمووی: حەز دەکەی لە چ شوێنێکی ماڵەکەتدا نوێژت بۆ بکەم؟ ئاماژەم بۆ ئەو جێگایە کرد کە پێم خۆش بوو نوێژی تێدا بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا تەکبیر (الله أكبر)ی کرد، ئێمەیش لە پشتیەوە ڕیزمان بەست، دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، کاتێ ئەو سەلامی دایەوە ئێمەیش سەلامان دایەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ رَدِّ الْمَأْمُومِ عَلَى الْإِمَامِ إِذَا سَلَّمَ الْإِمَامُ عِنْدَ انْقِضَاءِ الصَّلَاةِ

**١٧١٠-** عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُسَلِّمَ عَلَى أَيْمَانِنَا، وَأَنْ يَرُدَّ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ. يَعْنِي فِي الصَّلَاةِ[١].

## باسی نوێژخوێن وەڵامی پێشنوێژ بداتەوە، ئەگەر پێشنوێژ سەلامی دایەوە لە کاتی تەواوبوونی نوێژ

واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بەلای ڕاستماندا سەلام بدەینەوە، هەندێکیشمان وەڵامی هەندێکی دیکەمان بدەینەوە. واتە: لەنێو نوێژ.

**١٧١١-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَرُدَّ عَلَى أَئِمَّتِنَا السَّلَامَ، وَأَنْ نَتَحَابَّ، وَأَنْ يُسَلِّمَ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾النساء: ٨٦، وَفِي خَبَرِ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى مَنْ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَلَى مَنْ عَنْ شِمَالِهِ، دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَ يُسَلِّمُ مِنَ الصَّلَاةِ عِنْدَ انْقِضَائِهَا عَلَى مَنْ عَنِ يَمِينِهِ مِنَ النَّاسِ إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَلَى مَنْ عَنْ شِمَالِهِ إِذَا سَلَّمَ عَنْ شِمَالِهِ، وَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِرَدِّ السَّلَامِ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾النساء: ٨٦، فَوَاجِبٌ عَلَى الْمَأْمُومِ رَدُّ السَّلَامِ عَلَى الْإِمَامِ إِذَا الْإِمَامُ سَلَّمَ عَلَى الْمَأْمُومِ عِنْدَ انْقِضَاءِ الصَّلَاةِ.

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین وەڵامی سەلامی پێشەواکانمان بدەینەوە (لەنێو نوێژ) و خۆشمان بوێن، هەروەها هەندێکیشمان سەلام لە هەندێکمان بکەین.

ئەبو بەکر دەڵێ: خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾، واتە: وە ئەگەر سڵاوتان لێ کرا ئەوە ئێوە بەجوانتر و چاکتر وەڵامی سەلامەکە بدەنەوە. وە لە فەرموودەکەی جابری کوڕی سەمورە هاتووە: پاشان سەلامی دەکرد لەسەر ئەوەی لەلای ڕاستێتی، وە لەسەر ئەوەیشی لەلای چەپێتی، بەڵگەیە لەسەر

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

ئەوەی پێشنوێژ لە كۆتایی نوێژەكەیدا سەلام دەكات لەسەر ئەوەی لەلای ڕاستێتی لە خەڵكەكە، ئەگەر بەلای ڕاستیدا سەلامی دایەوە، وە لەسەر ئەو كەسەی لەلای چەپێتی، ئەگەر بەلای چەپیدا سەلامی دایەوە، خوای بەرز و مەزنیش فەرمانی كردووە بە موسوڵمان وەڵامی سەلام بداتەوە لەو فەرمایشتەدا: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ﴾، بۆیە پێویستە لەسەر نوێژخوێن وەڵامی پێشنوێژ بداتەوە، ئەگەر پێشنوێژ سەلامی كرد لەسەر نوێژخوێن لە كاتی تەواوبوونی نوێژ.

## بَابُ إِقْبَالِ الْإِمَامِ بِوَجْهِهِ يُمْنَةً إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَيُسْرَةً إِذَا سَلَّمَ عَنْ شِمَالِهِ، وَفِيهِ دَلِيلٌ أَيْضًا أَنَّ الْإِمَامَ إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَالْمَأْمُومِينَ الَّذِينَ عَنْ يَسَارِهِ إِذَا سَلَّمَ عَنْ يَسَارِهِ.

**١٧١٢-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ[١].

**باسی پێشنوێژ ڕوو دەكاتە لای ڕاست كاتێ سەلامی دایەوە بەلای ڕاستیدا، وە بەلای چەپ كاتێ سەلامی دایەوە بەلای چەپیدا، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی پێشنوێژ كاتێ سەلامی دایەوە بەلای ڕاستیدا، نوێژخوێنانی لای ڕاستی ڕوومەتیان دەبینێ، وە كاتێ سەلامی دایەوە بەلای چەپیدا نوێژخوێنانی لای چەپی ڕوومەتیان دەبینێ**

واتە: سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەلای ڕاستیدا سەلامی دەدایەوە، وە بەلای چەپیشی تا سپیایی ڕوومەتی دەبینرا.

## بَابُ انْحِرَافِ الْإِمَامِ مِنَ الصَّلَاةِ الَّتِي لَا يُتَطَوَّعُ بَعْدَهَا

**١٧١٣-** عَنْ يَزِيدِ بْنِ الْأَسْوَدِ الْعَامِرِيِّ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَجَّتَهُ، قَالَ: فَصَلَّيْتُ مَعَهُ صَلَاةَ الْفَجْرِ فِي مَسْجِدِ الْخَيْفِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ وَانْحَرَفَ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلَيْنِ فِي آخِرِ الْقَوْمِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی لاکردنەوەی پێشنوێژ بە لای خەڵکەکەدا لەو نوێژەی کە لە دوایەوە نوێژی سوننەت ناکرێ

واتە: یەزیدی کوڕی ئەسوەدی عامری ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری حەجکردنەکەی بووم، وتی: نوێژی بەیانیم لەگەڵیدا کرد لە مزگەوتی (الْخَيْف) (لە مینا) کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد و سەلامی دایەوە و ڕووی وەرگێڕا (واتە: بەلای ڕاستی ڕووی لە نوێژخوێنەکان کرد لای چەپیشی ڕووی لە قیبلە بوو)، دوو پیاوی لە کۆتایی خەڵکەکەوە بینی. دواتر فەرموودەکەی باس کرد.

## بَابُ تَخْيِيرِ الْإِمَامِ فِي الِانْصِرَافِ مِنَ الصَّلَاةِ أَنْ يَنْصَرِفَ يُمْنَةً، أَوْ يَنْصَرِفَ يُسْرَةً

١٧١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَجْعَلَنَّ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ مِنْ نَفْسِهِ جُزْءًا، لَا يَرَى إِلَّا أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لَا يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ، أَكْثَرُ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْصَرِفُ عَنْ شِمَالِهِ[١].

## باسی پێشنوێژ ئازادە لەوەی کاتێ نوێژی تەواو کرد بەلای ڕاست یان بەلای چەپ ڕوو وەربچەرخێنێ

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: با کەسێك لە ئێو بەشێك لە نوێژەکەی بۆ شەیتان دانەنێت، پێی وا بێت لەسەری واجبە کە ڕوو لە نوێژ وەرنەچەرخێنێت تەنها بۆ لای ڕاستی نەبێت، بەدڵنیایی من زۆر جار پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ڕووی بۆلای چەپ وەرگێڕاوە (بەلای چەپیدا هەستا و شوێنی نوێژی جێهێشت).

## بَابُ إِبَاحَةِ اسْتِقْبَالِ الْإِمَامِ بِوَجْهِهِ بَعْدَ السَّلَامِ إِذَا لَمْ يَكُنْ مُقَابِلَهُ مَنْ قَدْ فَاتَهُ بَعْضُ صَلَاةِ الْإِمَامِ فَيَكُونَ مُقَابِلَ الْإِمَامِ إِذَا قَامَ يَقْضِي

١٧١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا سَلَّمَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگە دراوە پێشنوێژ لەدوای سەلامدانەوە ڕوو بکاتە خەڵکەکە، ئەگەر کەسێك لەبەرانبەری نەبوو بەشێك لە نوێژەکەی مابوو، ئەوکات ڕووبەڕووی پێشنوێژ دەوەستێ کاتێ، هەڵدەستێ بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی بۆ کردین، کاتێ سەلامی دایەوە بە ڕوخساری ڕووی تێکردین.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ مُبَادَرَةِ الْإِمَامِ بِالِانْصِرَافِ مِنَ الصَّلَاةِ

**١٧١٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ مِنَ الصَّلَاةِ أَقْبَلَ إِلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي إِمَامُكُمْ، فَلَا تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ، وَلَا بِالسُّجُودِ، وَلَا بِالْقِيَامِ، وَلَا بِالْقُعُودِ، وَلَا بِالِانْصِرَافِ، وَإِنِّي أَرَاكُمْ خَلْفِي، وَايْمُ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَمَا رَأَيْتَ؟ قَالَ: «رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ»[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی نوێژخوێن پێش ئیمام بکەوێت لە بەجێهێشتنی جێگاکەی لە نوێژدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی بۆ کردین، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد ڕووی تێکردین و فەرمووی: ئەی خەڵکینە، من ئیمامی ئێوەم، پێشم مەکەون لە ڕکووع و سوژدە و لە هەستانەوە و دانیشتن و لە بەجێهێشتنی جێگاکانتان، چونکە من لەپێش و لەدواوەشم دەتانبینم، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئەوەی من بینیم ئێوەش بتانبینایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، وتی: وتمان: چیت بینیوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەهەشت و ئاگرم بینی.

## بَابُ نُهُوضِ الْإِمَامِ عِنْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ الَّتِي يَتَطَوَّعُ بَعْدَهَا سَاعَةً يُسَلِّمُ مِنْ غَيْرِ لَبْثٍ، إِذَا لَمْ يَكُنْ خَلْفَهُ نِسَاءٌ

**١٧١٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَخَفَّ النَّاسِ صَلَاةً فِي إِتْمَامٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ سَاعَةَ يُسَلِّمُ يَقُومُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ إِذَا سَلَّمَ وَثَبَ مَكَانَهُ كَأَنَّهُ يَقُومُ عَنْ رَضْفٍ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی هەستانەوەی پێشنوێژ لە کاتی تەواوبوونی ئەو نوێژەی کە لە دوایەوە نوێژی سوننەت دەکرێ، ئەوساتەی سەلام دەداتەوە دەستبەجێ بەبێ مانەوە جێگاکەی بەجێبهێڵێ، ئەگەر ئافرەتان لە پشتیەوە نەبوون**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئاسانترین و کورتترین بوو لەگەڵ جێبەجێکردنی ڕکووع و سوژدە و هەموو پایەکانی نێو نوێژ بەتەواوی. وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد ئەوکاتەی سەلامی دەدایەوە هەڵدەستا، پاشان لەگەڵ ئەبو بەکر نوێژم کرد کاتێ سەلامی دایەوە بەپەلە لە شوێنی خۆی هەڵدەستا دەتوت لەسەر بەردی گەرم دانیشتووە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يَقُومُ سَاعَةَ يُسَلِّمُ إِذَا لَمْ يَكُنْ خَلْفَهُ نِسَاءٌ، وَاسْتِحْبَابِ ثُبُوتِ الْإِمَامِ جَالِسًا إِذَا كَانَ خَلْفَهُ نِسَاءٌ لِيَرْجِعَ النِّسَاءُ قَبْلَ أَنْ يَلْحَقَهُمُ الرِّجَالُ**

**١٧١٨-** عَنْ هِنْدِ بِنْتِ الْحَارِثِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهَا، أَنَّ النِّسَاءَ كُنَّ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا سَلَّمْنَ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ قُمْنَ، وَثَبَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَنْ صَلَّى خَلْفَهُ مِنَ الرِّجَالِ، فَإِذَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَامَ الرِّجَالُ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە سەلامی دەدایەوە دەستبەجێ هەڵدەستا، ئەگەر ئافرەت لە پشتیەوە نەبووایە، بەڵام ئەگەر ئافرەتان لە پشتیەوە بوون چاکتر وایە دابنیشی تا ئافرەتەکان دەڕۆن پێش ئەوەی پیاوەکان بگەن پێیان**

واتە: هیندی کوڕی حاریس دەگێڕێتەوە، ئوممو سەلەمە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ دا، ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کاتێ سەلامیان دەدایەوە لە نوێژی فەرز هەڵدەستان و دەڕۆیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو پیاوانەی لەگەڵی نوێژیان دەکرد لە شوێنی خۆیان دەمانەوە، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا پیاوانیش هەڵدەستان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ تَخْفِيفِ ثُبُوتِ الْإِمَامِ بَعْدَ السَّلَامِ لِيَنْصَرِفَ النِّسَاءُ قَبْلَ الرِّجَالِ، وَتَرْكِ تَطْوِيلِهِ الْجُلُوسَ بَعْدَ السَّلَامِ

١٧١٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلَاةِ لَمْ يَمْكُثْ إِلَّا يَسِيرًا، حَتَّى يَقُومَ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَنَرَى ذَلِكَ - وَاللَّهُ أَعْلَمُ - أَنَّ ذَاكَ لِيَذْهَبَ النِّسَاءُ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ أَحَدٌ مِنَ الرِّجَالِ[1].

## باسی پێشنوێژ بەشێوەیەکی کەم لە شوێنی خۆی دەمێنێتەوە لەدوای سەلامدانەوە، تا ئافرەتان هەڵدەستن و دەڕۆن، نابێت زۆر دابنیشێ دوای سەلامدانەوە

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەلامی دەدایەوە لە نوێژ نەدەمایەوە کەمێك نەبێت، تا هەڵدەستا. زوهری دەڵێ: وا دەبینین -خوا زاناترە- ئەوە بۆ ئەوە بوو تا ئافرەتان بڕۆن پێش ئەوەی هیچ پیاوێك لە مزگەوت دەربچێت.

## كِتَابُ الْجُمُعَةِ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ عَلَى الشَّرْطِ الَّذِي ذَكَرْنَا فِي أَوَّلِ الْكِتَابِ

**بَابُ ذِكْرِ فَرْضِ الْجُمُعَةِ وَالْبَيَانِ أَنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَهَا عَلَى مَنْ قَبْلَنَا مِنَ الْأُمَمِ وَاخْتَلَفُوا فِيهَا فَهَدَى اللَّهُ أُمَّةَ مُحَمَّدٍ ﷺ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ لَهَا قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ٩﴾ الجمعة، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ يُوجِبُ الفرض بشريطة، وقَدْ يَجِبُ ذَلِكَ الْفَرْضُ بِغَيْرِ تِلْكَ الشَّرِيطَةِ؛ لِأَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَمَرَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَقَدْ لَا يَقْدِرُ الْحُرُّ الْمُسْلِمُ عَلَى الْمَشْيِ عَلَى الْقَدَمِ وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى الرُّكُوبِ، وَإِتْيَانِ الْجُمُعَةِ رَاكِبًا، وَهُوَ مَالِكٌ لِمَا يَرْكَبُ مِنَ الدَّوَابِّ، وَالْفَرْضُ لَا يَزُولُ عَنْهُ إِذَا قَدَرَ عَلَى إِتْيَانِ الْجُمُعَةِ رَاكِبًا، وَإِنْ كَانَ عَاجِزًا عَنْ إِتْيَانِهَا مَاشِيًا**

١٧٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «نَحْنُ الْآخِرُونَ، وَنَحْنُ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، ثُمَّ هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي كَتَبَهُ اللَّهُ

---

(١) صحيح.

عَلَيْهِمْ، فَاخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانَا اللَّهُ - يَعْنِي يَوْمَ الْجُمُعَةِ - النَّاسُ لَنَا تَبَعٌ فِيهِ، الْيَهُودُ غَدًا، وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ»[١].

## کتێبی هەینی، پوخت کراوە لە پوختکراوەی ئەو فەرموودانەی کە سەنەدەکەیان موتەصیلە لەسەر ئەو مەرجەی لە سەرەتای کتێبەکەماندا باسمان کرد

**باسی فەرزی نوێژی هەینی و ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی خوا ﷻ لەسەر ئوممەتەکانی پێش ئێمە فەرزی کردووە، بەڵام ئەوان جیاوازییان تێ کەوتووە، خوا ﷻ ڕێنمایی ئوممەتی موحەممەدی ﷺ کرد کە چاکترین ئوممەتە لەنێو خەڵك هەڵبژێردراوە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ ۝٩﴾، ئەمەش لەو شێوازەیە کە دەڵێ: بێگومان خوا ﷻ هەندێ جار فەرزێك واجب دەکات بەمەرج، کەم جارێکیش ئەو فەرزە واجب دەبێت بەبێ ئەو مەرجە، چونکە خوا لەم ئایەتەدا فەرمانی کردووە بە بەپەلە ڕۆیشتن بۆ هەینی، هەندێ جار مسوڵمانێکی ئازاد ناتوانێت بەپیادە لەسەر قاچی بچێ، بەڵام دەتوانێ بەسواری بڕوات، جا هاتن بۆ مزگەوت بەسواری و وڵاخەکەیش هی خۆی بێت، فەرزەکەی لەسەر ناکەوێ، ئەگەر توانی بەسواری بچێ بۆ مزگەوت، ئەگەرچی بەپیادە نەیتوانی بچێ**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە کۆتایەمین ئوممەتین (لە ڕووی زەمانەوە لە دنیادا)، وە یەکەمین کۆمەڵین (لە ڕووی پلەوپایە و ڕێزە) لە ڕۆژی دواییدا، ئەوە نەبێت ئەوان پێش ئێمە کتێبیان بۆ هاتووە، ئێمەش دوای ئەوان پێمان دراوە، پاشان ئەم ڕۆژەی خوا بۆ ئەوانی نووسی ئەوان جیاوازییان تێدا هەبوو، خوا هیدایەتی ئێمەی دا بۆی -واتە: ڕۆژی هەینی- خەڵکی لەمەدا شوێنی ئێمە دەکەون، سبەینێ (شەممە) جوولەکەکان و (یەك شەممە) گاورەکان.

---

(١) صحيح.

**بَابُ الدَّلِيلِ أَنَّ فَرَضَ الْجُمُعَةِ عَلَى الْبَالِغِينَ دُونَ الْأَطْفَالِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّهُ مِنَ الْأَخْبَارِ الْمُعَلَّلَةِ الَّذِي يَجُوزُ الْقِيَاسُ عَلَيْهِ، قَدْ بَيَّنْتُهُ فِي عَقِبِ الْخَبَرِ.**

**١٧٢١-** عَنْ حَفْصَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ، وَعَلَى مَنْ رَاحَ الْجُمُعَةَ الْغُسْلُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ: «عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ». مِنَ اللَّفْظِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْأَمْرَ إِذَا كَانَ لِعِلَّةٍ فَالتَّمْثِيلُ وَالتَّشْبِيهُ بِهِ جَائِزٌ مَتَى كَانَتِ الْعِلَّةُ قَائِمَةً فَالْأَمْرُ وَاجِبٌ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا عَلَّمَ أَنَّ عَلَى الْمُحْتَلِمِ رَوَاحَ الْجُمُعَةِ؛ لِأَنَّ الِاحْتِلَامَ بُلُوغٌ، فَمَتَى كَانَ الْبُلُوغُ وَإِنْ لَمْ يَكُنِ احْتِلَامٌ وَكَانَ الْبُلُوغُ بِغَيْرِ احْتِلَامٍ، فَفَرْضُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ بَالِغٍ وَإِنْ كَانَ بُلُوغُهُ بِغَيْرِ احْتِلَامٍ، وَلَوْ كَانَ عَلَى غَيْرِ أَصْلِنَا وَكَانَ عَلَى أَصْلِ مَنْ خَالَفَنَا فِي التَّشْبِيهِ وَالتَّمْثِيلِ، وَزَعَمَ أَنَّ الْأَمْرَ لَا يَكُونُ لِعِلَّةٍ، وَلَا يَكُونُ إِلَّا تَعَبُّدًا، لَكَانَ مَنْ بَلَغَ عِشْرِينَ سَنَةً وَثَلَاثِينَ سَنَةً وَهُوَ حُرٌّ عَاقِلٌ، فَسَمِعَ الْأَذَانَ لِلْجُمُعَةِ فِي الْمِصْرِ أَوْ هُوَ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ إِنْ لَمْ يَكُنِ احْتَلَمَ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّ رَوَاحَ الْجُمُعَةِ عَلَى الْمُحْتَلِمِ، وَقَدْ يَعِيشُ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ السِّنِينَ الْكَثِيرَةَ فَلَا يَحْتَلِمُ أَبَدًا، وَهَذَا كَقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾[النور: ٥٩]، فَإِنَّمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِالِاسْتِئْذَانِ مَنْ قَدْ بَلَغَ الْحُلُمَ، إِذِ الْحُلُمُ بُلُوغٌ، وَلَوْ لَمْ يَجُزِ الْحُكْمُ بِالتَّشْبِيهِ وَالنَّظِيرِ كَانَ مَنْ بَلَغَ ثَلَاثِينَ سَنَةً وَلَمْ يَحْتَلِمْ لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ الِاسْتِئْذَانُ، وَهَذَا كَخَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ، قَالَ فِي الْخَبَرِ: وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَمَنْ لَمْ يَحْتَلِمْ وَبَلَغَ مِنَ السِّنِّ مَا يَكُونُ إِدْرَاكًا مِنْ غَيْرِ احْتِلَامٍ فَالْقَلَمُ عَنْهُ غَيْرُ مَرْفُوعٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: حَتَّى يَحْتَلِمَ: أَنَّ الِاحْتِلَامَ بُلُوغٌ، فَمَتَى كَانَ الْبُلُوغُ - وَإِنْ كَانَ بِغَيْرِ احْتِلَامٍ - فَالْحُكْمُ عَلَيْهِ، وَالْقَلَمُ جَارٍ عَلَيْهِ، كَمَا يَكُونُ بَعْدَ الِاحْتِلَامِ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرزی نوێژی هەینی لەسەر ئەوانەیە باڵغ بوون نەك منداڵان، ئەمەش لەو شێوازەیە کە دەڵێم: ئەوە لەو فەرموودانەیە کە دروستە قیاسی لەسەر بکرێت، لە کۆتایی فەرموودەکە ڕوونم کردۆتەوە**

واتە: حەفصە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی پێویستە (واجبە) لەسەر هەموو ئەوانەی باڵغ بوون، وە لەسەر هەموو ئەوانەش پێویستە کە دەچێ بۆ هەینی.

---

(١) صحيح.




ئەبو بەکر دەڵێ ئەم دەستەواژەیە: (عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ)، لەو دەستەواژەیە کە دەڵێین: فەرمانکردن ئەگەر بۆ هۆکارێك بوو، هاوشێوەکردن و لێکچوواندن پێی دروستە، هەرکات هۆکارەکە هاتە جێ فەرمانکردنەکەش واجب دەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆیە ڕایگەیاندووە: (عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ)، چونکە (الِاحْتِلَام) باڵغ بوونە، جا هەر کات باڵغبوون هات ئەگەرچی (احْتِلَامٌ)یش بوونی نەبوو، وە باڵغبوون بەبێ (احْتِلَامٌ) بوو، ئەوە فەرزی هەینی واجب دەبێت لەسەر هەموو باڵغبوویەك، ئەگەرچی باڵغبوونەکەیشی بەبێ (احْتِلَامٌ) بوو، خۆ ئەگەر لەسەر بنەمای ئێمە نەبێت، بەڵام لەسەر بنەمای ئەوانە بێت کە پێچەوانەی ئێمەیان کردووە لە لێکچوواندن و هاوشێوەکردن، وە پێی وا بێت فەرمان بۆ هۆکارێك نییە بەڵکوو تەنها بۆ پەرستشە، ئەوە بە قسەی ئەوان ئەو کەسەی تەمەنی دەگاتە بیست ساڵ و سی ساڵ ئەوە ئازاد و ئاقڵە و گوێی لە بانگی هەینی دەبێت لە شارەکەیدا یان لەبەر دەرگای مزگەوتەکەیەوە پێویست نییە لەسەری بچێت بۆ نوێژی هەینی ئەگەر (احْتِلَامٌ) نەبوو بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە: ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی لەسەر کەسی (الْمُحْتَلِمِ)، هەندێ جار زۆرێك لە خەڵکی ساڵانێك لە تەمەنیان بەڕێ دەکەن هەرگیز (احْتِلَامٌ) نابن، ئەمەیش وەکوو فەرمایشتی خوایە ﷻ: ﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، بێگومان خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە مۆڵەت وەرگرتن بۆ ئەو کەسەی باڵغ دەبێت، چونکە (الْحُلُمُ) باڵغبوونە، جا ئەگەر دروست نەبێت حوکم بکرێت بە لێکچوواندن و هاوشێوەکردن، ئەوە ئەو کەسەی تەمەنی دەگاتە سی ساڵ و (احْتِلَامٌ) نەبووە مۆڵەتوەرگرتن لەسەری پێویست نییە، ئەمەیش وەکوو فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ)، لە فەرموودەکەدا فەرموویەتی: (وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ)، وە هەر کەسێك (احْتِلَامٌ) نەبوو تەمەنیشی گەیشتە ئاستێك هەستی بە شتەکان دەکرد بەبێ ئەوەی (احْتِلَامٌ) بێت، ئەوە هیچی لەسەر نانووسرێ، بێگومان پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (حَتَّى يَحْتَلِمَ)، (احْتِلَامٌ) بریتیە لە باڵغبوون، هەر کات باڵغ بوو -ئەگەرچی (احْتِلَامٌ)یش نەبوو- ئەوە هەرچی بکات لەسەری دەنووسرێ، هەمان حوکمی دواى (احْتِلَامٌ)می هەیە.

تێبینی: (الِاحْتِلَامَ): بریتییە لەوەی ئافرەت یان پیاو لە خەودا دەگات بە ئەوپەڕی چێژوەرگرتن و بەحەقیقی ئاوی دێتەوە.

**بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ فَرْضِ الْجُمُعَةِ عَنِ النِّسَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ خَاطَبَ بِالْأَمْرِ بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ عِنْدَ النِّدَاءِ بِهَا فِي قَوْلِهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ ۝٩﴾ الجمعة، الرِّجَالَ دُونَ النِّسَاءِ إِنْ ثَبَتَ هَذَا الْخَبَرُ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، وَإِنْ لَمْ يَثْبُتْ فَاتِّفَاقُ الْعُلَمَاءِ عَلَى إِسْقَاطِ فَرْضِ الْجُمُعَةِ عَنِ النِّسَاءِ كَافٍ مِنْ نَقْلِ خَبَرِ الْخَاصِّ فِيهِ**

**١٧٢٢-** عَنْ إِسْمَاعِيل بْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيِّ، حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا جَمَعَ نِسَاءَ الْأَنْصَارِ فِي بَيْتٍ، فَأَتَانَا عُمَرُ فَقَامَ عَلَى الْبَابِ فَسَلَّمَ، فَرَدَدْنَا عَلَيْهِ السَّلَامَ، فَقَالَ: «أَنَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيْكُنَّ»، فَقُلْنَا: مَرْحَبًا بِرَسُولِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ، قَالَ: «أَتُبَايِعْنَ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقْنَ، وَلَا تَزْنِينَ؟» قَالَتْ: قُلْنَا: نَعَمْ، فَمَدَدْنَا أَيْدِيَنَا مِنْ دَاخِلِ الْبَيْتِ، وَمَدَّ يَدَهُ مِنْ خَارِجٍ، قَالَتْ: وَأُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْحُيَّضَ وَالْعَوَاتِقَ فِي الْعِيدَيْنِ، وَنُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَا جُمُعَةَ عَلَيْنَا. قَالَ: قُلْتُ لَهَا: مَا الْمَعْرُوفُ الَّذِي نُهِيتُنَّ عَنْهُ؟ قَالَتِ: النِّيَاحَةُ[1].

**باسی هەڵگرتنی فەرزی هەینی لەسەر ئافرەتان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بێگومان خوا ﷻ کە فەرمانی کردووە بەپەلە بچن بۆ هەینی وەك فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ ۝٩﴾ مەبەستی پێی پیاوانە، ئەگەر ئەم فەرموودەیە جێگیر بێت لە ڕووی گواستنەوەوە، وە ئەگەر فەرموودەکەش جێگیر نەبێت ئەوە یەکدەنگی زانایان بەسە لەسەر کەوتنی فەرزی هەینی لەسەر ئافرەتان لە گواستنەوەی فەرموودەیەکی تایبەت بەو بابەتە**

واتە: ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەتییەی ئەنصاڕی دەگێڕێتەوە، داپیرەم ﵂ بۆی باس کردم پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئافرەتانی ئەنصاڕی کۆ کردەوە لە ماڵێکدا، عومەر هات بۆ لامان لەسەر دەرگاکە وەستا و سەلامی کرد، ئێمەیش وەڵامی سەلامەکەیان دایەوە، وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لاتان، وتمان: بەخێرهاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و نوێنەرەکەی دەکەین، وتی: بەیعەتم پێ دەدەن لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەش بۆ خوا، هەروەها دزی و زینا و

---

(١) إسناده ضعيف.

داوێنپیسی نەکەن؟ وتی: وتمان: بەڵێ: لەنێوماڵەکەوە دەستیان درێژ کرد، ئەویش لە دەرەوەی ماڵەکە دەستی درێژ کرد، وتی: وە فەرمانی پێ کردین لە جەژندا ئافرەتانی حەیزدار و تازەپێگەیشتوو بهێنینە دەرەوە (بۆ مزگەوت)، هەروەها ڕێگریان لێ کرا لە شوێنکەوتنی جەنازە. نوێژی هەینیشیان لەسەر نییە، ئیسماعیل وتی: پرسیارم لە داپیرەم کرد (لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ ١٢﴾ ) ئەو (الْمَعْرُوفُ) چییە کە قەدەغەتان لێ کراوە سەرپێچی بکەن؟ وتی: شیوەنکردن.

**١٧٢٣-** عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عُثْمَانَ بِنَحْوِهِ، وَلَمْ يَقُلْ: لَا تُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا[١].

واتە: ئیسحاقی کوڕی عوسمان دەگێڕێتەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو، بەڵام نەیوت: هاوبەش بۆ خوا دامەنێن.

## بَابُ ذِكْرِ أَوَّلِ جُمُعَةٍ جُمِعَتْ بِمَدِينَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَذِكْرِ عَدَدِ مَنْ جَمَّعَ بِهَا أَوَّلًا

**١٧٢٤-** عَنِ ابْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنْتُ قَائِدَ أَبِي كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ حِينَ ذَهَبَ بَصَرُهُ، وَكُنْتُ إِذَا خَرَجْتُ بِهِ إِلَى الْجُمُعَةِ فَسَمِعَ الْأَذَانَ بِهَا صَلَّى عَلَى أَبِي أُمَامَةَ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، قَالَ: فَمَكَثَ حِينًا عَلَى ذَلِكَ، لَا يَسْمَعُ الْأَذَانَ لِلْجُمُعَةِ إِلَّا صَلَّى عَلَيْهِ وَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: وَاللَّهِ إِنَّ هَذَا لَعَجْزٌ بِي حَيْثُ لَا أَسْأَلُهُ مَا لَهُ إِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ بِالْجُمُعَةِ صَلَّى عَلَى أَبِي أُمَامَةَ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ؟ قَالَ: فَخَرَجْتُ بِهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ كَمَا كُنْتُ أَخْرُجُ بِهِ، فَلَمَّا سَمِعَ الْأَذَانَ بِالْجُمُعَةِ صَلَّى عَلَى أَبِي أُمَامَةَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَتِ مَا لَكَ إِذَا سَمِعْتَ الْأَذَانَ بِالْجُمُعَةِ صَلَّيْتَ عَلَى أَبِي أُمَامَةَ؟ قَالَ: أَيْ بُنَيَّ، كَانَ أَوَّلَ مَنْ جَمَّعَ بِالْمَدِينَةِ فِي هَزْمِ بَنِي بَيَاضَةَ يُقَالُ لَهُ نَقِيعُ الْخَضَمَاتِ، قُلْتُ: وَكَمْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ رَجُلًا[٢].

## باسی یەکەم هەینی لە مەدینەی پێغەمبەر ﷺ، وە باسی ئەو ژمارەی کە یەکەم جار بۆ نوێژ هەینی کۆ بوونەوە

واتە: کوڕەکەی کەعبی کوڕی مالیك دەڵێ: من دەستی باوکم کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ دەگرت کاتێ کە چاوی لەدەست دابوو، جا هەر کاتێ لەگەڵ خۆم بمبردایە بۆ

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

نوێژی هەینی دەپاڕایەوە بۆ ئەبو ئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراڕە، وتی: ماوەیەك لەسەر ئەو شێوە مامەوە، گوێی لە بانگی هەینی نەدەبوو حەتمەن بۆی دەپاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکرد، لە دەروونی خۆمدا وتم: سوێند بە خوا ئەوە دەستەوسانی و کەمتەرخەمییە بۆ من کە پرسیاری لێ ناکەم بۆچی کاتێ گوێی لە بانگی هەینی دەبێت بۆ ئەبو ئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراڕە دەپاڕێتەوە؟ وتی: لەگەڵ خۆم بردم بۆ هەینی وەکوو چۆن پێشتر دەمبرد، کاتێ گوێی لە بانگی هەینی بوو بۆ ئەبو ئومامە پاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆی کرد، پێم وت: ئەی باوکە، ئەوە چییە هەر کات گوێت لە بانگی هەینی دەبێت بۆ ئەبو ئومامە دەپاڕێیتەوە؟ وتی: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، ئەو یەکەم کەس بوو لە مەدینە خەڵکی کۆ کردەوە بۆ هەینی لە (هَزْمِ) (کە گوندێکە یەك میل لە مەدینەوە دوورە) لەنێو نەوەکانی بەیاضە، پێی دەوترا: لە (نَقِيعُ الْخَضَمَاتِ)، وتم: ئێوە ئەوکاتە چەند کەس بوون؟ وتی: چل کەس.

## بَابُ ذِكْرِ الْجُمُعَةِ الَّتِي جُمِعَتْ بَعْدَ الْجُمُعَةِ الَّتِي جُمِعَتْ بِالْمَدِينَةِ، وَذِكْرِ الْمَوْضِعِ الَّذِي جَمَعَ بِهِ

**١٧٢٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ بَعْدَ جُمُعَةٍ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَسْجِدُ عَبْدِ الْقَيْسِ بِجُوَاثَى مِنَ الْبَحْرَيْنِ[١].

## باسی یەکەم نوێژی هەینی کە لەدوای نوێژی هەینی مەدینە کرا، وە باسی ئەو جێگایەی تیادا ئەنجام درا

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: بەڕاستی یەکەم هەینی لەدوای ئەو هەینییەی لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ کرا لە مزگەوتی عەبدولقەیس بوو لە (جُوَاثَى) (کە دێیەك بوو) لە نزیك (الْبَحْرَيْنِ) (کە ناوچەیەکی نزیکە لە دەریای عومان).

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ مَنِّ اللَّهِ ﷻ عَلَى أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ خَيْرِ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ بِهِدَايَتِهِ إِيَّاهُمْ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَلَهُ الْحَمْدُ كَثِيرًا عَلَى ذَلِكَ، إِذْ قَدْ ضَلَّ عَنْهُ أَهْلُ الْكِتَابِ قَبْلَهُمْ بَعْدَ فَرْضِ اللَّهِ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْهِدَايَةَ هِدَايَتَانِ عَلَى مَا بَيَّنْتُهُ فِي كِتَابِ «أَحْكَامِ الْقُرْآنِ» أَحَدُهُمَا: هِدَايَةُ خَاصٍّ لِأَوْلِيَائِهِ دُونَ أَعْدَائِهِ مِنَ الْكُفَّارِ، وَهَذِهِ الْهِدَايَةُ مِنْهَا، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ خَصَّ بِهَا الْمُؤْمِنِينَ دُونَ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، وَالْهِدَايَةُ الثَّانِيَةُ بَيَانٌ لِلنَّاسِ كُلِّهِمْ، وَهِيَ عَامٌّ لَا خَاصٌّ كَمَا بَيَّنْتُهُ فِي ذَلِكَ الْكِتَابِ

١٧٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَلَا غَرَبَتْ عَلَى يَوْمٍ خَيْرٍ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، هَدَانَا اللَّهُ لَهُ، وَضَلَّ النَّاسُ عَنْهُ، وَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ، فَهُوَ لَنَا، وَالْيَهُودُ يَوْمُ السَّبْتِ، وَالنَّصَارَى يَوْمُ الْأَحَدِ، إِنَّ فِيهِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا مُؤْمِنٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ»[١].

## باسی خوا ﷻ منەتی کردووە بەسەر ئوممەتی موحەممەد ﷺ چاکترین ئوممەتن کە دەرکەوتبێتن و هاتبێتن بۆ خەڵکی، بەوەی هیدایەتی داون بۆ ڕۆژی هەینی، سوپاس و ستاییشی بێپایان بۆی لەسەر هیدایەتی، بێگومان خاوەن کتێبەکان لێیان ون بوو دوای ئەوەی خوا فەرزی کرد لەسەریان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هیدایەت دوو جۆرە وەك لە کتێبی (أَحْكَامِ الْقُرْآنِ) ڕوونم کردۆتەوە: یەکەمیان: هیدایەتی تایبەتە بۆ دۆستەکانی نەك دوژمنەکانی لە بێباوەڕان، ئەم هیدایەتەیش لەو جۆرەیە، چونکە خوا بڕوادارانی تایبەت کردووە پێی، جگە لە خاوەن کتێبەکان لە جوولەکە و گاورەکان، هیدایەتی دووەمیش: ڕوونکردنەوەیە بۆ هەموو خەڵك، ئەم هیدایەتە گشتییە و تایبەت نییە وەك لەم کتێبەدا ڕوونم کردەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆر هەڵنەهاتووە و ئاوا نەبووە بەسەر هیچ ڕۆژێکدا چاکتر بێت لە ڕۆژی هەینی، خوا هیدایەتی ئێمەی دا بۆی و خەڵك لە خۆی ون کرد، خەڵکی لەوەدا شوێنی ئێمە دەکەون، ئەو ڕۆژە هی

---

(١) صحيح.




ئێمەیە، ڕۆژی شەممەیش هی جوولەکەیە، ڕۆژی یەکشەممەیش هی گاورەکانە، لەو ڕۆژەدا کاتێك هەیە بەندەی موسوڵمان تیایدا نوێژ بکات و داوای خێر و چاکە لە خوا بکات حەتمەن پێی دەبەخشێ.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ فَضْلِ الْجُمُعَةِ

## بَابٌ فِي ذِكْرِ فَضْلِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَأَنَّهَا أَفْضَلُ الْأَيَّامِ، وَفَزَعِ الْخَلْقِ غَيْرِ الثَّقَلَيْنِ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى

**١٧٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ بِيَوْمٍ وَلَا تَغْرُبُ أَفْضَلَ أَوْ أَعْظَمَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَمَا مِنْ دَابَّةٍ لَا تَفْزَعُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ إِلَّا هَذَيْنِ الثَّقَلَيْنِ: الْجِنَّ وَالْإِنْسَ»[١].

## كۆباسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژی هەینی

## باسی فەزڵ و گەورەیی هەینی، بێگومان چاکترینی ڕۆژەکانە، وە ترسانی بەدیهێنراوەکان جگە لە مرۆڤ و جنۆکە نەبێت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورتکراوە نەك درێژ و تێروتەسەل

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆر بەسەر هیچ ڕۆژێکدا هەڵنایەت و ئاوا نابێت چاکتر یان گەورەتر بێت لە ڕۆژی هەینی، وە هیچ گیانلەبەرێك نییە کە نەتۆقێت لە ڕۆژی هەینی جگە لەو دووانە نەبێت: جنۆکە و مرۆڤ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى لِلَفْظَةِ الْمُخْتَصَرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْعِلَّةَ الَّتِي تَفْزَعُ الْخَلْقُ لَهَا مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ هِيَ خَوْفُهُمْ مِنْ قِيَامِ السَّاعَةِ فِيهَا إِذِ السَّاعَةُ تَقُومُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

**١٧٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيِّدُ الْأَيَّامِ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی فەرموودەیەکی درێژەپێدراو بۆ دەستەواژە کورتکراوەکە کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەو هۆکارەی بەدیهێنراوەکان لەو ڕۆژەدا دەتۆقن بریتییە لە تۆقینیان لە هاتنی ڕۆژی دوایی، چونکە ڕۆژی دوایی لە ڕۆژی هەینیدا بەرپا دەبێ**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەی هەموو ڕۆژەکان ڕۆژی هەینییە، ئادەمی تێدا دروستکراوە و تێیدا خراوەتە بەهەشتەوە و تێیدا لە بەهەشت دەرکراوە، ڕۆژی قیامەتیش بەرپا نابێت تەنها لە ڕۆژی هەینیدا نەبێت.

**١٧٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژ خۆری تێدا هەڵهاتبێت ڕۆژی هەینییە، ئادەمی تێدا دروست کراوە و تێیدا خراوەتە بەهەشتەوە و تێیدا لە بەهەشت دەرکراوە و تێیدا ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت.

## بَابُ صِفَةِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَأَهْلِهَا إِذَا بُعِثُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي النَّفْسِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ

**١٧٣٠-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ الْأَيَّامَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى هَيْئَتِهَا، وَيَبْعَثُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ زَهْرَاءَ مُنِيرَةً، أَهْلُهَا يَحُفُّونَ بِهَا كَالْعَرُوسِ تُهْدَى إِلَى كَرِيمِهَا، تُضِيءُ لَهُمْ، يَمْشُونَ فِي ضَوْئِهَا، أَلْوَانُهُمْ كَالثَّلْجِ بَيَاضًا، وَرِيحُهُمْ يَسْطَعُ كَالْمِسْكِ، يَخُوضُونَ فِي جِبَالِ الْكَافُورِ، يَنْظُرُ إِلَيْهِمُ الثَّقَلَانِ، مَا يُطْرِقُونَ تَعَجُّبًا، حَتَّى يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ، لَا يُخَالِطُهُمْ أَحَدٌ إِلَّا الْمُؤَذِّنُونَ الْمُحْتَسِبُونَ»(٢).

---

(١) صحيح من غير هذا الوجه.

(٢) إسناده حسن.

## باسی سیفەتی ڕۆژی هەینی و خەڵکەکەی کاتێ لە ڕۆژی دوایی زیندوو دەکرێنەوە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت چونکە لە دەروونمدا شتێك هەیە بەرانبەر ئەم سەنەدە

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لە ڕۆژی دواییدا ڕۆژەکان لەسەر شێوەی خۆیان دروست دەکاتەوە، ڕۆژی هەینی دەنێرێ جوان و ڕووناککەرەوەیە ئەوانەی (لە دنیادا) بەژداری هەینییان کردووە، دەوری دەدەن وەکوو چۆن دەوری بووك دەدرێ و پێشکەش دەکرێت بە مێردەکەی، ڕووناکییان بۆ دەکات، بەڕووناکی ئەو ڕێدەکەن، ڕەنگیان وەکوو بەفر سپییە، بۆنیشیان وەکوو میسك بڵاو دەبێتەوە، تێکەڵ بە کێوی کافور دەبن، مرۆڤ و جنۆکەکان تەماشایان دەکەن، ئەوەندە پێیان سەرسام دەبن ناتوانن ملیان داچەمێنن، تا دەچنە بەهەشتەوە، کەس تێکەڵیان نابێت جگە لە بانگبێژەکان (کە تەنها لەبەر خوا بانگیان داوە).

## بَابُ ذِكْرِ السَّاعَةِ الَّتِي فِيهَا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ

**١٧٣١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِي، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ، وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الْأَحَدِ، وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ، وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلَاثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ آخِرَ خَلْقٍ فِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ»(١).

## باسی ئەو ساتەی خوا ﷻ ئادەمی تێدا دروست کرد لە ڕۆژی هەینی.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستمی گرت، فەرمووی: خوا ﷻ لە ڕۆژی شەممە خۆڵی دروست کرد، وە تیایدا کێوەکانی لە ڕۆژی یەکشەممە دروست کرد، لە ڕۆژی دووشەممەیش درەختەکانی دروست کرد، لە ڕۆژی سێشەممە شتە خراپەکانی دروست کرد، لە ڕۆژی چوارشەممە نووری دروست کرد، لە ڕۆژی

---

(١) صحيح.

پێنجشەممەیش گیانلەبەرەکانی تیایدا بڵاو کردەوە، ئادەمیشی دوای عەسری ڕۆژی هەینی دروست کرد کۆتا بەدیهێنراوەکان لە کۆتا کاتەکانی ڕۆژی هەینی لە نێوان عەسر و شەودا.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي أَحْسِبُ لَهَا سُمِّيَتِ الْجُمُعَةُ جُمُعَةً

**١٧٣٢-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا سَلْمَانُ، مَا يَوْمُ الْجُمُعَةِ؟» قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «يَا سَلْمَانُ مَا يَوْمُ الْجُمُعَةِ؟» قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «يَا سَلْمَانُ مَا يَوْمُ الْجُمُعَةِ؟» قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «يَا سَلْمَانُ، يَوْمُ الْجُمُعَةِ بِهِ جُمِعَ أَبُوكَ أَوْ أَبُوكُمْ، أَنَا أُحَدِّثُكَ عَنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، مَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ كَمَا أُمِرْتُمْ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ حَتَّى يَأْتِيَ الْجُمُعَةَ فَيَقْعُدَ، فَيُنْصِتَ حَتَّى يَقْضِيَ صَلَاتَهُ، إِلَّا كَانَ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ»(١).

## باسی هۆکاری ئەوەی ناوی هەینی (الْجُمُعَة) نراوە بە (جُمُعَة)

واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی سەلمان ڕۆژی هەینی چییە؟ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەی سەلمان ڕۆژی هەینی چییە؟ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەی سەلمان ڕۆژی هەینی چییە؟ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەی سەلمان ڕۆژی هەینی باوکت یان باوکتان (گێڕەرەوەی فەرموودەکە گومانی هەبوو کامەیانی فەرموو) کۆ کراوەتەوە، من دەربارەی ڕۆژی هەینی قسەتان بۆ دەکەم، هیچ پیاوێك نییە خۆی پاك بکاتەوە لە ڕۆژی هەینی وەکوو ئەوەی فەرمانتان پێ کراوە، پاشان لە ماڵەکەی دەربچێت تا دێت بۆ نوێژی هەینی، ئینجا دابنیشێت و بێدەنگ بێت تا نوێژەکەی تەواو دەکات، حەتمەن دەبێتە کەفارەتی هەینییەکەی پێشووی.

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

**١٧٣٣-** عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ

---

(١) إسناده ضعيف.

مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ»، قَالُوا: وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ؟ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی

واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بەڕاستی چاکترینی ڕۆژەکانتان ڕۆژی هەینییە، تێیدا ئادەم دروست کراوە و تێیدا ڕووحی کێشراوە و تێیدا فوو دەکرێ بە صوڕدا و تێیدا ڕاچڵەکان دەبێ (دەنگێکی ناخۆشە مرۆڤ لێی دەترسێ مەبەست پێی فووی یەکەمە)، زۆر صەلاواتم لەسەر لێ بدەن، چونکە صەلاواتی ئێوە بۆم دەخرێنە ڕوو (وەکوو چۆن دیاری دەخرێتە ڕوو)، وتیان: چۆن صەڵاواتی ئێمە دەخرێتە ڕووت کە تۆ ڕزیوی لەنێو خاکدا ئێسکەکانیشت نەماون؟ فەرمووی: خوا ﷻ حەرامی کردووە لەسەر زەوی جەستەی پێغەمبەران بخوات.

**١٧٣٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ بَعْضِ مَا خُصَّ بِهِ يَوْمُ الْجُمُعَةِ مِنَ الْفَضِيلَةِ، بِأَنْ جَعَلَ اللَّهُ فِيهِ سَاعَةً يَسْتَجِيبُ فِيهَا دُعَاءَ الْمُصَلِّي، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى

**١٧٣٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»[٣].

## باسی هەندێ لەو فەزڵ و چاکانەی کە ڕۆژی هەینی پێ تایبەت کراوە، بەوەی خوا ساتێکی تیایدا داناوە نزای نوێژخوێن تیایدا گیرا دەکات، بە باسکردنی دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، وە کورت و پوخت نەك درێژ و تێروتەسەل

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە ڕۆژی هەینیدا ساتێك هەیە ئەگەر بەندەی موسوڵمان تیایدا نوێژ بکات و داوای خێر و چاکە لە خوا بکات حەتمەن پێی دەبەخشێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى لِبَعْضِ هَذِهِ اللَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّما أَعْلَمَ أَنَّ هَذِهِ السَّاعَةَ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ إِنَّمَا يُسْتَجَابُ فِيهَا دُعَاءُ الْمُصَلِّي دُونَ غَيْرِهِ، وَفِيهِ اخْتِصَارٌ أَيْضًا، لَيْسَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ الَّتِي أَذْكُرُهَا بِمُتَقَصَّاةٍ لِكُلِّهَا

١٧٣٦- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ[١].

## باسی فەرموودەیەك درێژەپێدری هەندێ لەو دەستەواژە نارِوونەیە کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا ئەو ساتەی کە لە هەینیدا هەیە تەنها نزای ئەو کەسە گیرا دەبێت کە نوێژی تێدا دەکات نەك کەسێکی دیکە، هەروەها کورتکردنەوەی تێدایە، ئەم دەستەواژەیەی کە باسی دەکەم درێژەپێدەری هەمووی نییە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرە ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو هاتووە.

تێبینی: لێرەدا پێشەوا ئەبو بەکر: چەند دەستەواژەیەکی هێناوە لە ڕووی واتاوە هەمان مانای هەیە یان نزیکن لە یەکەوە، خوێنەر دەتوانێت تەماشای ئەم فەرموودە بکات لە کتێبەکە گەر دەیەوێت لە سەنەدەکان زیاتر حاڵی بێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصِّي لِلَفْظَتَيْنِ الْمُجْمَلَتَيْنِ اللَّتَيْنِ ذَكَرْتُهُما فِي الْبَابَيْنِ قَبْلُ، وَالْبَيَانُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَعْلَمَ أَنَّ دُعَاءَ الْمُصَلِّي الْقَائِمِ يُسْتَجَابُ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، دُونَ دُعَاءِ غَيْرِ الْمُصَلِّي، وَدُونَ دُعَاءِ الْمُصَلِّي غَيْرِ الْقَائِمِ، وَذِكْرِ قَصْرِ تِلْكَ السَّاعَةِ الَّتِي يُسْتَجَابُ فِيهَا الدُّعَاءُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

---

(١) صحيح.



**١٧٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»، وَقَالَ بِيَدِهِ: يُقَلِّلُهَا وَيُزَهِّدُهَا[1].

**باسی فەرموودەیەك درێژەپێدەر و شیکەرەوەی ئەو دوو دەستەواژە ناڕوونەیە کە لە دوو بەشەکەی پێشەوە باسم کرد، ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە نزای ئەو کەسە گیرا دەبێت کە لەوساتەی ڕۆژی هەینی نوێژ دەکات، نەك نزای ئەو کەسەی نوێژ ناکات، وە نەك نزای ئەو نوێژخوێنەی نەوەستاوە، هەروەها باسی کورتی ئەو ساتەی کە لە ڕۆژی هەینی نزای تێدا گیرایە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: باوکی قاسم ﷺ دەڵێ: بەڕاستی لە ڕۆژی هەینیدا ساتێك هەیە بەندەی موسوڵمان تیایدا وەستا بێت و نوێژ بکات و داوای خێر و چاکە لە خوا بکات حەتمەن پێی دەبەخشێ. وە بەدەستی ئاماژەی کرد کاتەکە زۆر کەمە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ السَّاعَةَ الَّتِي ذَكَرْنَاهَا هِيَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ مِنَ الْجُمُعَاتِ لَا فِي بَعْضِهَا دُونَ بَعْضٍ

**١٧٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جِئْتُ الطُّورَ، فَلَقِيتُ هُنَاكَ كَعْبَ الْأَحْبَارِ، فَحَدَّثْتُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَحَدَّثَ عَنِ التَّوْرَاةِ، فَمَا اخْتَلَفْنَا، حَتَّى مَرَرْتُ بِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، قُلْتُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي كُلِّ جُمُعَةٍ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا مُؤْمِنٌ وَهُوَ يُصَلِّي، فَيَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»، فَقَالَ كَعْبٌ: بَلْ فِي كُلِّ سَنَةٍ، فَقُلْتُ: مَا كَذَلِكَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَجَعَ فَتَلَا، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فِي كُلِّ يَوْمِ جُمُعَةٍ[2].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ئەو ساتەی کە باسمان کرد نزای تێدا گیرا دەبێ، لە هەموو هەینییەك لە هەینییەکان، نەك لە هەندێکی جگە لە هەندێکی دیکەی**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: هاتم بۆ کێوی طور، لەوێ گەیشتم بە کەعبی ئەحبار، فەرموودەی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆی باس کرد، ئەویش لە تەوراتەوە بۆی باس

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کردم، هیچ جیاوازیان نەبوو، تا گەیشتم بە ڕۆژی هەینی، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە هەموو هەینییەکدا ساتێك هەیە بەندەی بڕوادار تیایدا نوێژ بکات و داوای خێر و چاکە لە خوا بکات حەتمەن پێی دەبەخشێ. کەعب وتی: بەڵکوو لە هەموو ساڵەکە، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ وای نەفەرمووە، ئەویش دووبارە خوێندیەوە، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرموو، لە هەموو هەینییەك.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ أَنَّ الدُّعَاءَ بِالْخَيْرِ مُسْتَجَابٌ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ دُونَ الدُّعَاءِ بِالْمَأْثَمِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نزای خێر و چاکە لەو ساتە لە ڕۆژی هەینی گیرایە، نەك نزای گوناه و تاوان. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو سیرین لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: داوای خێر و چاکە لە خوا بکات حەتمەن پێی دەبەخشێ

## بَابُ ذِكْرِ وَقْتِ تِلْكَ السَّاعَةِ الَّتِي يُسْتَجَابُ فِيهَا الدُّعَاءُ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ

**١٧٣٩-** عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ»[1].

## باسی ئەو کاتەی کە نزای تێدا گیرایە لە ڕۆژی هەینی

واتە: ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما پێی وتم: ئایا بیستووتە باوکت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی کاتەکەی ڕۆژی هەینی فەرموودە باس بکات؟ وتی: وتم: بەڵێ، گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بریتییە لە نێوان ئەوەی پێشنوێژ لەسەر مینبەر دابنیشێت تا نوێژ تەواو دەبێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ أَنَّ الدُّعَاءَ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ يُسْتَجَابُ فِي الصَّلَاةِ لِانْتِظَارِ الصَّلَاةِ كَمَا تَأَوَّلَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ أَنَّ مُنْتَظِرَ الصَّلَاةِ فِي صَلَاةٍ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الدُّعَاءَ بِالْخَيْرِ فِي صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ جَائِزٌ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ فِي خَبَرِ أَبِي مُوسَى، أَنَّ تِلْكَ السَّاعَةَ هِيَ مَا بَيْنَ جُلُوسِ الْإِمَامِ عَلَى الْمِنْبَرِ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ، وَإِنَّمَا تُقْضَى الصَّلَاةُ فِي هَذَا الْوَقْتِ صَلَاةُ الْجُمُعَةِ لَا غَيْرُهَا

**١٧٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ». قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: وَقَالَ بِيَدِهِ عَلَى رَأْسِهِ، قُلْنَا: يُزَهِّدُهَا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى إِبَاحَةِ الدُّعَاءِ فِي الْقِيَامِ فِي الصَّلَاةِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پاڕانەوە لەو كاتەدا لەنێو نوێژ و لە چاوەڕوانی نوێژ گیرایە، وەكو چۆن عەبدوڵای كوڕی سەلام لەیەكی داوەتەوە، ئەو كەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەكات لەنێو نوێژدایە، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نزای خێر لەنێو نوێژی فەڕز دروستە، چونكە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەكەی ئەبو موسا ڕایگەیاندووە، ئەو ساتە بریتییە لە نێوان دانیشتنی پێشنوێژ لەسەر مینبەر تا نوێژ دەكات، بێگومان تەنها نوێژی هەینی لەو كاتەدا دەكرێت نەك نوێژەكانی دیكە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: باوكی قاسم ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە هەینیدا ساتێك هەیە ئەگەر بەندەی موسوڵمان تیایدا بەڕاوەستانەوە نوێژ بكات و داوای خێر و چاكە لە خوا بكات حەتمەن پێی دەبەخشێ، ئیبنو عەون وتی: بە دەستی دای بەسەری خۆیدا (واتە: لە دەستی داوە لەو كاتەدا نزا بكات)، وتمان: كاتەكەی بە كاتێكی كەم دیاری كرد.

ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكە بەڵگەی تێدایە لەسەر ڕێگەدان بە پاڕانەوە لە هەستانەوە لەنێو نوێژ.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ إِنْسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ وَقْتَ تِلْكَ السَّاعَةِ بَعْدَ عِلْمِهِ إِيَّاهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْعَالِمَ قَدْ يُخْبِرُ بِالشَّيْءِ، ثُمَّ يَنْسَاهُ وَيَحْفَظُهُ عَنْهُ بَعْضُ مَنْ سَمِعَهُ مِنْهُ؛ لِأَنَّ أَبَا مُوسَى الْأَشْعَرِيَّ، وَعَمْرَو بْنَ عَوْفٍ الْمُزَنِيَّ، قَدْ أَخْبَرَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ تِلْكَ السَّاعَةَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ أُنْسِيهَا، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ النِّكَاحِ- أَنَّ الْعَالِمَ قَدْ يُحَدِّثُ بِالشَّيْءِ، ثُمَّ يَنْسَاهُ- عِنْدَ ذِكْرِي طَعْنَ مَنْ طَعَنَ فِي خَبَرِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ لِحِكَايَةِ ابْنِ عُلَيَّةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِابْنِ شِهَابٍ فَلَمْ يَعْرِفْهُ، وَخَبَرَ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِالتَّكْبِيرِ، هُوَ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ أَيْضًا قَالَ أَبُو مَعْبَدٍ بَعْدَ مَا سُئِلَ عَنْهُ: لَا أَعْرِفُهُ، وَقَدْ حَدَّثَ بِهِ.**

**١٧٤١-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: قُلْتُ: وَاللَّهِ لَوْ جِئْتُ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذِهِ السَّاعَةِ أَنْ يَكُونَ عِنْدَهُ مِنْهَا عِلْمٌ، فَأَتَيْتُهُ. فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلًا، وَقَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَنَا عَنِ السَّاعَةِ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ، فَهَلْ عِنْدَكَ مِنْهَا عِلْمٌ؟ فَقَالَ: سَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ عَنْهَا، فَقَالَ: إِنِّي قَدْ كُنْتُ أُعْلِمْتُهَا ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، كَمَا أُنْسِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ(١).

**باسی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەو کاتەی لەبیر براوەتەوە دوای ئەوەی زانیاری دەربارەی هەبوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کەسی زانا هەندێ جار هەواڵ بە شتێك دەدات پاشان بیری دەچێت، بەڵام هەندێ لەوکەسانە کە لێیەوە بیستوویەتی دەیپارێزێ، چونکە ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عەوفی موزەنی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەواڵی ئەو ساتەیان داوە کە نزای تێدا گیرا دەبێت، پێغەمبەریش ﷺ ڕایگەیاندووە ئەو بیری چووە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە کتێبی (النِّكَاحِ) ڕوونم کردەوە -بێگومان زانا هەندێ جار زانیاری دەدات بە شتێك پاشان بیری دەچێت- کاتێ کە باسی تانەی ئەو کەسەم کرد کە تانەی داوە لە فەرموودەکەی ئیبنو جوڕەیج لە سولەیمانی کوڕی موساوە لە زوهری لە عوڕوە لە عائیشە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، لەبەر باسەکەی ئیبنو عولەیە لە ئیبنو جوڕەیجەوە وتی: ئەو فەرموودەم بۆ**

---

(١) إسناده ضعيف.

**ئیبنو شهاب -زوهری- باس کرد نەیناسییەوە، وە فەرموودەکەی عەمری کوڕی دینار لە ئەبو مەعبەد لە ئیبنو عەباسەوە ئێمە بە تەکبیر (الله أکبر) دەمانزانی پێغەمبەر ﷺ نوێژی تەواو کردووە، ئەویش بە هەمان شێوە لەم شێوازەیە، ئەبو مەعبەد دوای ئەوەی پرسیاری لێ کرا وتی: نازانم، لە کاتێدا خۆی باسی کرد**

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: وتم: سوێند بە خوا خۆزگە بچووایەم بۆ لای ئەبو سەعید رضي الله عنه پرسیاری ئەو ساتەم لێ بکردایە کە نزای تێدا گیرایە تا بمزانیایە ئایا زانیاری هەیە لەسەری، دواتر ڕۆیشتم. -باسێکی دوورودرێژی کرد- وتی: وتم: ئەی باوکی سەعید، ئەبو هورەیرە باسی ئەو ساتەی بۆ کردین لە ڕۆژی هەینی، ئایا تۆ هیچ زانیارییەکت هەیە لەبارەیەوە؟ وتی: پرسیارمان لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەبارەیەوە فەرمووی: من دەمزانی بەڵام لە بیرم برایەوە وەکوو چۆن شەوی قەدرم لەبیر برایەوە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْغُسْلِ لِلْجُمُعَةِ

**بَابُ إِيجَابِ الْغُسْلِ لِلْجُمُعَةِ مِثْلَ اللَّفْظَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ قَبْلُ، أَنَّ الْأَمْرَ إِذَا كَانَ لِعِلَّةٍ فَمَتَى كَانَتِ الْعِلَّةُ قَائِمَةٌ كَانَ الْأَمْرُ وَاجِبًا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ، إِنَّمَا قَالَ: غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، لِعِلَّةٍ: أَيْ أَنَّ الِاحْتِلَامَ بُلُوغٌ، فَمَتَى كَانَ الْبُلُوغُ وَإِنْ كَانَ بِغَيْرِ احْتِلَامٍ فَالْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى الْبَالِغِ، وَلَوْ كَانَ الْحُكْمُ بِالنَّظِيرِ وَالشَّبِيهِ غَيْرَ جَائِزٍ عَلَى مَا زَعَمَ بَعْضُ مَنْ خَالَفَنَا فِي هَذَا لَكَانَ مَنْ بَلَغَ مِنَ السِّنِّ مَا بَلَغَ، وَشَاخَ، وَلَمْ يَحْتَلِمْ لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَمَنِ احْتَلَمَ وَهُوَ ابْنُ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً أَوْ أَكْثَرَ وَجَبَ عَلَيْهِ غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَهَذَا لَا يَقُولُهُ مَنْ يَعْقِلُ أَحْكَامَ اللَّهِ وَدِينَهُ**

**١٧٤٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[1].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی خۆشۆردن بۆ ڕۆژی هەینی

**باسی پێویست (واجب) بوونی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی وەکو ئەو دەستەواژەی کە باسم کرد لەپێشەوە، بێگومان فەرمان ئەگەر لەبەر هۆکارێك بێت هەر کات هۆکارەکە دروست بوو ئەوە فەرمانەکەیش واجب دەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ)، تەنها لەبەر هۆکارێك بووە: ئەویش ئەوەیە (احْتِلَامَ) بالغبوونە، هەر کات باڵ غبوو ئەگەرچی (احْتِلَامَ)یش نەبوو ئەوە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجب دەبێت لەسەر هەموو باڵغبووەکان، وە ئەگەر حوکم بە هاوشان و لەیەکچوون دروست نەبووایە وەك هەندێ لەوانەی جیاوازن لەگەڵمان بۆچوونیان وایە، ئەوە هەرچۆنێك باڵغ و تێگەیشتوو بووایە بەڵام (احْتِلَامَ) نەبووایە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەری پێویست نەدەبوو، وە هەر کەسێك (احْتِلَامَ) بوو ئەگەرچی تەمەنی دوازدە ساڵ بووایە یان زیاتر خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەری پێویست دەبوو، بێگومان کەسێك قسەی وا ناکات لە حوکمی شەرعی و دینی خوا تێگەیشتبێت**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ و پێگەیشتوو.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: وَاجِبٌ أَيْ وَاجِبٌ عَلَى الْبَطْلَانِ لَا وُجُوبُ فَرْضٍ لَا يُجْزِئُ غَيْرُهُ، عَلَى أَنَّ فِي الْخَبَرِ أَيْضًا اخْتِصَارُ كَلَامٍ سَأُبَيِّنُهُ بَعْدُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ ﷻ**

**١٧٤٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْغُسْلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكَ، وَأَنْ يَمَسَّ مِنَ الطِّيبِ مَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ»[(١)].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (وَاجِبٌ) واتە: واجبە لەسەر بەتاڵبوون نەك واجبوونی فەرز جگە لەوە دروست نەبێت، لەسەر ئەوەی فەرموودەکە بەکورتی هاتووە دواتر بە ویستی خوا ﷻ ڕوونی دەکەمەوە**

---

(١) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەر هەموو باڵغ و پێگەیشتوویەکە، وە سیواکیش، هەروەها بەکارهێنانی بۆنی خۆش بە ئەندازەی ئەوەی لە توانایدایە.

**١٧٤٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَيَمَسُّ طِيبًا إِنْ كَانَ عِنْدَهُ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ و پێگەیشتوو، وە بۆنی خۆشیش بەکار بهێنێ ئەگەر لەلای هەبوو.

**١٧٤٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَأَنْ يَسْتَنَّ، وَأَنْ يَمَسَّ طِيبًا إِنْ وَجَدَ». قَالَ عَمْرٌو: أَمَّا الْغُسْلُ فَأَشْهَدُ أَنَّهُ وَاجِبٌ، وَأَمَّا الِاسْتِنَانُ فَاللَّهُ أَعْلَمُ: أَوَاجِبٌ هُوَ أَمْ لَا، وَلَكِنْ هَكَذَا حَدَّثَ[٢].

واتە: عەمری کوڕی سولەیم دەڵێ: شایەتی دەدەم بۆ ئەبو سەعیدی خودری ﷺ، کە ئەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بوو کە فەرمووی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ و پێگەیشتوو، وە سیواکیش بکات، هەروەها بۆنی خۆشیش بەکار بهێنێ ئەگەر لەبەردەست بوو. عەمر دەڵێ: هەرچی خۆشۆردنە شایەتی دەدەم کە واجبە، هەرچیش سیواککردنە خوا زاناترە: ئایا واجبە یان نا، بەڵام بەم شێوە باسی کرد.

**١٧٤٦-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[٣].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ و پێگەیشتوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

١٧٤٧- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي هَذَا الْخَبَرِ قَدْ قَرَنَ النَّبِيُّ ﷺ السِّوَاكَ وَإِمْسَاسَ الطِّيبِ إِلَى الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَأَخْبَرَ ﷺ أَنَّهُنَّ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكُ تَطْهِيرٌ لِلْفَمِ، وَالطِّيبُ مُطَيِّبٌ لِلْبَدَنِ، وَإِذْهَابًا لِلرِّيحِ الْمَكْرُوهَةِ عَنِ الْبَدَنِ، وَلَمْ نَسْمَعْ مُسْلِمًا زَعَمَ أَنَّ السِّوَاكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلَا إِمْسَاسَ الطِّيبِ فَرْضٌ، وَالْغَسْلُ أَيْضًا مِثْلُهُمَا، وَيُسْتَدَلُّ فِي الْأَبْوَابِ الْأُخَرِ بِدَلَائِلَ غَيْرِ مُشْكِلَةٍ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَنَّ غُسْلَ يَوْمِ الْجُمُعَةِ لَيْسَ بِفَرْضٍ، لَا يُجْزِئُ غَيْرُهُ[١].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا سیواك و بەکارهێنانی بۆنی خۆشی هاوشان کردووە لەگەڵ خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، هەواڵی داوە ئەوانە لەسەر هەموو باڵغێکن، سیواك: پاککردنەوەی دەم و ددانە، بۆنی خۆشیش جەستە بۆنخۆش دەکات و بۆنی ناخۆشی جەستە ناهێڵێت، بەڵام نەمانبیستووە موسوڵمانێك پێی وابێت سیواککردن لە ڕۆژی هەینی، یان خۆبۆنخۆشکردن فەرز بێت، خۆشۆردنیش بەهەمان شێوە هاوشێوەی ئەوەیە، وە لە بەشەکانی دیکەدا بەباسکردنی ڕوون و ئاشکرا بە ویستی خوا باسی دەکەین کە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی فەرز نییە، لە جێگای جگە لە خۆی دانانرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِغُسْلِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ مَنْ أَتَاهَا دُونَ مَنْ لَمْ يَأْتِ الْجُمُعَةَ

١٧٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَعَرَّضَ بِهِ، فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَتَأَخَّرُونَ بَعْدَ النِّدَاءِ؟ قَالَ عُثْمَانُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَا زِدْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَاءَ أَنْ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ أَقْبَلْتُ، قَالَ: الْوُضُوءُ أَيْضًا؟ أَوَلَمْ تَسْمَعْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[٢].

**باسی فەرموودەیەکی شیکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە ناڕوونەی (مُجْمَل)ەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها فەرمانی کردووە بەوکەسەی دەچێت بۆ نوێژی هەینی نەك ئەوەی ناچێت بۆ هەینی**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتاب وتاری دەدا، لە پڕ عوسمانی کوڕی عەففان هاتە ژوورەوە، عومەریش هەر لەنێو وتارەکەی بەناڕاستەوخۆ

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لۆمەی کرد، وتی: ئەوە چییە خەڵکانێك دوا دەکەون دوای بانگ دێن؟ عوسمان وتی: ئەی گەورەی بڕواداران کاتێ گوێم لە بانگ بوو تەنها دەستنوێژم گرت و هاتم، عومەریش وتی: تەنها دەستنوێژت گرت (واتە: تۆ لەگەڵ ئەوەی دوا کەوتی لە پاداشتی زووهاتن بۆ مزگەوت خۆیشت نەشۆرد)؟ ئایا گوێت لێ نەبووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کاتێ یەکێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.

## بَابُ أَمْرِ الْخَاطِبِ بِالْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخُطْبَةَ لَيْسَتْ بِصَلَاةٍ كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ النَّاسِ، إِذِ الْخُطْبَةُ لَوْ كَانَتْ صَلَاةً مَا جَازَ أَنْ يَتَكَلَّمَ فِيهَا مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ

١٧٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: «مَنْ جَاءَ مِنْكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[١].

## باسی فەرمانکردنی وتارخوێن بە خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینی لەنێو وتاری هەینی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی وتار نوێژ نییە وەکو هەندێ لە خەڵکی لێیان تێك چووە و وا لێی تێگەیشتوون، چونکە ئەگەر وتارخوێندن نوێژ بێت دروست نییە قسەیەکی تێدا بکرێ کە لەنوێژدا دروست نییە بکرێ

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: هەر کەسێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.

١٧٥٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ وَهُوَ يَقُولُ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا و دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە (ویستی) بچێت بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٧٥١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ يَخْطُبُ النَّاسَ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَغْتَسِلْ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ خەڵك دەدا و دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە (ویستی) بچێت بۆ مزگەوت (نوێژی هەینی) با خۆی بشوات.

## بَابُ أَمْرِ النِّسَاءِ بِالْغُسْلِ لِشُهُودِ الْجُمُعَةِ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ أَيْضًا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي ذَكَرْتُ أَنَّهُ مُفَسِّرٌ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ، وَبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِالْغُسْلِ مَنْ أَتَى الْجُمُعَةَ دُونَ مَنْ حُبِسَ عَنْهَا

١٧٥٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَتَى الْجُمُعَةَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ فَلْيَغْتَسِلْ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِهَا فَلَيْسَ عَلَيْهِ غُسْلٌ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ»(٢).

## باسی فەرمانكردن بە ئافرەتان خۆیان بشۆرن بۆ ئامادەبوونی نوێژی هەینی، بەهەمان شێوە ئەم دەستەواژەیە لەو شێوازەیە كە باسم كرد دەستەواژەیەكە شیكەرەوەی (مُفَسِّرٌ) دەستەواژەیەكی ناڕوونە (مُجْمَل) كە لە فەرموودەكەی ئەبو سەعید هاتووە، وە ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كردووە بە خۆشۆردن بۆ ئەو كەسەی دەچێت بۆ نوێژی هەینی نەك ئەوەی لە ماڵدایە

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك (ویستی) بچێت بۆ نوێژی هەینی لە پیاوان و ئافرەتان با خۆی بشوات، هەر كەسێكیش نەهات بۆ هەینی لە پیاوان و ئافرەتان ئەوە خۆشۆردنی لەسەر نییە.

---

(١) صحيح.

(٢) حديث صحيح دون قوله: ((والنساء))، فهي لفظة شاذة لم يقلها غير عثمان بن واقد العمري، وقد ضعفه أبو داود من أجل هذا الحديث بهذه الزيادة.

## بَابُ ذِكْرِ عِلَّةِ ابْتِدَاءِ الْأَمْرِ بِالْغُسْلِ لِلْجُمُعَةِ

**١٧٥٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ عُمَّالَ أَنْفُسِهِمْ، فَكَانُوا يَرُوحُونَ إِلَى الْجُمُعَةِ كَهَيْئَتِهِمْ، فَقِيلَ لَهُمْ: لَوِ اغْتَسَلْتُمْ(١).

### باسی هۆكاری سەرەتای فەرمانكردن بە خۆشۆردن بۆ نوێژی هەینی

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەوكات خەڵكی كاریان بۆ خۆیان دەكرد، هەر بەوشێوەیە دەچوون بۆ نوێژی هەینی، پێیان وترا: خۆزگە خۆتان بشۆردایە.

**١٧٥٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَنْتَابُونَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ مَنَازِلِهِمْ مِنَ الْعَوَالِي، فَيَأْتُونَ فِي الْعَبَاءِ، وَيُصِيبَهُمُ الْغُبَارُ وَالْعَرَقُ، فَيَخْرُجُ مِنْهُمُ الرِّيحُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنْسَانٌ مِنْهُمْ وَهُوَ عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَطَهَّرْتُمْ لِيَوْمِكُمْ هَذَا».

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: خەڵكی لە لادێیەكانی دەوروبەری مەدینە لە ماڵەكانیانەوە دەهاتن بۆ نوێژی هەینی، بەو جل و پۆشاكانەی كە كاریان پێیەوە دەكرد، لەڕێگا تووشی باو و تۆز دەبوون و ئارەقیان دەكرد بۆنێكی ناخۆشیان لێ دەردەچوو، جا كەسێك لە ئەوان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا لەلای من دانیشتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆزگە ئێوە بۆ ئەم ڕۆژەتان خۆتان بشۆردایە.

**١٧٥٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ أَتَيَاهُ فَسَأَلَاهُ عَنِ الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: أَوَاجِبٌ هُوَ؟ فَقَالَ لَهُمَا ابْنُ عَبَّاسٍ: مَنِ اغْتَسَلَ فَهُوَ أَحْسَنُ وَأَطْهَرُ، وَسَأُخْبِرُكُمْ لِمَاذَا بَدَأَ الْغُسْلُ: كَانَ النَّاسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُحْتَاجِينَ، يَلْبَسُونَ الصُّوفَ، وَيَسْقُونَ النَّخْلَ عَلَى ظُهُورِهِمْ، وَكَانَ الْمَسْجِدُ ضَيِّقًا، مُقَارِبَ السَّقْفِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي يَوْمٍ صَائِفٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، وَمِنْبَرُهُ قَصِيرٌ، إِنَّمَا هُوَ ثَلَاثُ دَرَجَاتٍ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَعَرِقَ النَّاسُ بِالصُّوفِ، فَثَارَتْ أَرْوَاحُهُمْ رِيحَ الْعَرَقِ وَالصُّوفِ حَتَّى كَانَ يُؤْذِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا، حَتَّى بَلَغَتْ أَرْوَاحُهُمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِذَا كَانَ هَذَا الْيَوْمُ فَاغْتَسِلُوا، وَلْيَمَسَّ أَحَدُكُمْ أَطْيَبَ مَا يَجِدُ مِنْ طِيبِهِ أَوْ دُهْنِهِ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو پیاو لە خەڵکی عێراق هاتن بۆ لای پرسیاریان لێ کرد دەربارەی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی: ئایا واجبە؟ ئیبنو عەباس پێیانی وت: هەر کەسێك خۆی بشوات ئەوە چاکتر و پاکترە، ئێستا بۆتان باس دەکەم بۆچی خۆشۆردن دەستی پێ کرد: خەڵك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەژار و کەمدەست بوون، خوورییان لەبەر دەکرد و بەشان ئاوی دارخورماکانیان دەدا، مزگەوتیش تەنگ بوو، دارەڕای مزگەوتەکەیش نزم بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی دەرچوو ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، مینبەرەکەیشی کورت بوو، سێ پلیکانە بوو، وتاری بۆ خەڵکەکە دا، خەڵکەکە لەنێو ڕیزەکان ئارەقیان کرد، ئینجا بۆنی ئارەق بەنێویاندا بڵاوەی کرد، هەندێکیان بە ئارەقی ئەوی دیکە بێزار بوون، تا ئەو بۆنە ناخۆشە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لەسەر مینبەر بوو، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئەم ڕۆژە هات خۆتان بشۆرن، وە با هەر یەکێتان خۆشترین بۆن یان چاکترین ڕۆن کە لە ماڵەیدا هەیە بدات لە خۆی.

## بَابُ ذِكْرِ دَلِيلٍ أَنَّ الْغَسْلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَضِيلَةٌ لَا فَرِيضَةٌ

١٧٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَدَنَا وَأَنْصَتَ، وَاسْتَمَعَ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، وَمَنْ مَسَّ الْحَصَا فَقَدْ لَغَا»(١).

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی کارێکی چاکە نەك فەرز

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ لە ڕۆژی هەینی بەچاکترین دەستنوێژ پاشان بچێت بۆ هەینی نزیك بێتەوە و بێدەنگ بێت و گوێ بۆ ئیمام بگرێت، ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت لە نێوان ئەو هەینییە بۆ هەینییەکەی دیکە، وە سێ ڕۆژ زیاتریش، هەر کەسێکیش دەستکاری بەرد بکات، ئەوا کاری نابەجێی کردووە (ئەوکات وەکوو ئێستا نەبوو نێو مزگەوت وردەبەردی تێدا بوو).

---

(١) صحيح.

**١٧٥٧-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَذَاكَ أَفْضَلُ»(١).

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ لە ڕۆژی هەینی ئەوە دەستی بە ڕوخصەتەوە گرتووە و چاکترین سوننەتە، هەر کەسێکیش خۆی بشوات ئەوە چاکترە.

## بَابُ ذِكْرِ فَضِيلَةِ الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذَا ابْتَكَرَ الْمُغْتَسِلُ إِلَى الْجُمُعَةِ فَدَنَا، وَأَنْصَتَ، وَلَمْ يَلْغُ

**١٧٥٨-** عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: «مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ، وَغَدَا وَابْتَكَرَ، فَدَنَا وَأَنْصَتَ، وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ كَأَجْرِ سَنَةٍ: صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا»(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَنْ قَالَ فِي الْخَبَرِ: مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ، فَمَعْنَاهُ: جَامَعَ فَأَوْجَبَ الْغُسْلَ عَلَى زَوْجَتِهِ أَوْ أَمَتِهِ وَاغْتَسَلَ، وَمَنْ قَالَ: غَسَلَ وَاغْتَسَلَ، أَرَادَ: غَسَلَ رَأْسَهُ، وَاغْتَسَلَ، فَغَسَلَ سَائِرَ الْجَسَدِ.

## باسی چاکەی خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینی، ئەگەر زوو بچێت بۆ مزگەوت و نزیك ببێتەوە لە ئیمام و بێدەنگ بێت و قسەی نابەجێ نەکات

واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕۆژی هەینی کرد، فەرمووی: هەر کەسێك لەگەڵ خێزانی جووت بوو خۆشۆردنی لەسەر واجب بوو، ئینجا خۆی شۆرد، وە زوو چوو بۆ مزگەوت و نزیك بۆیەوە (لە ئیمام) و بێدەنگ بوو، وە قسەی نابەجێی نەکرد، ئەوە هەر هەنگاوێکی بەگوێرەی کردەوەی ساڵێك پاداشتی بۆ هەیە وەکوو: بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بە شەویش شەونوێژ بکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەر کەسێك لە فەرموودەکەی وتوویەتی: (مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ)، ئەوە مانای: لەگەڵ خێزانەکەی یان کەنیزەکەکەی جووت بوو، خۆشۆردنی لەسەر واجب بوو، ئینجا خۆی شۆرد، وە ئەوەی وتوویەتی: (غَسَلَ وَاغْتَسَلَ)، مەبەستی لە: (غَسَلَ) سەری شۆرد، وە (وَاغْتَسَلَ) هەموو جەستەی شۆرد.

---

(١) اقتصر الترمذي على تحسينه، ولعله بمجموع طرقه لعدم سماع الحسن من سمرة.

(٢) صحيح.

**١٧٥٩-** عَنْ طَاوُسٍ الْيَمَانِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: زَعَمُوا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اغْتَسِلُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَاغْسِلُوا رُءُوسَكُمْ وَإِنْ لَمْ تَكُونُوا جُنُبًا، وَمَسُّوا مِنَ الطِّيبِ؟ » قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا الطِّيبُ فَلَا أَدْرِي، وَأَمَّا الْغُسْلُ، فَنَعَمْ.(١)

واتە: تاوسی یەمانی دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﵄ وت: پێیان وایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی هەینیدا خۆتان بشۆرن، وە سەریشتان بشۆرن، ئەگەرچی لەشگرانیش نەبن، وە بۆنی خۆش بەكاربهێنن؟ ئیبنو عەباس وتی: بۆنی خۆش نازانم، بەڵام خۆشۆردن بەڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ بَعْضِ فَضَائِلِ الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَأَنَّ الْمُغْتَسِلَ لَا يَزَالُ طَاهِرًا إِلَى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، وَإِنْ كَانَ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ سَمِعَ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ

**١٧٦٠-** عَنْ يحيى بن أبي كثير عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ أَبُو قَتَادَةَ ﵁ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَأَنَا أَغْتَسِلُ، قَالَ: غُسْلُكَ هَذَا مِنْ جَنَابَةٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَعِدْ غُسْلًا آخَرَ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لَمْ يَزَلْ طَاهِرًا إِلَى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى»(٢).

## باسی هەندێ فەزڵ و گەورەیی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وە ئەو كەسەی خۆی دەشوات تا هەینییەكەی دیكە پاكە، ئەگەر یەحیای كوڕی ئەبو كەسیر ئەم فەرموودەی بیستبێ لە عەبدوڵای كوڕی ئەبو قەتادە

واتە: یەحیای كوڕی ئەبو كەسیر دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای كوڕی ئەبو قەتادەوە دەڵێ: ئەبو قەتادە ﵁ هات بۆ لام لە ڕۆژی هەینی خۆم دەشۆرد، وتی: ئەم خۆشۆردنەت لەبەر لەشگرانییە؟ وتم: بەڵێ، وتی: جارێكی دیكە خۆت بشۆرە، من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر كەسێك لە ڕۆژی هەینی خۆی بشوات بەردەوام پاكە تا هەینییەكەی دیكە.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الطِّيبِ، وَالتَّسَوُّكِ، وَاللُّبْسِ لِلْجُمُعَةِ

### بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّطَيُّبِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ مِنَ الْحُقُوقِ عَلَى الْمُسْلِمِ التَّطَيُّبِ إِذَا كَانَ وَاجِدًا لَهُ

**١٧٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ كُلَّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ، وَأَنْ يَمَسَّ طِيبًا إِنْ وَجَدَهُ»[١].

### کۆباسی بەکارهێنانی بۆنی خۆش و سیواککردن و پۆشینی جلوبەرگ بۆ ڕۆژی هەینی

**باسی فەرمانکردن بە بەکارهێنانی بۆنی خۆش لە ڕۆژی هەینی، چونکە یەکێك لەو مافانە لەسەر مسوڵمان بەکارهێنانی بۆنی خۆشە ئەگەر لەبەردەست بوو**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەقە لەسەر هەموو موسوڵمانێك هەر حەوت ڕۆژ جارێك خۆی بشوات، وە ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو بەکاری بهێنێ.

### بَابُ فَضِيلَةِ التَّطَيُّبِ، وَالتَّسَوُّكِ، وَلُبْسِ أَحْسَنَ مَا يَجِدُ الْمَرْءُ مِنَ الثِّيَابِ بَعْدَ الِاغْتِسَالِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَتَرْكِ تَخَطِّي رِقَابِ النَّاسِ، وَالتَّطَوُّعِ بِالصَّلَاةِ بِمَا قَضَى اللَّهُ لِلْمَرْءِ أَنْ يَتَطَوَّعَ بِهَا قَبْلَ الْجُمُعَةِ، وَالْإِنْصَاتِ عِنْدَ خُرُوجِ الْإِمَامِ حَتَّى تُقْضَى الصَّلَاةُ

**١٧٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَا: سَمِعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاسْتَنَّ وَمَسَّ مِنَ الطِّيبِ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ جَاءَ إِلَى الْمَسْجِدِ، وَلَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ، ثُمَّ رَكَعَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَرْكَعَ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ حَتَّى يُصَلِّيَ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الَّتِي كَانَتْ قَبْلَهَا. يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَثَلَاثَةُ أَيَّامٍ زِيَادَةً، إِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی فەزڵ و گەورەیی بەکارهێنانی بۆنی خۆش و سیواککردن، وە پۆشینی چاکترینی جلەکانی دوای خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وە وازهێنان لە هەنگاونان بەسەر خەڵکیدا، وە ئەنجامدانی نوێژی زیادە (سوننەت) ئەوەندەی خوا ویستی لەسەریەتی پێش نوێژی هەینی، وە بێدەنگبوون لە کاتی چوونی پێشنوێژ بۆ سەر مینبەر تا نوێژ تەواو دەبێت

واتە: ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﵄ دەڵێن: گوێمان لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینیدا خۆی بشوات و سیواك بكات، وە بۆنی خۆش بەكاربهێنێت ئەگەر لەلای هەبوو، وە چاکترینی جلەکانی بپۆشێت، پاشان بچێت بۆ مزگەوت، بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاو نەنێت، پاشان ئەوەندەی خوا ویستی لەسەرە نوێژ بكات، پاشان بێدەنگ بێت کاتێ کە ئیمام دەردەچێ بۆ نوێژ تا نوێژەکەی تەواو دەکات، ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکان بۆی لە نێوانی ئەو هەینییە و هەینییەکەی پێشوو. ئەبو هورەیرە دەڵێ: سێ ڕۆژ زیاتریش، بەڕاستی خوا چاکەیەکی داناوە بەرانبەر بە دە هێندە پاداشت.

## بَابُ فَضِيلَةِ الِادِّهَانِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالتَّجْمِيعِ بَيْنَ الِادِّهَانِ وَبَيْنَ التَّطَيُّبِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

**١٧٦٣-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَحْسَنَ الْغُسْلَ، ثُمَّ لَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ مَسَّ مِنْ دُهْنِ بَيْتِهِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، أَوْ مِنْ طِيبِهِ، ثُمَّ لَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ كَفَّرَ اللَّهُ عَنْهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ قَبْلَهَا»[1].

## باسی فەزڵ و چاکێتی بەکارهێنانی ڕۆن بۆ سەر و ڕیش لە ڕۆژی هەینی، وە بەکارهێنانی ڕۆن و بۆنی خۆش پێکەوە لە ڕۆژی هەینی

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لەڕۆژی هەینیدا خۆی بشوات بەچاکترین خۆشۆردن، پاشان ئەو ڕۆنەی لەبەردەستیدایە بەکاری بهێنێت (بۆ سەر و ڕیشی)، یان بۆنی خۆش لە خۆی بدات، پاشان (بچێت

---

(١) حديث صحيح.

بۆ نوێژی هەینی) لە نێوانی دووکەسدا دانەنیشێ و لە یەکدی جیایان نەکاتەوە، ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت لە نێوان ئەو هەینییە و هەینییەکەی دیکە.

**١٧٦٤-** عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ بِهَذَا الْحَدِيثِ[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ اتِّخَاذِ الْمَرْءِ فِي الْجُمُعَةِ ثِيَابًا سِوَى ثَوْبَيِ الْمِهْنَةِ

**١٧٦٥-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ، عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَرَأَى عَلَيْهِمْ ثِيَابَ النِّمَارِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدَ سَعَةً أَنْ يَتَّخِذَ ثَوْبَيْنِ لِجُمُعَتِهِ سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ؟»[٢].

## باسی چاکتر وایە بەندە لە ڕۆژی هەینی پۆشاکێك بەکار بهێنێ جگە لە پۆشاکی پیشە و ئیشوکاری ڕۆژانەی

واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە خۆیان، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دا، بینی جلێکی خەتخەتیان لەبەردایە وەکوو پڵنگ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ژیانی باش بوو با دوو پۆشاکی هەبێت بۆ نوێژی هەینی، جگە لە پۆشاکی ئیشوکارەکەی.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ لُبْسِ الْجُبَّةِ فِي الْجُمُعَةِ إِنْ كَانَ الْحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَأَةَ سَمِعَ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ أَبِي جَعْفَرٍ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ

**١٧٦٦-** عَنْ حَجاجٍ عن أبي جَعفَر عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ جُبَّةٌ يَلْبَسُهَا فِي الْعِيدَيْنِ، وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ[٣].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

**باسی چاکتر وایە جوببە بەکار بهێنرێ لە ڕۆژی هەینی، ئەگەر حەجاجی کوڕی ئەرتەئە ئەم فەرموودەی بیستبێ لە ئەبو جەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی**

واتە: حەجاج دەگێڕێتەوە لە ئەبو جەعفەر لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جوببەیەکی هەبوو لە هەردوو جەژنەکە و ڕۆژی هەینی لەبەری دەکرد.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ التَّهْجِيرِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَالْمَشْيِ إِلَيْهَا

### بَابُ فَضْلِ التَّبْكِيرِ إِلَى الْجُمُعَةِ مُغْتَسِلًا، وَالدُّنُوِّ مِنَ الْإِمَامِ، وَالِاسْتِمَاعِ، وَالْإِنْصَاتِ

**١٧٦٧**- عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ غَدَا وَابْتَكَرَ، وَجَلَسَ مِنَ الْإِمَامِ قَرِيبًا، فَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ أَجْرُ سَنَةٍ، صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا»(١).

## کۆباسی زوو ڕۆیشتن بەپیادە بۆ نوێژی هەینی

### باسی فەزڵ و ڕێزی ئەو کەسەی خۆی دەشوات و زوو دەچێت بۆ نوێژی هەینی، وە نزیك دەبێتەوە لە ئیمام و گوێی لێ دەگرێ و بێدەنگ دەبێ

واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لەگەڵ خێزانی جووت بوو و خۆشۆردنی لەسەر واجب بوو، ئینجا خۆی شۆرد، پاشان بەیانی زوو چوو بۆ مزگەوت و لە نزیك ئیمامەوە دانیشت و گوێی گرت و بێدەنگ بوو، ئەوە خێرو کردەوەی ساڵێکی بۆ هەیە کە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بەشەویش شەونوێژ بکات

### بَابُ تَمْثِيلِ الْمُهَجِّرِينَ إِلَى الْجُمُعَةِ فِي الْفَضْلِ بِالْمُهْدِينَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَنْ سَبَقَ بِالتَّهْجِيرِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ إِبْطَائِهِ

**١٧٦٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمُسْتَعْجِلُ إِلَى الصَّلَاةِ كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، وَالَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي بَقَرَةً، وَالَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي شَاةً، وَالَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي طَيْرًا»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی ئەو کەسانەی زوو دەچن بۆ هەینی لە فەزڵ و چاکەدا وەکو ئەو کەسانەن کە حەیوان سەردەبڕن و گۆشتەکەی دەبخشنەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی زوو دەچێت بۆ هەینی چاکترە لەوکەسەی دواتر دەچێت

واتە: ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی پەلە دەکات و زوو دەچێت بۆ نوێژی هەینی (پاداشتەکەی) وەك ئەو کەسە وایە کە وشترێك سەر دەبڕێت (لە مەککە لە کاتی حەج)، ئەوەیشی دوای ئەو دەچێت (پاداشتەکەی) وەك ئەو کەسە وایە کە مانگایەك سەر دەبڕێت (لە مەککە لە کاتی حەج)، هەروەها ئەو کەسەی دواتر دەچێت (پاداشتەکەی) وەك ئەو کەسە وایە کە مەڕێك سەر دەبڕێت (لە مەککە لە کاتی حەج)، وە ئەو کەسەی دواتر دەچێت (پاداشتەکەی) وەك ئەو کەسە وایە باڵندەیەك سەر دەبڕێت (لە مەککە لە کاتی حەج).

### بَابُ ذِكْرِ جُلُوسِ الْمَلَائِكَةِ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لِكِتَابَةِ الْمُهَجِّرِينَ إِلَيْهَا عَلَى مَنَازِلِهِمْ، وَوَقْتِ طَيِّهِمْ لِلصُّحُفِ لِاسْتِمَاعِ الْخُطْبَةِ

**١٧٦٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ النَّاسَ عَلَى مَنَازِلِهِمُ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طُوِيَتِ الصُّحُفُ، وَاسْتَمَعُوا الْخُطْبَةَ، فَالْمُهَجِّرُ إِلَى الصَّلَاةِ كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَمُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَمُهْدِي كَبْشٍ، حَتَّى ذَكَرَ الدَّجَاجَةَ وَالْبَيْضَةَ»[1].

### باسی دانیشتنی فریشتەکان لەلای دەرگای مزگەوتەکان لە ڕۆژی هەینی بۆ نووسینی ناوی ئەو کەسانەی زوو دەچن بۆ مزگەوت، وە کاتی داخستنی پەڕاوەکان بۆ گوێگرتن لە وتاری هەینی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕۆژی هەینی دێت لەسەر هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی مزگەوت چەند فریشتەیەك هەن ناوی

خەڵك دەنووسن بەپێی پلەوپایەکانیان، ناوی یەکەمیی کەس دەنووسن، دواتر دوای ئەو، کاتێ ئیمام دەرچوو بۆ سەر مینبەر پەڕاوەکان دادەخەن و گوێبیستی وتار دەبن، ئەوەی زوو دەچێت بۆ نوێژی هەینی وەکوو ئەوە وایە وشترێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان ئەوەی دوای ئەو دێت وەکوو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێ بە قوربانی، پاشان ئەوەی دوای ئەو دێت وەکوو ئەوە وایە بەرانێکی کردبێ بە قوربانی، تەنانەت باسی مریشك و هێلەکەشی کرد (بەپێی زوو ڕۆیشتن و درەنگ ڕۆیشتن).

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ مَنْ يَقْعُدُ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنَ الْمَلَائِكَةِ لِكِتَابَةِ الْمُهَجِّرِينَ إِلَيْهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاثْنَيْنِ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِمَا اسْمُ جَمَاعَةٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَوْقَعَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ اسْمَ الْمَلَائِكَةِ

**١٧٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مَلَكَانِ يَكْتُبَانِ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، كَرَجُلٍ قَدَّمَ بَدَنَةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ بَقَرَةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ شَاةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ طَيْرًا، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ بَيْضَةً، فَإِذَا قَعَدَ الْإِمَامُ طُوِيَتِ الصُّحُفُ»[١].

**باسی ژمارەی ئەو فریشتانەی لەلای دەرگاکانی مزگەوت دەوەستن لە ڕۆژی هەینی، بۆ نووسینی ناوی ئەوانەی زوو دەچن بۆ مزگەوت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەندێ جار دوو کەس بەکۆمەڵ نێو دەهێنرێن، چونکە پێغەمبەر ﷺ ناوی دوو فەریشتەکەی (الْمَلَكَيْنِ) بە فریشتەکان (الْمَلَائِكَةِ) هێنا**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەسەر هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی مزگەوت دوو فریشتە هەن، ناوی یەکەمین کەس دەنووسن، دواتر دوای ئەو، جا هەر کەسێك لە کاتی یەکەم چووبێت بۆ مزگەوت وەکوو وشترێکی کردبێت بە خێر، هەر کەسێکیش دوای ئەو چووبێت وەکوو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێت بە خێر، هەر کەسێکیش دوای ئەو چووبێت وەکوو ئەوە وایە مەڕێکی کردبێ بە خێر، هەر کەسێکیش دوای ئەو چووبێت وەکوو ئەوە وایە باڵندەیەکی کردبێ بە خێر، هەر کەسێکیش دوای ئەو چووبێت وەکوو ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێ بە خێر، جا کاتێ ئیمام دانیشت پەڕاوەکان دادەخرێن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ دُعَاءِ الْمَلَائِكَةِ لِلْمُتَخَلِّفِينَ عَنِ الْجُمُعَةِ بَعْدَ طَيِّهِمُ الصُّحُفَ

**١٧٧١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «تُبْعَثُ الْمَلَائِكَةُ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَكْتُبُونَ مَجِيءَ النَّاسِ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طُوِيَتِ الصُّحُفُ، وَرُفِعَتِ الْأَقْلَامُ، فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: مَا حَبَسَ فُلَانًا؟ فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ ضَالًّا فَاهْدِهِ، وَإِنْ كَانَ مَرِيضًا فَاشْفِهِ، وَإِنْ كَانَ عَائِلًا فَأَغْنِهِ»[1].

## باسی پاڕانەوەی فریشتەکان بۆ ئەو کەسانەی دوا کەوتوون لە نوێژی هەینی دوای داخستنی پەڕاوەکانیان

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکی لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان دەنێردرێن بۆ لای دەرگای مزگەوتەکان لە ڕۆژی هەینی، ناوی هاتنی خەڵك تۆمار دەکەن، جا کاتێ ئیمام دەرچوو (بۆ سەر مینبەر)، پەڕاوەکان دادەخرێن و پێنووسەکان بەرز دەکرێنەوە، فریشتەکان هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: فڵانە کەس بۆ دیار نییە؟ فریشتەکان دەڵێن: خوایە ئەگەر گومڕایە هیدایەتی بدەی، ئەگەر نەخۆشە چاکی بکەیتەوە، ئەگەر کەمدەستە دەوڵەمەندی بکەی.

**بَابُ فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَتَرْكِ الرُّكُوبِ وَاسْتِحْبَابِ مُقَارِبَةِ الْخُطَا لِتَكْثُرَ الْخُطَا فَيَكْثُرَ الْأَجْرُ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ أَجْرُ سَنَةٍ صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا. قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ.**

**بَابُ الْأَمْرِ بِالسَّكِينَةِ فِي الْمَشْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَالنَّهْيِ عَنِ السَّعْيِ إِلَيْهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الِاسْمَ الْوَاحِدَ يَقَعُ عَلَى فِعْلَيْنِ يُؤْمَرُ بِأَحَدِهِمَا، وَيُزْجَرُ عَنِ الْآخَرِ بِالِاسْمِ الْوَاحِدِ، فَمَنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَلَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْمَعْنَيَيْنِ، قَدْ يَخْطِرُ بِبَالِهِ أَنَّهُمَا مُخْتَلِفَانِ، قَدْ أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي نَصِّ كِتَابِهِ السَّعْيَ إِلَى الْجُمُعَةِ فِي قَوْلِهِ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ٩﴾ **الجمعة، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى قَدْ نَهَى عَنِ السَّعْيِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ**

---

(١) إسناده ضعيف.

ﷺ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، وَالْوَقَارَ، وَقَالَ ﷺ: فَإِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ، فَلَا تَسْعَوْا إِلَيْهَا، وَامْشُوا، وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ نَهَى عَنِ السَّعْيِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَالسَّعْيُ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ بِهِ إِلَى الْجُمُعَةِ هُوَ الْمُضِيُّ إِلَيْهَا، غَيْرُ السَّعْيِ الَّذِي زَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ فِي إِتْيَانِ الصَّلَاةِ؛ لِأَنَّ السَّعْيَ الَّذِي زَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ هُوَ الْخَبَبُ، وَشِدَّةُ الْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ الَّذِي هُوَ ضِدُّ الْوَقَارِ، وَالسَّكِينَةِ، فَمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهِ غَيْرُ مَا زَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهُ، وَإِنْ كَانَ الِاسْمُ الْوَاحِدُ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِمَا جَمِيعًا قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ، فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، وَالْوَقَارَ»

١٧٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَمْشُونَ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَاقْضُوا»[1].

باسی فەزڵ و پاداشتی ڕۆیشتن بەپیادە بۆ مزگەوت، وە وازهێنان لە کەرەستەی گواستنەوە، هەروەها چاکتر وایە هەنگاوی بچووك بنێت بۆ ئەوەی پاداشتی زیاتری دەست بکەوێت. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەوسی کوڕی ئەوس هاتووە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بۆ هەر هەنگاوێکی بە گوێرەی کردەوەی ساڵێك پاداشتی بۆ هەیە: (بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بە شەویش شەونوێژ بکات). پێشتر فەرموودەکەم هێنا

باسی فەرمان کردن بە لەسەرخۆیی بۆ ئەو کەسەی بەپیادە دەچێ بۆ نوێژی هەینی، قەدەغەکردنیش لە پەلەپەلکردن لە هاتنیدا، بەڵگەش لەسەر ئەوەی یەك ناو بۆ دوو کردار بەکار دێت، فەرمان بە یەکێکیان دەکرێت و قەدەغەیش لەوی دیکەیان دەکرێ بە یەك ناو، جا ئەوەی لە زانست تێنەگەیشتووە و ناتوانێت ئەو دوو مانایە لە یەکدی جیا بکاتەوە وا دەزانێ و خەیاڵ دەکات ئەو دووانە جیاوازن، خوا لە کتێبەکەیدا فەرمانی کردووە بە (السَّعْي) بۆ نوێژی هەینی، لە فەرمایشتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ٩﴾، پێغەمبەریش ﷺ قەدەغەی کردووە (السَّعْي) پەلەپەل بۆ نوێژ، فەرموویەتی: کاتێ هاتن بۆ نوێژ بەهێمنی و

(١) صحيح.




**لەسەرخۆیی بچن. وە فەرموویەتی: کاتێ هاتن بۆ نوێژ پەلەپەل مەکەن، بەڵکوو بەلەسەرخۆیی بچن، جا خوا فەرمانی کردووە بە (السَّعْي) بۆ نوێژی هەینی، پێغەمبەریش ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە (السَّعْي) بۆ نوێژ، جا ئەو (السَّعْي)یەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە بۆ نوێژی هەینی بریتییە لە ڕۆیشتن بۆی، ئەو (السَّعْي)ە نییە کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە هاتن بۆ مزگەوت، چونکە ئەو (السَّعْي)یەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردووە بریتیە لە پەلەپەلکردن لە کاتی ڕۆیشتن بۆ نوێژ کە پێچەوانەی هێمنی و لەسەرخۆییە، جا ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردووە ئەوە نییە کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە، ئەگەرچی هەندێ جار یەك ناو بۆ دوو کردار بەکار دەهێنرێ پێکەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ هاتن بۆ نوێژ بەهێمنی و لەسەرخۆیی بچن**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قامەت بۆ نوێژ کرا پەلەپەل مەکەن لە کاتی هاتنتاندا، بەڵکوو بەهێمنی و لەسەرخۆیی بچن بۆ نوێژ، ئەوەی گەیشتن پێی نوێژ بکەن، (لەگەڵ پێشنوێژ) ئەوەیشی لەدەستتان چوو تەواوی بکەن.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَذَانِ وَالْخُطْبَةِ فِي الْجُمُعَةِ، وَمَا يَجِبُ عَلَى الْمَأْمُومِينَ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ مِنَ الِاسْتِمَاعِ لِلْخُطْبَةِ، وَالْإِنْصَاتِ لَهَا، وَمَا أُبِيحَ لَهُمْ مِنَ الْأَفْعَالِ، وَمَا نُهُوا عَنْهُ

## بَابُ ذِكْرِ الْأَذَانِ الَّذِي كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ إِذَا نُودِيَ بِهِ، وَالْوَقْتِ الَّذِي كَانَ يُنَادَى بِهِ، وَذِكْرِ مَنْ أَحْدَثَ النِّدَاءَ الْأَوَّلَ قَبْلَ خُرُوجِ الْإِمَامِ

١٧٧٣- عَنِ السَّائِبِ وَهُوَ ابْنُ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: كَانَ النِّدَاءُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ فِي الْقُرْآنِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ، وَإِذَا قَامَتِ الصَّلَاةُ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، حَتَّى كَانَ عُثْمَانُ، فَكَثُرَ النَّاسُ، فَأَمَرَ بِالنِّدَاءِ الثَّالِثِ عَلَى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ حَتَّى السَّاعَةِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِهِ وَإِذَا قَامَتِ الصَّلَاةُ: يُرِيدُ النِّدَاءَ الثَّانِيَ الْإِقَامَةَ، وَالْأَذَانُ وَالْإِقَامَةُ يُقَالُ لَهُمَا: أَذَانَانِ، أَلَمْ تَسْمَعِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ؟ وَإِنَّمَا أَرَادَ: بَيْنَ كُلِّ أَذَانٍ وَإِقَامَةٍ. وَالْعَرَبُ

---

(١) صحيح.

قَدْ تُسَمِّي الشَّيْئَيْنِ بِاسْمِ الْوَاحِدِ إِذَا قَرَنَتْ بَيْنَهُمَا، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾النساء: ١١، وَقَالَ: ﴿وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾النساء: ١١، وَإِنَّمَا هُمَا أَبٌ وَأُمٌّ، فَسَمَّاهُمَا اللَّهُ أَبَوَيْنِ، وَمِنْ هَذَا الْجِنْسِ خَبَرُ عَائِشَةَ: كَانَ طَعَامُنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْأَسْوَدَيْنِ: التَّمْرَ وَالْمَاءَ. وَإِنَّمَا السَّوَادُ لِلتَّمْرِ خَاصَّةً دُونَ الْمَاءِ، فَسَمَّتْهُمَا عَائِشَةُ: الْأَسْوَدَيْنِ، لَمَّا قَرَنَتْ بَيْنَهُمَا، وَمِنْ هَذَا الْجِنْسِ قِيلَ: سُنَّةُ الْعُمَرَيْنِ، وَإِنَّمَا أُرِيدَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، لَا كَمَا تَوَهَّمَ مَنْ ظَنَّ أَنَّهُ أُرِيدَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّهُ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: وَإِذَا قَامَتِ الصَّلَاةُ: النِّدَاءَ الثَّانِيَ الْمُسَمَّى إِقَامَةً.

## کۆباسی بانگدان و وتاردان لە ڕۆژی هەینی، ئەوەشی کە پێویستە لەسەر نوێژخوێنان لە کاتی وتاردا گوێ بگرن و بێدەنگ بن، هەروەها ئەوەشی ڕێگەیان پێدراوە بیکەن و ئەوەشی قەدەغەیان لێکراوە

### باسی ئەو بانگدانەی کە وا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا دەدرا کە خوا فەرمانی کردووە بە (السَّعْي) پەلەکردن بۆ هەینی کاتێ بانگ درا بۆی، وە باسی ئەو کاتەش کە بانگی بۆ دەدرێ، وە باسی ئەو کەسەش بانگی یەکەمی زیاد کرد پێش دەرچوونی ئیمام

واتە: سائیب کە کوڕی یەزیدە ﷺ دەڵێ: ئەو بانگدانەی کە خوا لە قورئاندا باسی کردووە لە ڕۆژی هەینی (لە سورەتی (الجمعة) لە ئایەتی نۆ) ئەو کاتەیە کە ئیمام دەچێتە سەر مینبەر، هەروەها ئەو کاتەیش کە قامەت کرا، یان بانگی دووەم درا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر، تا عوسمان بوو بە خەلیفە، خەڵك زۆر بوون، بۆیە فەرمانی کرد بانگی سێیەم بدرێ لەسەر (الزَّوْرَاء) (کە جێگایەك بوو لەنێو بازاڕی مەدینە).

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (وَإِذَا قَامَتِ الصَّلَاةُ)، مەبەستی پێی بانگی دووەمە، وە بانگ و قامەت پێیان دەوترێ: (أَذَانَانِ) دوو بانگەکە، ئایا نەتبیستووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ)، مەبەستی ئەوەیە لە نێوان بانگ و قامەتە. بێگومان عەرەب لەنێو خۆیاندا ناوێك بەکار دەهێنن لە دوو شت ئەگەر شتێك هەبێت بیانبەستێ بە یەکدییەوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ

﴿مِنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾، وە فەرموویەتی: ﴿وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾، بێگومان ئەو دووانە باوك و دایكن، خوا ناوی ناون بە (أَبَوَيْن) هەروەها فەرموودەكەی عائیشەیش لەم شێوازەیە: (كَانَ طَعَامُنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْأَسْوَدَيْنِ: التَّمْرَ وَالْمَاءَ)، جا تەنها خورما ڕەشە نەك ئاو، عائیشە ناوی هەردووكیانی برد بە (الْأَسْوَدَيْنِ) كاتێ بەیەكەوە باسی كردن، هەروەها لەم شێوازە وتراوە: (سُنَّةُ الْعُمَرَيْنِ)، مەبەستی پێی ئەبو بەكر و عومەرە، نەك وەكوو ئەو كەسەی بەهەڵەدا چووە گومانی وایە مەبەست پێی عومەری كوڕی خەتاب و عومەری كوڕی عەبدولعەزیزە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سائیب مەبەستی لە وتەكەیدا: (وَإِذَا قَامَتِ الصَّلَاةُ): بانگی دووەمە كە ناونراوە بە قامەت.

## بَابُ ذِكْرِ الْأَذَانِ الَّذِي كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ إِذَا نُودِيَ بِهِ، وَالْوَقْتِ الَّذِي كَانَ يُنَادَى بِهِ، وَذِكْرِ مَنْ أَحْدَثَ النِّدَاءَ الْأَوَّلَ قَبْلَ خُرُوجِ الْإِمَامِ

**١٧٧٤-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: كَانَ الْأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ أَذَانَيْنِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، حَتَّى كَانَ زَمَنُ عُثْمَانَ، فَكَثُرَ النَّاسُ، فَأَمَرَ بِالْأَذَانِ الْأَوَّلِ بِالزَّوْرَاءِ(١).

## باسی ئەو بانگدانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەدرا كە خوا فەرمانی كردووە بە پەلەكردن بۆ نوێژی هەینی كاتێ بانگ درا، ئەو كاتەشی كە بانگی تێدا دەدرێ، هەروەها باسی ئەو كەسەش كە بانگی یەكەمی داهێنا پێش دەرچوونی پێشنوێژ

واتە: سائیبی كوڕی زەید ﷺ دەڵێ: بانگدان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكر و عومەر دوو بانگ بوو (واتە: بانگ و قامەت) لە ڕۆژی هەینی، تا سەردەمی عوسمان، خەڵك زۆر بوون، فەرمانی كرد بانگدانی یەكەم لە (الزَّوْرَاءِ) (كە جێگایەك بوو لەنێو بازاڕی مەدینە) بدرێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ إِنْصَاتِ الْمَأْمُومِ عِنْدَ خُرُوجِ الْإِمَامِ قَبْلَ الِابْتِدَاءِ فِي الْخُطْبَةِ، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ كَلَامَ الْإِمَامِ يَقْطَعُ الْكَلَامَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَأَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ، وَكَذَلِكَ فِي خَبَرِ سَلْمَانَ أَيْضًا، وَأَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ، قَدْ خَرَّجْتُ خَبَرَ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ فِيمَا تَقَدَّمَ مِنَ الْكِتَابِ

**١٧٧٥-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَيَرْكَعُ إِنْ بَدَا لَهُ، وَلَمْ يُؤْذِ أَحَدًا، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ حَتَّى يُصَلِّيَ كَانَ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى»[(١)].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ: إِنَّ الْإِنْصَاتَ عِنْدَ الْعَرَبِ قَدْ يَكُونُ الْإِنْصَاتُ عَنْ مُكَالَمَةِ بَعْضِهِمْ بَعْضًا دُونَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَدُونَ ذِكْرِ اللَّهِ وَالدُّعَاءِ، كَخَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: كَانُوا يَتَكَلَّمُونَ فِي الصَّلَاةِ فَنَزَلَتْ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟﴾ الأعراف: ٢٠٤، فَإِنَّمَا زُجِرُوا فِي الْآيَةِ عَنْ مُكَالَمَةِ بَعْضِهِمْ بَعْضًا، وَأُمِرُوا بِالْإِنْصَاتِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ: الْإِنْصَاتِ عَنْ كَلَامِ النَّاسِ لَا عَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ، إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَتَّى يُصَلِّيَ، أَنْ يُنْصِتَ شَاهِدُ الْجُمُعَةِ فَلَا يُكَبِّرَ مُفْتَتِحًا لِصَلَاةِ الْجُمُعَةِ، وَلَا يُكَبِّرَ لِلرُّكُوعِ، وَلَا يُسَبِّحَ فِي الرُّكُوعِ، وَلَا يَقُولَ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَا يُكَبِّرَ عِنْدَ الْإِهْوَاءِ إِلَى السُّجُودِ، وَلَا يُسَبِّحَ فِي السُّجُودِ، وَلَا يَتَشَهَّدَ فِي الْقُعُودِ، وَهَذَا لَا يَتَوَهَّمُهُ مَنْ يَعْرِفُ أَحْكَامَ اللَّهِ وَدِينَهُ، فَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ مَعْنَى الْإِنْصَاتِ فِي هَذَا الْخَبَرِ: عَنْ مُكَالَمَةِ النَّاسِ، وَعَنْ كَلَامِ النَّاسِ، لَا عَمَّا أُمِرَ الْمُصَلِّي مِنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ وَالتَّسْبِيحِ وَالذِّكْرِ الَّذِي أُمِرَ بِهِ فِي الصَّلَاةِ، فَهَكَذَا مَعْنَى خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ- إِنْ ثَبَتَ -: وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا: أَيْ: أَنْصِتُوا عَنْ كَلَامِ النَّاسِ. وَقَدْ بَيَّنْتُ مَعْنَى الْإِنْصَاتِ وَعَلَى كَمْ مَعْنًى يَنْصَرِفُ هَذَا اللَّفْظُ فِي الْمَسْأَلَةِ الَّتِي أَمْلَيْتُهَا فِي الْقِرَاءَةِ خَلْفَ الْإِمَامِ.

**باسی فەزڵ و گەورەیی بێدەنگبوونی نوێژخوێن لە کاتی دەرچوونی ئیمام بۆ سەر مینبەر پێش دەستپێکردن بە وتار، دژی وتەی ئەو کەسەی کە دەڵێ: قسەی ئیمام قسە دەبڕێ. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی**

---

(١) صحيح.

**ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: (وَأَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ)، واتە: کاتێ ئیمامەکەی دەرچوو بێدەنگ دەبوو. بەهەمان شێوە لە فەرموودەکەی سولەیمان و ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، فەرموودەکەی ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرەم لە پێشەوە لەم کتێبەدا باس کرد**

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك ڕۆژی هەینی خۆی شۆرد و بۆنی خۆش لە خۆی دا ئەگەر هەیبوو، وە چاکترین جلوبەرگی لەبەر کرد، پاشان دەرچوو بۆ مزگەوت، ئەگەر بۆی ڕەخسا نوێژی کرد و کەسی ئازار نەدا، پاشان کاتێ ئیمامەکەی دەرچوو بێدەنگ بوو تا نوێژەکەی دەکات، ئەوە دەبێتە کەفارەتی نێوان ئەو هەینییە و هەینییەکەی دیکە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەمە لەو شێوازەیە کە دەڵێم: بەڕاستی (الْإِنْصَاتَ) لای عەرەب هەندێ جار بۆ قسەنەکردنی هەندێکە لەگەڵ هەندێکی دیکە جگە لە قورئانخوێندنی ئیمام و یادی خوا و پاڕانەوە، وەك لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە هاتووە: ئەوان لە نوێژدا قسەیان دەکرد، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ ﴾، لە ئایەتەکەدا تەنها سەرزەنشت کران لەوەی قسە لەگەڵ یەکدی بکەن، وە فەرمانیان پێ کرا بێدەنگ بن لە کاتی قورئانخوێندنی ئیمام، بێدەنگبوون لە قسەی خەڵکی نەك لە قورئانخوێندن و تەسبیح و تەکبیر و زیکر و پاڕانەوە، چونکە زانست ئەوەی سەلماندووە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی: (ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَتَّى يُصَلِّيَ)، مەبەستی ئەوە نەبووە ئەوەی بەشداری هەینی دەبێت بێدەنگ بێت (الله أكبر)ی دەستپێکی نوێژی هەینی نەکات، هەروەها (الله أكبر)ی ڕکووعیش، دوای ئەوەیش سەر بەرز دەکاتەوە لە ڕکووع نەڵێ: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ) و لە کاتی دابەزینی بۆ سوژدە (الله أكبر) نەکات و لە کاتی سوژدە تەسبیحات نەکات و لە کاتی دانیشتن تەحیات نەخوێنێ، هەر کەسێك شارەزایی لە ئەحکامی شەریعەت بێت خەیاڵی لەو جۆرە ناکات، زانست دەریخستووە کە مانای (الْإِنْصَاتَ) لە فەرموودەکە: بێدەنگبوونە لە قسەکردنی خەڵکی لەگەڵ یەکدی و لە بێدەنگکردنیان، نەك ئەوەی فەرمان کراوە بە نوێژخوێن لەنێو نوێژەکەی پێی هەستێت لە تەکبیر و قورئانخوێندن و تەسبیحکردن، مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەیەیە: -ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت-

(وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا) واتە: بێدەنگ بن لە قسەکردنی خەڵك. بێگومان مانای (الْإِنْصَات)م ڕوون کردەوە، وە بە چەند مانا هاتووە لە باسی: (الْقِرَاءَةِ خَلْفَ الْإِمَامِ).

## بَابُ ذِكْرِ أَنَّ مَوْضِعَ قِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْخُطْبَةِ، كَانَ قَبْلَ اتِّخَاذِهِ الْمِنْبَرَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخُطْبَةَ عَلَى الْأَرْضِ جَائِزَةٌ مِنْ غَيْرِ صُعُودِ الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِاتِّخَاذِ الْمِنْبَرِ إِذْ هُوَ أَحْرَى أَنْ يَسْمَعَ النَّاسُ خُطْبَةَ الْإِمَامِ إِذَا كَثُرُوا إِذَا خَطَبَ عَلَى الْمِنْبَرِ

**١٧٧٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُومُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ خَشَبٍ أَوْ جِذْعٍ أَوْ نَخْلَةٍ شَكَّ الْمُبَارَكُ فَلَمَّا كَثُرَ النَّاسُ قَالَ: ابْنُوا لِي مِنْبَرًا، فَبَنَوْا لَهُ الْمِنْبَرَ، فَتَحَوَّلَ إِلَيْهِ، حَنَّتِ الْخَشَبَةُ حَنِينَ الْوَالِهِ، فَمَا زَالَتْ حَتَّى نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمِنْبَرِ، فَأَتَاهَا، فَاحْتَضَنَهَا، فَسَكَنَتْ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْوَالِهُ: يُرِيدُ بِهَا الْمَرْأَةَ إِذَا مَاتَ لَهَا وَلَدٌ.

## باسی شوێنی وەستانی پێغەمبەر ﷺ لە وتاری هەینی، پێش دانانی مینبەر، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی وتاردان لە ڕۆژی هەینی لەسەر زەوی دروستە بەبێ چوونە سەر مینبەر، هەروەها هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە دانانی مینبەر چونکە ئەوە باشترە بۆ ئەوەی خەڵکەکە گوێبیستی وتاری ئیمام بن کاتێ زۆر بوون، کاتێ وتاری دا لەسەر مینبەر

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی دەوەستا و پشتی دەدایە کۆڵەکەیەك لە دار یان قەدە دارخورما یان دارخورما، موبارەك گومانی هەبوو (کام لەو سیانەیە) کاتێ خەڵکەکە زۆر بوون، فەرمووی: (مینبەرێکم بۆ دروست بکەن)، مینبەرێکیان بۆی دروست کرد، شوێنەکەی گواستەوە بۆ لای مینبەرەکە، دارەکە دڵتەنگ بوو دەنگی دەرکرد وەکوو چۆن دایك دڵتەنگ دەبێت بە مردنی منداڵەکەی، بەردەوام بەو شێوە بوو تا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکە دابەزی و چوو بۆ لای و باوەشی پێدا کرد، ئینجا بێدەنگ بوو.

---

(١) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: (الْوَالِهُ): مەبەستی پێی ئەو ئافرەتەیە کە کاتێ منداڵەکەی دەمرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا حَنَّ الْجِذْعُ عِنْدَ قِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَصِفَةِ مِنْبَرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَعَدَدِ دَرَجِهِ، وَالِاسْتِنَادِ إِلَى شَيْءٍ إِذَا خَطَبَ عَلَى الْأَرْضِ

١٧٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُومُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَيُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى جِذْعٍ مَنْصُوبٍ فِي الْمَسْجِدِ فَيَخْطُبُ، فَجَاءَ رُومِيٌّ فَقَالَ: أَلَا نَصْنَعُ لَكَ شَيْئًا تَقْعُدُ وَكَأَنَّكَ قَائِمٌ؟ فَصَنَعَ لَهُ مِنْبَرًا لَهُ دَرَجَتَانِ، وَيَقْعُدُ عَلَى الثَّالِثَةِ، فَلَمَّا قَعَدَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ خَارَ الْجِذْعُ خُوَارَ الثَّوْرِ حَتَّى ارْتَجَّ الْمَسْجِدُ بِخُوَارِهِ حُزْنًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَزَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمِنْبَرِ، فَالْتَزَمَهُ وَهُوَ يَخُورُ، فَلَمَّا الْتَزَمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَكَتَ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ لَمْ أَلْتَزِمْهُ مَا زَالَ هَكَذَا حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ حُزْنًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَدُفِنَ - يَعْنِي الْجِذْعَ. وَفِي خَبَرِ جَابِرٍ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ هَذَا بَكَى لِمَا فَقَدَ مِنَ الذِّكْرِ(١).

## باسی ئەو هۆکارەی کە قەدی دار خورماکە دەنگی خەمباری لێوە دەرچوو، لە کاتی وەستانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکە، وە چۆنیەتی مینبەری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ژمارەی پلەکانەکانی، وە پاڵدان بە شتێکەوە لە کاتی وتاردان لەسەر زەوی

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی دەوەستا و پشتی دەدایە قەدە دار خورمایێك کە لە مزگەوت چەقێندرابوو وتاری بۆ خەڵکی دەدا، پیاوێکی ڕۆمیش هاتە لای و وتی: ئایا شتێکت بۆ دروست نەکەم لەسەری دابنیشی و وەك ئەوەش وا بێ کە وەستاوی؟ دواتر مینبەرێکی بۆی دروست کرد دوو پلیکانەی هەبوو و لەسەر سێیەمیان دادەنیشت (واتە سێ پایەی هەبوو بەلام دوو پایەی یەکەمی جێ دەهێشت و لەسەر سێیەمیان دادەنیشت)، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم مینبەرە دانیشت (بۆ وتاردان) قەدە دار خورماکە دەنگی لێوە هات وەك دەنگی گاجووت، تاوەکوو دڵتەنگی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مزگەوتی داگرت، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە خوارەوە لەسەر مینبەرەکە و چوو بۆ لای قەدە دار خورماکە و لای مایەوە و دەستی لەسەر دانا لە کاتێکدا دار

---

(١) صحيح.

خورماکە وەك گاجووت دەنگی لێوە دەهات، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای و دەستی لەسەر دانا بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر نەچوومایە بۆ لای و دەستم لەسەر دانەنایە بەبەردەوامی ئەو دەنگەی لێوە دەهات تا ڕۆژی دوایی، لەبەر ئەوە پێیناخۆش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دوور کەوتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بخرێتە ژێر خاك. واتە: قەدە دارخورماکە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان بۆیە گریا چونکە ئیدی زیکر و یادی خوای لە تەنیشتەوە ناکرێت (مەبەستی وتاری پێغەمبەری خوایە ﷺ).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاعْتِمَادِ فِي الْخُطْبَةِ عَلَى الْقَوْسِ، أَوِ الْعَصَا، اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ

**١٧٧٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَالِدٍ وَهُوَ الْعَدْوَانِيُّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ أَبْصَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى قَوْسٍ أَوْ عَصًا حِينَ أَتَاهُمْ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ، فَوَعَيْتُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَأَنَا مُشْرِكٌ، ثُمَّ قَرَأْتُهَا فِي الْإِسْلَامِ، فَدَعَتْنِي ثَقِيفُ، فَقَالُوا: مَا سَمِعْتَ مِنَ هَذَا الرَّجُلِ، فَقَرَأْتُهَا عَلَيْهِمْ، فَقَالَ مَنْ مَعَهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ: نَحْنُ أَعْلَمُ بِصَاحِبِنَا، لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّهُ كَمَا يَقُولُ حَقٌّ لَتَابَعْنَاهُ[(١)].

## باسی چاکتر وایە وتاربێژ لە کاتی وتاری هەینی لەسەر مینبەر خۆی بدات بەسەر کەوانێك یان گۆچانێك، وەکو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی خالید کە عەدوانییە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی کاتێ هات بۆ لایان وەستابوو خۆیدا بوو بەسەر کەوانێك یان گۆچانێکدا، وتی: گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ)، لە سەردەمی نەفامی بەدڵ وەرم گرت کاتێ کە هاوبەشدانەر بووم، پاشان کە موسوڵمان بووم خوێندمەوە، هۆزی سەقیف بانگیان کردم، وتیان: چیت بیستووە لەم پیاوەوە، منیش بۆیانم خوێندەوە، ئەوانەی لەگەڵی بوون لە قوڕەیش وتیان: ئێمە هاوەڵەکەمان چاکتر دەناسین، ئەگەر بمانزانیایە ئەوەی ئەو دەیڵێ حەقە شوێنی دەکەوتین (مەبەستیان پێغەمبەر ﷺ بوو).

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الْعُودِ الَّذِي مِنْهُ اتُّخِذَ مِنْبَرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

١٧٧٩- عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: اخْتَلَفُوا فِي مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ هُوَ؟ فَأَرْسَلُوا إِلَى سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، فَقَالَ: مَا بَقِيَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَعْلَمَ بِهِ مِنِّي، هُوَ مِنْ أَثْلِ الْغَابَةِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْأَثْلُ هُوَ الطَّرْفَاءُ.

## باسی ئەو دارەی کە مینبەری پێغەمبەری خوای ﷺ لێ دروست کرا

واتە: ئەبو حازم دەڵێ: لەسەر داری مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جیاوازییان بوو ئایا لە چی دارێکە؟ ناردیان بۆ لای سەهلی کوڕی سەعد ﷺ، وتی: کەسێك نەماوە لە من زاناتر بیت بەو دارە، ئەوە لە داری (أَثْلِ) دارستان بوو. (کە نۆ میل لە مەدینەوە دوور بوو).

ئەبو بەکر دەڵێ: (الْأَثْلُ) بریتییە لە داری (الطَّرْفَاءُ) (کە دارێکە ڕاستەوڕاست دەچێت بە ئاسماندا گەڵای زۆر کەمە).

## بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ النَّاسَ بِالْجُلُوسِ عِنْدَ الِاسْتِوَاءِ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِنْ كَانَ الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَمَنْ دُونَهُ حَفِظَ ابْنَ عَبَّاسٍ فِي هَذَا الْإِسْنَادِ؛ فَإِنَّ أَصْحَابَ ابْنِ جُرَيْجٍ أَرْسَلُوا هَذَا الْخَبَرَ عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

١٧٨٠- عَنِ الْوَلِيدِ، أنبأَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺقَالَ: لَمَّا اسْتَوَى النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ قَالَ لِلنَّاسِ: اجْلِسُوا، فَسَمِعَهُ ابْنُ مَسْعُودٍ وَهُوَ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ فَجَلَسَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «تَعَالَ يَا ابْنَ مَسْعُودٍ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی پێشنوێژ لە ڕۆژی هەینی کاتێ دەچێتە سەر مینبەر فەرمان بە خەڵك بکات کە دابنیشن، ئەگەر وەلیدی کوڕی موسلیم و ئەوەشی لە خوار ئەوە لەبەری کردبێت لە ئیبنو عەباسەوە، چونکە بەڕاستی هاوەڵانی ئیبنو جوڕەیج ئەم فەرموودەیان بە (مُرسَل) هێناوە لە عەتائە وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ**

واتە: وەلید دەگێڕێتەوە، ئیبنو جوڕەیج بۆی باس کردین لە عەتائی کوڕی ئەبو ڕباح لە ئیبنو عەباسەوە ﵄ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەرەکەی بە خەڵکەکەی فەرمووی: دانیشن، ئیبنو مەسعود لەبەر دەرگای مزگەوتەکە بوو یەکسەر دانیشت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: تۆ بێرە ژوورەوە ئەی ئیبنو مەسعود.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْجِلْسَةِ بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ جَهِلَ السُّنَّةَ، فَزَعَمَ أَنَّ السُّنَّةَ بِدْعَةٌ، وَقَالَ: الْجُلُوسُ بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ بِدْعَةٌ

**١٧٨١**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ خُطْبَتَيْنِ، يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا[١].

**باسی ژمارەی وتاری ڕۆژی هەینی و دانیشتن لە نێوان هەردوو وتارەکە، دژی وتەی ئەو کەسەی لە سوننەت نازانێت، وا گومان دەبات ئەوەی سوننەتە بیدعەیە، دەڵێ: دانیشتن لە نێوان دوو وتارەکە بیدعەیە**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی دوو وتاری دەدا، لە نێوانیاندا دادەنیشت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَقْصِيرِ الْخُطْبَةِ وَتَرْكِ تَطْوِيلِهَا

**١٧٨٢**- عَنْ وَاصِلِ بْنِ حَيَّانَ قَالَ: قَالَ أَبُو وَائِلٍ: خَطَبَنَا عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ ، فَأَبْلَغَ وَأَوْجَزَ، فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا لَهُ: يَا أَبَا الْيَقْظَانِ، لَقَدْ أَبْلَغْتَ وَأَوْجَزْتَ، فَلَوْ كُنْتُ نَفَّسْتَ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَأَقْصِرُوا الْخُطْبَةَ، فَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی چاکتر وایە وتاری هەینی کورت بکرێت و درێژ نەکرێتەوە

واتە: واصیلی کوڕی حەیان دەڵێ: ئەبو وائیل وتی: عەماری کوڕی یاسر ﵄ وتاری بۆ داین، وتارێکی پوخت و پڕ بەمانای بۆ داین، کاتێ دابەزی وتمان: ئەی باوکی یەقزان، بەڕاستی وتارەکەت پوخت و پڕمانا بوو، خۆزگە هەندێکی دیکە درێژت دەکردەوە؟ وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی درێژکردنەوەی نوێژی کەسێك و کورتی وتاری نیشانەیە بۆ تێگەیشتنی ئەو کەسە، نوێژەکەتان درێژ بکەنەوە (لەچاو وتارەکەدا) وتارەکەش کورت بکەنەوە، بەڕاستی جۆرێ لە قسەکردن کە ڕەوانبێژییەکی ئەوتۆی تێدایە جادووە. (واتە ئەگەر وتار کورت و پوخت و پڕمانا بوو دەبێتە ڕەوانبێژی و هەرگیز بیر ناچێتەوە).

**١٧٨٣-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁: كَانَتْ خُطْبَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَصْداً.(١)

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی جابری کوڕی سەمورە ﵁ هاتووە: وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ مامناوەند بوو درێژ نەبوو.

**١٧٨٤-** وَفِي خَبَرِ الْحَكَمِ بْنِ حَزَنٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ كَلِمَاتٍ طَيِّبَاتٍ خَفِيفَاتٍ مُبَارَكَاتٍ(٢).

واتە: وە لە فەرموودەکەی حەکەمی کوڕی حەزن ﵁ هاتووە پێغەمبەر ﷺ وتاری دا: سوپاس و ستایيشی خوای کرد، بە کۆمەڵە وشەیەکی پاك و سووك و ئاسان و پیرۆز.

## بَابُ صِفَةِ خُطْبَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَبَدْئِهِ فِيهَا اللَّهِ، وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ

**١٧٨٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ، «يَحْمَدُ اللَّهَ، وَيُثْنِي عَلَيْهِ بِمَا هُوَ لَهُ أَهْلٌ، ثُمَّ يَقُولُ: مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، إِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ، ثُمَّ يَقُولُ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ، وَكَانَ إِذَا ذَكَرَ السَّاعَةَ احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ، وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ كَأَنَّهُ نَذِيرُ جَيْشٍ: صَبَّحَتْكُمُ السَّاعَةُ وَمَسَّتْكُمْ، ثُمَّ يَقُولُ: مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ أَوْ عَلَيَّ، وَأَنَا» وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ[١].

## باسی چۆنیەتی وتاری پێغەمبەر ﷺ و دەسپێکردنی وتارەکەی بە سوپاس و ستاییشکردنی خوا

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا سوپاس و ستاییشی خوای دەکرد بەو جۆرەی کە شایستەی خوایە، پاشان دەیفەرموو: هەر کەسێك خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێت گومڕای بکات، هەر کەسێکیش گومڕا بکات کەس نییە هیدایەتی بدات، بەڕاستی ڕاستترین باس کتێبی خوایە، وە چاکترین ڕێنمایی ڕێنمایی موحەممەدە ﷺ، خراپترین کارەکان ئەو شتانەیە کە لە شەریعەتدا نییە، هەر شتێکیش لە شەریعەتدا نەبێ داهێنراوە، هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە، هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە، پاشان دەیفەرموو: من نێردراوم لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دواییدا وەکوو ئەم دووانە (ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان و پەنجەکەی شانی کرد) جا کاتێ باسی ڕۆژی دوایی بکردایە بەرزایی ڕوومەتی سوور دەبۆیەوە، دەنگیشی بەرز دەبۆیەوە و بەسەختی تووڕە دەبوو، وەکوو ئەوە بوو ترسێنەری هێزێك بڵێ: دوژمن هاتە سەرتان سەرلەبەیانی و زەفەری پێبردن، هەر کەسێك ماڵێکی بەجێهێشتووە ئەوە بۆ خێزانەکەیەتی، هەر کەسێکیش قەرزار بووە لە ژیانیدا نەیداوەتەوە یان خێزان و منداڵی بەجێهێشتووە، ئەوە بەڕێوەبردنی خێزان و منداڵی لەسەر منە و دانەوەی قەرزەکانیشی لە ئەستۆمە، من پشتیوانی بڕوادارانم.

## بَابُ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

١٧٨٦- عَنِ ابْنَةِ الْحَارِثَةِ بْنِ النُّعْمَانِ ﵄ قَالَتْ: مَا حَفِظْتُ ق إِلَّا مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَقْرَأُ بِهَا فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، وَكَانَ تَنُّورُنَا وَتَنُّورُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَاحِدًا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قورئانخوێندن لە وتاری ڕۆژی هەینی

واتە: کچەکەی حاریسی کوڕی نوعمان ﷺ دەڵێ: سورەتی (ق)م لەبەر نەکرد، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەبێت، لە هەموو هەینییەك دەیخوێند، جا تەنووری ئێمە لەگەڵ تەنووری ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ یەك بوو ( ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی زۆر بەوردی موتابەعەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووە، هەموو شتەکانی بەچاکی لێیەوە وەرگرتووە، وەکوو چۆن دوو ماڵ ئەوەندە تێکەڵاو بن یەك تەنوور بەکار بهێنن بۆ نانکردن، وە ئاگایان لە ورد و درشتی نهێنی و ئاشکراکانی یەکدی بێت).

١٧٨٧- عَنْ أُمِّ هِشَامِ بِنْتِ حَارِثَةَ بْنِ النُّعْمَانِ ﷺ قَالَتْ: قَرَأْتُ ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يَقْرَؤُهَا كُلَّ جُمُعَةٍ عَلَى الْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ النَّاسَ[١].

واتە: ئوممو هیشامی کچی حاریسی کوڕی نوعمان ﷺ دەڵێ: سورەتی (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ)م لەبەر کرد لە زاری پێغەمبەری خواوە ﷺ، هەموو هەینییەك کاتێ وتاری بۆ خەڵك دەدا لەسەر مینبەر دەیخوێند.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ إِذَا قَحَطَ النَّاسُ، وَخِيفَ مِنَ الْقَحْطِ هَلَاكُ الْأَمْوَالِ، وَانْقِطَاعُ السُّبُلِ إِنْ لَمْ يُغِثِ اللَّهُ بِمَنِّهِ وَطَوْلِهِ

١٧٨٨- عَنْ شَرِيكِ بنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ بَابٍ كَانَ نَحْوَ بَابِ الْقَضَاءِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكَتِ الْأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يُغِيثَنَا قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا»، قَالَ أَنَسٌ: وَلَا وَاللَّهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ وَلَا قَزَعَةٍ، وَلَا مَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلَا دَارٍ، فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتْ، يَعْنِي السَّمَاءَ، انْتَشَرَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَا وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سَبْعًا، قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذَلِكَ الْبَابِ فِي الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِمًا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ الْأَمْوَالُ وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ

---

(١) صحيح.

أَنْ يُمْسِكَهَا عَنَّا قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلَا عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الْآكَامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الْأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، قَالَ: فَأَقْلَعَتْ وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ. قَالَ شَرِيكٌ: فَسَأَلْتُ أَنَسًا: أَهُوَ الرَّجُلُ الْأَوَّلُ؟ فَقَالَ: لَا أَدْرِي[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: السَّلْعُ: جَبَلٌ.

## باسی مۆڵەتدان بە داواکردنی باران لە وتاری هەینی، کاتێ بێبارانی و قاتوقڕی بوو، وە بەهۆی بێبارانی و قاتوقڕییەوە مەترسی هەبوو لەسەر لەناوچوونی مەڕومالآت و پچڕانی ڕێگاوبانەکان، ئەگەر خوا بەمنەت و چاکەی خۆی بارانی ڕەحمەت نەبارێنێ

واتە: شەریکی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو نەمر دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ، پیاوێك هاتە نێو مزگەوتەوە لە ڕۆژی هەینی لە دەرگایەکەوە ڕووی لە دەرگای (الْقَضَاءِ) (لە صەحیحی بوخاری موسلیم هاتووە: (دار الْقَضَاءِ) واتە: ماڵی عومەری کوڕی خەتاب، بۆیە ناو نراوە بە (دار الْقَضَاءِ) چونکە بۆ پڕکردنەوەی قەرزارییەکانی عومەر فرۆشرا)، پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر مینبەرەکە وەستا بوو وتاری دەدا، بەپێوە ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئاژەڵەکان لەناو چوون و ڕێگاکان بڕان، داوا لە خوا ﷻ بکە بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنێ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، پاشان فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە. ئەنەس وتی: سوێند بە خوا نە هەورمان دی لە ئاسمان و نە پەڵەیەکیش، وە لە نێوان ئێمە و کێوی سەلعدا کە دەکەوێتە خۆرئاوای مەدینەوە هیچ ماڵ و خانوویەك نەبوو (واتە: ئاسمان جوان دیار بوو) لەپشت ئەو کێوەوە هەورێك دەرچوو وەکوو قەڵغان، کاتێك گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمان بڵاو بۆیەوە و بارانی باراند، ئەنەس وتی: سوێند بە خوا بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ خۆرمان نەدی، پاشان پیاوێك هەفتەی داهاتوو هاتە ژوورەوە هەر لە هەمان دەرگاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە وتاری دەخوێندەوە، ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا بەپێوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵ و دەغڵودانمان تیا چوو، وە ڕێگاکان پچڕان لە

---

(١) صحيح.

خوا بپاڕێرەوە بیگرێتەوە لێمان، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز كردەوە و فەرمووی: خوایە بیبارێنە بە دەوروبەرماندا نەك بە سەرماندا، خوایە بیبارێنە بەسەر تەپۆلكەكان و نیمچە شاخەكان و دۆڵ و شیوەكان و شوێنی سەوزبوونی دار و گژوگیاكان، وتی: هەور بە ئاسمانەوە نەما دواتر دەرچوو لەبەر خۆر دەڕۆیشتین. شەریك وتی: پرسیم لە ئەنەس ئایا ئەوە هەمان ئەو پیاوەی یەكەم جار بوو (كە داوای بارانبارینی كرد)؟ وتی: نازانم.

ئەبو بەكر دەڵێ: (السَّلْعُ): كێوە.

## بَابُ الدُّعَاءِ بِحَبْسِ الْمَطَرِ عَنِ الْبُيُوتِ وَالْمَنَازِلِ إِذَا خِيفَ الضَّرَرُ مِنْ كَثْرَةِ الْأَمْطَارِ وَهَدْمِ الْمَنَازِلِ، وَمَسْأَلَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ تَحْوِيلِ الْأَمْطَارِ إِلَى الْجِبَالِ وَالْأَوْدِيَةِ حَيْثُ لَا يُخَافُ الضَّرَرُ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ

**١٧٨٩-** عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ ﵁: هَلْ كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ؟ قَالَ: قِيلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَحَطَ الْمَطَرُ، وَأَجْدَبَتِ الْأَرْضُ، وَهَلَكَ الْمَالُ، قَالَ: فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، فَاسْتَسْقَى وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ سَحَابَةً، قَالَ: فَمَا قَضَيْنَا الصَّلَاةَ حَتَّى إِنَّ الشَّابَّ الْقَرِيبَ الْمَنْزِلِ لَيُهِمُّهُ الرُّجُوعُ إِلَى أَهْلِهِ مِنْ شِدَّةِ الْمَطَرِ، فَدَامَتْ جُمُعَةً، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَاحْتُبِسَتِ الرُّكْبَانُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ بِيَدِهِ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلَا عَلَيْنَا، فَكُشِطَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ»(١).

## باسی پاڕانەوە لە وتاری هەینی بە گرتنەوەی باران لەنێو ماڵ و گەڕەكەكان، ئەگەر مەترسی ئەوە كرا زۆری باران زیان بگەیەنێ بە خانووەكان، هەروەها داواكردن لە خوا باران بگوازێتەوە بۆ نێو كێو و شیوەكان بەجۆرێ زیانی نەبێت

واتە: حومەید دەڵێ: پرسیار كرا لە ئەنەس ﵁: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە لە (دووعاكردن)؟ وتی: لە ڕۆژی هەینی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باران گیرایەوە و زەوی وشك بوو و مەڕوماڵات تیا چوون، وتی: دەستەكانی بەرز كردەوە تا سپیایی بنباڵیم بینی، داوای بارانی لە خوا ﷻ كرد، لە ئاسمان هیچ هەورێكمان

---

(١) صحيح.

بەدی نەدەکرد، وتی: کاتێ نوێژی هەینیپان تەواو کرد کوڕێکی گەنج کە ماڵی نزیك بوو دەیویست بچێتەوە بۆ نێو منداڵەکانی بەهۆی سەختی بارانەکەوە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە، یەك هەفتە بەردەوام بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ماڵەکان ڕوخان و سوارەکان گیریان خوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ بزەیەکی پێکەنینی بۆ کرد (بە هۆی ئەوەی نەوەکانی ئادەم چەندە زوو بێزار دەبن)، دەستەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی: خوایە لە دەوروبەرمان بیبارێنە نەك بەسەرماندا، بارانەکە لەسەر مەدینە نەما.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَبَسُّمِ الْإِمَامِ فِي الْخُطْبَةِ

**١٧٩٠-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ ﷺ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

## باسی مۆڵەت دراوە وتاربێژ لە کاتی وتاردان بزەی پێکەنین بکات

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی حومەید لە ئەنەسەوە ﷺ هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ بزەی پێکەنینی کرد.

## بَابُ صِفَةِ رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ

**١٧٩١-** عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ أَوْ عِنْدَ شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ؛ فَإِنَّهُ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ[٢].

## باسی چۆنیەتی دەستبەرزکردنەوە لە داوای بارانبارین لە وتاری هەینی

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە لە هیچ شتێك لە پاڕانەوەکانیدا یان لە کاتی هیچ شتێك لە پاڕانەوەکانیدا تەنها لە نوێژەبارانە نەبێت، بێگومان ئەو ئەوەندە دەستی بەرز دەکردەوە هەتا سپیایی بنباڵی دەبینرا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٧٩٢-** قَالَ أَبُو بَكْر: فِي خَبَر شَرِيْك بْنِ عَبْدِ اللهِ عَن أَنَسٍ ﷺ قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ فِي خَبَرِ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ، يُرِيدُ إِلَّا عِنْدَ مَسْأَلَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَسْقِيَهُمْ، وَعِنْدَ مَسْأَلَتِهِ بِحَبْسِ الْمَطَرِ عَنْهُمْ، وَقَدْ أَوْقَعَ اسْمَ الِاسْتِسْقَاءِ عَلَى الْمَعْنَيَيْنِ جَمِيعًا، أَحَدُهُمَا: مَسْأَلَتُهُ أَنْ يَسْقِيَهُمْ. وَالْمَعْنَى الثَّانِي: أَنْ يَحْبِسَ الْمَطَرُ عَنْهُمْ، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَدْ أَخْبَرَ فِي خَبَرِ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْهُ، أَنَّهُ رَفَعَ يَدَيْهِ فِي الْخُطْبَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حِينَ سَأَلَ اللَّهَ أَنْ يُغِيثَهُمْ، وَكَذَلِكَ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، فَهَذِهِ اللَّفْظَةُ أَيْضًا اسْتِسْقَاءٌ إِلَّا أَنَّهُ سَأَلَ اللَّهَ أَنْ يَحْبِسَ الْمَطَرُ عَنِ الْمَنَازِلِ وَالْبُيُوتِ، وَتَكُونَ السُّقْيَا عَلَى الْجِبَالِ وَالْآكَامِ وَالْأَوْدِيَةِ»[1].

واتە: ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی شەریكی كوڕی عەبدوڵا لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز كردووە، (فەرموودەی ژمارە ١٧٨٨) پێشتر باسم كرد لە فەرموودەكەی قەتادە لە ئەنەسەوە: دەستی بەرز نەدەكردەوە لە هیچ كام لە پاڕانەوەكانی جگە (الِاسْتِسْقَاءِ) مەبەستی ئەوەیە: جگە لە كاتی داواكردن لە خوا بارانیان بۆ ببارێنێ، وە لە كاتی داواكردن لەخوا بارانیان لێ بگرێتەوە، بێگومان ناوی (الِاسْتِسْقَاءِ) بە دوو مانا هاتووە، یەكەم: داواكردن لە خوا بارانیان بۆ ببارێنێ، مانای دووەم: ئەوەیە بارانیان لێ بگرێتەوە، بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەوەی لەیەكم دایەوە ئەنەسی كوڕی مالیك هەواڵی داوە لە فەرموودەكەی شەریك (پێغەمبەر ﷺ) لە وتاری ڕۆژی هەینی دەستەكانی بەرز كردەوە كاتێ داوای كرد خوا بارانیان بۆ ببارێنێ، بەهەمان شێوە هەردوو دەستی بەرز كردەوە كاتێ فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا)، واتە: خوایە لە دەوروبەرمان بیبارێنە نەك بەسەرماندا. هەروەها ئەم دەستەواژەیەش (الِاسْتِسْقَاءِ)ە ئەوە نەبێت ئەو داوای كرد لەخوا باران بگرێتەوە لەنێو شوێنی نیشتەجێبوون و ماڵەكان، وە باران لەسەر كێو و گرد و شیوەكان ببارێنێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْإِشَارَةِ بِالسَّبَّابَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ، وَكَرَاهَةِ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي غَيْرِ الِاسْتِسْقَاءِ

**١٧٩٣-** عَنْ حُصَيْنٍ قالَ: سَمِعْتُ عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: خَطَبَ بِشْرُ بْنُ مَرْوَانَ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ يَدْعُو، فَقَالَ عُمَارَةُ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَمَا يَقُولُ إِلَّا هَكَذَا - يُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ[١].

**باسی ئاماژەکردن بە پەنجەی هەڕەشە لەسەر مینبەر لە وتاری هەینی، وە باش نییە هەردوو دەست بەرز بکرێتەوە لەسەر مینبەر بۆ جگە لە داوای بارانبارین**

واتە: حوصەین دەڵێ: گوێم لە عومارەی کوڕی ڕوەیبەی سەقەفی ﷺ بوو وتی: بیشری کوڕی مەڕوان وتاری دا، هەردوو دەستی بەرز کردبۆیەوە دەپاڕایەوە، عومارە وتی: خوا ئەو دوو دەستە ناشرین بکات، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر مینبەر هیچی نەدەکرد بەو شێوە نەبێت -بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی دەکرد-.

**١٧٩٤-** عَنْ سُفْيَانَ جَمِيعًا عَنْ حُصَيْنٍ ﷺ[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ تَحْرِيكِ السَّبَّابَةِ عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِهَا فِي الْخُطْبَةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ خَبَرَ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ فِي كِتَابِ الْعِيدَيْنِ»

**باسی جوڵاندنی پەنجەی هەڕەشە لە کاتی ئاماژەکردن پێی لە وتاردا، ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان باسی فەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعدم کرد لە کتێبی هەردوو جەژندا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ النُّزُولِ عَنِ الْمِنْبَرِ لِلسُّجُودِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ فِي الْخُطْبَةِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

**١٧٩٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَرَأَ (ص) فَلَمَّا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدْنَا، وَقَرَأَ بِهَا مَرَّةً أُخْرَى فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةِ تَيَسَّرْنَا لِلسُّجُودِ، فَلَمَّا رَآنَا قَالَ: إِنَّمَا هِيَ تَوْبَةُ نَبِيٍّ، وَلَكِنْ أَرَاكُمْ قَدِ اسْتَعْدَدْتُمْ لِلسُّجُودِ، فَنَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدْنَا[١].

## باسی دابەزین لەسەر مینبەر بۆ سوژدەبردن لە کاتی خوێندنی ئایەتی (السَّجْدَةِ) لە وتاری هەینیدا، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك وتاری بۆ داین سوڕەتی (ص) ی خوێند، کاتێ بەسەر ئایەتی سەجدە تێپەڕ بوو دابەزی و سوژدەی برد، ئێمەیش لەگەڵی سوژدەمان برد، وە جارێکی دیکە خوێندیەوە، کاتێ گەیشتە ئایەتی سەجدە ئێمە خۆمان ئامادە کرد بۆ سوژدەبردن، کاتێ ئێمەی بینی فەرمووی: بێگومان ئەوە تەوبەی پێغەمبەرێك بوو، بەڵام من وا دەبینم خۆتان ئامادە کردووە بۆ سوژدەبردن، دابەزی و سوژدەی برد، ئێمەیش سوژدەمان برد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْعِلْمِ إِذَا سُئِلَ الْإِمَامُ وَقْتَ خُطْبَتِهِ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، ضِدَّ مَذْهَبِ مَنْ تَوَهَّمَ أَنَّ الْخُطْبَةَ صَلَاةٌ، وَلَا يَجُوزُ الْكَلَامُ فِيهَا بِمَا لَا يَجُوزُ فِي الصَّلَاةِ

**١٧٩٦-** عَنْ إسماعيل بن جعفر حَدَّثنا شريك (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ وَرَسُول الله ﷺ)[٢] عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَتَى السَّاعَةُ؟ فَأَشَارَ إِلَيْهِ النَّاسُ أَنِ اسْكُتْ، فَسَأَلَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ يُشِيرُونَ إِلَيْهِ أَنِ اسْكُتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ الثَّالِثَةِ: «وَيْحَكَ مَاذَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟» قَالَ: حُبَّ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ»، قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاعَةً، ثُمَّ مَرَّ غُلَامٌ شَنَئِيٌّ، قَالَ أَنَسٌ: أَقُولُ: أَنَا هُوَ، مِنْ أَقْرَانِي قَدِ احْتَلَمَ، أَوْ نَاهَزَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟» قَالَ: هَا هُوَ ذَا، قَالَ: «إِنْ أَكْمَلَ هَذَا الْغُلَامُ عُمُرَهُ فَلَنْ يَمُوتَ حَتَّى يَرَى أَشْرَاطَهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) ئەوەی لە نێوان ئەو دوو کەوانەدایە پەڕیوە لە ئەصڵەکە، تەماشای تەحقیقی د. ماهر بکە، بەرگ: ٣، لاپەڕە: ٢٧١، ساڵی چاپ ٢٠٠٩م.

(٣) صحيح.

**باسی ڕوخستدان بە زانست کاتێ ئیمام لەسەر مینبەر لە ڕۆژی هەینی پرسیاری لێ کرا، دژی مەزهەبی ئەو کەسەی وا خەیاڵ دەکات وتار نوێژە، دروست نییە قسەی تێدا بکرێ بەوەی دروست نییە لە نوێژدا قسە بکرێت**

واتە: ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر دەگێڕێتەوە، شەریك بۆی باس کردین (لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە نێو مزگەوتەوە پێغەمبەری خواش ﷺ) لەسەر مینبەر بوو لە ڕۆژی هەینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ خەڵکەکە ئاماژەیان بۆ کرد بێدەنگ بە، سێ جار پرسیاری لێ کرد، هەر جارێك ئاماژەیان بۆی دەکرد بێدەنگ بە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جاری سێیەم فەرمووی: هاوار بۆ تۆ چیت بۆی ئامادە کردووە؟ وتی: خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، فەرمووی: بەڕاستی تۆ لەگەڵ ئەوەی کە خۆشت دەوێ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان منداڵێکی (شَنَئِيّ) (خەڵکی ناوچەیەکە لە یەمەن) تێپەڕ بوو، ئەنەس وتی: لە تەمەنی مندا بوو باڵغ بووبوو، یان سەرەتای باڵغبوونی بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کابرایە لە کوێیە کە پرسیاری دەربارەی ڕۆژی قیامەت کرد؟ وتی: ئا ئەوەیە، فەرمووی: ئەگەر ئەو منداڵە تەمەنی تەواو بکات، نامرێ تا نیشانەکانی نەبینێ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَعْلِيمِ الْإِمَامِ النَّاسَ مَا يَجْهَلُونَ فِي الْخُطْبَةِ مِنْ غَيْرِ سُؤَالٍ يُسْأَلُ الْإِمَامَ

**١٧٩٧-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: «يَدْخُلُ عَلَيْكُمْ مِنْ هَذَا الْبَابِ أَوْ مِنْ هَذَا الْفَجِّ مِنْ خَيْرِ ذِي يَمَنٍ، أَلَا وَإِنَّ عَلَى وَجْهِهِ مَسْحَةَ مَلَكٍ، قَالَ: فَحَمِدْتُ اللَّهَ عَلَى مَا أَبْلَانِي»[١].

**باسی مۆڵەت دراوە ئیمام لە وتاری هەینیدا زانیاری بە خەڵك بدات لەوەی کە نایزانن بەبێ ئەوەی پرسیار بکرێ لە ئیمام**

---

(١) صحيح.

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کاتێ هاتمە مەدینە پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، (پێش ئەوەی من بگەمە خزمەتی لەپڕ) فەرمووی: کەمێکی دیکە لەو دەرگایەوە کەسێك دێتە ژوورەوە بۆ لاتان، یان لەو شوێنەوە دێت لە چاکترینی خەڵکی یەمەنە، لە ڕوخساریدا شوێنەواری پاکی و جوانی بەدی دەکرێ. وتی: منیش سوپاس و ستاییشی خوام کرد لەسەر ئەوەی تاقی کردمەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي سَلَامِ الْإِمَامِ فِي الْخُطْبَةِ عَلَى الْقَادِمِ مِنَ السَّفَرِ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ

**١٧٩٨-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا دَنَوْتُ مِنْ مَدِينَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَخْتُ رَاحِلَتِي، وَحَلَلْتُ عَيْبَتِي، فَلَبِسْتُ حُلَّتِي، فَدَخَلْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَسَلَّمَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَرَمَانِي النَّاسُ بِالْحَدَقِ، فَقُلْتُ لِجَلِيسٍ لِي: يَا عَبْدَ اللَّهِ، هَلْ ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَمْرِي شَيْئًا؟ قَالَ: نَعَمْ، ذَكَرَكَ بِأَحْسَنِ الذِّكْرِ، بَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُ إِذْ عَرَضَ لَهُ فِي خُطْبَتِهِ، قَالَ: إِنَّهُ سَيَدْخُلُ عَلَيْكُمْ مِنْ هَذَا الْبَابِ أَوْ مِنْ هَذَا الْفَجِّ مِنْ خَيْرِ ذِي يَمَنٍ، وَإِنَّ عَلَى وَجْهِهِ لَمَسْحَةَ مَلَكٍ. قَالَ: فَحَمِدْتُ اللَّهَ عَلَى مَا أَبْلَانِي[١].

## باسی مۆڵەت دراوە ئیمام لە کاتی وتاردان سڵاو لەوکەسە بکات لە سەفەرەوە دێت، کاتێ هاتە ژوورەوە بۆ لای

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کاتێك نزیك بوومەوە لە مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەم یەخ دا و توورەکەکەم کردەوە و کراسەکەم لەبەر کرد، چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوی لێ کردم، خەڵکەکەیش بە تیلەی چاویان سەرنجیان دەدام، بەوکەسەم وت کە لە تەنیشتم دانیشتبوو: ئەی بەندەی خوا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی سەبارەت بە من باس کرد؟ وتی: بەڵێ، بەچاکترین شێوە باسی کردی، لە کاتێکدا ئەو وتاری دەدا، لەپڕ لە وتارەکەیدا فەرمووی: کەمێکی دیکە لەو دەرگایەوە کەسێك دێتە ژوورەوە بۆ لاتان، یان لەو شوێنەوە دێت لە چاکترینی خەڵکی یەمەنە، ڕوخسارێکی پاك و جوانی هەیە، وتی: منیش سوپاس و ستاییشی خوام کرد لەسەر ئەوەی تاقی کردمەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ النَّاسَ فِي خُطْبَةِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ بِالصَّدَقَةِ، إِذَا رَأَى حَاجَةً، وَفَقْرًا

**١٧٩٩-** عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، دَخَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَمَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ يَخْطُبُ، فَقَامَ يُصَلِّي، فَجَاءَ الْأَحْرَاسُ لِيُجْلِسُوهُ، فَأَبَى حَتَّى صَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ مَرْوَانُ أَتَيْنَاهُ، فَقُلْنَا لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، إِنْ كَادُوا لَيَفْعَلُونَ بِكَ قَالَ: مَا كُنْتُ لِأَتْرُكَهُمَا بَعْدَ شَيْءٍ رَأَيْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. ثُمَّ ذَكَرَ أَنَّ رَجُلًا جَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي هَيْئَةٍ بَذَّةٍ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَصَدَّقُوا، فَمَا لَقَوْا ثِيَابًا، فَأَمَرَ لَهُ بِثَوْبَيْنِ، وَأَمَرَهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، ثُمَّ جَاءَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَصَدَّقُوا، فَأَلْقَى رَجُلٌ أَحَدَ ثَوْبَيْهِ، فَصَاحَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَوْ زَجَرَهُ، وَقَالَ: خُذْ ثَوْبَكَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذَا دَخَلَ فِي هَيْئَةٍ بَذَّةٍ، فَأَمَرْتُ النَّاسَ أَنْ يَتَصَدَّقُوا، فَمَا لَقَوْا ثِيَابًا، فَأَمَرْتُ لَهُ بِثَوْبَيْنِ، ثُمَّ دَخَلَ الْيَوْمَ فَأَمَرْتُ أَنْ يَتَصَدَّقُوا، فَأَلْقَى هَذَا أَحَدَ ثَوْبَيْهِ»، ثُمَّ أَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ[(١)].

## باسی ئیمام لە وتاری نوێژی هەینی فەرمان بکات بە بەخشین، ئەگەر هەژار و کەمدەستی بینی

واتە: عیازی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح دەگێڕێتەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە ڕۆژی هەینی هاتە نێو مزگەوتەوە مەڕوانی کوڕی حەکەمیش وتاری دەدا، ئەویش دەستی کرد بە نوێژکردن، پاسەوانەکانی هاتن بۆ ئەوەی داینیشێنن، ئەویش دانەنیشت تا نوێژەکەی کرد، کاتێ مەڕوان وتارەکەی تەواو کرد هاتین بۆ لای (ئەبو سەعید)، پێیان وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت خەریك بوو ئازارت بدەن، وتی: هەرگیز واز لەو دوو ڕکاتە ناهێنم دوای ئەوەی بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ کردی، پاشان باسی کرد پیاوێك لە ڕۆژی هەینی هاتە نێو مزگەوتەوە پۆشاکێکی شڕ و خراپی لەبەردا بوو، لەو کاتەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر وتاری دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد: ببەخشن، بەڵام هیچ پۆشاکێکیان پێ نەدا، بۆیە فەرمانی کرد دوو پۆشاکی پێ بدەن، وە فەرمانی بە کابراش کرد دوو ڕکات نوێژی کرد،

---

(١) إسناده حسن.

پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا، پاشان هەینییەکەی دیکە هاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد (ببەخشن) پیاوەکە یەکێك لە دوو پۆشاکەکەی دانا (وەکوو بەخشین)، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد یان سەرکۆنەی کرد، فەرمووی: پۆشاکەکەت هەڵگرە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە (هەفتەی پێشوو) هاتە نێو مزگەوتەوە بە پۆشاکێکی شڕ و خراپەوە، فەرمانم کرد بە خەڵکەکە ببەخشن، بەڵام هیچ پۆشاکێکیان دانەنا بۆی، دواتر فەرمانی کرد دوو پۆشاکی پێ بدرێ، پاشان ئەمڕۆ هاتە مزگەوتەوە فەرمانم کرد ببەخشن، یەکێك لەو دوو پۆشاکەی دانا (وەکوو بەخشین)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد دوو ڕکات نوێژ بکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قَطْعِ الْإِمَامِ الْخُطْبَةَ لِتَعْلِيمِ السَّائِلِ الْعِلْمَ

**١٨٠٠-** عَنْ أَبِي رِفَاعَةَ الْعَدَوِيِّ ﷺ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ، لَا يَدْرِي مَا دِينُهُ، فَأَقْبَلَ إِلَيَّ وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ، فَأُتِيَ بِكُرْسِيٍّ خَلَتْ قَوَائِمُهُ حَدِيدًا، -قَالَ حُمَيْدٌ: أُرَاهُ رَأَى خَشَبًا أَسْوَدَ حَسِبَهُ حَدِيدًا، فَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ وَأَتَمَّ آخِرَهَا[١].

## باسی مۆڵەت دراوە ئیمام وتارەکەی ببڕێت
## بۆ ئەوەی پرسیارکەرێك فێری زانست بکات

واتە: ئەبو ڕیفاعەی عەدەوی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو وتاری دەدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی غەریب هاتووە پرسیار دەکات سەبارەت بە ئایینەکەی، نازانێ ئایینەکەی چییە؟ (پێغەمبەر ﷺ) ڕووی تێکردم و وازی لە وتارەکەی هێنا، پاشان کورسییەکیان بۆی هێنا پێم وایە قاچەکانی ئاسن بوو، -حومەید (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرمودە) وتی: وا دەبینم بیچمی کورسییەکە دارێکی ڕەش بوو بۆیە وای زانی ئاسنە- (پێغەمبەر ﷺ لەسەری دانیشت)، ئەوەی فێر دەکردم کە خوا فێری کردبوو، پاشان چوو بۆ لای وتارەکەی کۆتایی پێهێنا.

---

(١) صحيح.




## بَابُ نُزُولِ الْإِمَامِ عَنِ الْمِنْبَرِ، وَقَطْعِهِ الْخُطْبَةَ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لَهُ

١٨٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَأَقْبَلَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَعْثُرَانِ وَيَقُومَانِ، فَنَزَلَ فَأَخَذَهُمَا فَوَضَعَهُمَا بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ١٥ ﴾التغابن، رَأَيْتُ هَذَيْنِ فَلَمْ أَصْبِرْ، ثُمَّ أَخَذَ فِي خُطْبَتِهِ[١].

## باسی دابەزینی ئیمام لەسەر مینبەر و بڕینی وتار لەبەر پێویستییەك ڕوو بدات

واتە: عەبدوڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا (لەسەر مینبەر) حەسەن و حوسەین هاتن، کراسێکی سووریان لەبەر بوو، ڕێیان دەکرد ئەوەندە منداڵ بوون خەریك بوو بەملاولادا دەکەوتن، پێغەمبەر ﷺ (لەسەر مینبەرەکە) دابەزیە خوارەوە (وتارەکەی بڕی) و هەردووکیانی هەڵگرت، پاشان (گەڕایەوە بۆ سەر مینبەرەکەی) و فەرمووی: خواو ﷺ پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ١٥ ﴾، ئەم دووانەم بینی خۆم پێ ڕانەگیرا. پاشان دەستی بە وتارخوێندنەکەی کرد.

١٨٠٢- عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ بِمِثْلِهِ. وَقَالَ: فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى نَزَلْتُ فَحَمَلْتُهُمَا، وَلَمْ يَقُلْ: ثُمَّ أَخَذَ فِي خُطْبَتِهِ[٢].

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر وتاری دەدا، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە، وە فەرمووی: خۆم پێ ڕانەگیرا تا دابەزیم و هەردووکیانم هەڵگرت، نەیوت: پاشان دەستی کردەوە بە وتارەکەی.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ الْإِنْصَاتِ، وَالِاسْتِمَاعِ لِلْخُطْبَةِ

١٨٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ فَاغْتَسَلَ الرَّجُلُ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ تَطَيَّبَ مِنْ أَطْيَبِ طِيبِهِ، وَلَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ وَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ اسْتَمَعَ لِلْإِمَامِ غُفِرَ لَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ»(١).

### باسی فەزڵ و گەورەیی بێدەنگبوون و گوێگرتن بۆ وتاری هەینی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕۆژی هەینی هات پیاو جەستەی بشوات و سەریشی بشوات، پاشان خۆشترین بۆنی کە هەیەتی لە خۆی بدات و چاکترین پۆشاکی بپۆشێ، پاشان دەربچێت بۆ نوێژی هەینی لە نێوانی دوو کەسدا دانەنیشێ و لە یەکدی جیایان نەکاتەوە (یان بە نێوانیاندا تێنەپەڕێت)، ئینجا گوێ بۆ ئیمام بگرێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت لەو هەینییەوە تا هەینییەکەی دیکە، وە سێ ڕۆژ زیاتریش.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْكَلَامِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عِنْدَ خُطْبَةِ الْإِمَامِ

١٨٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَكَلَّمْتَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَدْ لَغَوْتَ، وَأَلْغِيْتَ». يَعْنِي وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ(٢).

### باسی سەرزەنشتکردن لە قسەکردن لە ڕۆژی هەینی کاتێ ئیمام وتار دەدات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە ڕۆژی هەینی قسەت کرد (کاتێ ئیمام وتاری دەدا) ئەوە غەڵبەغەڵب و قسەی نابەجێت کردووە، وە پاداشتەکەت هەڵوەشاندووەتەوە واتە: کاتێ ئیمام وتاری دەدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِنْصَاتِ النَّاسِ بِالْكَلَامِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ

١٨٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَدْ لَغَوْتَ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە بێدەنگکردنی خەڵك بە قسەکردن لە ڕۆژی هەینی لە کاتێکدا ئیمام وتار بدات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر بە هاوەڵەکەت وت: بێدەنگ بە، ئیمامیش وتاری دەدا ئەوە غەڵبەغەڵب و قسەی نابەجێت کردووە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِنْصَاتِ النَّاسِ بِالْكَلَامِ، وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ خُطْبَةَ الْإِمَامِ

١٨٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِرَجُلٍ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ: أَنْصِتْ فَقَدْ لَغَيْتَ»[٢].

## باسی سەرزەنشتکردن لە بێدەنگ کردنی خەڵك، ئەگەرچی گوێی لە وتاری ئیمامیش نەبێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك بە پیاوێك بڵێ: بێدەنگ بە ئیمامیش وتار بدات، ئەوە غەڵبەغەڵب و قسەی نابەجێت کردووە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ السُّؤَالِ عَنِ الْعِلْمِ غَيْرَ الْإِمَامِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ

١٨٠٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَجَلَسْتُ قَرِيبًا مِنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، فَقَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ سُورَةَ بَرَاءَةَ، فَقُلْتُ لِأُبَيٍّ: مَتَى نَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ؟ قَالَ:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فَتَجَهَّمَنِي وَلَمْ يُكَلِّمْنِي، ثُمَّ مَكَثْتُ سَاعَةً، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَتَجَهَّمَنِي وَلَمْ يُكَلِّمْنِي، ثُمَّ مَكَثْتُ سَاعَةً، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَتَجَهَّمَنِي وَلَمْ يُكَلِّمْنِي، فَلَمَّا صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ، قُلْتُ لِأُبَيٍّ: سَأَلْتُكَ فَتَجَهَّمْتَنِي وَلَمْ تُكَلِّمْنِي، قَالَ أُبَيٌّ: مَا لَكَ مِنْ صَلَاتِكَ إِلَّا مَا لَغَوْتَ، فَذَهَبْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، كُنْتُ بِجَنْبِ أُبَيٍّ، وَأَنْتَ تَقْرَأُ بَرَاءَةَ، فَسَأَلْتُهُ: مَتَى نَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ؟ فَتَجَهَّمَنِي وَلَمْ يُكَلِّمْنِي، ثُمَّ قَالَ: مَا لَكَ مِنْ صَلَاتِكَ إِلَّا مَا لَغَوْتَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَدَقَ أُبَيٌّ»[١].

## باسی قەدەغەکردن لەوەی کاتێ کە ئیمام وتار دەدات پرسیاری زانستی لە غەیری ئەو بکرێ

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: ڕۆژی هەینی چوومە مزگەوتەوە پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، لە نزیکی ئوبەی کوڕی کەعب دانیشتم، پێغەمبەر ﷺ سوڕەتی (بَرَاءَةَ)ەی خوێند، بە ئوبەیم وت: ئەم سوڕەتە کەی دابەزی؟ وتی: بە ڕوخساری سەرزەنشتی کردم و قسەی لەگەڵم نەکرد، پاشان ساتێك مامەوە، پاشان پرسیارم لێ کرد بە ڕوخساری سەرزەنشتی کردم و قسەی لەگەڵم نەکرد، پاشان ساتێك مامەوە، ئینجا پرسیارم لێ کرد بە ڕوخساری سەرزەنشتی کردم و قسەی لەگەڵم نەکرد، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی تەواو کرد، بە ئوبەیم وت: پرسیارم لێت کرد بە ڕوخسارت سەرزەنشتت کردم و قسەیشت لەگەڵم نەکرد، ئوبەی وتی: هیچت بۆ نییە لە نوێژەکەت جگە لەوەی غەڵبەغەڵبت کردووە، منیش ڕۆیشتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من لە تەنیشتی ئوبەی بووم، تۆش سوڕەتی (بَرَاءَةَ)ت دەخوێند، پرسیارم لێ کرد ئەم سوڕەتە کەی دابەزی؟ بە ڕوخساری سەرزەنشتی کردم و قسەی لەگەڵم نەکرد، پاشان وتی: هیچت بۆ نییە لە نوێژەکەت جگە لەوەی غەڵبەغەڵبت کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئوبەی ڕاستی کرد.

**١٨٠٨-** عَنِ ابْنِ أَبِي مَرْيَمَ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

(٢) إسناده ضعيف لإنقطاعه.

## بَابُ ذِكْرِ إِبْطَالِ فَضِيلَةِ الْجُمُعَةِ بِالْكَلَامِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، وَزَجْرِ الْمُتَكَلِّمِ عَنِ الْكَلَامِ بِالتَّسْبِيحِ

١٨٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ تَلَا آيَةً، فَقَالَ رَجُلٌ وَهُوَ إِلَى جَنْبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: مَتَى أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، فَإِنِّي لَمْ أَسْمَعْهَا إِلَّا السَّاعَةَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سُبْحَانَ اللَّهِ فَسَكَتَ الرَّجُلُ، ثُمَّ تَلَا آيَةً أُخْرَى، فَقَالَ الرَّجُلُ لِعَبْدِ اللَّهِ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سُبْحَانَ اللَّهِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ، قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ لِلرَّجُلِ: إِنَّكَ لَمْ تَجْمَعْ مَعَنَا قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ قَالَ: فَذَهَبَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَدَقَ ابْنُ أُمِّ عَبْدٍ، صَدَقَ ابْنُ أُمِّ عَبْدٍ»[1].

**باسی بەتاڵبوونەوەی خێر و پاداشتی نوێژی هەینی بە قسەکردن، لە کاتێکدا ئیمام وتار بدات، بە دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، وە سەرزەنشتکردنی ئەو کەسەی قسە دەکات، پێی بوترێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ) (تا تێ بگات کاتی قسەکردن نییە)**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، کە ئایەتێکی خوێندەوە، پیاوێك لە تەنیشتی عەبدوڵای کوڕی مەسعود دانیشتبوو وتی: کەی ئەم ئایەتە دابەزی، من نەمبیستووە ئێستا نەبێت، عەبدوڵا وتی: (سُبْحَانَ اللَّهِ) و بێدەنگ بوو، پاشان ئایەتێکی دیکەی خوێندەوە، پیاوەکە هەمان پرسیاری لە عەبدوڵا کرد، عەبدوڵا وتی: (سُبْحَانَ اللَّهِ)، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، ئیبنو مەسعود بە پیاوەکەی وت: تۆ لەگەڵ ئێمە هەینیت نەکرد، وتی: (سُبْحَانَ اللَّهِ)، وتی: چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستی کرد ئیبنو ئوم عەبد، ڕاستی کرد ئیبنو ئوم عەبد.

---

(١) إسناده ضعيف.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّغْوَ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ إِنَّمَا يُبْطِلُ فَضِيلَةَ الْجُمُعَةِ لَا أَنَّهُ يُبْطِلُ الصَّلَاةَ نَفْسَهَا إِبْطَالًا يَجِبُ إِعَادَتُهَا، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ، أَنَّ الْعَرَبَ تَنْفِي الِاسْمَ عَنِ الشَّيْءِ لِنَقْصِهِ عَنِ الْكَمَالِ وَالتَّمَامِ، فَقَوْلُهُ ﷺ: لَمْ تَجْمَعْ مَعَنَا، مِنْ نَفْيِ الِاسْمِ إِذْ هُوَ نَاقِصٌ عَنِ التَّمَامِ وَالْكَمَالِ**

١٨١٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ مَسَّ مِنْ طِيبِ امْرَأَتِهِ إِنْ كَانَ لَهَا، وَلَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ لَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ، وَلَمْ يَلْغُ عِنْدَ الْمَوْعِظَةِ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهُمَا، وَمَنْ لَغَا أَوْ تَخَطَّى كَانَتْ لَهُ ظُهْرًا»(١).

**باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی ئەو دەستەواژە نارِوون (مُجْمَل)ەیە کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی قسەکردن کاتێ کە ئیمام وتار دەدات، فەزڵ و پاداشتی هەینی بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە بەجۆرێ پێویست بە دووبارەکردنەوە بکات، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە کتێبی (الْإِيمَان) باسم کردووە، عەرەب ناوێك ڕەت دەکاتەوە بەگشتی لەبەر بوونی کەموکورتی و ناتەواوی تیایدا، جا فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (لەگەڵ ئێمە هەینیت نەکرد)، لە ڕەتکردنی ناوە، چونکە (هەینیکردنەکەی کابرا) کەموکورتی تێدایە و تەواو نییە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە ڕۆژی هەینیدا خۆی بشوات، پاشان بۆنی خۆش بەکاربهێنێت ئەگەر لەلای هەبوو، وە چاکترینی جلەکانی بپۆشێت، پاشان (بچێت بۆ مزگەوت) بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاو نەنێت، قسەی نابەجێ نەکات لە کاتی ئامۆژگاری ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکان بۆی لە نێوانی ئەو دوو هەینییە، هەر کەسیش قسەی نابەجێ بکات یان بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاو بنێ لە فەزڵ و پاداشتەکەی بێبەش دەبێت، تەنها نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەنووسرێت.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِنْصَاتِ الْمُتَكَلِّمِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ بِالْإِشَارَةِ إِلَيْهِ بِالزَّجْرِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، عَنْ أَنَسٍ، فِي قِصَّةِ السَّائِلِ عَنِ السَّاعَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ النَّاسُ أَنِ اسْكُتْ»

## باسی فەرمانکردن بە بێدەنگکردنی قسەکەر کاتێ ئیمام وتار دەدات بە ئاماژەکردن بۆی و سەرکۆنەکردنی، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی شەریکی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو نەمر هاتووە لە ئەنەسەوە، لە چیرۆکی کابرا کە پرسیاری کرد دەربارەی ڕۆژی دوایی، خەڵکەکە ئاماژەیان بۆی کرد بێدەنگ بە

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ تَخَطِّي النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، وَإِبَاحَةِ زَجْرِ الْإِمَامِ عَنْ ذَلِكَ فِي خُطْبَتِهِ

**١٨١١-** عَنْ أَبِي الزَّاهِرِيَّةِ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَمَا زَالَ يُحَدِّثُنَا حَتَّى خَرَجَ الْإِمَامُ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، فَقَالَ لِي: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ: «اجْلِسْ، فَقَدْ آذَيْتَ وَآنَيْتَ»(١).

## باسی قەدەغەکردنی لە هەنگاونان بەسەر خەڵکیدا لە ڕۆژی هەینی، کاتێ ئیمام وتار دەدات، وە ڕێگەدان بەوەی ئیمام لە وتارەکەیدا سەرزەنشتی بکات لەو کارە

واتە: ئەبو زاهیریە دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی بوسر ﷺ لە ڕۆژی هەینی دانیشتبووم، بەردەوام قسەی بۆ دەکردین تا ئیمام دەرچوو بۆ سەر مینبەر، پیاوێك هات بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاوی دەنا، ئەویش پێی وتم: پیاوێ هات بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاوی دەنا، پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا، پێی فەرموو: دانیشە، بەڕاستی خەڵکت ئازار دا و دواش کەوتیت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّفْرِيقِ بَيْنَ النَّاسِ فِي الْجُمُعَةِ، وَفَضِيلَةِ اجْتِنَابِ ذَلِكَ

**١٨١٢-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَحْسَنَ الْغُسْلَ أَوْ تَطَهَّرَ فَأَحْسَنَ الطُّهُورَ فَلَبِسَ مِنْ خَيْرِ ثِيَابِهِ، وَمَسَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ طِيبًا، أَوْ دُهْنِ أَهْلِهِ، وَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ إِلَّا غُفِرَ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى»[1].

## باسی قەدەغەکردن لە جیاکردنەوەی نێوانی خەڵك لە هەینی، وە فەزڵ و چاکەی دوورکەوتنەوە لەو کارە

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژی هەینی خۆی بشوات بەچاکترین خۆشۆردن، یان خۆی پاك بكاتەوە بەچاکترین خۆپاککردنەوە، ئینجا چاکترینی جلوبەرگەکانی لەبەر بکات و بۆنی خۆش بەکاربهێنێت لەوەی خوا پێی داوە، یان ڕۆنی ماڵەوەی بەکار بهێنێ ( بۆ سەر و ڕیشی)، وە دوو کەس لە یەکدی جیا نەکاتەوە حەتمەن خوا لێی خۆش دەبێت تا هەینییەکەی دیکە.

## بَابُ طَبَقَاتِ مَنْ يَحْضُرُ الْجُمُعَةَ

**١٨١٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَحْضُرُ الْجُمُعَةَ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ يَحْضُرُهَا يَلْغُو، فَهُوَ حَظُّهُ مِنْهَا، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا بِدُعَاءٍ، فَهُوَ رَجُلٌ دَعَا اللَّهَ، فَإِنْ شَاءَ اللَّهُ أَعْطَاهُ، وَإِنْ شَاءَ مَنَعَهُ، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا بِوَقَارٍ وَإِنْصَاتٍ وَسُكُونٍ، وَلَمْ يَتَخَطَّ رَقَبَةَ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُؤْذِ أَحَدًا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ إِلَى الْجُمُعَةِ الَّتِي تَلِيهَا، وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ؛ لِأَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۝١٦٠﴾ [الأنعام]»[2].

## باسی ئەو چینانەی ئامادەی نوێژی هەینی دەبن

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ پیاو ئامادەی نوێژی هەینی دەبن: پیاوێك ئامادەی دەبێت

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

غەڵبەغەڵب دەکات، ئەوە بەشیەتی لێی، پیاوێکیش ئامادەی دەبێت بەپاڕانەوە، ئەو پیاوە لە خوا پاڕاوەتەوە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو پێی دەبەخشێ، وە ئەگەر ویستی لەسەر بوو پێی نابەخشێ، پیاوێکیش بەهێمنی و ئارامی و بێدەنگبوون و وەستان ئامادەی دەبێت، هەنگاو بەسەر هیچ موسوڵمانێکدا نانێت و کەس ئازار نادات، ئەوە دەبێتە کەفارەت بۆی تا ئەو هەینییەی بەدوایدا دێت، وە سێ ڕۆژ زیاتریش، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك چاکەیەکی کردبێ دە بەرانبەر پاداشتی بۆ هەیە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْأَخْبَارِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي الْأَبْوَابِ الْمُتَقَدِّمَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جَمِيعَ مَا تَقَدَّمَ مِنَ الْأَخْبَارِ فِي ذِكْرِ الْجُمُعَةِ أَنَّهَا كَفَّارَةٌ لِلذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا، إِنَّمَا هِيَ أَلْفَاظٌ عَامٌّ، مُرَادُهَا خَاصٌّ، أَرَادَ النَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ أَنَّهَا كَفَّارَةٌ لِصَغَائِرِ الذُّنُوبِ دُونَ كِبَارِهَا

١٨١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ»[١].

## باسی فەرموودەیەکی شیکەرەوە (الْمُفَسِّرِ) بۆ ئەو فەرموودە ناڕوونانەی (الْمُجْمَلَةِ) کە باسم کرد لە بەشەکانی پێشوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی لە پێشەوە هاتوون لە باسی ڕۆژی هەینی کە دەبێتە کەفارەتی گوناه و تاوانەکان، بێگومان ئەو دەستەواژانە گشتین (عَامٌّ) مەبەست پێیان تایبەتە (خَاصٌّ)، پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە کەفارەتە بۆ گوناهە بچووکەکان نەك گوناهە گەورەکان

واتە: ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پێنج نوێژەکە و هەینی بۆ هەینی بۆی دەبنە کەفارەتی ئەو گوناهانەی لە نێوانیاندا کردوویەتی بە مەرجێ تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْحِبووة يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ

**١٨١٥-** عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْحِبووة يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ(١).

## باسی قەدەغەکردن لە دانیشتن بە شێوەی (الْحِبووة)(٢) لە ڕۆژی هەینی، کاتێ کە ئیمام وتار دەدا

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەسی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی قەدەغەی کردووە لەوەی پیاو بە یەك پۆشاکەوە دابنیشێ لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ (هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگا و عەورەتیەوە نەبێت) ئیمامیش وتار بدات.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْحِلَقِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ

**١٨١٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشِّرَاءِ وَالْبَيْعِ فِي الْمَسَاجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهَا الْأَشْعَارُ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهَا الضَّالَّةُ، وَعَنِ الْحِلَقِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ(٣).

## باسی سەرزەنشتکردن لە دانیشتنی بەکۆمەڵ بەشێوەی بازنەیی لە ڕۆژی هەینی پێش نوێژکردن

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە کڕین و فرۆشتن لەنێو مزگەوت، هەروەها لەوەی شیعری تێدا بوترێ، هەروەها لە بانگەواز بۆ شتی ونبوو تیایدا، هەروەها لە دانیشتن بەکۆمەڵ بەشێوەی بازنەیی لە ڕۆژی هەینی لەنێو مزگەوت پێش نوێژکردن

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) (الْحِبووة) یان (الإِحْتِبَاءِ): بریتییە لە دانیشتنی پیاو بە یەك پۆشاکەوە لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگاو عەورەتیەوە نەبێ.

(٣) إسناده حسن.

(مەبەستی پێی ئەوکاتانەی کە خەڵك دێن بۆ مزگەوت بۆ نوێژی هەینی، بۆ ئەوەی بارگرانی لەسەر موسوڵمانان دروست نەبێت).

## بَابُ فَضْلِ تَرْكِ الْجَهْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ حِينِ يَأْتِي الْمَرْءُ الْجُمُعَةَ إِلَى انْقِضَاءِ الصَّلَاةِ

**١٨١٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَطَهَّرَ الرَّجُلُ فَأَحْسَنَ الطُّهُورَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَلَمْ يَلْغُ وَلَمْ يَجْهَلْ حَتَّى يَنْصَرِفَ الْإِمَامُ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ»[1].

## باسی فەزڵی وازهێنان لە سەرپێچی لە ڕۆژی هەینی لەو کاتەی بەندە دێت بۆ هەینی تا نوێژ تەواو دەبێ

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو خۆی شۆرد بەچاکترین خۆشۆردن، پاشان هات بۆ نوێژی هەینی، غەڵبەغەڵب و سەرپێچی خوای نەکرد تا ئیمام تەواو دەبێت، ئەوە دەبێتە کەفارەت بۆی لە نێوان ئەو هەینییە و هەینییەکەی دیکە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ مَسِّ الْحَصَى وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْإِعْلَامِ بِأَنَّ مَسَّ الْحَصَى فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ لَغْوٌ

**١٨١٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَدَنَا وَأَنْصَتَ وَاسْتَمَعَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا»[2].

## باسی سەرزەنشتکردن لە دەستکاریکردنی بەرد لە کاتێکدا ئیمام وتار بدات لە ڕۆژی هەینی، وە ئاگادارکردنەوە لەبارەی ئەوەی دەستکاری بەرد لەو کاتەدا کاری نابەجێیە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس دەستنوێژ بگرێ لە ڕۆژی هەینی بەچاکترین دەستنوێژ پاشان بچێت بۆ هەینی نزیك بێتەوە و

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

بێدەنگ بێت و گوێ بۆ ئیمام بگرێت، ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت لە نێوان ئەو هەینییە بۆ هەینییەکەی دیکە، وە سێ ڕۆژ زیاتریش، هەر کەسیش دەستکاری بەرد بکات، ئەوا کاری نابەجێی کردووە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَحَوُّلِ النَّاعِسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَنْ مَوْضِعِهِ إِلَى غَيْرِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النُّعَاسَ لَيْسَ بِاسْتِحْقَاقِ نَوْمٍ، وَلَا مُوجِبٌ وُضُوءًا

١٨١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي مَجْلِسِهِ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ»[١].

## باسی چاکتر وایە ئەو کەسەی خەوەنووچەکەی دێت لە ڕۆژی هەینی جێگاکەی بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خەوەنووچکە خەوی ڕاستەقینە نییە و دەستنوێژ لەسەر خاوەنەکەی واجب ناکاتەوە

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕۆژی هەینی خەوەنووچەکەی کرد لە شوێنی دانیشتنەکەی، ئەوە با لەو شوێنە دەربچێ بۆ شوێنێکی دیکە (دابنیشێ تا خەوەنووچکەکەی نامێنێ).

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِقَامَةِ الرَّجُلِ أَخَاهُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ مَجْلِسِهِ لِيَخْلُفَهُ فِيهِ

١٨٢٠- عَنْ إِبْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ نَافِعاً يَزْعُمُ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يُقِمْ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَخْلُفُهُ فِيهِ، فَقُلْتُ: أَنَا لَهُ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَغَيْرِهِ». قَالَ: وَقَالَ نَافِعٌ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُومُ لَهُ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ فَلَا يَجْلِسُ فِيهِ[٢].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی کەسێك لە ڕۆژی هەینی براکەی هەڵبسێنێ لە جێگای خۆی و لە جێگاکەی دانیشێ

---

(١) إسناده معلول بالوقف.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: گوێم لێ بوو نافیع دەیوت: ئیبنو عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با یەکێك لە ئێوە براکەی لە جێگای خۆی هەڵنەسێنی و دواتر لە جێگاکەی دابنیشێ، وتم: تەنها لە ڕۆژی هەینی؟ وتی: لە ڕۆژی هەینی و جگە لە هەینی، وتی: نافیع وتی: پیاو شوێنی خۆی بۆ ئیبنو عومەر چۆڵ دەکرد، بەڵام ئەو لەو شوێنە دانەدەنیشت.

## بَابُ ذِكْرِ قِيَامِ الرَّجُلِ مِنْ مَجْلِسِهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ يَرْجِعُ، وَقَدْ خَلَفَهُ فِيهِ غَيْرُهُ، وَالْبَيَانِ أَنَّهُ أَحَقُّ بِمَجْلِسِهِ مِمَّنْ خَلَفَهُ فِيهِ

**١٨٢١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَرْجِعُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»[١].

## باسی هەستانی پیاو لە جێگاکەی خۆی لە ڕۆژی هەینی، پاشان بگەڕێتەوە بۆی، کەسێکی دیکە لە شوێنی دانیشتبێت، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ئەو لە پێشترە بە جێگاکەی خۆی لەوەی لە شوێنی دانیشتووە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە جێگای خۆی هەستا (لە ڕۆژی هەینی) پاشان بگەڕێتەوە بۆی ئەوا ئەو لەپێشترە بەو جێگایە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّوَسُّعِ وَالتَّفَسُّحِ إِذَا ضَاقَ الْمَوْضِعُ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴿١١﴾ ﴾المجادلة.

**١٨٢٢**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُقِيمَ الرَّجُلُ أَخَاهُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَخْلُفُهُ، وَلَكِنْ تَوَسَّعُوا، وَتَفَسَّحُوا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەرمانکردن بە کردنەوە و فراوانکردنی جێگا ئەگەر شوێنەکە تەسك و تەنگ بوو، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر پێتان وترا جێگا فراوان بکەنەوە ئەوە جێگا فراوان بکەنەوە خوا ﷻ شوێنتان بۆ فراوان دەکاتەوە**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە پیاوێك براکەی هەڵبسێنێ لە جێگاکەی خۆی، پاشان لە جێگاکەی ئەو دابنیشێ، بەڵام جێگەی بۆ بکەنەوە و مەجلیسەکە فراوان بکەن.

**بَابُ ذِكْرِ كَرَاهَةِ انْفِضَاضِ النَّاسِ عَنِ الْإِمَامِ وَقْتَ خُطْبَتِهِ لِلنَّظَرِ إِلَى لَهْوٍ أَوْ تِجَارَةٍ قَالَ اللَّهُ ﷻ لِنَبِيِّهِ الْمُصْطَفَى ﷺ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾ ﴾ [الجمعة: ١١] الْآيَةَ**

**١٨٢٣**- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ، فَانْفَتَلَ النَّاسُ إِلَيْهَا حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾ ﴾الجمعة[1].

**باسی کەراهەتی ئەوەی خەڵك ئیمام بەجێ بهێڵن لە کاتی وتاری هەینی، بۆ تەماشاکردنی هەوا و ئارەزووی دنیایی یان بازرگانی، خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموو: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾ ﴾، ئەوان کاتێك بازرگانییەك یاخود کارێکی دونیایی ببینن ئەوە هەموویان بەرەوپیری دەڕۆن وە تۆ بەتەنها بەپێوە بەجێ ئەهێڵن**

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وتاری دەدا، کاروانییەك لە شامەوە هات، خەڵکەکە وتاریان بەجێهێشت و چوون بەدەمیەوە، کەس لە مزگەوت نەمایەوە دوازدە پیاو نەبێت، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی کە لە سورەتی (الْجُمُعَة)دا هاتووە: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾ ﴾.

---

(١) صحيح.

## أَبْوَابُ الصَّلَاةِ قَبْلَ الْجُمُعَةِ

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِعْطَاءِ الْمَسَاجِدِ حَقَّهَا مِنَ الصَّلَاةِ عِنْدَ دُخُولِهَا

**١٨٢٤**- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْطُوا الْمَسَاجِدَ حَقَّهَا»، قِيلَ: وَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: «رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ»[١].

## باسەکانی نوێژی (سوننەت) پێش نوێژی هەینی

## باسی فەرمانکردن بەوەی مافی مزگەوتەکان بدرێت بە نوێژکردن لە کاتی چوونە نێوەوەیان

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مافی مزگەوتەکان بدەن، وترا: مافیان چییە؟ فەرمووی: دوو ڕکاتە پێش ئەوەی دابنیشی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّطَوُّعِ بِرَكْعَتَيْنِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ قَبْلَ الْجُلُوسِ

**١٨٢٥**- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە دوو ڕکات نوێژی سوننەت لە کاتی چوونە نێو مزگەوت پێش دانیشتن

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە چۆیە نێو مزگەوتەوە با دوو ڕکات نوێژ بکات.

**١٨٢٦**- عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ. زَادَ: قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ[٣].

واتە: عامری کوڕی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بە هەمان زنجیرە دەگێڕێتەوە. ئەوەی زیاد کردووە: پێش ئەوەی دابنیشێت.

---

(١) هذا حديث شاذ بهذا المتن المخالف رواية ثقات الأثبات.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْجُلُوسِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ

**١٨٢٧-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە دانیشتن لە کاتی چوونە نێو مزگەوت، پێش ئەوەی دوو ڕکات سوننەت بکات

واتە: ئەبو قەتادەی کوڕی ربعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە چۆیە نێو مزگەوتەوە با دانەنیشێت تا دوو ڕکات نوێژی سوننەت دەکات.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالرُّجُوعِ إِلَى الْمَسْجِدِ لِيُصَلِّيَ الرَّكْعَتَيْنِ إِذَا دَخَلَهُ فَخَرَجَ مِنْهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَهُمَا

**١٨٢٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ: «أَدَخَلْتَ الْمَسْجِدَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ فِيهِ؟» قُلْتُ: لَا، قَالَ: «فَاذْهَبْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە گەڕانەوە بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەگەر چووە ژوورەوە و دەرچوو پێش ئەوەی دوو ڕکات نوێژ بکات

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ڕۆژێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، فەرمووی: چوویتە نێو مزگەوتەوە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەی نوێژت تێدا کرد؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: بڕۆ دوو ڕکات نوێژ بکە.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِرَكْعَتَيْنِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ أَمْرُ نَدْبٍ، وَإِرْشَادٍ، وَفَضِيلَةٍ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الزَّجْرَ عَنِ الْجُلُوسِ قَبْلَ صَلَاةِ رَكْعَتَيْنِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ نَهْيُ تَأْدِيبٍ لَا نَهْيُ تَحْرِيمٍ، بَلْ حَضٌّ عَلَى الْخَيْرِ وَالْفَضِيلَةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ: الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا، وَمَا عَلَى هَذَا الْمِثَالِ مِنْ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ (الْكَبِيرِ) فِي الْجُزْءِ الْأَوَّلِ مِنْ كِتَابِ (الصَّلَاةِ). فَأَعْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ لَا فَرْضَ مِنَ الصَّلَاةِ إِلَّا خَمْسُ صَلَوَاتٍ، وَأَنَّ مَا سِوَى الْخَمْسِ فَتَطَوُّعٌ لَا فَرْضَ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ.**

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانكردن بە دوو ڕكات لە كاتی چوونە نێو مزگەوت، فەرمانێكە بە مەبەستی بەچاكدانان و ڕێنیشاندان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەرزەنشتكردن لە دانیشتن پێش دوو ڕكات نوێژ لە كاتی چوونە نێو مزگەوت ڕێگریكردنێكە بۆ پەروەردەكردن نەك ڕێگرییەك بۆ قەدەغەكردن، بەڵكوو هاندانە بۆ خێر و چاكە، ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی تەلحەی كوڕی عوبەیدوڵا: پیاوێكی دەشتەكی هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: خوا ﷻ چی فەڕز كردووە لەسەرم لە نوێژكردن؟ فەرمووی: پێنج نوێژ مەگەر نوێژی زیادە بكەیت وە ئەوەشی وەكو ئەم نموونەیە لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ باسم كردووە لە كتێبی (الْكَبِيرِ) لە بەشی یەكەم لە كتێبی (الصَّلَاةِ). پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە هیچ نوێژێكی فەڕز نییە جگە لە پێنج نوێژەكە نەبێت، هەرچی لە جگە لەو پێنج نوێژەیە سوننەتە و فەڕز نییە

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْجَالِسَ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّكْعَتَيْنِ لَا يَجِبُ إِعَادَتُهُمَا، إِذِ الرَّكْعَتَانِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ فَضِيلَةٌ لَا فَرِيضَةٌ**

١٨٢٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، فَجَلَسْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ؟» قُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُكَ جَالِسًا وَالنَّاسُ جُلُوسٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ»(١).

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەو کەسەی کاتێ چووە نێو مزگەوتەوە و دانیشت پێش ئەوەی دوو ڕکات نوێژ بکات، پێویست نییە لەسەری دووبارەی بکاتەوە، چونکە ئەو دوو ڕکاتە لە کاتی چوونە نێو مزگەوت فەزڵ و چاکەیە نەك فەرز**

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: چوومە نێو مزگەوتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو خەڵکەکە دانیشتبوو، منیش دانیشتم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی ڕێگری لێ کردی پێش ئەوەی دابنیشی دوو ڕکات نوێژ بکەی؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆم بینی دانیشتوویت و خەڵکەکەیش دانیشتوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێك لە ئێوە هاتە نێو مزگەوتەوە با دانەنیشێ تا دوو ڕکات نوێژ دەکات.

**بَابُ الْأَمْرِ بِتَطَوُّعِ رَكْعَتَيْنِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ، وَإِنْ كَانَ الْإِمَامُ يَخْطُبُ خُطْبَةَ الْجُمُعَةِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُصَلِّيَ دَاخِلَ الْمَسْجِدِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ**

١٨٣٠- عَنْ عياض عن أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ مَرْوَانُ يَخْطُبُ، فَصَلَّى أَبُو سَعِيدٍ، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ الْأَحْرَاسُ لِيُجْلِسُوهُ، فَأَبَى حَتَّى صَلَّى، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ أَتَيْنَاهُ، فَقُلْنَا لَهُ: كَادُوا يَفْعَلُونَ بِكَ، غَفَرَ اللَّهُ لَكَ فَقَالَ: لَنْ أَدَعَهُمَا أَبَدًا بَعْدَ أَنْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ(١).

**باسی فەرمانکردن بە دوو ڕکات نوێژی سوننەت لە کاتی چوونە نێو مزگەوت، ئەگەرچی ئیمامیش وتاری هەینی دەدا، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە کاتێ ئیمام وتار دەدات دروست نییە هیچ کەس لەنێو مزگەوت نوێژ بکات**

واتە: عیاز دەگێڕێتەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ وتی: مەڕوان وتاری دەدا، ئەبو سەعیدیش نوێژی دابەست، پاسەوانەکانی هاتن بۆ ئەوەی داینیشێنن، ئەویش دانەنیشت تا نوێژەکەی کرد، کاتێ (مەڕوان) نوێژی تەواو کرد هاتین بۆ لای (ئەبو سەعید) پێیان وت: خەریك بوو ئازارت بدەن، خوا لێت خۆش بێت، وتی: هەرگیز وازی لێناهێنم دوای ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە.

---

(١) إسناده حسن.

**١٨٣١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێك لە ئێوە هات بۆ مزگەوت ئیمامیش وتاری دەدا، با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت.

## بَابُ سُؤَالِ الْإِمَامِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ دَاخِلَ الْمَسْجِدِ وَقْتَ الْخُطْبَةِ أَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أَمْ لَا؟ وَأَمْرِ الْإِمَامِ الدَّاخِلَ بِأَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَلَّاهُمَا قَبْلَ سُؤَالِ الْإِمَامِ إِيَّاهُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى الْخُطْبَةِ لَيْسَتْ بِصَلَاةٍ

**١٨٣٢-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ: دَخَلَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ: «صَلَّيْتَ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

## باسی پرسیارکردنی ئیمام لە وتاری هەینی لەوکەسەی دێتە نێو مزگەوت لە کاتی وتاردان: ئایا دوو ڕکات نوێژی کردووە یان نا؟ وە فەرمانکردنی ئیمام بەو کەسەی کە دێتە نێو مزگەوت دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەگەر پێش پرسیارکردنی ئیمام دوو ڕکاتەکەی نەکردبوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی وتار نوێژ نییە

واتە: جابر ﵁ دەڵێ: سولەیکی غەتەفانی ڕۆژی هەینی هاتە نێو مزگەوت پێغەمبەریش ﷺ وتاری دەدا، پێی فەرموو: نوێژت کردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە.

**١٨٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَقُمْ فَارْكَعْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك (ڕۆژی هەینی هاتە نێو مزگەوت) پێغەمبەریش ﷺ وتاری دەدا، فەرموو: ئایا نوێژت کردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: هەستە نوێژ بکە.

**١٨٣٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ: «أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: فَقَالَ: «ارْكَعْ»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات پێغەمبەریش ﷺ لەسەر مینبەر لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، پێی فەرموو: ئایا دوو ڕکات نوێژت کردووە؟ وتی: نەخێر، وتی: فەرمووی: نوێژ بکە.

**بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ فِي خُطْبَةِ الْجُمُعَةِ دَاخِلِ الْمَسْجِدِ بِرَكْعَتَيْنِ يُصَلِّيهِمَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَقْطَعْ خُطْبَتَهُ لِيُصَلِّيَ الدَّاخِلُ الَّذِي أَمَرَهُ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ إِلَى أَنْ يَفْرَغَ الْمُصَلِّي مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَمَا زَعَمَ بَعْضُ مَنْ لَمْ يُنْعِمِ النَّظَرَ فِي الْأَخْبَارِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنْ عِيَاضٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: وَأَمَرَهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، قَدْ أَمْلَيْتُ الْخَبَرَ بِتَمَامِهِ قَبْلُ**

**باسی فەرمانکردنی ئیمام لە وتاری هەینی بەوکەسەی دێتە نێو مزگەوتەوە دوو ڕکات نوێژ بکات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وتارەکەی نەبڕی تا ئەو کەسەی لەنێو مزگەوتە دوو ڕکاتە نوێژەکەی بکات کە فەرمانی پێ کردبوو دوو ڕکات نوێژ بکات، وەك هەندێ لەوانەی نیعمەتی سەرنجدان و ڕامانی فەرموودەکانی پێ نەبەخشراوە ئەو بۆچوونەی هەیە، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو عجلان لە عیاز لە ئەبو سەعیدەوە: وە فەرمانی پێ کرد دوو ڕکات نوێژی کرد پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا، پێشتر ئەم فەرموودەم بەتەواوی باس کرد**

**بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ فِي خُطْبَتِهِ الْجَالِسَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيهِمَا بِالْقِيَامِ لِيُصَلِّيهِمَا أَمْرَ اخْتِيَارٍ وَاسْتِحْبَابٍ، وَالتَّجَوُّزِ فِيهِمَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ هَذَا كَانَ خَاصًّا لِسُلَيْكٍ الْغَطَفَانِيِّ**

---

(١) صحيح.

**١٨٣٥**- عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَجَلَسَ، فَقَالَ لَهُ: يَا سُلَيْكُ، قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا، ثُمَّ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بَعْدَ فَرَاغِ سُلَيْكٍ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ مَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ بِهَذَا الْأَمْرِ كُلَّ مُسْلِمٍ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، وَكَيْفَ يَجُوزُ أَنْ يَتَأَوَّلَ عَالِمٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا خَصَّ بِهَذَا الْأَمْرِ سُلَيْكًا الْغَطَفَانِيَّ إِذْ دَخَلَ الْمَسْجِدَ رَثَّ الْهَيْئَةِ وَقْتَ خُطْبَتِهِ ﷺ؟ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَأْمُرُ بِلَفْظٍ عَامٍّ مَنْ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ فَرَاغِ سُلَيْكٍ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ رَاوِي الْخَبَرِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَحْلِفُ أَنْ لَا يَتْرُكَهُمَا بَعْدَ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِهِمَا، فَمَنِ ادَّعَى أَنَّ هَذَا كَانَ خَاصًّا لِسُلَيْكٍ- أَوْ لِلدَّاخِلِ وَهُوَ رَثُّ الْهَيْئَةِ وَقْتَ خُطْبَةِ النَّبِيِّ ﷺ- فَقَدْ خَالَفَ أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ الْمَنْصُوصَةَ؛ لِأَنَّ قَوْلَهُ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، مُحَالٌ أَنْ يُرِيدَ بِهِ دَاخِلًا وَاحِدًا دُونَ غَيْرِهِ؛ لِأَنَّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ، عِنْدَ الْعَرَبِ يَسْتَحِيلُ أَنْ تَقَعَ عَلَى وَاحِدٍ دُونَ الْجَمْعِ. وَقَدْ خَرَّجْتُ طُرُقَ هَذِهِ الْأَخْبَارِ فِي كِتَابِ الْجُمُعَةِ.

**باسی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەوکەسەی دانیشت پێش ئەوەی دوو ڕکاتەکە بکات، بە هەستان بۆ ئەوەی ئەنجامیان بدات، فەرمانێکە بۆ ویست و ئارەزوو و بەچاکدانان، وە بەکورتی ئەنجامیان بدات، وە بەڵگەش لەسەر دژی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات ئەوە تایبەتە بە سولەیکی غەتەفانی**

واتە: جابر ﵁ دەڵێ: سولەیکی غەتەفانی لە ڕۆژی هەینی هاتە نێو مزگەوتەوە پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا، یەکسەر دانیشت، پێی فەرموو: ئەی سولەیك هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە بەکورت و پوختی، پاشان فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە ڕۆژی هەینی هات و ئیمامیش وتاری دەدا با دوو ڕکات نوێژ بکات، وە با بەسووکی ئەنجامیان بدات.

ئەبو بەکر دەڵێ: دوای تەواوبوونی سولەیك لە دوو ڕکاتەکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد هەر کەس هات بۆ هەینی و ئیمامیش وتاری دەدا با دوو ڕکات نوێژ بکات،

---

(١) صحيح.

هەموو موسوڵمانێك دەچێتە چوارچێوەیەوە كاتێ ئیمام وتار دەدا تا ڕۆژی دوایی، چۆن دروستە بۆ زانایەك فەرمانەكە تایبەت بكات بە سولەیكی غەتەفانی كاتێ هاتە مزگەوتەوە بە جلێكی شڕ و كۆنەوە لە كاتی وتاردانی پێغەمبەر ﷺ؟ پێغەمبەریش ﷺ دوای تەواوبوونی سولەیەك لە دوو ڕكاتەكە بە دەستەواژەیەكی گشگیر فەرمانی كرد هەر كەس هاتە نێو مزگەوتەوە و ئیمام وتاری دەدا دوو ڕكات نوێژ بكات، ئەبو سەعیدی خودریش كە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سوێند دەخوات وازی لێ ناهێنێ دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كردووە پێیان، جا هەر كەس بانگەشەی ئەوە دەكات ئەو دوو ڕكاتە تایبەتە بە سولەیك -یان بەو كەسەی هاتە نێو مزگەوت و جلی كۆنە و شڕی لەبەردا بوو لە كاتی وتاردانی پێغەمبەر ﷺ- ئەوە پێچەوانەی دەقی فەرموودەكانی پێغەمبەری ﷺ كردووە، چونكە فەرموودەكەی: ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە لە ڕۆژی هەینی هاتە نێو (مزگەوت) ئیمامیش وتاری دەدا با دوو ڕكات نوێژ بكات. ئەستەمە مەبەستی هاتنەژوورەوەی یەك كەس بێت جگە لە ئەوی مەبەست نەبێت، چونكە ئەم دەستەواژەیە: ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە. لەلای عەرەب ئەستەمە بۆ یەك كەس بەكار بهێنرێ جگە لە كۆ. بێگومان ڕێگاكانی ئەم فەرموودەم لە كتێبی (الْجُمُعَةِ) باس كرد.

**بَابُ إِبَاحَةِ مَا أَرَادَ الْمُصَلِّي مِنَ الصَّلَاةِ قَبْلَ الْجُمُعَةِ مِنْ غَيْرِ حَظْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ مَا شَاءَ، وَأَرَادَ مِنْ عَدَدِ الرَّكَعَاتِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ كُلَّ مَا صَلَّى قَبْلَ الْجُمُعَةِ فَتَطَوُّعٌ لَا فَرْضٌ مِنْهَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، وَفِي خَبَرِ سَلْمَانَ: مَا قُدِّرَ لَهُ، وَفِي خَبَرِ أَبِي أَيُّوبَ: فَيَرْكَعُ إِنْ بَدَا لَهُ».**

**باسی ڕێگە دراوە نوێژخوێن چەند ڕكات نوێژ بكات پێش هەینی بەبێ ڕێگریكردن هەر چەندی پێ خۆشە لە ژمارەی ڕكاتەكان با نوێژ بكات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەرچەند نوێژ بكات پێش هەینی زیادەیە نەك فەرز، ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: نوێژی كرد ئەوەندەی بۆی نووسراوە، وە لە فەرموودەكەی سەلمان هاتووە: بۆی دانراوە، لە فەرموودەكەی ئەیوبیش هاتوە: ئەگەر بۆی ڕەخسا نوێژی كرد و كەسی ئازار نەدا**

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَطْوِيلِ الصَّلَاةِ قَبْلَ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ

**١٨٣٦-** عَنْ أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِنَافِعٍ: أَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي قَبْلَ الْجُمُعَةِ؟ فَقَالَ: قَدْ كَانَ يُطِيلُ الصَّلَاةَ قَبْلَهَا، وَيُصَلِّي بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَيُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ[1].

## باسی بەچاکدانانی درێژکردنەوەی نوێژی سوننەت پێش نوێژی هەینی

واتە: ئەیوب ﷺ دەڵێ: بە نافیعم وت: ئایا ئیبنو عومەر پێش هەینی نوێژی دەکرد؟ وتی: بێگومان پێش هەینی نوێژی درێژ دەکردەوە، دوای هەینیش دوو ڕکاتی لە ماڵەوە دەکرد، وە باسی دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوە نوێژی دەکرد.

## بَابُ وَقْتِ الْإِقَامَةِ لِصَلَاةِ الْجُمُعَةِ

**١٨٣٧-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: مَا كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا مُؤَذِّنٌ وَاحِدٌ، إِذَا خَرَجَ أَذَّنَ، وَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ، وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ كَذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ وَكَثُرَ النَّاسُ، أَمَرَ بِالنِّدَاءِ الثَّالِثِ عَلَى دَارٍ فِي السُّوقِ يُقَالُ لَهَا: الزَّوْرَاءُ، فَإِذَا خَرَجَ أَذَّنَ، وَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ[2].

## باسی کاتی قامەتکردن بۆ نوێژی هەینی

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها یەك بانگدەری بوو، کاتێ دەرچووبایە (بۆ سەر مینبەر) بانگی دەدا، کاتێکیش دابەزیبایە (لەسەر مینبەر) قامەتی دەکرد، هەروەها ئەبو بەکر و عومەریش، بەڵام کاتێ عوسمان (بوو بە خەلیفە) و خەڵك زۆر بوون، فەرمانی کرد بە بانگی سێیەم لەسەر خانوویەك بدرێ لە بازاڕێکی نزیك لە مزگەوت پێی دەوترا: (الزَّوْرَاءُ)، کاتێ دەرچووبایە (بۆ سەر مینبەر) بانگی دەدا، کاتێکیش دابەزیبایە قامەتی دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْكَلَامِ لِلْمَأْمُومِ وَالْإِمَامِ بَعْدَ الْخُطْبَةِ، وَقَبْلَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ

**١٨٣٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ مِنَ الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَيُكَلِّمُ الرَّجُلَ وَيُكَلِّمُهُ، ثُمَّ يَنْتَهِي إِلَى مُصَلَّاهُ فَيُصَلِّي(١).

## باسی مۆڵەت دراوە نوێژخوێن و وتاربێژ دوای وتارەکە قسە بکەن، پێش دەستپێکردنی نوێژ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی کە لەسەر مینبەر دادەبەزی و (وتاری تەواو دەکرد) قسەی لەگەڵ کەسێکدا دەکرد ئەویش قسەی لەگەڵی دەکرد، پاشان دەچوو بۆ نوێژگەکەی و نوێژی دەکرد.

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ

**١٨٣٩-** عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَجْمَعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْئَ(٢).

## باسی کاتی نوێژی هەینی

واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینیمان دەکرد، کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان بترازبایە، پاشان دەگەڕاینەوە بەدوای سێبەردا دەگەڕاین خۆمان بدەینە پاڵی. (واتە: کاتێ نوێژی هەینیمان تەواو دەکرد سێبەر زۆر کەم بوو).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّبْكِيرِ بِالْجُمُعَةِ

**١٨٤٠-** عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﵁ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْجُمُعَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَبْتَدِرُ الْفَيْئَ، فَمَا يَكُونُ إِلَّا قَدْرَ قَدَمٍ أَوْ قَدَمَيْنِ(٣).

---

(١) هذا الحديث ظاهر إسناده الصحة، لكن حكم عليه بالشذوذ والوهم الإمام البخاري.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## باسی چاکتر وایە نوێژی هەینی زوو تەواو بکرێت

واتە: زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەڵێ: ئێمە نوێژی هەینیمان تەواو دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی سێبەر دەکەوتین، سێبەر نەبوو مەگەر بە ئەندازەی پێیەك یان دوو پێ.

**١٨٤١-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُبَكِّرُ - يَعْنِي - بِالْجُمُعَةِ، ثُمَّ نَقِيلُ[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئێمە نوێژی هەینیمان زوو تەواو دەکرد، پاشان دەخەوتین.

## بَابُ التَّبْرِيدِ بِصَلَاةِ الْجُمُعَةِ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ وَالتَّبْكِيرِ بِهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ التَّبْكِيرِ يَقَعُ عَلَى التَّعْجِيلِ بِالظُّهْرِ وَالْجُمُعَةِ بَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ؛ لِأَنَّ التَّبْكِيرِ لَا يَقَعُ إِلَّا عَلَى أَوَّلِ النَّهَارِ قَبْلَ زَوَالِ الشَّمْسِ»

**١٨٤٢-** عَنْ أَبِي خَلْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَس بْن مَالِكٍ ﷺ، وَنَادَاهُ يَزِيدُ الضَّبِّيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي زَمَنِ الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، قَدْ شَهِدْتَ الصَّلَاةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَشَهِدْتَ الصَّلَاةَ مَعَنَا، فَكَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اشْتَدَّ الْبَرْدُ بَكَّرَ بِالصَّلَاةِ، وَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ أَبْرَدَ بِالصَّلَاةِ[٢].

## باسی نوێژکردنی هەینی بەفێنکی لە کاتی گەرمای سەخت، وە زوو ئەنجامدانی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ناوی (التَّبْكِيرِ) بۆ پەلەکردن لە نوێژی نیوەڕۆی هەینی بەکار دێت دوای ترازانی خۆر، چونکە (التَّبْكِيرِ) تەنها بۆ سەرەتای ڕۆژ بەکار دەهێنرێ پێش ترازانی خۆر

واتە: ئەبو خەلدە دەڵێ: لە سەردەمی حەجاج گوێم لێ بوو یەزیدی زەبی لە ڕۆژی هەینی بانگی ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ کرد، وتی: ئەی باوکی حەمزە تۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژت کردووە و لەگەڵ ئێمەیش نوێژت کردووە، پێغەمبەری

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

خوا ﷺ چۆن نوێژی دەکرد؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سەرمای سەخت زوو نوێژەکەی دەکرد، کاتێکیش گەرما تینی بهێنایە نوێژەکەی دوا دەخست تا سێبەر دروست دەبوو.

(تێبینی: (الأبراد): بریتییە لەوەی نوێژی نیوەڕۆ دوا بخرێت بۆ نێو فێنکی، جا سنووری دواخستنەکە ئەوەیە سێبەری دیوار دەربکەوێت).

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ فِي كِتَابِ الْعِيدَيْنِ.

## باسی ژمارەی نوێژی هەینی، ئەبو بەکر دەڵێت: فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب: (صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ) واتە: نوێژی هەینی دوو ڕکاتە، لە کتێبی (الْعِيدَيْنِ) باسم کرد

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ

**١٨٤٣-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ كَاتِبِ عَلِيٍّ قَالَ: كَانَ مَرْوَانُ يَسْتَخْلِفُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَلَى الْمَدِينَةِ، فَصَلَّى بِهِمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَرَأَ بِـ الْجُمُعَةِ، ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، فَقُلْتُ: أَبَا هُرَيْرَةَ، لَقَدْ قَرَأْتَ بِنَا قِرَاءَةً قَرَأَهَا بِنَا عَلِيٌّ بِالْكُوفَةِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ حِبِّي أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقْرَأُ بِهِمَا[١].

## باسی قورئانخوێندن لە نوێژی هەینی

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی ئەبو ڕافیع نووسەری عەلی دەڵێ: مەڕوان ئەبو هورەیرەی ﷺ لە جێگای خۆی دادەنا لە مەدینە، ڕۆژێك نوێژی هەینی بۆ کردن سورەتی: (الْجُمُعَةِ) و ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾ ی خوێند، وتم: ئەی ئەبو هورەیرە بەڕاستی قورئانێکت بۆ خوێندین عەلی لە کوفە بۆی خوێندین، ئەبو هورەیرە وتی: گوێم لێ بوو خۆشەویستم باوکی قاسم ﷺ دەیخوێند.

---

(١) صحيح.

**١٨٤٤-** عَنْ جَعْفَرٍ فِي الثَّانية: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾ المنافقون[١].

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، لە ڕکاتی دووەم: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾ ی خوێند.

## بَابُ إِبَاحَةِ قِرَاءَةِ غَيْرَ سُورَةِ الْمُنَافِقِينَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيةِ مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ، وَإِنْ قَرَأَ فِي الْأُولَى بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ

**١٨٤٥-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَتَبَ الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ يَسْأَلُهُ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ مَعَ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ فَكَتَبَ إِلَيْهِ: أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ بـ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾[٢].

## باسی ڕێگە دراوە لە ڕۆژی هەینی لە ڕکاتی دووەم جگە لە سورەتی (المنافقون) بخوێنرێ، ئەگەرچی لە ڕکاتی یەکەمیش سورەتی (الْجُمُعَةِ)ی خوێند

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود دەڵێ: زەحاکی کوڕی قەیس نامەی نارد بۆ نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ پرسیاری لێ دەکرد: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی چ سورەتێکی دەخوێند لەگەڵ سورەتی: (الْجُمُعَةِ)؟ ئەویش نووسراوی بۆ نووسی: بێگومان پێغەمبەر ﷺ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ ی دەخوێند.

**١٨٤٦-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عن الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ الفِهري عن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: سَأَلْنَاهُ مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مَعَ السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا الْجُمُعَةُ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ مَعَهَا ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾[٣].

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای دەگێڕێتەوە، زەحاکی کوڕی قەیسی فیهری وتی: پرسیارمان لە نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاڕی ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی چ سورەتێکی دەخوێند لەگەڵ ئەو سورەتەی باسی (الْجُمُعَةِ) تێدا دەکرێ؟ وتی: لەگەڵیدا: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ ی دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ «وَهَذَا الِاخْتِلَافُ فِي الْقِرَاءَةِ مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ»

١٨٤٧- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾الغاشية[1].

**باسی ڕێگەدان بە خوێندنی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ لە نوێژی هەینی، وە ئەم جیاوازییە لە قورئانخوێندن لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراون**

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی سورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ ی دەخوێند.

## بَابُ الْمُدْرِكِ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ مَعَ الْإِمَامِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُدْرِكَ مِنْهَا رَكْعَةً يَكُونُ مُدْرِكًا لِلْجُمُعَةِ، يَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يُضِيفَ إِلَيْهَا أُخْرَى، لَا كَمَا قَالَ بَعْضُ مَنْ زَعَمَ: أَنَّ مَنْ فَاتَتْهُ الْخُطْبَةُ فَعَلَيْهِ أَنْ يُصَلِّيَ ظُهْرًا أَرْبَعًا، مَعَ الدَّلِيلِ أَنَّ مَنْ لَمْ يُدْرِكْ مِنْهَا رَكْعَةً فَعَلَيْهِ أَنْ يُصَلِّيَ ظُهْرًا أَرْبَعًا، نَقْضُ مَا قَالَ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ أَنَّ مَنْ أَدْرَكَ التَّشَهُّدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَجْزَأَتْهُ رَكْعَتَانِ.

١٨٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلَاةٍ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَهَا»[2].

**باسی ئەو کەسەی دەگاتە ڕکاتێك لە نوێژی هەینی لەگەڵ ئیمام، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەر کەس بگاتە ڕکاتێك لە نوێژ ئەوە گەیشتووە بە نوێژی هەینی، پێویستە لەسەری ڕکاتەکەی دیکە بداتە پاڵی، نەك وەکو ئەوەی هەندێ وا گومان دەبات: هەر کەس وتاری هەینی لەدەست چوو پێویستە لەسەری چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ بکات، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەس نەگات بە یەك ڕکات لەگەڵیدا ئەوە پێویستە لەسەری چوار**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**ڕكات نوێژی نیوەڕۆ بكات، وتەی هەندێ لە عێراقییەكان هەڵدەوەشێنێتەوە كە پێی وایە: هەر كەس لە ڕۆژی هەینی بگات بە تەحیاتدا ئەوە دوو ڕكاتەكە بەسە بۆی ئەنجامی بدات**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەركەس بگات بە ڕكاتێك لە نوێژ (لەگەڵ ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە نوێژەكەدا.

**١٨٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»، قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَنَرَى أَنَّ صَلَاةَ الْجُمُعَةِ مِنْ ذَلِكَ، فَإِذَا أَدْرَكَ مِنْهَا رَكْعَةً فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس بگات بە ڕكاتێك لە نوێژ (لەگەڵ ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە نوێژەكەدا. زوهری دەڵێ: وا دەبینین نوێژی هەینی لەو چوارچێوەدایە، ئەگەر گەیشت بە یەك ڕكاتیدا با ڕكاتەكەی دیكەش بداتە پاڵی.

**١٨٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا خَبَرٌ رُوِيَ عَلَى الْمَعْنَى، لَمْ يُؤَدَّ عَلَى لَفْظِ الْخَبَرِ، وَلَفْظُ الْخَبَرِ: مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَالْجُمُعَةُ مِنَ الصَّلَاةِ أَيْضًا، كَمَا قَالَهُ الزُّهْرِيُّ، فَإِذَا رُوِيَ الْخَبَرُ عَلَى الْمَعْنَى لَا عَلَى اللَّفْظِ جَازَ أَنْ يُقَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً، إِذِ الْجُمُعَةُ مِنَ الصَّلَاةِ، فَإِذَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ، كَانَتِ الصَّلَوَاتُ كُلُّهَا دَاخِلَةً فِي هَذَا الْخَبَرِ، الْجُمُعَةُ وَغَيْرُهَا مِنَ الصَّلَوَاتِ».

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس بگات بە ڕكاتێك لە نوێژی هەینی (لەگەڵ ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە نوێژەكەدا.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەكە بەمانا گێڕدراوەتەوە، دەستەواژەی دەقی فەرموودەكەی نەهێناوە، دەستەواژەی دەقی فەرموودەكە بەم شێوەیە: (مَنْ أَدْرَكَ مِنَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون ذكر لفظة (الجمعة).

الصَّلَاةِ رَكْعَةً)، واتە: هەر كەس بگاتە یەك ڕكاتی نوێژ. جا نوێژی هەینیش بەهەمان شێوە یەكێكە لە نوێژەكان، وەك زوهری وتی، جا ئەگەر فەرموودەكە لەسەر مانا گێڕدرایەوە نەك لەسەر دەستەواژە و دەق دروستە بوترێ: (مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً)، واتە: هەر كەس بگات بە ڕكاتێك لە نوێژی هەینی. چونكە نوێژی هەینی یەكێكە لە نوێژەكان، جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ)، واتە: هەركەس بگات بە ڕكاتێك نوێژ (لەگەڵ ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە نوێژەكەدا. ئەوە هەموو نوێژەكان لەنێو ئەم فەرموودەدا جێیان دەبێتەوە، هەینی و جگە لە هەینیش لە نوێژەكان.

١٨٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس بگات بە ڕكاتێك لە نوێژی هەینی (لەگەڵ ئیمام) با ڕكاتەكەی دیكەش بداتە پاڵی.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى تَجْوِيزِ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِأَقَلَّ مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلًا، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْجُمُعَةَ لَا تَجْزِئُ بِأَقَلَّ مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلًا خَبَرًا بَالِغًا»

١٨٥٢- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِمًا، إِذَا قَدِمَتْ عِيرُ الْمَدِينَةِ، فَابْتَدَرَهَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، مِنْهُمْ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَنَزَلَتِ الْآيَةُ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾﴾ الجمعة[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژی هەینی دروستە و هیچ كێشەیەكی تێدا نییە بە كەمتر لە چل پیاو، دژی وتەی ئەو كەسەی وا گومان دەبات هەینی دانامەزرێ بە كەمتر لە چل پیاوی باڵغ

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وتاری دەدا، كاروانییەك لە شامەوە هات، هاوەڵەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریان بەجێ هێشت و چوون بەدەمیەوە،

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

كەسیان نەمانەوە جگە لە دوازدە پیاو نەبێت، ئەبو بەكر و عومەر یەكێك لەوانە بوون مابوونەوە، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی كە لە سورەتی (الْجُمُعَة) هاتووە: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئەوان كاتێك بازرگانییەك یاخود كارێكی دونیایی ببینن ئەوە هەموویان بەرەوپیری دەڕۆن وە تۆ بەتەنها بەپێوە بەجێ دەهێڵن.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي التَّخَلُّفِ عَنْ شُهُودِ الْجُمُعَةِ

**١٨٥٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِقَوْمٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ: «لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلًا يُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ»(١).

## باسی هەڕەشەكردن لە دواكەوتن و نەچوون بۆ نوێژی هەینی

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە خەڵكانێكی فەرموو كە لە نوێژی هەینی دوا دەكەون (واتە: ناچن) بۆ نوێژی هەینی: هات بە خەیاڵمدا فەرمان بكەم بە پیاوێك نوێژ بۆ خەڵكەكە بكات، پاشان بچم بۆلای خەڵكانێك كە دوا كەوتوون و ئامادەی نوێژی هەینی نابن ماڵەكەیان بەسەردا بسوتێنم.

**١٨٥٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَقَدْ هَمَمْتُ بِمِثْلِهِ»(٢).

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هات بە خەیاڵمدا، هەر وەكوو فەرموودەكەی پێشوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَتْمِ عَلَى قُلُوبِ التَّارِكِينَ لِلْجُمُعَاتِ، وَكَوْنِهِمْ مِنَ الْغَافِلِينَ بِالتَّخَلُّفِ عَنِ الْجُمُعَةِ

**١٨٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵄ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ تَرْكِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيُخْتَمَنَّ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی مۆردان بەسەر دڵی ئەوانەی وازیان لە نوێژی هەینییەکان هێناوە، وە دەبنە یەکێك لەوانەی بێئاگا و غافڵن بە دوا کەوتن و نەچوون بۆ نوێژی هەینی

واتە: ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یان ئەوەتا خەڵکانێك واز دەهێنن لە وازهێنانیان لە چوونە جومعە، یان خوا ﷻ مۆر دەدات بەسەر دڵەکانیان، دواتر لە بێئاگا و غافڵان دەبن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوَعِيدَ لِتَارِكِ الْجُمُعَةِ هُوَ لِتَارِكِهَا مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ

**١٨٥٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثًا مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەڕەشەکردن لەوکەسەی واز لەهەینی دەهێنێ، بۆ ئەو کەسەیە بەبێ عوزر و بیانوو وازی لێهێناوە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ (هەفتە) واز لە نوێژی هەینی بهێنێ بەبێ هیچ بیانوو و پاساوێك خوا مۆر دەدات بەسەر دڵیدا.

**١٨٥٧-** عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثًا مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ»، قَالَ فِي خَبَرِ ابْنِ إِدْرِيسَ: طُبِعَ عَلَى قَلْبِهِ، وَفِي خَبَرِ وَكِيعٍ: فَهُوَ مُنَافِقٌ[٢].

واتە: ئەبو جەعدی زەمری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ (هەفتە) واز لە نوێژی هەینی بهێنێ بەبێ هیچ بیانوو و پاساوێك، لە فەرموودەکەی ئیبنو ئیدریس فەرموویەتی: خوا ﷻ مۆر دەدات بەسەر دڵیدا. وە لە فەرموودەکەی وەکیع: ئەوە دووڕووە.

---

(١) المتن صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الطَّبْعَ عَلَى الْقَلْبِ بِتَرْكِ الْجُمُعَاتِ الثَّلَاثِ إِنَّمَا يَكُونُ إِذَا تَرَكَهَا تَهَاوُنًا بِهَا

**١٨٥٨-** عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَهَاوُنًا بِهَا، طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مۆردان لەسەر دڵی ئەو کەسەی سێ جار نەچێت بۆ نوێژی هەینی بەهۆی کەمتەرخەمی و تەمبەڵی و کەم تەماشاکردنییەوە

واتە: ئەبو جەعدی زەمری ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ جار واز لە نوێژی هەینی بهێنێ بەهۆی کەمتەرخەمی و تەمبەڵی و کەم تەماشاکردنییەوە، خوا ﷻ مۆر دەدات بەسەر دڵیدا.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْغَيْبَةِ عَنِ الْمُدُنِ لِمَنَافِعِ الدُّنْيَا إِذَا آلَتِ الْغَيْبَةُ إِلَى تَرْكِ شُهُودِ الْجُمُعَاتِ

**١٨٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلَا هَلْ عَسَى أَحَدُكُمْ أَنْ يَتَّخِذَ الصُّبَّةَ مِنَ الْغَنَمِ عَلَى رَأْسِ مِيلٍ أَوْ مِيلَيْنِ، فَتَعَذَّرَ عَلَيْهِ الْكَلَأُ عَلَى رَأْسِ مِيلٍ أَوْ مِيلَيْنِ، فَيَرْتَفِعَ حَتَّى تَجِيءَ الْجُمُعَةُ، فَلَا يَشْهَدُهَا، وَتَجِيءُ الْجُمُعَةُ فَلَا يَشْهَدُهَا، وَتَجِيءُ الْجُمُعَةُ فَلَا يَشْهَدُهَا حَتَّى يُطْبَعَ عَلَى قَلْبِهِ»[٢].

## باسی هەڕەشەکردن لە دوورکەوتنەوە لە شارەکان بۆ کاروبار و قازانجی دنیایی، ئەگەر ئەو دوورکەوتنەوە بوو بە مایەی وازهێنان لە ئامادەبوونی هەینییەکان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕەنگە یەکێك لە ئێوە کۆمەڵە مەڕێك بدات بەو شاخ و کێوەدا میلێك یان دوو میل دوور بکەوێتەوە (تا چاو

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

بڕ بكات) لەوەڕی دەست نەكەوێت بۆ مەڕ و ماڵاتەكانی، ئینجا دوورتر بكەوێتەوە كاتێ هەینی دێتە پێشەوە ئامادەی نەبێت، وە هەینییەكی دیكەش بێت ئامادەی نەبێت، وە هەینییەكی دیكەش بێت ئامادەی نەبێت، تا مۆر دەدرێت بەسەر دڵیدا.

## بَابُ ذِكْرِ شُهُودِ مَنْ كَانَ خَارِجَ الْمُدُنِ الْجُمُعَةَ مَعَ الْإِمَامِ إِذَا جَمَعَ فِي الْمُدُنِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ سُوءِ حِفْظِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ الْعُمَرِيِّ رَحِمَهُ اللَّهُ

١٨٦٠- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَر عَنْ نَافِعَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ أَهْلَ قُبَاءَ كَانُوا يَجْمَعُونَ الْجُمُعَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: وَكَانَتِ الْأَنْصَارُ يَشْهَدُونَ الْجُمُعَةَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُونَ فَيَقِيلُونَ عِنْدَهُ مِنَ الْحَرِّ وَلِتَهْجِيرِ الصَّلَاةِ، وَكَانَ النَّاسُ يَفْعَلُونَ ذَلِكَ[1].

## باسی ئامادەبوونی ئەوانەی لە دەرەوەی شارەكانن بۆ نوێژی هەینی لەگەڵ ئیمام، ئەگەر لە شارەكان نوێژی هەینی كرا، ئەگەر فەرموودەكە تەواو بێت، چونكە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی خراپی لەبەركردنی عەبدوڵای كوڕی عومەری عومەری ڕەحمەتی خوای لێ بێت

واتە: عەبدوڵای كوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە ، خەڵكی قوباء لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینییان دەكرد. عەبدوڵای كوڕی عومەر وتی: ئەنصارەكانیش ئامادەی هەینی دەبوون لەگەڵ عومەری كوڕی خەتاب، پاشان تەواو دەبوون، قەیلولەیان لەلای دەكرد لەبەر گەرما و ئەنجامدانی نوێژ (ی عەسر) لە كاتی خۆیدا، وە خەڵكەكەش بەوشێوەیان دەكرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِصَدَقَةِ دِينَارٍ إِنْ وَجَدَهُ، أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ إِنْ أَعْوَزَهُ دِينَارٌ لِتَرْكِ جُمُعَةٍ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ قَتَادَةَ، عَنْ قُدَامَةَ بْنِ وَبَرَةَ، وَلَسْتُ أَعْرِفُ قُدَامَةَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

١٨٦١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَنِصْفَ دِينَارٍ»[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

**باسی فەرمانکردن بەو کەسەی نوێژی هەینی نەکردووە لەگەڵ ئیمام بەبێ پاساو و بیانوو، دینارێك ببەخشێ ئەگەر هەیبوو، یان نیو دینار ئەگەر دینارێکی نەبوو، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من زانیاریم نییە لەسەر ئەوەی قەتادە لە قودامەی کوڕی وەبرەوە بیستوویەتی یان نا، وە نازانم قودامە دادپەروەرە یان لەکەدارە**

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نوێژی هەینییەکی نەکرد بەبێ پاساو و بیانوو، با دینارێك ببەخشێ، ئەگەر دەستی نەکەوت با نیو دینار ببەخشێ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّخَلُّفِ عَنِ الْجُمُعَةِ فِي الْأَمْطَارِ إِذَا كَانَ الْمَطَرُ وَابِلًا كَبِيرًا

**١٨٦٢-** عَنِ ابْنِ أَبِي عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ قَالَ: مَرَرْتُ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهُوَ عَلَى نَهَرِ أُمِّ عَبْدِ اللَّهِ وَهُوَ يُسِيلُ الْمَاءَ عَلَى غِلْمَانِهِ وَمَوَالِيهِ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ ﷺ الْجُمُعَةَ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ الْمَطَرُ وَابِلًا فَصَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[١].

**باسی مۆڵەتدان بە ئامادەنەبوون لە نوێژی هەینی لە کاتی بارانبارین، ئەگەر بارانەکە چڕ و بەلێزمە بوو**

واتە: ئیبنو ئەبو عەمار مەولای نەوەکانی هاشم دەڵێ: تێپەڕیم بەلای عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ لە ڕۆژی هەینی، لەسەر ڕووباری دایکی عەبدوڵا بوو، لەگەڵ کۆیلە و خزمەتکارەکانی ئاوی لافاوی لادەدا، پێم وت: ئەی باوکی سەعید ﷺ نوێژی هەینی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر باران بەلێزمە بوو لە جێگا و ماڵەکانی خۆتان نوێژ بکەن.

---

(١) إسناده حسن.

**بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّخَلُّفِ عَنِ الْجُمُعَةِ فِي الْمَطَرِ وَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْمَطَرُ مُؤْذِيًا، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِنَا فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ، وَفِي الْكُتُبِ الْمُصَنَّفَةِ مِنَ الْمُسْنَدِ، أَنَّ اللَّهَ جَلَّ وَعَلَا، وَرَسُولَهُ الْمُصْطَفَى قَدْ يُبِيحَانِ الشَّيْءَ لِعِلَّةٍ مِنْ غَيْرِ حَظْرِ ذَلِكَ الشَّيْءَ، وَإِنْ كَانَتْ تِلْكَ الْعِلَّةُ مَعْدُومَةً، مِنْ ذَلِكَ قَوْلُهُ ﷻ فِي الْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا إِذَا نَكَحَتْ زَوْجًا غَيْرَ الْأَوَّلِ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ﴾ البقرة: ٢٣٠، فَأَبَاحَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا الْمُطَلَّقَةَ ثَلَاثًا بَعْدَ طَلَاقِ الثَّانِي، وَهِيَ قَدْ تَحِلُّ لَهُ بِمَوْتِ الثَّانِي، وَإِنْ لَمْ يُطَلِّقْهَا، وَقَدْ تَحِلُّ لَهُ إِذَا انْفَسَخَ النِّكَاحُ بَيْنَهُمَا إِمَّا بِلِعَانٍ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الزَّوْجِ الثَّانِي، أَوْ بِارْتِدَادِ أَحَدِهِمَا، ثُمَّ تَنْقَضِي عِدَّتُهَا قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ الْمُرْتَدُّ مِنْهَا إِلَى الْإِسْلَامِ، وَغَيْرُ ذَلِكَ مِمَّا يَفْسَخُ النِّكَاحَ بَيْنَ الزَّوْجَيْنِ، وَمَنْ هَذَا الْجِنْسِ قَوْلُهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَوٰةِ﴾ النساء: ١٠١، وَالْقَصْرُ أَيْضًا مُبَاحٌ، وَإِنْ لَمْ يَخَافُوا مِنْ فِتْنَةِ الْكُفَّارِ.**

**١٨٦٣-** عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ مُحَمَّدٍ ﵁، أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَأَصَابَهُمْ مَطَرٌ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ لَمْ يَبْتَلَّ أَسْفَلُ نِعَالِهِمْ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُصَلُّوا فِي رِحَالِهِمْ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ يَقُلْ أَحَدٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غَيْرَ سُفْيَانَ بْنِ حَبِيبٍ.

**باسی مۆڵەتدان بە دواکەوتن و نەچوون بۆ نوێژی هەینی لە کاتی باران ئەگەرچی بارانەکە زیانبەخشیش نەبوو، ئەمەش لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاندووە لە چەند شوێنێکی کتێبەکەماندا لە کتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ)، وە لەو کتێبانەیش کە لە موسنەدەکەدا نووسراوە، خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ هەندێ جار ڕێگە بە شتێك دەدەن لەبەر هۆکارێك بەبێ ئەوەی ئەو شتە قەدەغە بێت، ئەگەرچی ئەو هۆکارەکەش بوونی نەبێت، نموونەی ئەوەش فەرمایشتی خوایە دەربارەی ئەو ئافرەتەی سێ بەسێ تەڵاق دراوە ئەگەر شووی کرد بە پیاوێك جگە لە یەکەم پیاو: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ﴾ البقرة: ٢٣٠، واتە: ئینجا ئەگەر (مێردی دووەم) تەڵاقی دا ئیدی گوناه نییە لەسەر ژن و مێردە (کۆنە)کە بگەڕێنەوە بۆ لای یەکدی خوا ﷻ ڕێگەی داوە**

---

(١) صحيح.

بە ئەو ئافرەتەی سێ بەسێ تەڵاق دراوە دوای ئەوەی پیاوی دووەمی تەڵاقی دەدا بگەڕێتەوە بۆ لای پیاوی یەکەم، ئەو ئافرەتە حەڵاڵ دەبێ بۆ مێردی یەکەم بە مردنی مێردی دووەم، ئەگەرچی تەڵاقیشی نەدابێت، هەندێ جار حەڵاڵ دەبێت بۆی ئەگەر نیکاحەکە بەتاڵ بۆیەوە لە نێوانیان، یان بە (لِعَّان) لە نێوان ژنەکە و مێردی دووەمی، یان بە هەڵگەڕانەوەی یەکێکیان لە دین، پاشان عیدەکەی تەواو بێت پێش ئەوەی مێردە هەڵگەڕاوەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، وە جگە لەوەیش لەوەی نیکاح هەڵدەوەشێنێتەوە لە نێوان ژن و پیاو، هەروەها لەم شێوازەیش خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ النساء: ١٠١، واتە: ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە کە هەندێ لە نوێژەکان کورت بکەنەوە. هەروەها کورتکردنەوەی نوێژیش ڕێگەپێدراوە، ئەگەرچی نەترسان لەوانەی بێباوەڕان جەنگیان لەگەڵ بکەن

واتە: ئەبو مەلیح دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە موحەممەد ﷺ ئەو ئامادەی سەردەمی حودەیبیە بوو، لە ڕۆژی هەینی تووشی بارانێك بوون، ژێر نەعلەکانیان تەڕ نەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن لە بارگە و جێگاکانی خۆیان نوێژ بکەن.

ئەبو بەکر دەڵێ: هیچ کام لە گێڕەرەوەکان نەیوتووە: ڕۆژی هەینی. جگە لە سوفیانی کوڕی حەبیب.

## بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ الْمُؤَذِّنَ فِي أَذَانِ الْجُمُعَةِ بِالنِّدَاءِ، أَنَّ الصَّلَاةَ فِي الْبُيُوتِ لِيَعْلَمَ السَّامِعُ أَنَّ التَّخَلُّفَ عَنِ الْجُمُعَةِ فِي الْمَطَرِ طَلْقٌ مُبَاحٌ

١٨٦٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ أَنْ يُؤَذِّنَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَذَلِكَ يَوْمٌ مَطِيرٌ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: نَادِ النَّاسَ فَلْيُصَلُّوا فِي بُيُوتِهِمْ، فَقَالَ لَهُ النَّاسُ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتَ؟ قَالَ: قَدْ فَعَلَ هَذَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، أَفَتَأْمُرُونِي أَنْ أُخْرِجَ النَّاسَ أَوْ أَنْ يَأْتُوا يَدُوسُونَ الطِّينَ إِلَى رُكَبِهِمْ؟[1].

---

(١) صحيح.

## باسی فەرمانکردنی ئیمام بە بانگدەر لە بانگی هەینی بڵێ: نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن، بۆ ئەوەی بیسەر گوێی لێ بێت دواکەوتن لە نوێژی هەینی لە بارانبارین ڕەها و ڕێگەپێدراوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی حاریس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەباس ﷺ لە ڕۆژێکی باراناوی فەرمانی بە بانگدەر کرد بانگ بدات، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، پاشان پێی وت: بانگی خەڵك بکە با لە ماڵەکانی خۆیان نوێژ بکەن، پاشان پێی وت: خەڵکەکە پێیان وت: ئەوە چییە دەیکەی؟ وتی: کەسێك ئەوەی کردووە لە من چاکترە، ئایا فەرمانم پێ دەکەن خەڵك دەربکەن یان بێن بۆ مزگەوت تا چۆکیان قوڕاوی بێت؟

## بَابُ أَمْرِ الْإِمَامِ الْمُؤَذِّنَ بِحَذْفِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، وَالْأَمْرِ بِالصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ بَدَلَهُ

**١٨٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَلَا تَقُلْ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، قُلْ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ، فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا ذَلِكَ، فَقَالَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ ذَا؟ فَقَدْ فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، إِنَّ الْجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُخْرِجَكُمْ فَتَمْشُوا فِي الطِّينِ وَالدَّحَضِ[١].

## باسی فەرمانکردنی ئیمام بە بانگدەر (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ) نەڵێ، وە فەرمانی پێ بکات لە جێگای ئەو بڵێ: نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن

واتە: عەبدوڵای کوڕی حاریس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەباس ﷺ لە ڕۆژێکی باراناوی بە بانگدەرەکەی وت: ئەگەر وتت: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، مەڵێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ)، بڵێ: نوێژەکانتان لە ماڵەکانتان بکەن، خەڵکەکە نکووڵی ئەوەیان کرد، وتی: ئایا سەرتان لەمە سوڕ دەمێنێ؟ بێگومان کەسێك ئەوەی کرد لە من چاکتر بوو، بێگومان هاتن بۆ هەینی عەزیمەیە و جەختی لەسەر کراوەتەوە (مەبەستی ئەوەیە ئەگەر بانگدەر بڵێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ) ئەوە ئەو کەسەی گوێی لێ دەبێت بەو بارانە

---

(١) صحيح.

دەچێت بۆ نوێژ و قورس و گران دەبێت بەسەریەوە بۆیە فەرمانی پێ کرد بڵێ: نوێژ لەماڵەکانتان بکەن، تا بزانن باران لەو بیانوو و پاساوانەیە کە عەزیمەتی پێ دەبێتە مۆڵەت)، من پێم باش نەبوو لە ماڵ دەرتان بکەم بەنێو قوڕ و قوڕاودا بێن بۆ مزگەوت.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالنِّدَاءِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِالصَّلَاةِ فِي الرِّحَالِ، الَّذِي خَبَّرَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّهُ فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، النَّبِيُّ ﷺ، إِنْ كَانَ عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ حَفِظَ هَذَا الْخَبَرَ الَّذِي أَذْكُرُهُ.

**١٨٦٦-** عَنِ عَبَّاد وهو بن منصور عَن عَطاء عن ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ يَوْمَ جُمُعَةٍ: «أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە بانگدان لە ڕۆژی هەینی نوێژ لە بارگەکان بکرێت، وەك لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس هاتووە، بێگومان کەسێك ئەوەی کردووە لە من چاکترە، کە ئەویش پێغەمبەرە ﷺ، ئەگەر عەبادی کوڕی مەنصور ئەم فەرموودەی ڕەوان کردبێ کە باسی دەکەم**

واتە: عەبادی کوڕی مەنصور دەگێڕێتەوە، لە عەتاء لە ئیبنو عەباسەوە ﵄، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژێکی باراناوی کە ڕۆژی هەینی بوو فەرمووی: نوێژ لە بارگە و جێگاکانی خۆتان بکەن.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْفَصْلِ بَيْنَ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ، وَبَيْنَ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بَعْدَهَا بِكَلَامٍ، أَوْ خُرُوجٍ

**١٨٦٧-** عَنْ عُمَرَ بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: أَرْسَلَنِي نَافِعُ بْنُ جُبَيْرٍ إِلَى السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ أَسْأَلُهُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ مَعَ مُعَاوِيَةَ ﵁، فَلَمَّا سَلَّمْتُ قُمْتُ أُصَلِّي، فَأَرْسَلَ إِلَيَّ فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ لِي: إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ إِلَّا أَنْ تَخْرُجَ، أَوْ تَتَكَلَّمَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِذَلِكَ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بە جیاکردنەوەی نێوان نوێژی هەینی و نێوان نوێژی سوننەت لەدوای نوێژی هەینی بە قسەکردن یان دەرچوون

واتە: عومەری کوڕی عەتاء دەڵێ: نافیعی کوڕی جوبەیر ناردمی بۆ لای سائیبی کوڕی یەزید پرسیاری لێ بکەم، منیش پرسیارم لێ کرد، وتی: بەڵێ، لەگەڵ موعاویە ﷠ نوێژی هەینیم کرد لە ژوورێك لەنێو مزگەوت دروست کرابوو، کاتێ سەلامم دایەوە هەستام نوێژ بکەم، ناردی بە دوامدا منیش هاتم بۆ لای، پێمی وت: ئەگەر نوێژی هەینیت کرد یەکسەر بەدوایدا نوێژی سوننەت مەکە تا دەردەچیت لەو جێگایە یان قسە دەکەیت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە کردووە.

## بَابُ الِاكْتِفَاءِ مِنَ الْخُرُوجِ لِلْفَصْلِ بَيْنَ الْجُمُعَةِ، وَالتَّطَوُّعِ بَعْدَهَا بِالتَّقَدُّمِ أَمَامَ الْمُصَلَّى الَّذِي صَلَّى فِيهِ الْجُمُعَةَ

١٨٦٨- عَنْ عُمَرَ بْنِ عَطَاءِ بْنِ أَبِي الْخُوَارِ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ، أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ ﷠ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَهُ فِي الْمَقْصُورَةِ فَقُمْتُ لِأُصَلِّيَ مَكَانِي، فَقَالَ لِي: لَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ حَتَّى تَمْضِيَ أَمَامَ ذَلِكَ أَوْ تَتَكَلَّمَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِذَلِكَ[١].

## باسی ئەوەندە بەسە نوێژی هەینی و نوێژی سوننەت لە دوایەوە لە یەکدی جیا بکرێتەوە، بەچوونەپێشەوە لەو جێگایەی نوێژی هەینی تێدا کردووە

واتە: عومەری کوڕی عەتائی کوڕی ئەبو خوار دەگێڕێتەوە، نافیعی کوڕی جوبەیر ناردی بۆ لای سائیبی کوڕی یەزید پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەو شتەی کە موعاویە ﷠ لێی بینی، وتی: لەگەڵ موعاویە نوێژی هەینیم کرد لە ژوورێك لەنێو مزگەوت هەستام لە جێگای خۆم نوێژ بکەم، پێمی وت: ئەگەر نوێژی هەینیت کرد یەکسەر بەدوایدا نوێژی سوننەت مەکە تا دەچیتە پێشەوە یان قسە دەکەیت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە کردووە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَطَوُّعِ الْإِمَامِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ فِي مَنْزِلِهِ

**١٨٦٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى الْجُمُعَةَ دَخَلَ بَيْتَهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ[١].

**باسی چاکتر وایە پێشنوێژ نوێژی سوننەتی دوای هەینی لە ماڵەکەیدا بکات**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی هەینی بکردایە دەچۆیە ماڵەکەی خۆی دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد.

**١٨٧٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّهُ، رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی دوای نوێژی هەینی و دوای نوێژی ئێوارە دوو ڕکات نوێژەی لە ماڵەکەی خۆی کرد.

**١٨٧١-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ[٣].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژی هەینی دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ لِلْإِمَامِ فِي الْمَسْجِدِ قَبْلَ خُرُوجِهِ مِنْهُ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ مُوسَى بْنِ الْحَارِثِ فِي جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ

**١٨٧٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، فَرَأَى أَشْيَاءَ لَمْ يَكُنْ رَآهَا قَبْلَ ذَلِكَ مِنْ حَضْنِهِ عَلَى النَّخِيلِ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّكُمْ إِذَا جِئْتُمْ عِيدَكُمْ هَذَا مَكَثْتُمْ حَتَّى تَسْمَعُوا مِنْ قَوْلِي؟ قَالُوا: نَعَمْ بِآبَائِنَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأُمَّهَاتِنَا قَالَ: فَلَمَّا حَضَرُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ صَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْجُمُعَةَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ فِي الْمَسْجِدِ، وَلَمْ يُرَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ، كَانَ يَنْصَرِفُ إِلَى بَيْتِهِ قَبْلَ ذَلِكَ الْيَوْمِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) إسناده ضعيف.




**باسی ڕێگەدراوە بە پێشنوێژ دوای نوێژی هەینی نوێژی سوننەت لە مزگەوت بکات پێش دەرچوونی لێی، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من زانیاریم نییە لەسەر ئەوەی موسای کوڕی حاریس لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە بیستوویەتی یان نا**

واتە: موحەممەدی کوڕی موسای کوڕی حاریس دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی چوارشەممە هات بۆ نێو نەوەکانی عەمری کوڕی عەوف، شتانێکی بینی کە بۆ پاراستنی خورما بەکاردەهات پێشتر نەیبینیبوو، فەرمووی: خۆزگە ئێوە کاتێ دەهاتن بۆ نوێژی جەژنتان دەمانەوە تا گوێبیستی قسەکانم دەبوون؟ وتیان: بەڵێ، باوك و دایکمان بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: کاتێ ئامادەی هەینی بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینی بۆ کردن، پاشان لەدوای هەینی لەنێو مزگەوت دوو ڕکات نوێژی کرد، پێشتر نەبینرابوو لەدوای هەینی لە ڕۆژی هەینی دوو ڕکات نوێژ بکات لە مزگەوت، پێش ئەو ڕۆژە دەچوو بۆ ماڵەوەی (نوێژەکەی دەکرد).

## بَابُ أَمْرِ الْمَأْمُومِ بِأَنْ يَتَطَوَّعَ بَعْدَ الْجُمُعَةِ بِأَرْبَعِ رَكَعَاتٍ بِلَفْظٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى

**١٨٧٣** - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوا بَعْدَ الْجُمُعَةِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ»[١].

**باسی فەرمانکردن بە نوێژخوێن دوای هەینی چوار ڕکات نوێژ بکات، بە دەستەواژەیەکی کورتکراوە نەك درێژ و تێروتەسەل**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەدوای نوێژی هەینی چوار ڕکات (سوننەت) بکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى لِلَّفْظَةِ الْمُخْتَصِرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ الْمَرْءَ بِأَنْ يَتَطَوَّعَ بِأَرْبَعِ رَكَعَاتٍ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ بَعْدَهَا، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَا صَلَّى بَعْدَهَا فَتَطَوُّعٌ غَيْرُ فَرِيضَةٍ

**١٨٧٤** - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا»[١].

**باسی فەرموودەیەك درێژەپێدری دەستەواژە كورتكراوەكەیە كە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها فەرمانی بەوكەسە كردووە چوار ڕكات بكات ئەگەر ویستی بەدوایدا نوێژ بكات، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو نوێژەی دوای هەینی كردوویەتی سوننەتە نەك فەڕز**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لە ئێوە لەدوای هەینی نوێژ دەكات با چوار ڕكات بەدوایدا بكات.

## بَابُ الرُّجُوعِ إِلَى الْمَنَازِلِ بَعْدَ قَضَاءِ الْجُمُعَةِ لِلْغَدَاءِ، وَالْقَيْلُولَةِ

**١٨٧٥**- عَنْ سُهَيْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَجْمَعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَتَغَدَّى وَنَقِيلُ[٢].

**باسی گەڕانەوە بۆماڵەوە بۆ نانخواردن و خەوتن، دوای تەواوبوونی هەینی**

واتە: سوهەیلی كوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینیمان دەكرد پاشان دەگەڕاینەوە نانی نیوەڕۆمان دەخوارد و دەخەوتین.

**١٨٧٦**- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: مَا كُنَّا نَتَغَدَّى وَلَا نَقِيلُ إِلَّا بَعْدَ الْجُمُعَةِ[٣].

واتە: سەهەلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئێمە نانی نیوەڕۆمان نەدەخوارد و نەدەخەوتین دوای نوێژی هەینی نەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**١٨٧٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَجْمَعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَقِيلُ[(١)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینیمان دەکرد پاشان دەگەڕاینەوە دەخەوتین.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِانْتِشَارِ بَعْدَ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ وَالِابْتِغَاءِ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾الجمعة: ١٠، إِلَّا أَنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْخَبَرِ، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ سَعِيدَ بْنَ عَنْبَسَةَ الْقَطَّانَ هَذَا، وَلَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ بِشْرٍ الَّذِي رَوَى عَنْهُ سَعِيدٌ هَذَا بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ، غَيْرَ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَمَرَ فِي نَصِّ تَنْزِيلِهِ بَعْدَ قَضَاءِ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِالِانْتِشَارِ فِي الْأَرْضِ وَالِابْتِغَاءِ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ، وَهَذَا مِنْ أَمْرِ الْإِبَاحَةِ

**١٨٧٨-** عَنْ سَعِيد بن عَنبسة وهو القَطان قَالَ: حَدَّثنا عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ بُسْرٍ ﷺ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِذَا صَلَّى الْجُمُعَةَ خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ قَدْرًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيُصَلِّي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يُصَلِّيَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ لِأَيِّ شَيْءٍ تَصْنَعُ هَذَا؟ قَالَ: لِأَنِّي رَأَيْتُ سَيِّدَ الْمُسْلِمِينَ ﷺ هَكَذَا يَصْنَعُ، يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ وَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾الجمعة: ١٠، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ[(٢)].

## باسی چاکتر وایە دوای نوێژی هەینی بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا، وە داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە نەبێت لە دڵدا شتێك هەیە لە بەرامبەر ئەم فەرموودە، چونکە من نازانم سەعیدی کوڕی عەنبەسەی قەتان و عەبدوڵای کوڕی بوسر کە سەعید لێیەوە گێڕاویەتەوە، دادپەروەرە یان لەکەدارە، ئەوە نەبێت خوا ﷻ فەرمانی کردووە لە کتێبەکەیدا دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا، وە داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن، ئەم فەرمانیشە فەرمانی ڕێگەپێدانە

واتە: سەعیدی کوڕی عەنبەسەی قەتان دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی بوسر بۆی باس کردین وتی: عەبدوڵای کوڕی بوسرم بینی ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.




نوێژی هەینی بکردایە ئەندازەیەکی زۆر لە مزگەوت دەردەچوو، پاشان دەگەڕایەوە بۆ مزگەوت تا خوا ویستی لەسەر بووایە نوێژ بکات نوێژی دەکرد، پێم وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت بۆچی ئەوە دەکەی؟ وتی: من گەورەی موسوڵمانانم بینی بەو شێوەی دەکرد، واتە: پێغەمبەر ﷺ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: جا کاتێك نوێژی هەینی تەواو بوو ئیدی بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا وە داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن.



# كِتَابُ الصِّيَامِ

# پەرتووكی ڕۆژوو



**كِتَابُ الصِّيَامِ، الْمُخْتَصَرُ مِنَ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الشَّرْطِ الَّذِي ذَكَرْنَا بِنَقْلِ الْعَدْلِ عَنِ الْعَدْلِ مَوْصُولًا إِلَيْهِ ﷺ، مِنْ غَيْرِ قَطْعٍ فِي الْإِسْنَادِ، وَلَا جَرْحٍ فِي نَاقِلِي الْأَخْبَارِ إِلَّا مَا نَذْكُرُ أَنَّ فِيَ الْقَلْبِ مِنْ بَعْضِ الْأَخْبَارِ شَيْءٌ، إِمَّا لِشَكٍّ فِي سَمَاعِ رَاوٍ مِنْ فَوْقِهِ خَبَرًا أَوْ رَاوٍ لَا نَعْرِفُهُ بِعَدَالَةٍ، وَلَا جَرْحٍ فَنُبَيِّنَ أَنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ ذَلِكَ الْخَبَرِ، فَإِنَّا لَا نَسْتَحِلُّ التَّمْوِيهَ عَلَى طَلَبَةِ الْعِلْمِ بِذِكْرِ خَبَرٍ غَيْرِ صَحِيحٍ لَا نُبَيِّنَ عِلَّتَهُ فَيَغْتَرَّ بِهِ بَعْضُ مَنْ يَسْمَعُهُ، فَاللَّهُ الْمُوَفِّقُ لِلصَّوَابِ**

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ مِنَ الْإِيمَانِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ خَبَرَ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ وَعَبَّادِ بْنِ عَبَّادٍ الْمُهَلَّبِيِّ وَشُعْبَةَ بْنِ الْحَجَّاجِ جَمِيعًا عَنْ أَبِي جَمْرَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ**

**١٨٧٩**- عَنْ أَبِي جَمْرَةَ الضُّبَعِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّ لِي جَرَّةً انْتُبِذَ لِي فِيهَا، فَأَشْرَبُ مِنْهُ، فَإِذَا أَطَلْتُ الْجُلُوسَ مَعَ الْقَوْمِ خَشِيتُ أَنْ أُفْتَضَحَ مِنْ حَلَاوَتِهِ، فَقَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ مُضَرَ، وَإِنَّا لَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَحَدِّثْنَا عَمَلًا مِنَ الْأَمْرِ إِذَا أَخَذْنَا بِهِ دَخَلْنَا بِهِ الْجَنَّةَ، وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا، وَقَالَ: «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ؟» قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْمَغَانِمِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ النَّبِيذِ فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ»(١).

**پەرتوکی ڕۆژووگرتن، پوخت کراوە لە پوختکراوەی ئەو فەرموودانەی کە سەنەدەکەیان بە موتەصیلی هاتووە هەتا دەگاتە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەرجەی باسمان کرد، بەگواستنەوەی کەسی دادپەروەر، لە کەسی دادپەروەر، تا دەگاتە پێغەمبەر ﷺ بەبێ پچڕان لە سەنەدیدا و بەبێ لەکە لەوانەی فەرموودەکانیان گواستووەتەوە جگە لەوەی باسی دەکەین و دەڵێین: شتێك لە دڵدا هەیە بەرانبەر ئەو فەرموودانە، یان لەبەر ئەوەیە گومانمان هەیە لەبیستنی گێڕەرەوەکە لە سەرووی خۆیەوە، یان گێڕەرەوەیەکی تێدایە نایناسین دادپەروەرە یان لەکەدارە، جا ڕوونی**

---

(١) صحيح.




**دەکەینەوە بەوەی: لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەو فەرموودە، بێگومان ئێمە فریودان و شاردنەوەی ڕاستییەکان حەڵاڵ ناکەین لەسەر خوێندکاری زانستی شەرعی باسی فەرموودەیەکی ناتەواوی بۆ بکەین هۆکارەکەی ڕوون نەکەینەوە، دواتر هەندێ لەوەی بیستوویەتی پێی فریو بخوات، خوا یارمەتیدەرە بۆ ڕاستییەکان**

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە باوەڕەوەیە، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی حەمادی کوڕی زەید و عەبادی کوڕی عەبادی موهەلی و شوعبەی کوڕی حەجاج هەموویان لە ئەبو حەمزە لە ئیبنو عەباسەوە باس کرد لە کتێبی (الْإِيمَانِ)**

واتە: ئەبو جەمرەی زوبەعی دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﷺ وت: کوپەیەکم هەیە (داپیرەم) شلەمەنییەك یان خۆشاوێك دەگرێتەوە لەنێویدا، دەیخۆمەوە زۆر بەلەزەتە، ئەگەر زۆری لێ بخۆمەوە دەترسم لەنێو کۆڕ و مەجلیسدا تووشی نەنگی و ڕیسوایی ببم، وتی: وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخێر بێن ئەم وەفدە هەرگیز ڕیسوا و پەشیمان نەبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانی ئێمە و تۆدا هاوبەشدانەران لە هۆزی موضەر هەن، ئێمە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت مەگەر لە مانگەکانی حەرامدا نەبێت، شتێکمان پێ بڵێ ئەگەر دەستی پێوە بگرین بچینە بەهەشتەوە، وە بانگەوازی دوای خۆمانیشی پێ بکەین، فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت و ڕێگریتان لێ دەکەم لە چوار شت: فەرمانتان پێ دەکەم بە بڕواهێنان بە خوا، ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خوا چییە؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان، وە پێنجیەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن (بە من)، وە ڕێگریتان لێ دەکەم لە گرتنەوەی شلەمەنی لەنێو کولەکە (النَّقِيرِ) و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو (الْحَنْتَمِ) و گۆزە (الْمُزَفَّتِ) و قاپی بۆیەکرا و بە زفت (چەند قاپێك بووە لەنێو عەرەبدا بەکار هاتووە، لە دار دروست کرابوو، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکار و یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببێتە سەرخۆشکەر).

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ مِنَ الْإِسْلَامِ إِذِ الْإِيمَانُ وَالْإِسْلَامُ اسْمَانِ لِمُسَمًّى وَاحِدٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ جِبْرِيلَ فِي مَسْأَلَتِهِ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْإِسْلَامِ قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ

**١٨٨٠**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە پایەکانی ئیسلامە، چونکە ئیسلام و ئیمان دوو ناون بۆ یەك نێوەڕۆك، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی جبریل کە پرسیاری کرد لەبارەی ئیسلامەوە، لە کتێبی (الإیمان) باسم کرد بەڵگەیە لەسەر ئەوە

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام بونیاد نراوە لەسەر پێنج شت: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتدان و حەجکردنی ماڵی خوا تعالى و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان.

**١٨٨١**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ فَضَائِلِ شَهْرِ رَمَضَانَ وَصِيَامِهِ

## بَابُ ذِكْرِ فَتْحِ أَبْوَابِ الْجِنَانِ -نَسْأَلُ اللَّهَ دُخُولَهَا- وَإِغْلَاقِ أَبْوَابِ النَّارِ، بَاعَدَنَا اللَّهُ مِنْهَا وَتَصْفِيدِ الشَّيَاطِينِ بِاللَّهِ نَتَعَوَّذُ مِنْ شَرِّهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ بِذِكْرِ لَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ فِي تَصْفِيدِ الشَّيَاطِينِ

**١٨٨٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ شَهْرُ رَمَضَانَ فُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## کۆباسی فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژووگرتنی

### باسی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت -لەخوا دەپاڕێینەوە بچینە نێویەوە- داخستنی دەرگاکانی دۆزەخ، خوا بەدوورمان بگرێت لێی، هەروەها کۆت و زنجیرکردنی شەیتانەکان، -پەنا دەگرین بە خوا لە شەڕ و خراپەیان- لە مانگی ڕەمەزان، بەباسکردنی دەستەواژەیەکی (عَامّ) گشتی مەبەستی پێی (خاصّ) تایبەتە لە کۆت و زنجیرکردنی شەیتانەکان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە و کۆت دەکرێن.

### بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ، مَرَدَةُ الْجِنِّ مِنْهُمْ، لَا جَمِيعَ الشَّيَاطِينِ، إِذِ اسْمُ الشَّيَاطِينِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِهِمْ، وَذِكْرِ دُعَاءِ الْمَلَكِ فِي رَمَضَانَ إِلَى الْخَيْرَاتِ، وَالتَّقْصِيرِ عَنِ السَّيِّئَاتِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَبْوَابَ الْجِنَانِ إِذَا فُتِحَتْ لَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ، وَلَا يُفْتَحُ بَابٌ مِنْ أَبْوَابِ النِّيرَانِ إِذَا أُغْلِقَتْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ

**١٨٨٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ مَرَدَةُ الْجِنِّ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ، وَفُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجِنَانِ، فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ، وَنَادَى مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ، وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ»[1].

### باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ) ئەو جنۆکانەیە کە یاخین نەك هەموو شەیتانەکان، چونکە نێو شەیتانەکان بەسەر هەندێکیان دەکەوێت نەك هەموویان، هەروەها باسی بانگەوازی فریشتەکان لە ڕەمەزان بۆ کاری چاکە و دوورکەوتنەوە لە کاری خراپ، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەرگاکانی بەهەشت ئەگەر کرایەوە دەرگایەکیان داناخرێ، وە دەرگایەکیش لە دەرگاکانی دۆزەخ ناکرێتەوە ئەگەر داخرا لە مانگی ڕەمەزان

---

(١) إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان هات شەیتانە یاخیبووەکان دەبەسترێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن هیچ دەرگایەکیان ناکرێتەوە، دەرگاکانی بەهەشتیش دەکرێنەوە هیچ دەرگایەکیان ناگیرێ، بانگکەرێك بانگ دەکات: ئەی ئەو کەسەی بەدوای خێردا دەگەڕێیت ڕوو بکە لەو مانگە (و بەڕۆژوو بە)، وە ئەی ئەو کەسەی بەدوای شەڕدا دەگەڕێی دەست هەڵگرە، بەڕاستی خوا (هەموو شەوێکی ئەو مانگە) خەڵکانێك ڕزگار دەکات لە ئاگر.

## بَابٌ فِي فَضْلِ شَهْرِ رَمَضَانَ، وَأَنَّهُ خَيْرُ الشُّهُورِ لِلْمُسْلِمِينَ، وَذِكْرِ إِعْدَادِ الْمُؤْمِنِ الْقُوَّةَ مِنَ النَّفَقَةِ لِلْعِبَادَةِ قَبْلَ دُخُولِهِ

**١٨٨٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَظَلَّكُمْ شَهْرُكُمْ هَذَا بِمَحْلُوفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا مَرَّ بِالْمُسْلِمِينَ شَهْرٌ خَيْرٌ لَهُمْ مِنْهُ، وَلَا مَرَّ بِالْمُنَافِقِينَ شَهْرٌ شَرٌّ لَهُمْ مِنْهُ بِمَحْلُوفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَيَكْتُبُ أَجْرَهُ وَنَوَافِلَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهُ، وَيَكْتُبُ إِصْرَهُ وَشَقَاءَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهُ، وَذَلِكَ أَنَّ الْمُؤْمِنَ يُعِدُّ فِيهِ الْقُوَّةَ مِنَ النَّفَقَةِ لِلْعِبَادَةِ، وَيَعُدُّ فِيهِ الْمُنَافِقُ اتِّبَاعَ غَفَلَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وَاتِّبَاعَ عَوْرَاتِهِمْ، فَغُنْمٌ يَغْنَمُهُ الْمُؤْمِنُ، يَغْتَنِمُهُ الْفَاجِرُ»(١).

## باسی فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەمەزان، بێگومان ئەو مانگە لە چاکترین مانگەکانە بۆ مسوڵمانان، هەروەها باسی خۆئامادەکردنی باوەڕدار بۆ پەرستش پێش چوونە نێوەوەی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم مانگە نزیك بۆیەوە لێتان، سوێند بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ خواردووە، هیچ مانگێك تێنەپەڕیوە بەسەر موسوڵمانان چاکتر بێت لەم مانگە بۆیان، وە هیچ مانگێك تێنەپەڕیوە بەسەر دووڕووەکان خراپتر بێت لەم مانگە بۆیان، سوێند بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ خواردووە، (خوای گەورە) پاداشت و سونەتەکانی دەنووسی پێش ئەوەی بچێتە نێویەوە، وە گوناە و بەدبەختییەکانی دەنووسی پێش ئەوەی بچێتە

---

(١) إسناده ضعيف.

نێویەوە، بڕوادار لەو مانگەدا پێش ئەوەی بچێتە نێویەوە خۆی ئامادە دەکات بۆ پەرستشی زیاتر، دووڕووش هەر خەریکی شوێنکەوتنی عەیبوعاری موسوڵمانان دەبێت، جا ئەوە دەستکەوتێکە بڕوادار بەدەستی دێنێ، خراپەکاریش دەستکەوتی خۆی بەدەست دێنێ (کە خراپەیە).

## بَابُ ذِكْرِ تَفَضُّلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عِبَادَةِ الْمُؤْمِنِينَ فِي أَوَّلِ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ بِمَغْفِرَتِهِ إِيَّاهُمْ كَرَمًا وَجُودًا، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ خَلَفًا أَبَا الرَّبِيعِ هَذَا بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ، وَلَا عَمْرَو بْنَ حَمْزَةَ الْقَيْسِيَّ الَّذِي هُوَ دُونَهُ

**١٨٨٥-** عَنْ عمرو بن حمزة القيسي ثنا خلف أبو الربيع إمام مسجد بن أبي عروبة حدَّثنا أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَسْتَقْبِلُكُمْ وَتَسْتَقْبِلُونَ- ثَلَاثَ مَرَّاتٍ-» فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَحْيٌ نَزَلَ؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: عَدُوٌّ حَضَرَ؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَمَاذَا؟ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَغْفِرُ فِي أَوَّلِ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ لِكُلِّ أَهْلِ هَذِهِ الْقِبْلَةِ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَيْهَا، فَجَعَلَ رَجُلٌ يَهُزُّ رَأْسَهُ» وَيَقُولُ: بَخٍ بَخٍ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا فُلَانُ، ضَاقَ بِهِ صَدْرُكَ؟» قَالَ: لَا، وَلَكِنْ ذَكَرْتُ الْمُنَافِقَ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْكَافِرُونَ، وَلَيْسَ لِكَافِرٍ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ قال: إسناده ضعيف»[1].

## باسی خوای بەرز و مەزن بەچاکە و بەخشندەیی خۆی لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان لە بەندە بڕوادارەکانی خۆش دەبێت، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم خەلەفی ئەبو ڕەبیع دادپەروەرە یان لەکەدارە، هەروەها عەمری کوڕی حەمزەی قەیسیش کە لەخواری ئەوەوەیە

واتە: عەمری کوڕی حەمزەی قەیسی دەڵێ: خەلەف ئەبو ڕەبیع پێشنوێژی مزگەوتی ئیبنو ئەبو عروبە بۆی باس کردین، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار فەرمووی: بەرەوپیری دەچن و بەرەوپیریتان دێت، عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەحی و نیگایەك دابەزیوە؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: دوژمن ئامادە دەبێت؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی چییە؟ فەرمووی: بەڕاستی خوای بەرز و مەزن لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان لە هەموو ئەهلی قیبلە خۆش

---

(١) إسناده ضعيف.

دەبێت، بە دەستی ئاماژەی بۆی كرد، پیاوێكیش سەری دەجوڵاند و دەیوت: بەه، بەه، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی فڵان، دڵت پێ تەنگ بوو؟ وتی: نەخێر، بەڵام بیرم لە دووڕووەكان كردەوە، فەرمووی: دووڕووەكان بێباوەڕن، بێباوەڕیش هیچی لەوە بۆ نییە.

**١٨٨٦-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ ذَاتَ يَوْمٍ وَقَدْ أَهَلَّ رَمَضَانُ، فَقَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ الْعِبَادُ مَا رَمَضَانُ لَتَمَنَّتْ أُمَّتِي أَنْ يَكُونَ السَّنَةَ كُلَّهَا»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ خُزَاعَةَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، حَدِّثْنَا، فَقَالَ: «إِنَّ الْجَنَّةَ لَتَزَيَّنُ لِرَمَضَانَ مِنْ رَأْسِ الْحَوْلِ إِلَى الْحَوْلِ، فَإِذَا كَانَ أَوَّلُ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ هَبَّتْ رِيحٌ مِنْ تَحْتِ الْعَرْشِ، فَصَفَقَتْ وَرَقَ الْجَنَّةِ، فَتَنْظُرُ الْحُورُ الْعِينُ إِلَى ذَلِكَ»، فَيَقُلْنَ: يَا رَبِّ اجْعَلْ لَنَا مِنْ عِبَادِكَ فِي هَذَا الشَّهْرِ أَزْوَاجًا تُقِرُّ أَعْيُنَنَا بِهِمْ، وَتُقِرُّ أَعْيُنَهُمْ بِنَا قَالَ: فَمَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ إِلَّا زُوِّجَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِينِ فِي خَيْمَةٍ مِنْ دُرَّةٍ مِمَّا نَعَتَ اللَّهُ: ﴿حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾﴾ الرحمن، عَلَى كُلِّ امْرَأَةٍ سَبْعُونَ حُلَّةً، لَيْسَ مِنْهَا حُلَّةٌ عَلَى لَوْنِ الْأُخْرَى، تُعْطَى سَبْعُونَ لَوْنًا مِنَ الطِّيبِ، لَيْسَ مِنْهُ لَوْنٌ عَلَى رِيحِ الْآخَرِ، لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ سَبْعُونَ أَلْفَ وَصِيفَةٍ لِحَاجَتِهَا، وَسَبْعُونَ أَلْفَ وَصِيفٍ، مَعَ كُلِّ وَصِيفٍ صَحْفَةٌ مِنْ ذَهَبٍ، فِيهَا لَوْنُ طَعَامٍ، تَجِدُ لِآخِرِ لُقْمَةٍ مِنْهُ لَذَّةً، لَا تَجِدُ لِأَوَّلِهِ، لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ سَبْعُونَ سَرِيرًا مِنْ يَاقُوتَةٍ حَمْرَاءَ، عَلَى كُلِّ سَرِيرٍ سَبْعُونَ فِرَاشًا، بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ، فَوْقَ كُلِّ فِرَاشٍ سَبْعُونَ أَرِيكَةً، وَيُعْطَى زَوْجُهَا مِثْلَ ذَلِكَ عَلَى سَرِيرٍ مِنْ يَاقُوتٍ أَحْمَرَ، مُوَشَّحٍ بِالدُّرِّ، عَلَيْهِ سِوَارَانِ مِنْ ذَهَبٍ، هَذَا بِكُلِّ يَوْمٍ صَامَهُ مِنْ رَمَضَانَ سِوَى مَا عَمِلَ مِنَ الْحَسَنَاتِ[1].

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژێك كە مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان دەركەوتبوو، فەرمووی: ئەگەر بەندەكان بیانزانیایە چی لە ڕەمەزاندا هەیە ئەوە ئوممەتەكەم ئاواتیان دەخواست هەموو ساڵەكە ڕەمەزان بووایە، پیاوێك لە هۆزی خوزاعە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان باس بكە، فەرمووی: بەڕاستی بەهەشت لە سەرەتای ساڵ تا كۆتایی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ مانگی ڕەمەزان، جا كە یەكەم ڕۆژی ڕەمەزان دێت بایەك لەژێر عەرشەوە هەڵدەكات، هەموو گەڵاكانی بەهەشت دەدەن لەیەكدی چەپڵە لێ دەدەن، حۆرییە چاوگەشەكان تەماشای ئەو دیمەنە دەكەن، دەڵێن: خوایە لەم مانگەدا پیاوانێكمان لە بەندەكان بۆ دابنێ چاومان

---

(١) هذا حديث موضوع باطل مكذوب.

پێیان گەش ببێتەوە، چاوی ئەوانیش بە ئێمە گەش ببێتەوە، فەرمووی: هەر بەندەیەك یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە ڕەمەزان حەتمەن ئافرەتێکی لە حۆرییە چاوگەشەکان پێ دەدرێت لەنێو دەوارێکدایە لە گەوهەر و مرواری وەك چۆن خوا وەسفی کردووە: ﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: حۆرییانێك کە چاویان تەنها لەسەر مێردەکانیان و لەنێو دەوارن. هەر ئافرەتێك لەوانە حەفتا کراسی لەبەردایە ڕەنگی هیچ کامەیان لەوی دیکە ناچێت، حەفتا جۆر بۆن دەدا لە پاکی و جوانی، بۆنێکیان نییە لە بۆنی ئەوی دیکە بچێت، هەر ئافرەتێك لەوانە حەفتا هەزار کەنیزەك خزمەتی دەکەن، وە حەفتا هەزار خزمەتکاریش، هەر خزمەتکارێك دەفرێکی ئاڵتوونی لەلایە جۆرە خواردنێکی تێدایە، کۆتا پارووی لە یەکەم پاروو خۆشترە، هەر ئافرەتێك لەوانە حەفتا تەختی خەوی سووری هەیە، لەسەر هەر تەختێك حەفتا ڕاخەر هەیە، بەڕەکانیان لە ئاوریشمی ئەستوورە، لەسەر هەر ڕاخەرێك حەفتا پشتی هەیە، مێردەکەیشی بەهەمان شێوەی ئەوی پێ دەدرێت لەسەر تەختەخەوێك لە یاقووتی سوورە، نێوی پڕ کراوە لە گەوهەر و مرواری، دوو ملوانکەی ئاڵتوونیشی لە ملدایە، ئەمە بۆ هەر ڕۆژێك لە ڕەمەزان جگە لەو کردەوە چاکانەی کردوویەتی.

## بَابُ فَضَائِلِ شَهْرِ رَمَضَانَ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

**١٨٨٧-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ شَعْبَانَ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ أَظَلَّكُمْ شَهْرٌ عَظِيمٌ، شَهْرٌ مُبَارَكٌ، شَهْرٌ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، جَعَلَ اللَّهُ صِيَامَهُ فَرِيضَةً، وَقِيَامَ لَيْلِهِ تَطَوُّعًا، مَنْ تَقَرَّبَ فِيهِ بِخَصْلَةٍ مِنَ الْخَيْرِ، كَانَ كَمَنْ أَدَّى فَرِيضَةً فِيمَا سِوَاهُ، وَمَنْ أَدَّى فِيهِ فَرِيضَةً كَانَ كَمَنْ أَدَّى سَبْعِينَ فَرِيضَةً فِيمَا سِوَاهُ، وَهُوَ شَهْرُ الصَّبْرِ، وَالصَّبْرُ ثَوَابُهُ الْجَنَّةُ، وَشَهْرُ الْمُوَاسَاةِ، وَشَهْرٌ يَزْدَادُ فِيهِ رِزْقُ الْمُؤْمِنِ، مَنْ فَطَّرَ فِيهِ صَائِمًا كَانَ مَغْفِرَةً لِذُنُوبِهِ وَعِتْقَ رَقَبَتِهِ مِنَ النَّارِ، وَكَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْتَقِصَ مِنْ أَجْرِهِ شَيْءٌ»، قَالُوا: لَيْسَ كُلُّنَا نَجِدُ مَا يُفَطِّرُ الصَّائِمَ، فَقَالَ: يُعْطِي اللَّهُ هَذَا الثَّوَابَ مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا عَلَى تَمْرَةٍ، أَوْ شَرْبَةِ مَاءٍ، أَوْ مَذْقَةِ لَبَنٍ، وَهُوَ شَهْرٌ أَوَّلُهُ رَحْمَةٌ، وَأَوْسَطُهُ مَغْفِرَةٌ، وَآخِرُهُ عِتْقٌ مِنَ النَّارِ، مَنْ خَفَّفَ عَنْ مَمْلُوكِهِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ، وَأَعْتَقَهُ مِنَ النَّارِ، وَاسْتَكْثِرُوا فِيهِ مِنْ أَرْبَعِ خِصَالٍ: خَصْلَتَيْنِ تُرْضُونَ بِهِمَا رَبَّكُمْ، وَخَصْلَتَيْنِ لَا غِنَى بِكُمْ عَنْهُمَا، فَأَمَّا الْخَصْلَتَانِ اللَّتَانِ تُرْضُونَ بِهِمَا رَبَّكُمْ: فَشَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَتَسْتَغْفِرُونَهُ،

وَأَمَّا اللَّتَانِ لَا غِنًى بِكُمْ عَنْهمَا: فَتُسْأَلُونَ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَتَعُوذُونَ بِهِ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ أَشْبَعَ فِيهِ صَائِمًا سَقَاهُ اللَّهُ مِنْ حَوْضِي شَرْبَةً لَا يَظْمَأُ حَتَّى يَدْخُلَ الْجَنَّةَ»(١).

## باسی فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەمەزان ئەگەر فەرموودەکە تەواو بوو

واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتا ڕۆژی مانگی شەعبان وتارێکی بۆ داین، فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەوە مانگێکی مەزن و مانگێکی پیرۆزە هات، مانگێکە شەوێکی تێدایە (پەرستش تیایدا) چاکترە لە هەزار مانگ، خوا ڕۆژووگرتنی تیایدا فەرز کردووە شەونوێژیشی تیایدا کردووە بە سوننەت، هەر کەس بە ڕۆیشتنێکی چاك خۆی نزیك بکاتەوە وەکوو ئەوە وایە فەرزێکی لە غەیری ئەو مانگە بەجێ هێنابێت، هەر کەسیش فەرزێکی تێدا بەجێ بهێنێ وەکوو ئەوە وایە حەفتا فەرزی لە مانگەکانی دیکەدا بەجێ هێنابێت، ئەو مانگە مانگی خۆڕاگری و ئارامییە، ئارامگرتنیش پاداشتەکەی بەهەشتە، وە مانگی دڵدانەوەیە، مانگێکە ڕزق و ڕۆزی باوەڕدار تیایدا زیاد دەکات، هەر کەس بەربانگ بە ڕۆژووەوانێك بکاتەوە ئەوە دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی گوناهەکانی و ئازادکردنی گەردنی لە ئاگر، وە بەهەمان شێوەی ئەو ئەجر و پاداشتی بۆ هەیە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە پاداشتەکەی کەم بکاتەوە، وتیان: هەموومان ناتوانین نانی ڕۆژووەوان بدەین، فەرمووی: خوای گەورە ئەم پاداشتە دەبەخشێ بەوکەسەی خورمایەك یان قومە ئاوێك یان قومە شیرێك بدات بە ڕۆژووەوانێك بەربانگی پێ بکاتەوە، بەڕاستی مانگێکە سەرەتاکەی ڕەحمەت و میهرەبانییە، نێوەڕاستەکەی لێخۆشبوونە، کۆتاییەکەیشی ئازادکردنی گەردنە لە ئاگر، هەرکەس کارئاسانی بکات بۆ کۆیلەکەی (تا خۆی ئازاد بکات) خوا لێی خۆش دەبێت و ڕزگاری دەکات لە ئاگر، وە چوار ڕەوشتی تێدا زۆر ئەنجام بدەن: دوو ڕەوشتیان پەروەردگارتانی پێ ڕازی دەکەن، دوو ڕەوشتی دیکەشیان هەرگیز بێنیاز نابن لێی، جا ئەو دوو ڕەوشتەی پەروەردگاری خۆتانی پێ ڕازی دەکەن: شایەتیدانە بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە داوای لێخۆشبوونیشی لێ بکەن، بەڵام ئەو دووانەی هەرگیز بێنیاز نابن لێی: داوای بەهەشت لە خوا بکەن و

---

(١) إسناده ضعيف.

پەنا بگرن بە خوا لە ئاگر، وە هەر کەس لەو مانگەدا ڕۆژووەوانێك تێر بکات خوا لە حەوزی من ئاوی دەرخوارد دەدات دوای ئەوە هەرگیز تینووی نابێت تا دەچێتە بەهەشتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاجْتِهَادِ فِي الْعِبَادَةِ فِي رَمَضَانَ، لَعَلَّ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ بِرَأْفَتِهِ وَرَحْمَتِهِ، يَغْفِرُ لِلْمُجْتَهِدِ قَبْلَ أَنْ يَنْقَضِيَ الشَّهْرُ وَلَا يَرْغَمُ بِأَنْفِ الْعَبْدِ بِمُضِيِّ رَمَضَانَ قَبْلَ الْغُفْرَانِ

**١٨٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَقِيَ الْمِنْبَرَ فَقَالَ: «آمِينَ، آمِينَ، آمِينَ»، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا كُنْتَ تَصْنَعُ هَذَا فَقَالَ: «قَالَ لِي جِبْرِيلُ: أَرْغَمَ اللَّهُ أَنْفَ عَبْدٍ- أَوْ بَعُدَ- دَخَلَ رَمَضَانَ فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، فَقُلْتُ: آمِينَ، ثُمَّ قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ عَبْدٍ- أَوْ بَعُدَ- أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا لَمْ يُدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، ثُمَّ قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ عَبْدٍ- أَوْ بَعُدَ- ذُكِرْتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، فَقُلْتُ: آمِينَ»[1].

## باسی چاکتر وایە لە مانگی ڕەمەزان کۆشش بکرێت لە پەرستش، بەڵکوو پەروەردگار ﷻ بەسۆز و بەزەیی خۆی لەوکەسە ببوورێت کە کۆشش دەکات پێش ئەوەی مانگەکە تەواو بێت، بەندە لووتی بەخۆڵدا بچێت باشترە لەوەی ڕەمەزان تێپەڕێنێت بەبێ لێخۆشبوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆیە سەر مینبەر فەرمووی: (آمِينَ، آمِينَ، آمِينَ)، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی ئەوەت کرد، فەرمووی: جبریل پێمی وت: خوا لووتی ئەو بەندە بەخۆڵدا ببات -یان دوور بکەوێتەوە- چووبێتە نێو مانگی ڕەمەزان لێی نەبووردرێت، وتم: (آمِينَ)، پاشان وتی: لووتی ئەو بەندە بەخۆڵدا بچێت -یان دوور بکەوێتەوە- گەیشتبێت بە باوك و دایکی یان یەکێکیان کە بەهۆی ئەوانەوە نەچێتە بەهەشت (واتە: ئەوەند خزمەتیان نەکات کە شیاوی ئەوە بێت بچێتە بەهەشتەوە)، وتم: (آمِينَ)، پاشان وتی: لووتی ئەو بەندە بەخۆڵدا بچێت -یان دوور بکەوێتەوە- باسی تۆی لەلادا بکرێ صەڵاوات لەسەرت نەدات، وتم: (آمِينَ).

---

(١) إسناده حسن.




## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْجُودِ بِالْخَيْرِ وَالْعَطَايَا
## فِي شَهْرِ رَمَضَانَ إِلَى انْسِلَاخِهِ اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ

١٨٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَأْتِيهِ جِبْرِيلُ فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ[١].

### باسی چاکتر وایە بۆ بەندە لە مانگی ڕەمەزان بەخشندەتر بێت و ببەخشێت تا ڕەمەزان تەواو دەبێت، ئەمیش وەك پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترینی نێو خەڵکی بوو، لە ڕەمەزاندا زۆر زیاتر بەخشندەتر بوو تا (ڕەمەزان) تەواو دەبوو، جبریل (لە هەموو شەوێکی مانگی ڕەمەزان) دەهات بۆ لای، قورئانی بۆ دەخستە ڕوو (واتە: دەوری قورئانی پێ دەکردەوە)، جا کاتێ جبریل پێی دەگەیشت پێغەمبەری خوا ﷺ لە شنەی شەماڵ بەخشندەتر دەبوو.

## بَابُ الِاجْتِنَانِ بِالصَّوْمِ مِنَ النَّارِ،
## إِذِ اللَّهَ ﷻ جَعَلَ الصَّوْمَ جُنَّةً مِنَ النَّارِ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ

١٨٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الصَّوْمُ جُنَّةٌ»[٢].

### باسی ڕۆژووکردنە قەڵغان لە ئاگر، چونکە خوا ﷻ ڕۆژووی کردووە بە قەڵغان لە ئاگر، پەنا دەگرین بە خوا لە ئاگر

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە (لە ئاگری دۆزەخ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٨٩١-** عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، فَدَعَا بِلَبَنٍ لِيَسْقِيَهُ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ، كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ، قال وَصيامٌ حسنٌ صيام ثلاثة أيام من كل شهر»[١].

واتە: موتەڕیف دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عوسمانی کوڕی ئەبولعاص ﷺ، بانگی کرد شیر بهێنن تا پێی بدا بیخواتەوە، وتم: من بەڕۆژووم، وتی: من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر، وەکوو چۆن یەکێك لە ئێوە قەڵغان دەپۆشێ بۆ جەنگ، فەرمووی: ڕۆژووی چاك سێ ڕۆژ ڕۆژووگرتنە لە هەموو مانگێکدا.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّوْمَ إِنَّمَا يَكُونُ جُنَّةً بَاجْتِنَابِ مَا نُهِيَ الصَّائِمُ عَنْهُ وَإِنْ كَانَ مَا نُهِيَ عَنْهُ مِمَّا لَا يُفَطِّرُهُ، وَلَكِنْ يَنْقُصُ صَوْمُهُ عَنِ الْكَمَالِ وَالتَّمَامِ

**١٨٩٢-** عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الصَّوْمُ جُنَّةٌ مَا لَمْ يَخْرِقْهُ»[٢]

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژوو لە کاتێکدا قەڵغانە ڕۆژووەوان دوور بکەوێتەوە لەوەی قەدەغەی لێ کراوە، ئەگەرچی ئەوەی قەدەغەی لێ کراوە ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، بەڵکوو ڕۆژووەکەی ناتەواو دەکات لە تەواوێتی

واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە ئەگەر تێکی نەدات (بە درۆکردن یان غەیبەت).

## بَابُ فَضْلِ الصِّيَامِ وَأَنَّهُ لَا عَدْلَ لَهُ مِنَ الْأَعْمَالِ

**١٨٩٣-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ قَالَ: «عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَا عِدْلَ لَهُ»[٣].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.



**باسی فەزڵ و شکۆی ڕۆژوو، وە بێگومان هیچ هاوشێوەیەکی نییە لە کردەوەکان**

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێنماییم بکە بۆ کردەوەیەك، فەرمووی: دەست بگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە هاوشێوەی نییە.

## بَابُ ذِكْرِ مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ السَّالِفَةِ بِصَوْمِ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا

١٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»(١).

**باسی لێخۆشبوون لە تاوانەکانی ڕابردوو بەهۆی ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان کە بڕوای بە فەڕزبوونی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت**

واتە: ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ بڕوای بە فەڕزبوونی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت، هەر کەسیش شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

## بَابُ ذِكْرِ تَمْثِيلِ الصَّائِمِ فِي طِيبِ رِيحِهِ بِطِيبِ رِيحِ الْمِسْكِ إِذْ هُوَ أَطْيَبُ الطِّيبِ

١٨٩٥- عَنِ الْحَارِثِ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَى يَحْيَى بْنِ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ يَعْمَلَ بِهِنَّ، وَيَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ، فَكَأَنَّهُ أَبْطَأَ بِهِنَّ، فَأَتَاهُ عِيسَى فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَكَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ تَعْمَلَ بِهِنَّ، وَيَأْمُرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ، فَإِمَّا أَنْ تُخْبِرَهُمْ، وَإِمَّا أَنْ أُخْبِرَهُمْ فَقَالَ: يَا أَخِي، لَا تَفْعَلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ تَسْبِقْنِيَ بِهِنَّ أَنْ يُخْسَفَ بِي، أَوْ أُعَذَّبَ قَالَ: فَجَمَعَ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِبَيْتِ الْمَقْدِسِ، حَتَّى امْتَلَأَ الْمَسْجِدَ، وَقَعَدُوا عَلَى الشُّرُفَاتِ، ثُمَّ خَطَبَهُمْ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ، وَآمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ: أَوَّلُهُنَّ: أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا؛ فَإِنَّ مَثَلَ مَنْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْدًا مِنْ

---

(١) صحيح.

خَالِصِ مَالِهِ، بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، ثُمَّ أَسْكَنَهُ دَارًا، فَقَالَ: اعْمَلْ وَارْفَعْ إِلَيَّ، فَجَعَلَ يَعْمَلُ وَيَرْفَعُ إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَرْضَى أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ؟ فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَكُمْ وَرَزَقَكُمْ، فَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَإِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَلَا تَلْتَفِتُوا؛ فَإِنَّ اللَّهَ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ إِلَى وَجْهِ عَبْدِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ، وَمَثَلُ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ فِي عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةُ مَسْكٍ، كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَجِدَ رِيحَهَا، وَإِنَّ الصِّيَامَ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَآمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ، وَمَثَلُ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ الْعَدُوُّ، فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ، وَقَرَّبُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَجَعَلَ يَقُولُ: هَلْ لَكُمْ أَنْ أَفْدِيَ نَفْسِيَ مِنْكُمْ؟ وَجَعَلَ يُعْطِي الْقَلِيلَ وَالْكَثِيرَ حَتَّى فَدَى نَفْسَهُ، وَآمُرُكُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ كَثِيرًا، وَمَثَلُ ذِكْرِ اللَّهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ طَلَبَهُ الْعَدُوُّ سِرَاعًا فِي أَثَرِهِ، حَتَّى أَتَى حِصْنًا حَصِينًا، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ فِيهِ، وَكَذَلِكَ الْعَبْدُ لَا يَنْجُو مِنَ الشَّيْطَانِ إِلَّا بِذِكْرِ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ أَمَرَنِي اللَّهُ بِهِنَّ: الْجَمَاعَةُ، وَالسَّمْعُ، وَالطَّاعَةُ، وَالْهِجْرَةُ، وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ، فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ مِنْ رَأْسِهِ، إِلَّا أَنْ يُرَاجِعَ، وَمَنِ ادَّعَى دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ فَهُوَ مِنْ جُثَى جَهَنَّمَ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى؟ قَالَ: «وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى، تَدَاعُوا بِدَعْوَى اللَّهِ الَّذِي سَمَّاكُمْ بِهَا الْمُؤْمِنِينَ الْمُسْلِمِينَ عِبَادَ اللَّهِ»[١].

## باسی چواندنی بۆنی دەمی ڕۆژووەوان بە بۆنی میسك، چونکە ئەوە خۆشترین بۆنە

واتە: حاریسی ئەشعەری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز و مەزن وەحی کرد بۆ یەحیای کوڕی زەکەریا بە پێنج وشە کردەوەیان پێ بکات، فەرمانیش بکات بە نەوەکانی ئیسرائیل کردەوەی پێ بکەن، وەکوو بڵێی خاوەخاوی تێدا کرد، عیسا هات بۆ لای فەرمووو: خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووی بە پێنج وشە کردەوەیان پێ بکەیت و فەرمانیش بە نەوەکانی ئیسرائیل بکەیت کردەوەی پێ بکەن، جا یان تۆ هەواڵیان پێ بدە، یان من هەواڵیان پێ دەدەم، وتی: براکەم کاری وا مەکە، من لەوە دەترسم پێشم بکەویت بخرێم بە ناخی زەویدا یان سزا بدرێم، وتی: خەڵکی لەنێو بەیتولمەقدیس کۆ کردەوە تا مزگەوتەکە پڕ بو و لەسەر بەرزاییەکان دانیشتن، پاشان وتاری بۆ دان، وتی: خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووم بە پێنج وشە خۆم کردەوەی پێ بکەم و فەرمانیش بکەم بە نەوەکانی ئیسرائیل کردەوەی پێ بکەن: یەکەمینیان:

(١) صحيح.

خَالِصِ مَالِهِ، بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، ثُمَّ أَسْكَنَهُ دَارًا، فَقَالَ: اعْمَلْ وَارْفَعْ إِلَيَّ، فَجَعَلَ يَعْمَلُ وَيَرْفَعُ إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَرْضَى أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ؟ فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَكُمْ وَرَزَقَكُمْ، فَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَإِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَلَا تَلْتَفِتُوا؛ فَإِنَّ اللَّهَ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ إِلَى وَجْهِ عَبْدِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ، وَمَثَلُ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ فِي عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةُ مِسْكٍ، كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَجِدَ رِيحَهَا، وَإِنَّ الصِّيَامَ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَآمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ، وَمَثَلُ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ الْعَدُوُّ، فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ، وَقَرَّبُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَجَعَلَ يَقُولُ: هَلْ لَكُمْ أَنْ أَفْدِيَ نَفْسِيَ مِنْكُمْ؟ وَجَعَلَ يُعْطِي الْقَلِيلَ وَالْكَثِيرَ حَتَّى فَدَى نَفْسَهُ، وَآمُرُكُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ كَثِيرًا، وَمَثَلُ ذِكْرِ اللَّهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ طَلَبَهُ الْعَدُوُّ سِرَاعًا فِي أَثَرِهِ، حَتَّى أَتَى حِصْنًا حَصِينًا، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ فِيهِ، وَكَذَلِكَ الْعَبْدُ لَا يَنْجُو مِنَ الشَّيْطَانِ إِلَّا بِذِكْرِ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ أَمَرَنِي اللَّهُ بِهِنَّ: الْجَمَاعَةُ، وَالسَّمْعُ، وَالطَّاعَةُ، وَالْهِجْرَةُ، وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ، فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ مِنْ رَأْسِهِ، إِلَّا أَنْ يُرَاجِعَ، وَمَنِ ادَّعَى دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ فَهُوَ مِنْ جُثَى جَهَنَّمَ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى؟ قَالَ: «وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى، تَدَاعُوا بِدَعْوَى اللَّهِ الَّذِي سَمَّاكُمْ بِهَا الْمُؤْمِنِينَ الْمُسْلِمِينَ عِبَادَ اللَّهِ»[١].

## باسی چواندنی بۆنی دەمی ڕۆژووەوان بە بۆنی میسك، چونكە ئەوە خۆشترین بۆنە

**واتە: حاریسی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز و مەزن وەحی كرد بۆ یەحیای كوڕی زەكەریا بە پێنج وشە كردەوەیان پێ بكات، فەرمانیش بكات بە نەوەكانی ئیسرائیل كردەوەی پێ بكەن، وەكوو بڵێی خاوەخاوی تێدا كرد، عیسا هات بۆ لای فەرمووی: خوا ﷻ فەرمانی پێ كردووی بە پێنج وشە كردەوەیان پێ بكەیت و فەرمانیش بە نەوەكانی ئیسرائیل بكەیت كردەوەی پێ بكەن، جا یان تۆ هەواڵیان پێ بدە، یان من هەواڵیان پێ دەدەم، وتی: براكەم كاری وا مەكە، من لەوە دەترسم پێشم بكەویت بخرێم بە ناخی زەویدا یان سزا بدرێم، وتی: خەڵكی لەنێو بەیتولمەقدیس كۆ كردەوە تا مزگەوتەكە پڕ بو و لەسەر بەرزاییەكان دانیشتن، پاشان وتاری بۆ دان، وتی: خوا ﷻ فەرمانی پێ كردووم بە پێنج وشە خۆم كردەوەی پێ بكەم و فەرمانیش بكەم بە نەوەكانی ئیسرائیل كردەوەی پێ بكەن: یەكەمینیان:**

---

(١) صحيح.

هاوبەش بۆ خوا ﷻ دامەنێن، نموونەی ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێت، وەکوو نموونەی پیاوێکە کۆیلەیەکی بە ماڵ و سامانی کڕیبێت بە زێڕ بێت یان زیو، پاشان لە خانوویەك نیشتەجێی کردبێت، پێی بڵێ: کار بکە و بیهێنە بۆم، کۆیلەکەیش ئیشوکار بکات بەرهەمەکەی ببات بۆ غەیری گەورەکەی، جا کێ لەئێوە پێی خۆشە کۆیلەکەی بەو شێوەیە بێت؟ بێگومان خوا ﷻ دروستی کردوون و ڕزق و ڕۆزی داون، هەرگیز هاوبەشی بۆ دامەنێن، (فەرمانیشی پێ کردن بە نوێژکردن)، کاتێ نوێژتان کرد ئاوڕ مەدەنەوە بەملا و بەولادا، خوا ﷻ بەڕوخساری ڕوو دەکات لە بەندەکەی تا ئاوڕ نەداتەوە، وە فەرمانتان پێ دەکەم بە ڕۆژووگرتن، بێگومان نموونەی ئەوە وەکوو پیاوێك وایە لەنێو کۆمەڵێکدا بێت گۆزەیەکی پێ بێت میسکی تێدا بێت، هەموویان پێیان خۆش بێت بۆنی بکەن، بێگومان ڕۆژوو لەلای خوا بۆنی خۆشترە لە بۆنی میسك، وە فەرمانتان پێ دەکەم بە بەخشین، نموونەی بەخشین وەکوو کەسێك وایە دوژمن دەستگیری کردبێت دەستیان تا گەردنی بەستبێتەوە و نزیکی بکەنەوە بۆ ئەوەی لە گەردنی بدەن، ئەویش بڵێ: ئایا دەتوانم ڕووحی خۆم ڕزگار بکەم؟ ماڵ و سامانی کەم و زۆریان بۆ بخاتە ڕوو تا گیانی خۆی ڕزگار دەکات، وە فەرمانتان پێ دەکەم بەوەی زۆر یادی خوا بکەن، چونکە نموونەی یادی خوا وەکوو پیاوێك وایە دوژمن بە شوێنیدا بگەڕێ ئەویش بچێتە نێو قەڵایەکی قایم، خۆی تێدا بپارێزێت، بەهەمان شێوە بەندە ڕزگاری نابێت لە شەیتان مەگەر بە یاد و زیکری خوا نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منیش فەرمانتان پێ دەکەم بە پێنج شت خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووم: پەیوەستبوون بە کۆمەڵی موسوڵمانان و گوێڕایەڵی و ملکەچی و هیجرەت و جیهادکردن لەپێناوی خوا، هەر کەس لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا ببێتەوە بە قەد بستێك ئەوە پەتی ئیمان و ئیسلامەتی لە گەردنی خۆی داڕنیوە مەگەر بگەڕێتەوە، هەر کەسیش هاتوهاواری سەردەمی نەفامی بکات ئەوە دەبێتە بەردی کۆکراوەی دۆزەخ، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ڕۆژوو بگرێ و نوێژیش بکات؟ فەرمووی: ئەگەر ڕۆژوو بگرێ و نوێژیش بکات، ئەی بەندەکانی خوا کۆ ببنەوە لەژێر ئەو چەترەی خوا ناوی لێ ناون بە بڕواداران و موسوڵمانان.

## بَابُ ذِكْرِ طِيبِ خِلْفَةِ الصَّائِمِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

**١٨٩٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْنِي: «قَالَ اللَّهُ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ، فَهُوَ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، الصِّيَامُ عَنْهُ جُنَّةٌ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ»[١].

### باسی بۆنخۆشی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خوا لە ڕۆژی دوایی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: واتە: خوا فەرموویەتی: هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو، ڕۆژوو بۆ منە و تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە بۆی، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە: کاتێ ڕۆژووەکەی دەشکێنێ دڵخۆش دەبێ بە شکاندنەکەی، کاتێکیش دەگات بە پەروەردگاری دڵخۆشە بە ڕۆژووەکەی.

## بَابُ ذِكْرِ إِعْطَاءِ الرَّبِّ ﷻ الصَّائِمَ أَجْرَهُ بِغَيْرِ حِسَابٍ إِذِ الصِّيَامُ مِنَ الصَّبْرِ، قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر.

**١٨٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ قَالَ اللَّهُ: إِلَّا الصِّيَامَ، فَهُوَ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ الطَّعَامَ مِنْ أَجْلِي، وَيَدَعُ الشَّرَابَ مِنْ أَجْلِي، وَيَدَعُ لَذَّتَهُ مِنْ أَجْلِي، وَيَدَعُ زَوْجَتَهُ مِنْ أَجْلِي، وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ حِينَ يُفْطِرُ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ»[٢].

**باسی پەروەردگار ﷻ پاداشتی ڕۆژووەوان دەداتەوە بەبێ حیساب، چونکە ڕۆژووگرتن ئارامگرتنە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ واتە: بەڕاستی تەنها دانبەخۆداگران بەبێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو کردەوەکانی نەوەکانی ئادەم بۆ خۆیەتی، یەك چاکەش بەرانبەرە بە دە بۆ حەوت سەد ئەوەندە، خوا فەرموویەتی: جگە لە ڕۆژوو، ئەوە بۆ منە و من پاداشتی دەدەمەوە، لەبەر من واز لە خواردن دەهێنێ، لەبەر من واز لە خواردنەوە دەهێنێ، لەبەر من واز لە چێژو خۆشی دەهێنێ، هەروەها لەبەر من واز لە هاوسەرەکەی دەهێنێ، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە: خۆشییەك کاتێ ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، خۆشییەکیش کاتێ دەگات بە پەروەردگاری.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الصِّيَامَ مِنَ الصَّبْرِ عَلَى مَا تَأَوَّلْتُ خَبَرَ النَّبِيِّ ﷺ

**١٨٩٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ مِثْلُ الصَّائِمِ الصَّابِرِ»، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصَّوْمَ؛ فَإِنَّهُ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ڕۆژووگرتن بەشێکە لە خۆڕاگرتن، وەکو چۆن فەرموودەکەی پێغەمبەرم ﷺ لەیەك دایەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی خواردن دەخوات و سپاسگوزارە (پاداشتی) وەکوو کەسێکی ڕۆژووگری ئارامگر وایە، وتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ فەرمووی: هەموو کردەوەکانی نەوەکانی ئادەم بۆ خۆیەتی، جگە لە ڕۆژوو، بێگومان ئەوە بۆ منە و من پاداشتی دەدەمەوە، لەبەر من واز لە خواردن و خواردنەوە دەهێنێ، هەروەها لەبەر من واز لە حەز و ئارەزووەکانی دەهێنێ.

**١٨٩٩-** عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ عَلِي قَالَ سَمِعْتُ أَبا هُرَيْرَةَ ﷺ بِهَذَا الْبَقِيعِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده حسن.

واتە: حەنزەلەی كوڕی عەلی دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو هوڕەیڕە ﷺ لەم بەقیعەدا دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، وەكوو فەرموودەكەی پێشوو.

## بَابُ ذِكْرِ فَرَحِ الصَّائِمِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِإِعْطَاءِ الرَّبِّ إِيَّاهُ ثَوَابَ صَوْمِهِ بِلَا حِسَابٍ، جَعَلَنَا اللَّهُ مِنْهُمْ

**١٩٠٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: الصَّوْمُ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، إِنَّ لِلصَّائِمِ فَرْحَتَيْنِ: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِيَ اللَّهَ فَجَزَاهُ فَرِحَ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[١].

## باسی ڕۆژووەوان لە ڕۆژی دوایی دڵخۆش دەبێت، كاتێ خوا پاداشتی ڕۆژووەكەی دەداتەوە بەبێ ژمارە، خوا ﷻ بمانگێڕێ بە یەكێك لە ئەوان

واتە: ئەبو هوڕەیڕە و ئەبو سەعید ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا دەفەرمووێت: ڕۆژوو، بۆ منە و من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە: كاتێ ڕۆژی شكاند دڵخۆش دەبێت، كاتێكیش دەگاتە لای خوا، پاداشتی دەداتەوە دڵخۆش دەبێت، سوێند بەوزاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسك.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِجَابَةِ اللَّهِ ﷻ دُعَاءَ الصُّوَّامِ إِلَى فِطْرِهِمْ مِنْ صِيَامِهِمْ، جَعَلَنَا اللَّهُ مِنْهُمْ

**١٩٠١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: الصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ، وَإِمَامٌ عَدْلٌ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ يَرْفَعُهَا اللَّهُ فَوْقَ الْغَمَامِ، وَيَفْتَحُ لَهَا أَبْوَابَ السَّمَوَاتِ، فَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: وَعِزَّتِي لَأَنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## باسی خوا ﷻ پاڕانەوەی ڕۆژووەوان گیرا دەكات لەو كاتەی بەڕۆژووە تا دەیشكێنێت، خوا بمانگێڕێت لە ئەوان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ كەس هەن داوایان ڕەت ناكرێتەوە: ڕۆژووەوان تا ڕۆژووەكەی دەشكێنێ، پێشەوایەكی دادپەروەر، داوای ستەملێكراو خوا بەرزی دەكاتە بۆ سەر هەور و دەرگای ئاسمانەكانی بۆ دەكاتەوە، پەروەردگار ﷻ دەڵێ: بە عیزەتم سەرت دەخەم ئەگەر چی دوای ماوەیەكیش بێت.

## بَابُ ذِكْرِ بَابِ الْجَنَّةِ الَّذِي يُخَصُّ بِدُخُولِهِ الصُّوَّامُ دُونَ غَيْرِهِمْ، وَنَفْيِ الظَّمَأِ عَمَّنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، وَيَشْرَبُ مِنْ شَرَابِهَا، جَعَلَنَا اللَّهُ مِنْهُمْ

**١٩٠٢**- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِلصَّائِمِينَ بَابٌ فِي الْجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلَ آخِرُهُمْ أُغْلِقَ، مَنْ دَخَلَ شَرِبَ، وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا»[1].

## باسی ئەو دەرگایەی بەهەشت كە تایبەت كراوە بە چوونەژوورەوەی ڕۆژووەوانەكان، جگە لە ئەوان كەسی دیكە بۆی نییە بچێتە نێویەوە، وە ڕەتكردنەوەی تینوێتی لەوەی دەچێتە بەهەشتەوە و لە خواردنەوەكانی دەخواتەوە، خوا بمانگێڕێ لە ئەوان

واتە: سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەكێك لە دەرگاكانی بەهەشت تایبەتە بە ڕۆژووەوان، پێی دەوترێ: ڕەییان، هیچ كەس ناچێتە نێویەوە جگە لە ئەوان، كاتێ كۆتا كەسیان چۆیە نێویەوە، دادەخرێ، هەر كەس بچێتە نێویەوە، دەخواتەوە، هەر كەسیش بخواتەوە، هەرگیز تینوو نابێتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ صِفَةِ بَدْءِ الصَّوْمِ، كَانَ فِي تَخْيِيرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِبَادَةَ الْمُؤْمِنِينَ بَيْنَ الصَّوْمِ وَالْإِطْعَامِ، وَنَسْخِ ذَلِكَ بِإِيجَابِ الصَّوْمَ عَلَيْهِمْ مِنْ غَيْرِ تَخْيِيرِ

**١٩٠٣-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي رَمَضَانَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ وَافْتَدَى بِإِطْعَامِ مِسْكِينٍ، حَتَّى أُنْزِلَتِ الْآيَةُ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾البقرة: ١٨٥[١].

## باسی چۆنیەتی دەستپێکردنی ڕۆژوو، سەرەتا خوا بەندە بڕوادارەکانی سەرپشك كرد لە نێوان ڕۆژووگرتن و فیدیەدان، دواتر حوکمی سەرپشککردنی هەڵوەشاندەوە (نەسخ کردەوە)

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزان هەر کەس بیویستایە بەڕۆژوو دەبوو، هەر کەسیش بیویستایە بەڕۆژوو نەدەبوو لەجیاتی ڕۆژووگرتن خواردنی هەژارێکی وەك فیدیە دەدا، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾، واتە: ئینجا هەر یەکێك لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی با بەڕۆژوو بێت.

## بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ الصَّائِمُ عَنْهُ مَمْنُوعًا بَعْدَ النَّوْمِ، فِي لَيْلِ الصَّوْمِ مِنَ الْأَكْلِ، وَالشُّرْبِ، وَالْجِمَاعِ عِنْدَ ابْتِدَاءِ فَرْضِ الصِّيَامِ، وَنَسْخِ اللَّهِ ﷻ ذَلِكَ بِإِبَاحَتِهِ لَهُمْ ذَلِكَ أَجْمَعَ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ، تَفَضُّلًا مِنْهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ، وَعَفْوًا مِنْهُ عَنْهُمْ، وَتَخْفِيفًا عَلَيْهِمْ

**١٩٠٤-** عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ إِذَا كَانَ أَحَدُهُمْ صَائِمًا، فَحَضَرَ الْإِفْطَارَ فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلَا يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَ الْإِفْطَارُ أَتَى امْرَأَتَهُ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لَا، وَلَكِنْ أَطْلُبُ، فَطَلَبَتْ لَهُ وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ وَجَاءَتِ امْرَأَتُهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ، فَأَصْبَحَ، فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة: ١٨٧، فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا، فَقَالَ: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة: ١٨٧[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ئەوەی ڕێگری لێ کرابوو لە ڕۆژووەوان دوای خەوتن بە شەو لە خواردن و خواردنەوە و جووتبوون لە سەرەتای فەرزبوونی ڕۆژوو، وە خوا ﷻ حوکمی ئەوەی نەسخ کردەوە بەوەی ڕێگەی پێدان بەگشتی تا بەرەبەیان دەردەکەوێت، بە فەزڵ و چاکەی لەسەر بەندەکانی، وە بە لێبووردنی خۆی لێیان و کارئاسانی کردنی بۆیان**

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ یەکێکیان بەڕۆژوو بووایە و ئامادەی بەربانگ بووایە و دواتر بخەوتایە پێش ئەوەی ڕۆژووی بشکاندایە، ئەوە ئەو شەوەی و ئەو ڕۆژەی هیچی نەدەخوارد هەتا ئێوارە دەهات، جا قەیسی کوڕی صیرمە بەڕۆژوو بوو کاتێ کاتی بەربانگ بوو، هات بۆ لای خێزانەکەی وتی: ئایا هیچ خواردنێکت لەلا هەیە؟ وتی: نەخێر، بەڵام دەڕۆم دەگەڕێم، دواتر ڕۆیشت بۆ خواردن گەڕا، جا ئەو پیاوە بە ڕۆژ کاری دەکرد، خەو زاڵ بوو بەسەر چاوەکانیدا و خەوی لێکەوت، خێزانەکەی هاتەوە بۆ لای وتی: بێبەش بووی لە خواردنەکە، پاشان بەیانی کردەوە، کاتێ ڕۆژ نیوە بوو بێهۆش کەوت، دواتر ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەوسا ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴿١٨٧﴾﴾، واتە: ڕێتان پێ دراوە لە شەوانی ڕۆژووی (ڕەمەزاند)دا جووت بن لەگەڵ ژنەکانتان. دڵخۆش بوون پێی دڵخۆشبوونێکی زۆر فەرمووی: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴿١٨٧﴾﴾، واتە: وە بخۆن و بخۆنەوە هەتا بۆتان جیادەبێتەوە ڕوشتەی سپی (ڕۆژ) لە ڕوشتەی ڕەشی (شەو) لە شەبەقدا.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَهِلَّةِ وَوَقْتُ ابْتِدَاءِ صَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصِّيَامِ لِرُؤْيَةِ الْهِلَالِ إِذَا لَمْ يُغَمَّ عَلَى النَّاسِ

١٩٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ»[1].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی بینینی مانگی یەك شەوە لە سەرەتای ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان

## باسی فەرمانکردن بە بینیی بانگ ئەگەر هەور بەرچاوی خەڵکی نەگرت

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگتان بینی (لە سەرەتای ڕەمەزان) ڕۆژوو بگرن، کاتێکیش (مانگی شەوال) تان بینی (لە کۆتایی ڕەمەزان) ڕۆژوو بشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەوی شەعبان تەواو بکەن.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ اللَّهَ ﷻ جَعَلَ الْأَهِلَّةَ مَوَاقِيتَ لِلنَّاسِ لِصَوْمِهِمْ وَفِطْرِهِمْ، إِذْ قَدْ أَمَرَ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ بِصَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ لِرُؤْيَتِهِ، وَالْفِطْرِ لِرُؤْيَتِهِ مَا لَمْ يُغَمَّ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ﴾ البقرة: ١٨٩.**

**١٩٠٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْأَهِلَّةَ مَوَاقِيتَ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ، وَاعْلَمُوا أَنَّ الشَّهْرَ لَا يَزِيدُ عَلَى ثَلَاثِينَ»[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی خوا ﷻ مانگەکانی کردووە بە دیاریکردنی کاتی ڕۆژووگرتنی خەڵك و ڕۆژوونەگرتنیان، چونکە خوا ﷻ لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانی کردووە بە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان بە بینینی و ڕۆژوونەگرتنیش بە بینینی بە مەرجێك هەور نەبێ، خوا فەرموویەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ﴾، واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نوێبوونەوەی مانگە نوێیەکان، بەڵێ ئەمانە نیشانەی کاتەکانن بۆ خەڵکی**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ﷻ مانگەکانی کردووە بە نیشانە، کاتێك مانگتان بینی (لە سەرەتای ڕەمەزان) بەڕۆژوو بن، کاتێکیش مانگتان بینی (لە کۆتایی ڕەمەزاندا) ڕۆژوو بشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەو بژمێرن، وە بزانن مانگ سی شەو زیاتر تێناپەڕێنێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّقْدِيرِ لِلشَّهْرِ إِذَا غُمَّ عَلَى النَّاسِ

**١٩٠٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً، فَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ إِلَّا أَنْ يُغَمَّ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ غُمِّيَ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ»[١].

**باسی فەرمانکردن بە خەمڵاندن و تەقدیرکردنی مانگ، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن**

**واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆ ڕۆژە (بەلایەنی کەمەوە) ڕۆژوو مەگرن تا مانگی (ڕەمەزان) دەبینن، هەروەها مەیشکێنن تا دەیبینن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەو تەواو بکەن.**

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالتَّقْدِيرِ لِلشَّهْرِ إِذَا غُمَّ، أَنْ يُعَدَّ شَعْبَانُ ثَلَاثِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يُصَامُ

**١٩٠٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ: «فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ»[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە خەمڵاندنی مانگ کاتێ هەور بەرچاوی گرتن، سی شەو لە مانگی شەعبان تەواو بکرێ، پاشان ڕۆژوو بگیرێ**

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر، فەرمووی: ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەو لە شەعبان بژمێرن.**

**١٩٠٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا ثَلَاثِينَ، وَالشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، وَيَعْقِدُ فِي الثَّالِثَةِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا ثَلَاثِينَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ بەوشێوە و بەوشێوە و بەوشێوەیە (هەر جارێك بە دە پەنجەکەی ئاماژەی کرد کە دەکاتە) سی شەو، وە مانگ بەوشێوە و بەوشێوە و بەوشێوەیە بەڵام لە جاری سێیەم پەنجەیەکی نوقاند، (واتە: بیست و نۆ ڕۆژە)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن سی شەو تەواو بکەن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِإِكْمَالِ ثَلَاثِينَ يَوْمًا لِصَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ دُونَ إِكْمَالِ ثَلَاثِينَ يَوْمًا لِشَعْبَانَ

**١٩١٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَحَفَّظُ مِنْ هِلَالِ شَعْبَانَ مَا لَا يَتَحَفَّظُ مِنْ غَيْرِهِ، ثُمَّ يَصُومُ لِرُؤْيَةِ رَمَضَانَ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْهِ عَدَّ ثَلَاثِينَ يَوْمًا، ثُمَّ صَامَ[1].

## باسی بەڵگە لە دژی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە تەواوکردنی سی ڕۆژ بۆ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، نەك تەواوکردنی سی ڕۆژ لە شەعبان

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە جەختی دەکردەوە لە ژماردنی ڕۆژەکانی مانگی شەعبان لە غەیری ئەو مانگە ئەوەندە جەختی نەدەکردەوە، پاشان بە بینینی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبوو، ئەگەر هەور بەرچاوی بگرتایە سی شەوی (شەعبانی) تەواو دەکرد، پاشان بەرۆژوو دەبوو.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الصِّيَامِ لِرَمَضَانَ قَبْلَ مُضِيِّ ثَلَاثِينَ يَوْمًا لِشَعْبَانَ إِذَا لَمْ يُرَ الْهِلَالُ

**١٩١١-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقَدِّمُوا هَذَا الشَّهْرَ حَتَّى تَرَوَا الْهِلَالَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ»[2].

## باسی سەرزەنشتکردن لە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان پێش تەواوبوونی سی ڕۆژ لە شەعبان، ئەگەر مانگ نەبینرا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش ئەم مانگە (ڕەمەزان) مەکەون (بەڕۆژووگرتن) تا مانگی یەك شەوە دەبینن، یان سی ڕۆژی شەعبان تەواو دەکەن.

١٩١٢- عَنْ سِمَاكٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عِكْرِمَةَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ مِنْ رَمَضَانَ، وَهُوَ يَأْكُلُ فَقَالَ: ادْنُ فَكُلْ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ قَالَ: وَاللَّهِ لَتَدْنُوَنَّ قُلْتُ: فَحَدِّثْنِي قَالَ: ثنا ابْنُ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَسْتَقْبِلُوا الشَّهْرَ اسْتِقْبَالًا، صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ حَالَ بَيْنَكَ وَبَيْنَ مَنْظَرِهِ سَحَابٌ أَوْ قَتَرَةٌ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ»[١].

واتە: سیاك دەڵێ: هاتم بۆ لای عیکریمە لەو ڕۆژەی گومانی تێدا بوو نەدەزانرا ڕەمەزانە یان شەعبان، ئەو خواردنی دەخوارد، وتی: وەرە پێشەوە بخۆ، وتم: من بەڕۆژووم، وتی: سوێندی بە خوا دێیتە پێشەوە، وتم: بۆم باس بکە، وتی: ئیبنو عەباس ﷺ بۆی باس کردم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش مانگی ڕەمەزان مەکەون بەڕۆژووگرتن، ڕۆژوو بگرن بە بینینی مانگی ڕەمەزان، ڕۆژوویش بشکێنن بە بینینی (واتە: لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن یان تاریکی، ئەوە مانگەکە تەواو بکەن کە سی ڕۆژە.

## بَابُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الزَّجْرِ عَنْ صِيَامِ رَمَضَانَ قَبْلَ رُؤْيَةِ هِلَالِ رَمَضَانَ إِذَا لَمْ يُغَمَّ الْهِلَالُ، وَبَيْنَ الزَّجْرِ عَنْ إِفْطَارِ رَمَضَانَ قَبْلَ رُؤْيَةِ هِلَالِ شَوَّالٍ إِذَا لَمْ يُغَمَّ الْهِلَالُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّائِمَ لِرَمَضَانَ إِذَا غُمَّ الْهِلَالُ قَبْلَ مُضِيِّ ثَلَاثِينَ يَوْمًا لِشَعْبَانَ عَاصٍ كَالْمُفْطِرِ قَبْلَ مُضِيِّ ثَلَاثِينَ يَوْمًا لِرَمَضَانَ إِذَا غُمَّ الْهِلَالُ

١٩١٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ- وَعَقَدَ إِبْهَامَهُ- فَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی یەکسانی سەرزەنشتکردن لە نێوان ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان پێش بینینی یەکشەوەی مانگی ڕەمەزان، ئەگەر هەور و تەمومژ بەردەمی نەگرتبوو، وە لە نێوان سەرزەنشتکردن لە شکاندنی ڕەمەزان پێش بینیی مانگی شەوال ئەگەر هەور بەردەمی مانگی نەگرتبوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی ڕۆژی ڕەمەزان دەگرێ کاتێ هەور بەرچاوی گرت لە بینینی یەکشەوەی ڕەمەزان پێش ئەوەی سی شەو تەواو بکات لە شەعبان ئەوە سەرپێچی کردووە وەکو ئەو کەسە وایە ڕۆژووی شکاندووە پێش ئەوەی سی ڕۆژ تێپەڕ بێت لە مانگی ڕەمەزان ئەگەر هەور بەرچاوی گرت**

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆیە -پەنجە گەورەکەی نوقاند- بەڕۆژوو مەبن تا مانگ دەبینن، ڕۆژوویش مەشکێنن تا مانگی شەوال دەبینن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەوەکە تەواو بکەن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صَوْمِ الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، أَمِنْ رَمَضَانَ أَمْ مِنْ شَعْبَانَ، بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**١٩١٤-** عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ ﭬ فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ، فَقَالَ: كُلُوا فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ»[1].

**باسی سەرزەنشتکردن لە ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژەی گومانی تێدا دەکرێ، ئایا لە ڕەمەزانە یان شەعبانە بە دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون**

واتە: صیلەی کوڕی زوفەر دەڵێ: ئێمە لای عەمار ﭬ بووین بەرخێکی برژاوی بۆ هات، وتی: بخۆن، هەندێ لە خەڵکەکە هاتە دواوە، وتی: من بەڕۆژووم، عەمار وتی: هەر کەسێك ئەم ڕۆژە بەڕۆژوو بێت کە گومانی تێدا هەیە ئەوە سەرپێچی باوکی قاسمی ﷺ کردووە.

---

(١) إسناده صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْهِلَالَ يَكُونُ لِلَّيْلَةِ الَّتِي يُرَى صَغُرَ أَوْ كَبُرَ مَا لَمْ تَمْضِ ثَلَاثُونَ يَوْمًا لِلشَّهْرِ، ثُمَّ لَا يُرَى الْهِلَالَ لِغَيْمٍ أَوْ سَحَابٍ

**١٩١٥-** عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: أَهْلَلْنَا هِلَالَ رَمَضَانَ وَنَحْنُ بِذَاتِ عِرْقٍ قَالَ: فَأَرْسَلْنَا رَجُلًا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَمَدَّهُ لَكُمْ لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ أُغْمِيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی یەکشەوەی مانگی ڕەمەزان لەو شەوەدا کە دەبینرێ بچووك بێت یان گەورە، ئەگەر سێ ڕۆژ لە شەعبان نەڕۆیشتبێت، پاشان مانگی یەکشەوە نەبینرا بەهۆی تەمومژ یان هەور

واتە: ئەبولبەحتەری دەڵێ: ئێمە كە لە (ذَاتِ عِرْقٍ) بووین مانگی ڕەمەزانمان بینی، پیاوێکمان نارد بۆ لای ئیبنو عەباس ﵄ پرسیاری لێ بکات، ئیبنو عەباس وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ماوەی مانگی شەعبانی درێژ کردەوە تا کاتی بینینی سەرەتای ڕەمەزان، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سێ شەوی شەعبان تەواو بکەن.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوَاجِبَ عَلَى أَهْلِ كُلِّ بَلْدَةٍ صِيَامُ رَمَضَانَ لِرُؤْيَتِهِمْ لَا رُؤْيَةِ غَيْرِهِمْ

**١٩١٦-** عَنْ كُرَيْبٍ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ ﵁ بِالشَّامِ قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، وَاسْتَهَلَّ عَلَيَّ هِلَالُ رَمَضَانَ وَأَنَا بِالشَّامِ فَرَأَيْنَا الْهِلَالَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، وَرَآهُ النَّاسُ وَصَامُوا، وَصَامَ مُعَاوِيَةُ، فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلَالَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ أَنَا رَأَيْتُهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، وَرَآهُ النَّاسُ وَصَامُوا، وَصَامَ مُعَاوِيَةُ. قَالَ: لَكِنَّنَا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ فَلَا نَزَالُ نَصُومُهُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلَاثِينَ أَوْ نَرَاهُ، فَقُلْتُ: أَوَلَا تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ قَالَ: لَا، هكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی واجبە خەڵکی هەر ناوچەیەك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرن، بە پێی بینینی خۆیان نەك بینینی جگە لە خۆیان

واتە: کوڕەیب دەگێڕێتەوە، دایکی فەزلی کچی حاریس ناردی بۆ لای موعاویە ﷺ لە شام، وتی: چوومە شامەوە سەرەتای مانگی ڕەمەزانم بەسەردا هات، لە شەوی هەینی مانگمان بینی، خەڵکەکەیش بینییان و ڕۆژوویان گرت، موعاویەش ڕۆژووی گرت، دواتر لە کۆتایی مانگی ڕەمەزان هاتمەوە بۆ مەدینە، عەبدوڵای کوڕی عەباس پرسیاری لێ کردم، پاشان باسی یەکشەوەی مانگی ڕەمەزانی کرد، وتی: کەی مانگتان بینی؟ وتی: شەوی هەینی بینیمان، وتی: تۆ شەوی هەینی بینیت؟ وتم: بەڵێ من شەوی هەینی بینیم، خەڵکیش بینییان و بەڕۆژوو بوون، موعاویەش بەڕۆژوو بوو، وتی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە بینیمان، بەردەوام بەڕۆژوو دەبین سی شەو تەواو دەکەین یان مانگ دەبینین، وتم: ئەی ئەوەندە بەس نییە موعاویە بینیویەتی و بەڕۆژوو بووە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوە فەرمانی پێ کردووین.

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي أَنَّ الشَّهْرَ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**١٩١٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[١].

## باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە لەبارەی ئەوەی مانگ بیست و نۆیە، بە دەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆیە.

**١٩١٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



واته: ئیبنو عومەر ﷠ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان مانگ بیست و نۆیە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى خِلَافِ مَا تَوَهَّمَهُ الْعَامَّةُ، وَالْجُهَّالُ أَنَّ الْهِلَالَ إِذَا كَانَ كَبِيرًا مُضِيئًا أَنَّهُ لِلَّيْلَةِ الْمَاضِيَةِ لَا لِلَّيْلَةِ الْمُسْتَقْبَلَةِ

١٩١٩- عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: خَرَجْنَا لِلْعُمْرَةِ فَلَمَّا نَزَلْنَا بِبَطْنِ نَخْلَةَ رَأَيْنَا الْهِلَالَ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ هُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ ابْنُ لَيْلَتَيْنِ، قَالَ: فَلَقِينَا ابْنُ عَبَّاسٍ ، فَقُلْنَا: رَأَيْنَا الْهِلَالَ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: هُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ ابْنُ لَيْلَتَيْنِ فَقَالَ: أَيَّ لَيْلَةٍ رَأَيْتُمُوهُ؟ قُلْنَا: لَيْلَةَ كَذَا وَكَذَا فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ مَدَّهُ لِرُؤْيَتِهِ، فَهُوَ لِلَّيْلَةِ رَأَيْتُمُوهُ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی ئەوەی خەڵکی بەگشتی و نەفامەکان وا گومان دەکەن: ئەگەر مانگ گەورە بوو ئەوە هی شەوەکەی پێشووە نەك ئەو شەوەی دادێت

واته: ئەبولبەختەری دەڵێ: دەرچووین بۆ عومرە کاتێ دابەزینە نێو باخە خورمایەك بۆ پشوودان مانگمان بینی، هەندێ لە خەڵکەکە وتی: سێشەوەیە، هەندێکی دیکەشیان وتی: دووشەوەیە، وتی: کە گەیشتین بە ئیبنو عەباس ﷠ وتمان: مانگمان بینی هەندێکمان وتی: سێشەوەیە، هەندێکیشمان وتی: دووشەوە، وتی: چی شەوێك بینیتان؟ وتمان: شەوی ئەوەندە و ئەوەندە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ﷻ ماوەی مانگی درێژ کردەوە لەبەر بینینی، ئەو شەوەی کە مانگتان بینی سەرەتای ڕەمەزان بوو.

## بَابُ ذِكْرِ إِعْلَامِ النَّبِيِّ ﷺ أُمَّتَهُ أَنَّ الشَّهْرَ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ بِإِشَارَةٍ لَا بِنُطْقٍ، مَعَ إِعْلَامِهِ إِيَّاهُمْ أَنَّهُ أُمِّيٌّ لَا يَكْتُبُ، وَلَا يَحْسِبُ، ﷺ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْإِشَارَةَ الْمَفْهُومَةَ مِنَ النَّاطِقِ تَقُومُ مَقَامَ النُّطْقِ فِي الْحُكْمِ كَهِيَ مِنَ الْأَخْرَسِ

١٩٢٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، ثُمَّ قَبَضَ أَصَابِعَهُ فِي الثَّالِثَةِ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەكەی ئاگادار كردەوە مانگ بیست و نۆیە، بەئاماژە نەك بەقسەكردن، لەگەڵ ئەوەدا ئاگاداری كردنەوە كە ئەو نەخوێندەوارە نە دەزانێ بنووسێ و نە دەزانێ بژمێرێت ﷺ، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئاماژەی تێگەیەنراو لەلایەن كەسێكی قسەكەرەوە لە جێگای قسەكردنە و هەمان حوكمی ئاماژەی كەسی لاڵی هەیە**

واتە: سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مانگ بەوشێوە و بەوشێوە و بەوشێوەیە، پاشان لە سێیەم جاردا پەنجەیەكی نوقاند (واتە: سێ جار بە هەر دە پەنجەكەی ئاماژەی كرد پاشان پەنجەیەكی نوقاند كە دەكاتە بیست و نۆ).

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، بَعْضَ الشُّهُورِ لَا كُلَّهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، أَرَادَ: أَيْ قَدْ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ**

**١٩٢١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لَمَّا اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا كُنْتَ فِي الْغُرْفَةِ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ»[1].

**باسی فەرموودەیەكی شیكەرەوە (الْمُفَسِّرِ) بۆ ئەو دەستەواژە ناڕوونەی (مُجْمَل)ەی كە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەكەی: مانگ بیست و نۆیە، بەشێك لە مانگەكانی ساڵە نەك هەموویان، وە بەڵگەش لەسەر فەرموودەكەی: مانگ بیست و نۆیە واتە: هەندێ جار بیست و نۆیە**

واتە: عومەری كوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ لە خێزانەكانی كەنارگیر بوو، (بۆ ماوەی یەك مانگ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ بیست و نۆ ڕۆژ لە ژوورەكەت بووی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان مانگ بیست و نۆ ڕۆژەیش دەبێت (واتە: دەگونجێ هەندێ جاریش مانگ بیست و نۆ ڕۆژ بێت وەكوو چۆن سی ڕۆژ دەبێ).

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صِيَامَ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لِرَمَضَانَ كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِ ثَلَاثِينَ خِلَافَ مَا يَتَوَهَّمُ بَعْضُ الْجُهَّالِ، وَالرِّعَاعِ، أَنَّ الْوَاجِبَ أَنْ يُصَامَ لِكُلِّ رَمَضَانَ ثَلَاثُونَ يَوْمًا كَوَامِلَ

**١٩٢٢-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَمَا صُمْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرُ مِمَّا صُمْتُ مَعَهُ ثَلَاثِينَ[1].

## بەڵگە لەسەر ئەوەی ژمارەی ڕەمەزانەكان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بیست و نۆ ڕۆژ بووە زیاتر لەوەی سی ڕۆژ بێت، بە پێچەوانەی هەندێ كەسی تێنەگەیشتوو، وا دەزانن واجبە هەموو ڕەمەزانێك سی ڕۆژی تەواو بێ

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: ئەو مانگانەی بیست و نۆ ڕۆژ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو دەبووم زیاتر بوون لەو مانگانەی كە سی ڕۆژ لەگەڵی بەڕۆژوو بووم.

## بَابُ إِجَازَةِ شَهَادَةِ الشَّاهِدِ الْوَاحِدِ عَلَى رُؤْيَةِ الْهِلَالِ

**١٩٢٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَبْصَرْتُ الْهِلَالَ اللَّيْلَةَ، فَقَالَ: «أَتَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «قُمْ يَا فُلَانُ فَأَذِّنْ بِالنَّاسِ فَلْيَصُومُوا غَدًا»[2].

## باسی مۆڵەتدانی وەرگرتنی شایەتی یەك شایەت لەسەر بینینی یەكەم شەوی مانگ

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: دەشتەكییەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەمشەو مانگی یەكشەوەم بینی، فەرمووی: ئایا شایەتی ئەدەی بەوەی هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەرێتی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی فلان هەستە خەڵك ئاگادار بكەرەوە كە بەیانی بەڕۆژوو بن.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

**١٩٢٤-** عَنْ زَائِدَةَ بِهَذَا الْإِسْنَادِ وَنَحْوِهِ. وَقَالَ: أَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ بِالنَّاسِ[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە، وە وتی: فەرمانی بە بیلال کرد، ئەویش خەڵکی ئاگادار کردەوە.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ اللَّهَ ﷻ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ١٨٧﴾ البقرة، بَيَانَ بَيَاضِ النَّهَارِ مِنَ اللَّيْلِ، فَوَقَعَ اسْمَ الْخَيْطِ عَلَى بَيَاضِ النَّهَارِ، وَعَلَى سَوَادِ اللَّيْلِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّ الْعَرَبَ لَمْ تَكُنْ تَعْرِفُهَا فِي مَعْنَاهَا، وَأَنَّ اللَّهَ ﷻ إِنَّمَا أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِلُغَتِهِمْ لَا بِمَعَانِيهِمْ، فَالْخَيْطُ لُغَتُهُمْ، وَإِيقَاعُ هَذَا الِاسْمُ عَلَى بَيَاضِ النَّهَارِ وَسَوَادِ اللَّيْلِ، لَمْ يَكُنْ مِنْ مَعَانِيهِمُ الَّتِي يَفْهَمُونَهَا حَتَّى أَعْلَمَهُمْ ﷺ**

**١٩٢٥-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ١٨٧﴾ البقرة، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا ذَلِكَ بَيَاضُ النَّهَارِ مِنْ سَوَادِ اللَّيْلِ»[٢].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی خوا ﷻ مەبەستی لە فەرمایشتەکەی: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ١٨٧﴾، سپیایی ڕۆژە لە شەودا، جا ناوی (الْخَيْطِ) بۆ سپیایی ڕۆژ بەکار هاتووە، هەروەها بۆ تاریکیی شەویش، ئەمەش لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاندووە عەرەب ماناکەی نەدەزانی، بێگومان خوا کتێبی بەزمانی ئەوان ناردووە نەك بە ماناکانیان، جا (الْخَيْطِ) زمانی ئەوانە، وە بەکارهێنانی ئەم ناوە بۆ سپیایی ڕۆژ و تاریکیی شەو بەکار دێت، لەنێو ئەو مانایە نەبووە کە لێی تێگەیشتوون تا پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردنەوە**

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: کاتی ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ١٨٧﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان جیابوونەوەی سپیایی ڕۆژە لە تاریکیی شەو.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**١٩٢٦-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ؟ أَهُمَا الْخَيْطَانِ؟ قَالَ: «إِنَّكَ لَعَرِيضُ الْقَفَا أَرَأَيْتَ أَبْصَرْتَ الْخَيْطَيْنِ قَطُّ؟» ثُمَّ قَالَ: لَا بَلْ هُوَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ[١].

واتە: عەدی كوڕی حاتەم رضي الله عنه دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ) ئایا ئەوانە دوو گوریسن؟ فەرمووی: بەڕاستی پشتەملت پانە (واتە: لە شت حاڵی نابیت و تێنەگەیشتووی)، هەواڵم بدەرێ ئایا ئەو دوو گوریسەت بینی؟ (عەدی كوڕی حاتەم كە ئایەتەكە دابەزی هەموو شەوێك دوو گوریسی دەخستە ژێر سەری دانەیەكیان سپی و ئەوی دیكە ڕەش، كە پارشێو هەڵدەستا نانی دەخوارد جار جار دەچوو سەرینەكەی لادەدا تەماشای دەكردن كاتێ تاریك بووایە و لە یەكدی جیایانی نەكردایەتەوە نانی خۆی دەخوارد، بەڵام ئەگەر لە یەكدی جیایانی بكردایەتەوە دەستی هەڵدەگرت لە خواردن و خواردنەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەشێوەی گاڵتەكردن فەرمووی تۆ پشتەملت پانە، واتە: ئەو دوو گوریسە لەژێر سەرینی ئاسایی جێیان نابێتەوە، دیارە سەرینەكەی تۆ گەورەتر بووە)، پاشان فەرمووی: بەڵكوو ئەوە تاریكیی شەو و سپیایی ڕۆژە.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْفَجْرَ هُمَا فَجْرَانِ، وَأَنَّ طُلُوعَ الثَّانِي مِنْهُمَا هُوَ الْمُحَرِّمُ عَلَى الصَّائِمِ الْأَكْلَ وَالشُّرْبَ وَالْجِمَاعَ، لَا الْأَوَّلُ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ اللَّهَ عز وجل وَلَّى نَبِيَّهُ عَلَيْهِ السَّلَامُ الْبَيَانَ عَنْهُ عز وجل

**١٩٢٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْفَجْرُ فَجْرَانِ: فَأَمَّا الْأَوَّلُ فَإِنَّهُ لَا يُحَرِّمُ الطَّعَامَ، وَلَا يُحِلُّ الصَّلَاةَ، وَأَمَّا الثَّانِي فَإِنَّهُ يُحَرِّمُ الطَّعَامَ، وَيُحِلُّ الصَّلَاةَ»[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی (فجر) بەرەبەیان دوو بەرەبەیانە، جا لە دەركەوتنی دووەمیان خواردن و خواردنەوە و جیماع حەرام دەبێت نەك یەكەم، ئەمەش لەو شێوازەیە كە ڕامگەیاندووە بێگومان خوا عز وجل پێغەمبەرەكەی ﷺ ڕاسپاردووە فەرمایشتەكانی ڕوون بكاتەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرەبەیان دوو بەرەبەیانە: یەکەم بەرەبەیان خواردن و خواردنەوە تیایدا حەرام نییە، نوێژیش تیایدا حەڵاڵ نییە (مەبەستی نوێژی بەیانییە)، بەڵام دووەم خواردن و خواردنەوە تیایدا حەرامە و نوێژ تیایدا حەڵاڵە.

## بَابُ صِفَةِ الْفَجْرِ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ وَهُوَ الْمُعْتَرِضُ لَا الْمُسْتَطِيلُ

**١٩٢٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْنَعَنَّ أَذَانُ بِلَالٍ أَحَدًا مِنْكُمْ مِنْ سَحُورِهِ فَإِنَّهُ يُنَادِي أَوْ يُؤَذِّنُ لِيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ وَيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ. قَالَ: وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ، يَعْنِي الصُّبْحَ، هَكَذَا أَوْ قَالَ هَكَذَا، وَلَكِنْ حَتَّى يَقُولَ: هَكَذَا وَهَكَذَا - يَعْنِي طُولًا، وَلَكِنْ هَكَذَا - يَعْنِي عَرَضًا»[١].

## باسی سیفەتی ئەو بەرەبەیانەی کە باسمان کرد بەلای پانیدا بڵاو دەبێتەوە نەك بەلای درێژیدا

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با بانگدانی بیلال ڕێگری نەکات لە یەکێك ئێوە لە دەستهەڵگرتن لە پارشێوکردنی، چونکە ئەو بانگ دەکات، یان بانگ دەدات بۆ ئەوەی ئەوەتان خەوتووە بەخەبەر بهێنێتەوە و ئەوەشتان شەونوێژ دەکات پشوو بدات (بۆ ئەوەی ئەندازەیەك بخەوێت و بە چالاکییەوە هەستێت بۆ نوێژی بەیانی)، فەرمووی: شەبەق ئەوە نییە بڵێ بەوشێوە یان بڵێ: بەوشێوە (دای لە دەستی و بەرزی کردەوە)، بەڵکوو تا بڵێ: بەوشێوە و بەوشێوە، -واتە: بەدرێژی- بەڵکوو بەوشێوە- واتە: بەپانی.

**١٩٢٩-** عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَغُرَّنَّكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ، وَلَا هَذَا الْبَيَاضُ لِعَمُودِ الصُّبْحِ حَتَّى يَسْتَطِيرَ»[٢].

واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با بانگی بیلال فریوتان نەدات، هەروەها ئەم سپیاییەش کە ڕاست دەچێت بە ئاسماندا تا بەلای پانیدا بڵاو دەبێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْفَجْرَ الثَّانِي الَّذِي ذَكَرْنَاهُ هُوَ الْبَيَاضُ الْمُعْتَرِضُ الَّذِي لَوْنُهُ الْحُمْرَةُ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنِ النُّعْمَانِ هَذَا بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ، وَلَا أَعْرِفُ لَهُ عَنْهُ رَاوِيًا غَيْرَ مُلَازِمِ بْنِ عَمْرٍو

**١٩٣٠-** عَنْ مُلَازِمِ بْنِ عَمْرٍو، أنبأنَا عَبْدِ اللَّهِ بْنُ النُّعْمَانِ السُّحَيْمِيُّ، قَالَ: أَتَانِي قَيْسُ بْنُ طَلْقٍ فِي رَمَضَانَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي طَلْقُ بْنُ عَلِي ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَلَا يَغُرَّنَّكُمُ السَّاطِعُ الْمُصْعِدُ، وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الْأَحْمَرُ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەرەبەیانی دووەم کە باسمان کرد، بریتییە لە پانتاییەکی سپی ڕەنگەکەی سوور ئەڕوانێ، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم ئەم عەبدوڵای کوڕی نوعمانە دادپەروەرە یان لەکەدارە، وە نازانم کەسێکی دیکە لێیەوە گێڕابێتیەوە جگە لە مولازمی کوڕی عەمر

واتە: مولازمی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی نوعمانی سەمحی بۆی باس کردین وتی: قەیسی کوڕی تەڵق لە ڕەمەزان هات بۆ لامان وتی: باوکم تەڵقی کوڕی عەلی ﷺ بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوە، با ئەو درەوشاوەییەی کە سەرکەوتووە بەدرێژایی بۆ سەرەوە فریوتان نەدات، بخۆن و بخۆنەوە تا بن ئاسمان بەپانی سوور دەبێت. بەدەستی ئاماژەی بۆی کرد.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَذَانَ قَبْلَ الْفَجْرِ لَا يَمْنَعُ الصَّائِمَ طَعَامَهُ، وَلَا شَرَابَهُ، وَلَا جِمَاعًا ضِدَّ مَا يَتَوَهَّمُ الْعَامَّةُ

**١٩٣١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ»[٢].

---

(١) حديث حسن.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بانگدان پێش بەرەبەیان ڕێگر نییە لەبەردەم ڕۆژووەوان بخوات و بخواتەوە و جووت ببێت لەگەڵ هاوسەرەکانی، دژی ئەوەی خەڵکی بەگشتی وا خەیاڵ دەکەن بانگی پێش بەرەبەیان دەبێتە ڕێگر لەبەردەم خواردن و خواردنەوە و جووتبوون

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بیلال بەشەو بانگ دەدا، بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبنو ئوم مەکتوم بانگ دەدا.

## بَابُ ذِكْرِ قَدْرِ مَا كَانَ بَيْنَ أَذَانِ بِلَالٍ، وَأَذَانِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ

**١٩٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ». قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا قَدْرُ مَا يَنْزِلُ هَذَا، وَيَرْقَى هَذَا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ مِنَ الْأَخْبَارِ الْمُعَلَّلَةِ الَّتِي يَجُوزُ الْقِيَاسُ عَلَيْهَا، وَيَتَعَيَّنُ الْعِلْمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا أَمَرَ بِالْأَكْلِ وَالشُّرْبِ بَعْدَ نِدَاءِ بِلَالٍ أَعْلَمَهُمْ أَنَّ الْجِمَاعَ وَكُلَّ مَا جَازَ لِلْمُفْطِرِ فِعْلَهُ فَجَائِزٌ فِعْلُهُ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ، لَا أَنَّهُ أَبَاحَ الْأَكْلَ وَالشُّرْبَ فَقَطْ دُونَ غَيْرِهِمَا.

## باسی ئەندازەی نێوان بانگی بیلال و بانگی ئیبنو ئوم مەکتوم

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بیلال بەشەو بانگ دەدا، بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبنو ئوم مەکتوم بانگ دەدات، وتی: نێوانیان تەنها ئەوەندە بوو ئەمیان دابەزێ و ئەویان بچێتە سەرەوە (بۆ بانگدان).

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە کە دەڵێم لەو فەرموودانەیە دروستە قیاسیان لەسەر بکرێت، زانست ئەوە دەچەسپێنێ پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی بە خواردنەوە و خواردن کردن دوای بانگدانی بیلال، زانیاری پێ دان کە جووتبوون و ئەوەی بۆ کەسی ڕۆژوونەگر دروستە بەهەمان شێوە دروستە لەو کاتەدا بکرێ، نەك تەنها خواردن و خواردنەوە ڕێگەپێدراو بێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِيجَابِ الْإِجْمَاعِ عَلَى الصَّوْمِ الْوَاجِبِ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ بِلَفْظٍ عَامٍّ، مُرَادُهُ خَاصٌّ

١٩٣٣- عَنْ حَفْصَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَجْمَعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلَا صِيَامَ لَهُ»(١).

## باسی پێویستبوونی نییەتهێنان لەسەر ڕۆژووی واجب پێش دەرچوونی بەرەبەیان، بە دەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: حەفصە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەودا نییەتی ڕۆژووی نەهێنابێت، ئەوە ڕۆژووی بۆ نییە (بەری ناکەوێت).

## بَابُ إِيجَابِ النية لِصَوْمِ كُلِّ يَوْمٍ قَبْلَ طُلُوعِ فَجْرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ، خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ نية وَاحِدَةً فِي وَقْتٍ وَاحِدٍ لِجَمِيعِ الشَّهْرِ جَائِزٌ

١٩٣٤- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنية، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى» قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الْوُضُوءِ(٢).

## باسی پێویستبوونی نییەتهێنان بۆ ڕۆژووگرتنی هەموو ڕۆژێك پێش دەرچوونی بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە، بەپێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات یەك نییەتهێنان بۆ هەموو مانگەکە دروستە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ: بەڕاستی کردەوەکان بەپێی نییەت و مەبەستەکانن، هەموو کەسێکیش بەپێی نییەت و مەبەستی خۆیەتی، نووسیومە لە پەرتووکی دەستنوێژ گرتندا.

---

(١) إسناده معلول بالوقف.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَجْمِعِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، الْوَاجِبَ مِنَ الصِّيَامِ دُونَ التَّطَوُّعِ مِنْهُ

**١٩٣٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: حَدِيثُ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْتِيهَا فَيَقُولُ: «هَلْ عِنْدَكُمْ غَدَاءٌ، وَإِلَّا، فَإِنِّي صَائِمٌ خَرَّجْتُهُ فِي ذِكْرِ صِيَامِ التَّطَوُّعِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: ڕۆژوو نییە بۆ کەسێك کە لە شەودا نییەتی نەهێنا بێت ڕۆژووی واجبە نەك سوننەت

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی عائیشە ﵂، پێغەمبەر ﷺ دەهات بۆ لای دەیوت: ئایا خواردنێکت لەلایە، ئەگەر نییە، ئەوە من بەڕۆژووم، لە باسی ڕۆژووی سوننەت باسم کرد

## بَابُ الْأَمْرِ بِالسَّحُورِ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ، إِذِ السَّحُورُ بَرَكَةٌ، لَا أَمْرُ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ، يَكُونُ تَارِكُهُ عَاصِيًا بِتَرْكِهِ

**١٩٣٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»[٢].

## باسی فەرمان بە پارشێوکردن فەرمانێکە بە مەبەستی بەچاکدانان و ڕێنیشاندان، چونکە پارشێو کردن فەڕ و بەرەکەتە، نەك فەرمانێك بێت بۆ فەڕز و واجببوون، ئەو کەسەی پێی هەڵنەسابێت سەرپێچی کردبێت

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێوکردندا فەڕ و بەرەکەت هەیە.

**١٩٣٧-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) المتن صحيح كما في الذي بعده، وهذا إسناد معلول بالوقف.

(٣) صحيح.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێوکردندا فەڕ و بەرەکەت هەیە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ أَنَّ السَّحُورَ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ الْغَدَاءِ

**١٩٣٨-** عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو رَجُلًا إِلَى السَّحُورِ، فَقَالَ: «هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ»(١).

## باسی بەڵگە کە هەندێ جار پارشێوکردن ناوی خواردنی (نیوەڕۆ یان ئێوارەی) لێ دەنرێت

واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی پیاوێکی کرد بۆ پارشێو فەرمووی: بەپەلە بێ بۆ لای خواردنێکی بەفەڕ و بەرەکەت (واتە: پارشێو).

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاسْتِعَانَةِ عَلَى الصَّوْمِ بِالسَّحُورِ إِنْ جَازَ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِ زَمْعَةَ بْنِ صَالِحٍ فَإِنْ فِي الْقَلْبِ مِنْهُ؛ لِسُوءِ حِفْظِهِ

**١٩٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اسْتَعِينُوا بِطَعَامِ السَّحَرِ عَلَى صِيَامِ النَّهَارِ، وَبِقَيْلُولَةِ النَّهَارِ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ»(٢).

## باسی فەرمانکردن بە پشتبەستن لەسەر ڕۆژوو بە خواردنی پارشێو، ئەگەر دروست بێت فەرموودەکەی زەمعەی کوڕی صالح بە بەڵگە وەربگیرێ، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی خراپی لەبەرکردنی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پشت ببەستن بە خواردنی پارشێو لەسەر ڕۆژووی ڕۆژ، وە بە قەیلولەی ڕۆژ لەسەر شەونوێژ. (قەیلولە: خەوتنێکە لە کاتی نیوەڕۆ بۆ ماوەی نزیك لە نیو کاتژمێر).

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ السَّحُورِ فَضْلًا مِنْ صِيَامِ النَّهَارِ، وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَالْأَمْرِ بِمُخَالَفَتِهِمْ إِذْ هُمْ لَا يَتَسَحَّرُونَ

**١٩٤٠-** عَنْ أَبِي قَيْسٍ مَوْلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﭬ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا، وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أُكْلَةُ السَّحُورِ»(١).

## باسی چاکتر وایە پارشێو بکرێ بۆ ئەوەی ببێتە جیاکەرەوە لەگەڵ ڕۆژووی خاوەن کتێبەکان، هەروەها فەرمانکردن بە پێچەوانەبوونیان، چونکە ئەوان پارشێو ناکەن

واتە: ئەبو قەیس مەولای عەمری کوڕی عاص ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی خاوەن کتێبەکان خواردنی پارشێوە.

## بَابُ تَأْخِيرِ السَّحُورِ

**١٩٤١-** عَنْ قَتادةَ عن أنسٍ عَن زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﭬ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: قَدْرُ قِرَاءَةِ خَمْسِينَ آيَةً(٢).

## باسی دواخستنی پارشێو

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، لە ئەنەس لە زەیدی کوڕی سابیتەوە ﭬ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەستاین بۆ نوێژی (بەیانی)، وتم: نێوانیان چەند بوو؟ وتی: بە ئەندازەی ئەوەی کەسێك پەنجا ئایەت بخوێنێت.

**١٩٤٢-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﭬ يَقُولُ: كُنْتُ أَتَسَحَّرُ فِي أَهْلِي، ثُمَّ تَكُونُ سُرْعَةٌ بِي أَنْ أُدْرِكَ صَلَاةَ الصُّبْحِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من لەلای خێزانم پارشێوم دەکرد، پاشان پەلەم دەکرد تا بگەم بە نوێژی بەیانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ اللَّوَاتِي تُفْطِرِ الصَّائِمِ

## بَابُ ذِكْرِ الْمُفْطِرِ بِالْجِمَاعِ فِي نَهَارِ الصِّيَامِ

**١٩٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ رَجُلًا أَفْطَرَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ بِعِتْقِ رَقَبَةٍ، أَوْ صِيَامِ شَهْرَيْنِ، أَوْ إِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَقَالَ مَالِكٌ فِي عَقِبِ خَبَرِهِ: وَكَانَ فِطْرُهُ بِجِمَاعٍ[١].

## کۆباسی ئەو کردەوانەی ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشکێنن

## باسی ئەو کەسەی لە مانگی ڕەمەزان ڕۆژووەکەی بە جووتبوون دەشکێنێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە مانگی ڕەمەزان ڕۆژووی شکاندبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد کۆیلەیەك ئازاد بکات، یان دوو مانگ بەڕۆژوو بێت، یان خواردنی شەست هەژار بدات. مالیك (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە) دوای فەرموودەکە وتی: ڕۆژووشکاندنەکەی بەهۆی جووتبوونەوە بوو.

## بَابُ إِيجَابِ الْكَفَّارَةِ عَلَى الْمُجَامِعِ فِي الصَّوْمِ فِي رَمَضَانَ بِالْعِتْقِ إِذَا وَجَدَهُ، أَوِ الصِّيَامِ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْعِتْقَ، أَوِ الْإِطْعَامِ إِذَا لَمْ يَسْتَطِعِ الصَّوْمِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ خَبَرَ ابْنِ جُرَيْجٍ وَمَالِكٍ مُخْتَصَرٌ غَيْرُ مُتَقَصًّى مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّفْظَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ فِي خَبَرِهِمَا كَانَ فِطْرًا بِجِمَاعٍ لَا بِأَكْلٍ، وَلَا بِشُرْبٍ، وَلَا هُمَا.

**١٩٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: هَلَكْتُ، فَقَالَ: «وَمَا أَهْلَكَكَ؟» قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَقَالَ: «هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُعْتِقَ رَقَبَةً؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «اجْلِسْ»، فَجَلَسَ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، قَالَ: «وَالْعَرَقُ هُوَ الْمِكْتَلُ الضَّخْمُ»، قَالَ: خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعَلَى أَهْلِ بَيْتٍ أَفْقَرَ مِنَّا؟

---

(١) صحيح.

فَمَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرَ مِنَّا فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، وَقَالَ: «اذْهَبْ فَأَطْعِمْ أَهْلَكَ»(١).

## باسی ئەو کەسەی لە مانگی ڕەمەزان لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بوو کەفارەتەکەی بریتییە لە ئازادکردنی بەندەیەك ئەگەر لە توانایدا بوو، یان ناندان ئەگەر توانای ڕۆژووی نەبوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی ئیبنو جورەیج و مالیك (فەرموودەی ژمارە ١٣٤٩) کورت و پوختە و درێژ نییە، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو دەستەواژەی لە فەرموودەکەی هەردووکیان باسمان کرد ڕۆژووشکاندن بوو بەجووتبوون نەك بەخواردن یان خواردنەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: تیا چووم؟ فەرمووی: چیت لێ قەوماوە؟ وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەم جوت بووم لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژ، فەرمووی: ئایا دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی دەتوانیت دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی دەتوانیت نانی شەست هەژار بدەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دانیشە، دواتر (الْعَرَقُ) سەبەتەیەکی گەورەی خورما بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، -وتی: (الْعَرَقُ): واتە: سەبەتەیەکی گەورە- فەرمووی: ئەمە ببە و ببیەخشە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بۆ خانەوادەیەك لە من هەژارتر بێت؟ لە نێوان ئەم دوو زنجیرە چیایەدا لە ئێمە هەژارتری تێدا نییە، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: بڕۆ ببیەرەوە بۆ خێزانەکەت.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْإِمَامِ الْمُجَامِعَ فِي رَمَضَانَ نَهَارًا مَا يُكَفِّرُ بِهِ إِذَا لَمْ يَكُنْ وَاجِدًا لِلْكَفَّارَةِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُجَامِعَ فِي رَمَضَانَ نَهَارًا إِذَا كَانَ غَيْرَ وَاجِدٍ لِلْكَفَّارَةِ وَقْتَ الْجِمَاعِ، ثُمَّ اسْتَفَادَ مَا بِهِ يُكَفِّرُ، كَانَتِ الْكَفَّارَةُ وَاجِبَةً عَلَيْهِ

**١٩٤٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ الْآخَرَ وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ فِي رَمَضَانَ، قَالَ: فَقَالَ لَهُ: «أَتَجِدُ مَا تُحَرِّرُ رَقَبَةً؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «أَفَتَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «أَفَتَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟» قَالَ: لَا، قَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

---

(١) صحيح.

بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ وَهُوَ الزِّنْبِيلُ، فَقَالَ: «أَطْعِمْ هَذَا عَنْكَ»، فَقَالَ: مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجَ مِنَّا قَالَ: «فَأَطْعِمْ أَهْلَكَ»[١].

## باسی پێشەوای مسوڵمانان خواردن دەدات بەوکەسەی لە ڕۆژی مانگی ڕەمەزان لە کاتی بەڕۆژووبوون لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بووە، تا بیکاتە کەفارەتی ئەو کارەی کردوویەتی، ئەگەر ئەو کەسە دەستکورت و نەدار بوو، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی لە مانگی ڕەمەزان جووت بوو، وە هیچی نەبوو کەفارەتی بدات لە کاتی جووتبوون، پاشان ئەوەندەی دەستکەوت کەفارەتی بدات ئەوە کەفارەت پێویست دەبێت لەسەری

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وت: ئەو پیاوە لە مانگی ڕەمەزان لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بووە، پێی فەرموو: ئایا دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی دەتوانیت دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی دەتوانیت نانی شەست هەژار بدەیت؟ وتی: نەخێر، وتی: دواتر (الْعَرَقُ) سەبەتەیەکی گەورە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات خورمای تێدا بوو، ئەویش فەرمووی: ئەمە لە بری خۆت ببەخشە، وتی: لە نێوان ئەم دوو زنجیرە چیایەدا لە ئێمە هەژارتری تێدا نییە، بۆیە فەرمووی: بیدە بە خێزانەکەت و بیخۆن.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ مُخْتَصَرًا وَهِمَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ مِنَ الْحِجَازِيِّينَ، أَنَّ الْمُجَامِعَ فِي رَمَضَانَ نَهَارًا جَائِزٌ لَهُ أَنْ يُكَفِّرَ بِالْإِطْعَامِ، وَإِنْ كَانَ وَاجِدًا لِعِتْقِ رَقَبَةٍ، مُسْتَطِيعًا لِصَوْمِ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ

١٩٤٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: أَتَى رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، احْتَرَقْتُ، فَسَأَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ «مَا شَأْنُهُ»، فَقَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِيَ، قَالَ: «تَصَدَّقْ»، قَالَ: وَاللَّهِ مَا لِي شَيْءٌ وَمَا أَقْدِرُ عَلَيْهِ، قَالَ: «اجْلِسْ»، فَجَلَسَ، فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ رَجُلٌ يَسُوقُ حِمَارًا عَلَيْهِ طَعَامٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيْنَ الْمُحْتَرِقُ؟» فَقَامَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَصَدَّقْ بِهَذَا، فَقَالَ: «عَلَى غَيْرِنَا فَوَاللَّهِ إِنَّا لَجِيَاعٌ، وَمَا لَنَا شَيْءٌ قَالَ: فَكُلُوهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە زانایانی حیجاز بەهەڵە لێی تێگەیشتوون، پێیان وایە: ئەو کەسەی لە ڕەمەزان جووت دەبێت بە ڕۆژ کاتێ کە بەڕۆژووە، دروستە بۆی خواردن بدات بە کەفارەت، ئەگەرچی توانای ڕزگارکردنی کۆیلەشی هەبێت، یان توانای هەبێت دوو مانگ بەدوای یەکدی ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت لە ڕەمەزاندا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سووتام، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد کێشەت چییە؟ وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەم جووت بووم، فەرمووی: ببەخشە، وتی: سوێند بە خوا توانای هیچم نییە ببیەخشم، فەرمووی: دانیشە، ئەویش دانیشت، لە کاتێکدا ئەو لەو حاڵەدا بوو پیاوێك هات گوێدرێژێکی لێدەخوڕی خواردنی بەسەرەوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سووتاوەکە لە کوێیە؟ پیاوەکە هەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە ببەخشە، وتی: بە جگە لە خۆمان، سوێند بە خوا ئێمە برسین و هیچمان نییە، فەرمووی: بۆ خۆتان بیخۆن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، إِنَّمَا أَمَرَ هَذَا الْمُجَامِعَ بِالصَّدَقَةِ بَعْدَ أَنْ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ لَا يَجِدُ عِتْقَ رَقَبَةٍ، وَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ قَدْ أُعْلِمَ أَيْضًا أَنَّهُ غَيْرُ مُسْتَطِيعٍ لِصَوْمِ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ كَإِخْبَارِ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَاخْتُصِرَ الْخَبَرُ

**١٩٤٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ظِلِّ فَارِعٍ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي بَيَاضَةَ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، احْتَرَقْتُ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا لَكَ؟» قَالَ: وَقَعْتُ بِامْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْتِقْ رَقَبَةً»، قَالَ: لَا أَجِدُهُ، قَالَ: «أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا»، قَالَ: لَيْسَ عِنْدِي، قَالَ: «اجْلِسْ»، فَجَلَسَ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ عِشْرُونَ صَاعًا، فَقَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ آنِفًا؟» قَالَ: هَا أَنَا ذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلَى أَحْوَجَ مِنِّي وَمِنْ أَهْلِي؟ فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا لَنَا عَشَاءُ لَيْلَةٍ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَعُدْ بِهِ عَلَيْكَ وَعَلَى أَهْلِكَ». لَمْ يُذْكَرِ الصَّوْمُ فِي الْخَبَرِ[1].

---

(١) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنْ ثَبَتَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ، بِعَرَقٍ فِيهِ عِشْرُونَ صَاعًا، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ هَذَا الْمُجَامِعَ أَنْ يُطْعِمَ كُلَّ مِسْكِينٍ ثُلُثَ صَاعٍ مِنْ تَمْرٍ؛ لِأَنَّ عِشْرِينَ صَاعًا إِذَا قُسِّمَ بَيْنَ سِتِّينَ مِسْكِينًا كَانَ لِكُلِّ مِسْكِينٍ ثُلُثُ صَاعٍ، وَلَسْتُ أَحْسِبُ هَذِهِ اللَّفْظَةَ ثَابِتَةً، فَإِنَّ فِي خَبَرِ الزُّهْرِيِّ: أُتِيَ بِمِكْتَلٍ فِيهِ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، أَوْ عِشْرُونَ صَاعًا، هَذَا فِي خَبَرِ مَنْصُورِ بْنِ الْمُعْتَمِرِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. فَأَمَّا هِقْلُ بْنُ زِيَادٍ فَإِنَّهُ رَوَى، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، قَدْ خَرَّجْتُهُمَا بَعْدُ، وَلَا أَعْلَمُ أَحَدًا مِنْ عُلَمَاءِ الْحِجَازِ وَالْعِرَاقِ قَالَ: يُطْعِمُ فِي كَفَّارَةِ الْجِمَاعِ كُلَّ مِسْكِينٍ ثُلُثَ صَاعٍ فِي رَمَضَانَ. قَالَ أَهْلُ الْحِجَازِ: يُطْعِمُ كُلَّ مِسْكِينٍ مُدًّا مِنْ طَعَامٍ، تَمْرًا كَانَ أَوْ غَيْرَهُ، وَقَالَ الْعِرَاقِيُّونَ: يُطْعِمُ كُلَّ مِسْكِينٍ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَأَمَّا ثُلُثُ صَاعٍ فَلَسْتُ أَحْفَظُ عَنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ تَرْكُ ذِكْرِ الْأَمْرِ بِصِيَامِ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ فِي هَذَا الْخَبَرِ إِنَّمَا كَانَ؛ لِأَنَّ السُّؤَالَ فِي هَذَا الْخَبَرِ إِنَّمَا كَانَ فِي رَمَضَانَ قَبْلَ أَنْ يَقْضِيَ الشَّهْرَ، وَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ لِهَذِهِ الْحَوْبَةِ لَا يُمْكِنُ الِابْتِدَاءُ فِيهِ إِلَّا بَعْدَ أَنْ يَقْضِيَ شَهْرَ رَمَضَانَ وَبَعْدَ مُضِيِّ يَوْمٍ مِنْ شَوَّالٍ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ الْمُجَامِعَ بِإِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا، إِذِ الْإِطْعَامُ مُمْكِنٌ فِي رَمَضَانَ لَوْ كَانَ الْمُجَامِعُ مَالِكًا لِقَدْرِ الْإِطْعَامِ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ مِمَّا يَجُوزُ لَهُ فِعْلُهُ مُعَجَّلًا، دُونَ مَا لَا يَجُوزُ لَهُ فِعْلُهُ إِلَّا بَعْدَ مُضِيِّ أَيَّامٍ وَلَيَالٍ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ وَلَسْتُ أَحْفَظُ فِي شَيْءٍ مِنْ أَخْبَارِ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ السُّؤَالَ مِنَ الْمُجَامِعِ قَبْلَ أَنْ يَنْقَضِيَ شَهْرُ رَمَضَانَ، فَجَازَ إِذَا كَانَ السُّؤَالُ بَعْدَ مُضِيِّ رَمَضَانَ أَنْ يُؤْمَرَ بِصِيَامِ شَهْرَيْنِ؛ لِأَنَّ الصِّيَامَ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ لِلْكَفَّارَةِ جَائِزَةٌ».

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی کرد بەوکەسەی جووت بوو ببەخشێ، دوای ئەوە بووە کە هەواڵی پێداوە، ئەو ناتوانێت کۆیلەك ئازاد بکات، وە پێدەچێ پێغەمبەر ﷺ زانیاری پێدرابێ ئەو پیاوە ناتوانێت دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بێ، وەك فەرموودەکانی ئەبو هورەیرە، ئەم فەرموودەش کورتکراوەتەوە

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سێبەرێك دانیشتبوو، پیاوێك لە نەوەکانی بەیاضە هات بۆ لای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سووتام، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چیتە؟ وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەم جووت بووم لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووم، لە ڕەمەزاندا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەندەیەك ئازاد بکە، وتی: توانام نییە، فەرمووی: خواردنی شەست کەسی هەژار بدە، وتی: توانام نییە، فەرمووی: دانیشە، ئەویش

دانیشت، دواتر سەبەتەیەکی گەورە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بیست (صاع) مەن خورمای تێدا بوو، فەرمووی: ئەو کەسەی کەمێك پێش ئێستا پرسیاری کرد لەکوێیە؟ وتی: ئا بەڵێ لێرەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەمە ببە و ببەخشە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ خانەوادەیەك لە من و خێزانەکەم هەژارتر هەبێت؟ سوێند بەوەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە، خواردنی شەوێکمان نییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ببیەوە بۆ خۆت و خێزانەکەت. لە فەرموودەکە باسی ڕۆژوو (گرتنی دوو مانگ) نەکراوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر ئەو دەستەواژەیە جێگیر بێت: (بِعَرَقٍ فِيهِ عِشْرُونَ صَاعًا)، واتە: سەبەتەیەکی گەورە بیست مەن خورمای تێدا بوو. ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەوکەسەی جووت بووە لەگەڵ خێزانی بۆ هەر هەژارێك سێیەکی مەنێك خورما بدات، چونکە بیست مەن ئەگەر دابەش کرا لە نێوان شەست هەژار ئەوە هەر هەژارێك سێیەکی مەنێکی دەکەوێت، پێم وا نییە ئەو دەستەواژەیە جێگیر بێت، چونکە لە فەرموودەکەی زوهری: (أُتِيَ بِمِكْتَلٍ فِيهِ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، أَوْ عِشْرُونَ صَاعًا)، واتە: سەبەتەیەکی گەورەی بۆ هێنرا پازدە مەن یان بیست مەن دەبوو. ئەمە لە فەرموودەکەی مەنصوری کوڕی موعتەمیر لە زوهرییەوە، بەڵام هیقلی کوڕی زیاد ئەو گێڕاویەتەوە لە ئەوزاعی لە زوهرییەوە دەڵێ: (خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا) پازدە صاعە، هەردوو فەرموودەکەم لەدوای ئەمە هێناوە، زانیاریم نییە کەسێك لە زانایانی حیجاز و عێراق و تبێتی: لە کەفارەتی جووتبوون لە ڕەمەزاندا بۆ هەر هەژارێك سێیەکی مەنێك خورما دەدرێت، خەڵکی حیجاز وتوویانە: بۆ هەر هەژارێك گوێلێك لە خواردن بدات بە کەفارەت، خورما بێت یان جگە لە خورما. عێراقییەکان دەڵێن: بۆ هەر هەژارێك مەنێك لە خورما دەدات، بەڵام سێیەکی مەنێك لە هیچ یەکێکیانەوە نەمبیستووە وتبێتی.

ئەبو بەکر دەڵێ: دەکرێ لەم فەرموودە فەرمانی بە بەڕۆژووبوونی دوو مانگی نەکردبێت بەدوای یەکدیدا، چونکە پرسیارەکە لەم فەرموودە لە مانگی ڕەمەزاندا کراوە، ڕۆژووگرتنی دوو مانگ لەو کاتەدا گونجاو نییە، مەگەر دوای ڕەمەزان و دوای ڕۆیشتنی ڕۆژێك لە مانگی شەوال، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەوکەسەی

جووت بوو نانی شەست هەژار بدات، چونکە لە ڕەمەزاندا خواردن گونجاوە ئەگەر جووت بوو بتوانێت خواردن بدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردووە بە شتێك کە دەکرێ بەپەلە ئەنجام بدرێت، نەك شتێك دروست نییە ئەنجام بدرێت مەگەر دوای ڕۆیشتنی ڕۆژگار و شەوانێك نەبێت، خوا زاناترە، هیچ یەکێك لە فەرموودەکانی ئەبو هورەیرەم لەبەر نییە پرسیاری جووتبوون پێش تەواوبوونی ڕەمەزان بووبێت، ئەگەر پرسیارەکە دوای ڕەمەزان بوو دروستە فەرمان بکرێت بە ڕۆژووگرتنی دوو مانگ، چونکە ڕۆژووگرتن لەو کاتەدا بۆ کەفارەت دروستە.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُجَامِعَ فِي رَمَضَانَ إِذَا مَلَكَ مَا يُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَلَمْ يَمْلِكْ مَعَهُ قُوتَ نَفْسِهِ وَعِيَالِهِ، لَمْ تَجِبْ عَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ

**١٩٤٨-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَائِشَةَ ﵂ قَالَ: إِنَّا لَجِيَاعٌ مَا لَنَا شَيْءٌ. هَذَا فِي خَبَرِ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ: مَا لَنَا عَشَاءُ لَيْلَةٍ. وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَحْوَجَ مِنَّا[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر کەس لە ڕەمەزاندا جووت بوو ئەگەر توانی خواردنی شەست کەس بدات، لەگەڵ ئەوەدا خواردنی بژێوی خۆی و خێزانەکەی نەبوو، کەفارەتی لەسەر پێویست نابێت

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عائیشە ﵂ هاتووە، وتی: ئێمە خۆمان برسین هیچمان نییە. ئەمە لە فەرموودەکەی عەمری کوڕی حاریس، وە لە فەرموودەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریس: خواردنی ئێوارەمان نییە، وە لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە: لە نێوان ئەو دوو زنجیرە چیایە کەس نییە زیاتر لە ئێمە پێویستی پێی بێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاسْتِغْفَارِ لِلْمَعْصِيَةِ الَّتِي ارْتَكَبَهَا الْمُجَامِعُ فِي صَوْمِ رَمَضَانَ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْكَفَّارَةَ بِعِتْقٍ، وَلَا بِإِطْعَامٍ، وَلَا يَسْتَطِيعُ صَوْمَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، وَالْأَمْرِ بِإِطْعَامِ التَّمْرِ فِي كَفَّارَةِ الْجِمَاعِ فِي رَمَضَانَ

---

(١) صحيح.

**١٩٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكْتُ، قَالَ: «وَيْحَكَ مَا شَأْنُكَ؟» قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى أَهْلِي فِي رَمَضَانَ، قَالَ: «أَعْتِقْ رَقَبَةً»، قَالَ: مَا أَجِدُهَا، قَالَ: «صُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ»، قَالَ: مَا أَسْتَطِيعُ، قَالَ: أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا»، قَالَ: مَا أَجِدُهُ، قَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: «خُذْهُ وَتَصَدَّقْ بِهِ»، قَالَ: مَا أَجِدُ أَحَقَّ بِهِ مِنْ أَهْلِي، يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا بَيْنَ طُنُبَيِ الْمَدِينَةِ أَحَدًا أَحْوَجَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، قَالَ: «خُذْهُ وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ»[1].

## باسی فەرمانکردن بەداوای لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی کردووە لە مانگی ڕەمەزاندا، بەزمانی بەڕۆژوو جووت بووە، ئەگەر نەیتوانی کەفارەت بدات، بەندەیەك ئازاد بکات، یان دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بێت، وە فەرمانکردن بەوەی خورما وەکو کەفارەت بدات لە کەفارەتی جووتبوون لە مانگی ڕەمەزان

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من دانیشتبووم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێك هات بۆ خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تیا چووم، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ چیت لێ قەوماوە؟ وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەم جوت بووم لە مانگی ڕەمەزاندا، فەرمووی: بەندەیەك ئازاد بکە، وتی: هیچ بەندەیەکم نییە، فەرمووی: دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بە، وتی: ناتوانم، فەرمووی: نانی شەست هەژار بدە، وتی: توانام نییە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەبەتەیەکی خورمای بۆ هات، فەرمووی: ئەمە ببە و ببیەخشە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس نابینم لە خێزانی من لەپێشتر بێت، لە نێوان ئەم دوو زنجیرە چیای مەدینە کەس لە من هەژارتری تێدا نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت، فەرمووی: ببەرەوە و داوای لێخۆشبوون لە خوا ﷻ بکە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ قَدْرِ مِكْيَلِ التَّمْرِ لِإِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا فِي كَفَّارَةِ الْجِمَاعِ فِي صَوْمِ رَمَضَانَ

**١٩٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. وَقَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِكْتَلٍ فِيهِ خَمْسَةَ عَشَرَ أَوْ عِشْرُونَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُذْهُ، فَأَطْعِمْهُ عَنْكَ»[١].

## باسی خەمڵاندنی پێوانەی خورما بۆ خواردنی شەست هەژار لە کەفارەتی جووتبوون لە مانگی ڕەمەزاندا

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد-. وە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەبەتەیەك خورمای بۆ هات پازدە یان بیست (صَاع) مەن خورما دەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیبە و لەجیاتی خۆت بیبەخشە.

**١٩٥١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. وَقَالَ: «فَأُتِيَ بِمِكْتَلٍ فِيهِ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، أَوْ عِشْرِينَ صَاعًا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وە وتی: پێغەمبەر ﷺ سەبەتەیەك خورمای بۆ هات پازدە یان بیست (صَاع) مەن خورما دەبوو.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى خِلَافِ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ إِطْعَامَ مِسْكِينٍ وَاحِدٍ طَعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا فِي سِتِّينَ يَوْمًا، كُلَّ يَوْمٍ طَعَامُ مِسْكِينٍ جَائِزٌ فِي كَفَّارَةِ الْجِمَاعِ فِي صَوْمِ رَمَضَانَ، فَلَمْ يُمَيِّزْ بَيْنَ إِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَبَيْنَ طَعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَمَنْ فَهِمَ لُغَةَ الْعَرَبِ عَلِمَ أَنَّ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا لَا يَكُونُ إِلَّا وَكُلُّ مِسْكِينٍ غَيْرَ الْآخَرِ

**١٩٥٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ الزُّهْرِيِّ: أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە (إِطْعَامِ) خواردنپێدانی یەك هەژار لە شەست ڕۆژدا (وەکوو) (طَعَامِ) خواردندانی شەست هەژار وایە، دروستە هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك لە کەفارەتی جووتبوون لە مانگی ڕەمەزاندا بدرێت، ئەو کەسە نێوانی (إِطْعَامِ) خواردنپێدانی شەست هەژار و (طَعَامِ) خواردنی شەست هەژاری لە یەکدی جیای نەکردۆتەوە، هەر کەس تێگەیشتبێت لە زمانی عەرەب دەزانێ (إِطْعَامِ) خواردنپێدانی شەست هەژار نابێت مەگەر هەر هەژارێك لەوی دیکە جیا بێت**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی زوهری هاتووە: خواردن بدە بە شەست هەژار.

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صِيَامَ الشَّهْرَيْنِ فِي كَفَّارَةِ الْجِمَاعِ لَا يَجُوزُ مُتَفَرِّقًا إِنَّمَا يَجِبُ صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ.**

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دروست نییە دوو مانگ ڕۆژووگرتن لە کەفارەتی جووتبوون بەجیاجیا، بەڵکوو پێویستە ئەو دوو مانگە بەدوای یەکدیدا بێت، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی زوهری، لە حومەید، لە ئەبو هورەیرە هاتووە: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، واتە: دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بە**

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُجَامِعَ إِذَا وَجَبَ عَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ فَفَرَّطَ فِي الصِّيَامِ، حَتَّى تَنْزِلَ بِهِ الْمَنِيَّةُ، قُضِيَ الصَّوْمُ عَنْهُ، كَالدَّيْنِ يَكُونُ عَلَيْهِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ دَيْنَ اللَّهِ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ مِنْ دُيُونِ الْعِبَادِ**

**١٩٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ أُخْتِي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: «لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكَ دَيْنٌ، أَكُنْتِ تَقْضِينَهُ؟» قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «فَحَقُّ اللَّهِ أَحَقُّ»[١].

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی جووت بووە لە مانگی ڕەمەزاندا بەزمانی بەڕۆژوو، پێویستە لەسەری دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بێت، بەڵام کەمتەرخەمی کرد لە گرتنیدا تا مرد، لەبەر ئەو ڕۆژووەکە دەگیرێتەوە، وەکو قەرزێك کە لەسەریەتی، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قەرزی خوا لەپێشترە بە دانەوەی لە قەرزی بەندەکان**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: بەڕاستی خوشکەکەم مرد و دوو مانگ ڕۆژووی بەدوای یەکدیدا لەسەر بوو، فەرمووی: ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بووایە ئایا تۆ قەرزەکەت بۆی دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: حەقی خوا لەپێشترە.

## بَابُ أَمْرِ الْمُجَامِعِ بِقَضَاءِ صَوْمِ يَوْمٍ مَكَانَ الْيَوْمِ الَّذِي جَامَعَ فِيهِ إِذَا لَمْ يَكُنْ وَاجِدًا لِلْكَفَّارَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا قَبْلُ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذِهِ اللَّفْظَةِ

**١٩٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ وَقَعَ بِأَهْلِهِ فِي رَمَضَانَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. وَقَالَ فِي آخِرِهِ: «فَصُمْ يَوْمًا وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ»[١].

**باسی فەرمان کراوە بەوکەسەی جووت بووە یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لەجێگای ئەو ڕۆژەی تیایدا جووت بووە، ئەگەر ئەو کەفارەتەی نەبوو کە باسم کرد لە پێشەوە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەو دەستەواژەیە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزان لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بووبوو، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد-. لە کۆتاییەکەیدا فەرمووی: ڕۆژێك بەڕۆژوو بە و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە.

**١٩٥٥-** عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ قَالَ: الْحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ الزُّهْرِيِّ شَيْئًا[٢].

واتە: ئیبنو لموبارەك دەڵێ: حەجاجی کوڕی ئەرتات لە زوهرییەوە هیچی نەبیستووە.

---

(١) إسناده شاذ.

(٢) حسن.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الِاسْتِقَاءَ عَلَى الْعَمْدِ يُفْطِرُ الصَّائِمَ

**١٩٥٦-** عَنْ يعيش بن الوليد قال: أنّ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ حدثَّه: أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﷺ حَدَّثَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَاءَ فَأَفْطَرَ، فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: صَدَقَ، أَنَا صَبَبْتُ لَهُ وَضُوءَهُ[١].

### باسی ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەوەی خۆڕشاندنەوە بەئەنقەست ڕۆژوو دەشكێنێت

واتە: یەعیشی كوڕی وەلید دەڵێ: مەعدانی كوڕی ئەبو تەلحە بۆی باس كرد: ئەبو دەرداء ﷺ بۆی باس كرد: پێغەمبەر ﷺ (بەڕۆژوو بوو بەڵام لەبەر پێویستییەك) دواتر خۆی ڕشاندەوە و ڕۆژووی شكاند، گەیشتم بە سەوبان لە مزگەوتی دیمەشق، ئەوەم بۆی باس كرد وتی: ڕاستی كرد، من ئاوی دەستنوێژم بۆی ئامادە كرد.

**١٩٥٧-** عَنْ يَعِيشَ بْنِ الْوَلِيدِ، عَنْ أَبِيه، عَنْ مَعْدَانَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، وَالصَّوَابُ مَا قَالَ أَبُو مُوسَى، إِنَّمَا هُوَ يَعِيشُ عَنْ مَعْدَانَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ[٢].

واتە: یەعیشی كوڕی وەلید دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە لە مەعدان لە ئەبو دەرداوە ﷺ، تەواوترین ئەوەیە كە ئەبو موسا وتوویەتی، بەڵكوو یەعیش گێڕاویەتەوە لە مەعدان لە ئەبو دەرداوە. هەمان فەرموودە.

**١٩٥٨-** عَنْ يَعيشِ عَن معدان بن أبي طلحة عن أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى[٣].

واتە: یەعیش دەگێڕێتەوە لە مەعدانی كوڕی ئەبو تەلحە لە ئەبو دەرداوە ﷺ، بەهەمان شێوەی فەرموودەكەی ئەبو موسا.

**١٩٥٩-** عَنْ يَعِيشَ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّ مَعْدَانَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﷺ أَخْبَرَهُ مِثْلَ حَدِيثِ عَبْدِ الصَّمَدِ ...، الصواب ما رواه أبو موسى وان يعيش بن الوليد سمع من معدان وليس بينهما أبوه[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) الحديث صحيح.

(٣) الحديث صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: یەعیشی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە، مەعدان هەواڵی پێ داوە، ئەبو دەرداء ﷺ هەواڵی پێ دا بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی عەبدولصەمەد ....، ئەوەی ڕاست و دروستە ئەوەیە کە ئەبو موسا گێڕاویەتەوە، یەعیش کوڕی وەلید لە مەعدانەوە بیستوویەتی باوکی لە نێوانیان نییە.

تێبینی: خوێنەری خۆشەویست پێشەوا ئەبو بەکر ئیبنو خوزەیمە فەرموودەی ژمارە (١٩٥٧-١٩٥٨ - ١٩٥٩)ی هێناوە بۆ ئەوەی جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی یەعیش کوڕی وەلید فەرموودەی ژمارە (١٩٥٦)ی لە مەعدانەوە بیستووە نەك لە باوکی لە مەعدانەوە، جا ئەم زانستەش تایبەتە بەوانەی زانستی فەرموودە دەخوێنن، بۆیە خۆت بەوە سەرقاڵ مەکە، ئەگەر تەخەصوصی خۆت نییە.

## بَابُ ذِكْرِ إِيجَابِ قَضَاءِ الصَّوْمِ عَنِ الْمُسْتَقِيءِ عَمْدًا، وَإِسْقَاطِ الْقَضَاءِ عَمَّنْ يَذْرَعُهُ الْقَيْءُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ إِيجَابَ الْكَفَّارَةِ عَلَى الْمُجَامِعِ لَا لِعِلَّةِ الْفِطْرِ فَقَطْ، إِذْ لَوْ كَانَ لِعِلَّةِ الْفِطْرِ فَقَطْ لَا لِلْجِمَاعِ خَاصَّةً، كَانَ عَلَى كُلِّ مُفْطِرٍ الْكَفَّارَةُ، وَالْمُسْتَقِيءُ عَمْدًا مُفْطِرٌ بِحُكْمِ النَّبِيِّ ﷺ، وَالْكَفَّارَةُ غَيْرُ وَاجِبَةٍ عَلَيْهِ

**١٩٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَقَاءَ الصَّائِمُ أَفْطَرَ، وَإِذَا ذَرَعَهُ الْقَيْءُ لَمْ يُفْطِرْ»[١].

**باسی ئەو کەسەی بەئەنقەست خۆی دەڕشێنێتەوە واجبە ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە، ئەو کەسەشی ڕشانەوە زۆری بۆ هێناوە قەزای ناکاتەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی واجببوونی کەفارەت لەسەر ئەو کەسەی جووت بووە تەنها لەبەر شکاندن نییە، چونکە ئەگەر تەنها لەبەر شکاندن بووایە نەك جووتبوون بەتایبەت، ئەوە ئەو کەفارەتە لەسەر هەموو کەسێك واجب دەبوو کە ڕۆژووەکەی شکاندووە، ئەو کەسەشی بەئەنقەست خۆی دەڕشێنێتەوە بە حوکمی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی شکاندووە، کەفارەتیش واجب نییە لەسەری**

---

(١) هذا حديث معلول بالوقف ولا يصح مرفوعاً.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ڕۆژووەوان خۆی ڕشاندەوە ڕۆژووەکەی شکاوە، وە ئەگەر ڕشانەوە زۆری بۆی هێنا و ڕشایەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ.

**١٩٦١-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ مَرَّةً أُخْرَى فَقَالَ: مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَمَنِ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ[(١)].

واتە: جارێکی دیکە لە عەلییەوە ﷺ فەرمووی: هەرکەس ڕشانەوە زۆری بۆی هێنا و ڕشایەوە (بەڕۆژوو بوو)، ئەوا قەزاکردنەوەی لەسەر نییە، هەر کەسیش بەئەنقەست خۆی ڕشاندەوە با قەزای بکاتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْحِجَامَةَ تُفْطِرُ الْحَاجِمَ وَالْمَحْجُومَ جَمِيعًا

**١٩٦٢-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[(٢)].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی کەڵەشاخکردن ڕۆژووی کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو دەشکێنێت پێکەوە

واتە: سەوبان ﷺ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویەتەوە.

**١٩٦٣-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِثَمَانَ عَشَرَ خَلَتْ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ إِلَى الْبَقِيعِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ يَحْتَجِمُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»[(٣)].

واتە: سەوبان ﷺ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺدەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ بەقیع هەژدە ڕۆژ تێپەڕیبوو لە مانگی ڕەمەزان، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای پیاوێکی کرد کەڵەشاخی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا.

---

(١) أخرجه ابن ماجه (١٦٧٦)، والحاكم ٤٢٦/١ و ٤٢٦ - ٤٢٧ من طريق أبي هريرة وقال: هذا حديث صحيح على الشرط الشيخين ولم يخرجاه.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**١٩٦٤-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»[١].

**واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا.**

**١٩٦٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَدْ ثَبُتَ الْخَبَرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ، فَقَالَ بَعْضُ مَنْ خَالَفَنَا فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ: إِنَّ الْحِجَامَةَ لَا تُفَطِّرُ الصَّائِمَ، وَاحْتَجَّ بِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ مُحْرِمٌ، وَهَذَا الْخَبَرُ غَيْرُ دَالٍّ عَلَى أَنَّ الْحِجَامَةَ لَا تُفَطِّرُ الصَّائِمَ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ فِي سَفَرٍ لَا فِي حَضَرٍ؛ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ قَطُّ مُحْرِمًا مُقِيمًا بِبَلَدِهِ، إِنَّمَا كَانَ مُحْرِمًا وَهُوَ مُسَافِرٌ، وَالْمُسَافِرُ- وَإِنْ كَانَ نَاوِيًا لِلصَّوْمِ- قَدْ مَضَى عَلَيْهِ بَعْضُ النَّهَارِ وَهُوَ صَائِمٌ عَنِ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ، وَأَنَّ الْأَكْلَ وَالشُّرْبَ يُفَطِّرَانِهِ، لَا كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ أَنَّ الْمُسَافِرَ إِذَا دَخَلَ الصَّوْمُ لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يُفْطِرَ إِلَى أَنْ يُتِمَّ صَوْمَ ذَلِكَ الْيَوْمِ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ، فَإِذَا كَانَ لَهُ أَنْ يَأْكُلَ وَيَشْرَبَ وَقَدْ نَوَى الصَّوْمَ وَقَدْ مَضَى بَعْضُ النَّهَارِ وَهُوَ صَائِمٌ يُفْطِرُ بِالْأَكْلِ وَالشُّرْبِ، جَازَ لَهُ أَنْ يَحْتَجِمَ وَهُوَ مُسَافِرٌ فِي بَعْضِ نَهَارِ الصَّوْمِ، وَإِنْ كَانَتِ الْحِجَامَةُ مُفَطِّرَةً، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ لِلصَّائِمِ أَنْ يُفْطِرَ بِالْأَكْلِ وَالشُّرْبِ فِي السَّفَرِ فِي نَهَارٍ قَدْ مَضَى بَعْضُهُ وَهُوَ صَائِمٌ[٢].

**واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان فەرموودەی تەواو جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا، هەندێ لەوانەی لەم بابەتە پێچەوانەی ئێمەیە دەڵێ: کەڵەشاخ ڕۆژوو ناشکێنێ، بەڵگەی هێناوەتەوە پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی کردووە و بەڕۆژوویش بووە، ئەم فەرموودەیە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کەڵەشاخ ڕۆژوو ناشکێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کەڵەشاخی کردووە و بەڕۆژوو بووە لە سەفەردا بووە نەك لە شوێنی نیشتەجێبوون، چونکە هەرگیز لە شاری خۆی ئیحرامی نەبەستووە، بەڵکوو لە کاتێکدا ئیحرامی بەستووە لە گەشتدا بووە، گەشتیاریش -ئەگەرچی نییەتی ڕۆژووی هێنا بێت- هەندێك ڕۆژگار تێپەڕیوە و ئەو هەر بەڕۆژووە لە خواردن و خواردنەوە، ئەگەرچی خواردن و خواردنەوەیش ڕۆژووەکەی دەشکێنن، نەك وەکوو ئەوەی هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چوون وا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**دەزانن گەشتیار کاتێ چووە نێو ڕۆژوو بۆی نییە بیشکێنێ تا ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی تەواو دەکات کە چۆتە نێویەوە، جا ئەگەر بۆی هەبوو بخوا و بخواتەوە لە کاتێکدا نییەتی ڕۆژووی هێناوە و بەشێك لە ڕۆژ تێپەڕ بووە ئەو هێشتا بەڕۆژووە، ڕۆژووەکەی دەشکێنێ بە خواردن و خواردنەوە، بەهەمان شێوە دروستە بۆی کەڵەشاخ بکات لە کاتێکدا لە گەشتدایە لە بەشێك لە ڕۆژ، ئەگەرچی کەڵەشاخ ڕۆژوو دەشکێنێ، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ڕۆژووەوان بۆی هەیە ڕۆژووەکەی بشکێنێ بەخواردن و خواردنەوە لە گەشتدا بە ڕۆژ کە بەشێك لە ڕۆژەکەیش تێپەڕ بوویێت ئەو بەڕۆژوو بێت.**

**١٩٦٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى عَلَى نَهَرٍ مِنْ مَاءِ السَّمَاءِ فِي يَوْمٍ صَائِفٍ، وَالْمُشَاةُ كَثِيرٌ، وَالنَّاسُ صِيَامٌ، فَوَقَفَ عَلَيْهِ، فَإِذَا فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، اشْرَبُوا، فَجَعَلُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ قَالَ: إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي رَاكِبٌ وَأَنْتُمْ مُشَاةٌ، وَإِنِّي أَيْسَرُكُمْ اشْرَبُوا، فَجَعَلُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ مَا يَصْنَعُ فَلَمَّا أَبَوْا حَوَّلَ وَرِكَهُ فَنَزَلَ وَشَرِبَ وَشَرِبَ النَّاسُ وَخَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ خَرَّجْتُهُمَا فِي كِتَابِ الصِّيَامِ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ أَفَيَجُوزُ لِجَاهِلٍ أَنْ يَقُولَ: الشُّرْبُ جَائِزٌ لِلصَّائِمِ، وَلَا يُفَطِّرُ الشُّرْبُ الصَّائِمَ؟ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ أَصْحَابَهُ وَهُوَ صَائِمٌ بِالشُّرْبِ، فَلَمَّا امْتَنَعُوا شَرِبَ وَهُوَ صَائِمٌ، وَشَرِبُوا، فَمَنْ يَعْقِلُ الْعِلْمَ، وَيَفْهَمُ الْفِقْهَ يَعْلَمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَارَ مُضْطَرًّا وَأَصْحَابُهُ لِشُرْبِ الْمَاءِ، وَقَدْ كَانُوا نَوَوُا الصَّوْمَ، وَمَضَى بِهِمْ بَعْضُ النَّهَارِ، وَكَانَ لَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا، إِذْ كَانُوا فِي السَّفَرِ لَا فِي الْحَضَرِ، وَكَذَلِكَ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَحْتَجِمَ وَهُوَ صَائِمٌ فِي السَّفَرِ وَإِنْ كَانَتِ الْحِجَامَةُ تُفَطِّرُ الصَّائِمَ؛ لِأَنَّ مَنْ جَازَ لَهُ الشُّرْبُ - وَإِنْ كَانَ الشُّرْبُ مُفْطِرًا - جَازَ لَهُ الْحِجَامَةُ - وَإِنْ كَانَ بِالْحِجَامَةِ مُفْطِرًا - فَأَمَّا مَا احْتَجَّ بِهِ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ أَنَّ الْفِطْرَ مِمَّا يَدْخُلُ، وَلَيْسَ مِمَّا يَخْرُجُ، فَهَذَا جَهْلٌ وَإِغْفَالٌ مِنْ قَائِلِهِ وَتَمْوِيهٌ عَلَى مَنْ لَا يُحْسِنُ الْعِلْمَ وَلَا يَفْهَمُ الْفِقْهَ وَهَذَا الْقَوْلُ مِنْ قَائِلِهِ خِلَافُ دَلِيلِ كِتَابِ اللَّهِ وَخِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ وَخِلَافُ قَوْلِ أَهْلِ الصَّلَاةِ مِنْ أَهْلِ اللَّهِ جَمِيعًا إِذَا جُعِلَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ عَلَى ظَاهِرِهَا قَدْ دَلَّ اللَّهُ فِي مُحْكَمِ تَنْزِيلِهِ أَنَّ الْمُبَاشَرَةَ هِيَ الْجِمَاعُ فِي نَهَارِ الصِّيَامِ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَدْ أَوْجَبَ عَلَى الْمُجَامِعِ فِي رَمَضَانَ عِتْقَ رَقَبَةٍ إِنْ وَجَدَهَا وَصِيَامَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِنْ لَمْ يَجِدِ الرَّقَبَةَ أَوْ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا إِنْ لَمْ يَسْتَطِعِ الصَّوْمَ، وَالْمُجَامِعُ لَا يَدْخُلُ جَوْفَهُ شَيْءٌ فِي الْجِمَاعِ، إِنَّمَا يَخْرُجُ مِنْهُ مَنِيٌّ إِنْ أَمْنَى، وَقَدْ يُجَامِعُ مِنْ غَيْرِ إِمْنَاءٍ فِي الْفَرْجِ، فَلَا يَخْرُجُ مِنْ جَوْفِهِ أَيْضًا مَنِيٌّ وَالْتِقَاءُ الْخِتَانَيْنِ مِنْ غَيْرِ إِمْنَاءٍ يُفَطِّرُ الصَّائِمَ، وَيُوجِبُ الْكَفَّارَةَ وَلَا يَدْخُلُ جَوْفَ الْمُجَامِعِ شَيْءٌ وَلَا يَخْرُجُ مِنْ جَوْفِهِ شَيْءٌ إِذَا كَانَ الْمُجَامِعُ هَذِهِ صِفَتُهُ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْمُسْتَقِيءَ عَامِدًا يُفَطِّرُهُ الِاسْتِقَاءُ عَلَى الْعَمْدِ، وَاتَّفَقَ

أَهْلُ الصَّلَاةِ وَأَهْلُ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ الِاسْتِقَاءَ عَلَى الْعَمْدِ يُفَطِّرُ الصَّائِمَ وَلَوْ كَانَ الصَّائِمُ لَا يُفَطِّرُهُ إِلَّا مَا يَدْخُلُ جَوْفَهُ كَانَ الْجِمَاعُ وَالِاسْتِقَاءُ لَا يُفَطِّرَانِ الصَّائِمَ، وَجَاءَ بَعْضُ أَهْلِ الْجَهْلِ بِأُعْجُوبَةٍ فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ، فَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا قَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ، لِأَنَّهُمَا كَانَا يَغْتَابَانِ فَإِذَا قِيلَ لَهُ: فَالْغِيبَةُ تُفْطِرُ الصَّائِمَ؟ زَعَمَ أَنَّهَا لَا تُفْطِرُ الصَّائِمَ، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَكَ إِنَّمَا قَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ، لِأَنَّهُمَا كَانَا يَغْتَابَانِ وَالْغِيبَةُ عِنْدَكَ لَا تُفَطِّرُ الصَّائِمَ، فَهَلْ يَقُولُ هَذَا الْقَوْلَ مَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ، يَزْعُمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْلَمَ أُمَّتَهُ أَنَّ الْمُغْتَابَيْنِ مُفْطِرَانِ، وَيَقُولُ هُوَ: بَلْ هُمَا صَائِمَانِ غَيْرُ مُفْطِرَيْنِ، فَخَالَفَ النَّبِيَّ ﷺ الَّذِي أَوْجَبَ اللَّهُ عَلَى الْعِبَادِ طَاعَتَهُ وَاتِّبَاعَهُ، وَوَعَدَ الْهُدَى عَلَى اتِّبَاعِهِ، وَأَوْعَدَ عَلَى مُخَالِفِيهِ، وَنَفَى الْإِيمَانَ عَمَّنْ وَجَدَ فِي نَفْسِهِ حَرَجًا مِنْ حُكْمِهِ، فَقَالَ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾النساء: ٦٥، وَلَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا لِأَحَدٍ خِيَرَةً فِيمَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾الأحزاب: ٣٦، وَالْمُحْتَجُّ بِهَذَا الْخَبَرِ إِنَّمَا صَرَّحَ بِمُخَالَفَةِ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ نَفْسِهِ، بِلَا شُبْهَةٍ وَلَا تَأْوِيلٍ يَحْتَمِلُ الْخَبَرَ الَّذِي ذَكَرَهُ، إِذْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا قَالَ لِلْحَاجِمِ وَالْمَحْجُومِ مُفْطِرَانِ لِعِلَّةِ غِيبَتِهِمَا ثُمَّ هُوَ زَعَمَ أَنَّ الْغِيبَةَ لَا تُفَطِّرُ، فَقَدْ جَرَّدَ مُخَالَفَةَ النَّبِيِّ ﷺ بِلَا شُبْهَةٍ وَلَا تَأْوِيلٍ[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا چۆیە سەر ڕوبارێك بەهۆی باران ئاوی لەبەر دەڕۆیی لە ڕۆژێکی گەرمدا، پیادەکانیش زۆر بوون و خەڵکەکەیش بەڕۆژوو بوون، لەسەر ڕوبارەکە وەستا، خەڵکێکیش لەگەڵی وەستان، فەرمووی: ئەی خەڵکینە بخۆنەوە، ئەوانیش تەماشای ئەویان دەکرد، فەرمووی: من وەکوو ئێوە نیم، من سوارم و ئێوەیش پیادەن بۆ من ئاسانترە بخۆنەوە، ئەوانیش تەماشای ئەویان دەکرد چی دەکات، کاتێ نکوولْیان کرد لە خواردنەوەی ئاوەکە، پێغەمبەر ﷺ خۆی وەرگێڕاو پاشان لەسەر وڵاخەکەی دابەزی و ئاوی خواردەوە و خەڵکەکەیش بەدوایدا ئاویان خواردەوە. وە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس و ئەنەسی کوڕی مالیکم باس کردووە لە کتێبی ڕۆژوو لە کتێبی (الْكَبِير) ئایا دروستە بۆ کەسێکی نەفام بڵێ: دروستە ڕۆژووەوان بخواتەوە، خواردنەوەیش ڕۆژووەکەی نەشکێنێ؟ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی بخۆنەوە

---

(١) حديث صحيح.

لە کاتێکدا خۆی بەڕۆژوو بوو، کاتێ خۆیان گرتەوە لە ئاوخواردنەوە پێغەمبەر ﷺ بەزمانی بەڕۆژوو ئاوی خواردەوە، دواتر ئەوانیش ئاویان خواردەوە، جا هەرکەسێك زانستی هەبێ و لە فیقە تێگەیشتبێ دەزانێ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ناچار بوون ئاو بخۆنەوە، لە کاتێکدا ئەوان نییەتی ڕۆژوویان هێنابوو، وە بەشێکیش لە ڕۆژەکە بەڕۆژوو بوون، وە بۆیان هەبوو ڕۆژوو بشکێنن ئەگەر لە سەفەردا بوون نەك لە شوێنی نیشتەجێبوون، بەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ بۆی هەبووە کەڵەشاخ بکات لە گەشتدا لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووە، ئەگەرچی کەڵەشاخ ڕۆژوو دەشکێنێ، چونکە ئەو کەسەی بۆی دروست بێ ئاو بخواتەوە- ئەگەرچی خواردنەوە ڕۆژوو دەشکێنێ- بۆی هەیە کەڵەشاخ بکات- ئەگەرچی کەڵەشاخ ڕۆژوو دەشکێنێ-، بەڵام ئەوەی کە هەندێ لە عێراقییەکان کردوویانە بە بەڵگە لەم بابەتەدا ئەوەیە ڕۆژووشکاندن بریتییە لەو شتەی بچێتە ژوورەوە، نەك ئەو شتەی بێتە دەرەوە، بەڕاستی ئەمە نەفامی و بێئاگاییە لەلایەن خاوەنەکەیەوە، وە فریودانی کەسێکە کە شارەزایی زانستی شەرعی نییە و لە فیقهیش تێ ناگات، ئەم قسەیە کە وتراوە پێچەوانەی بەڵگەکانی کتێبی خوا و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و پێچەوانەی وتەی هەموو ئەوانەیە کە نوێژ دەکەن، ئەگەر ئەم دەستەواژەیە لەسەر ڕواڵەتەکەی کاری پێ بکرێت، بێگومان خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا هێناویەتی (الْمُبَاشَرَةَ) بریتییە لە جوتبوون لە ڕۆژدا کە کەسەکە بەڕۆژوو بێت، وە پێغەمبەر ﷺ واجبی کردووە لەسەر ئەو کەسەی لە مانگی ڕەمەزاندا بەزمانی بەڕۆژوو لە ڕۆژدا لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت دەبێ: بەندەیەك ئازاد بکات ئەگەر هەیبوو ئەگەر بەندەی دەست نەکەوت دوو مانگ بەدوای یەکدیدا بەڕۆژوو بێت، ئەگەر نەیتوانی بەڕۆژوو بێت نانی شەست کەسی هەژار بدات، خۆ ئەو کەسەی جووت بووە هیچ شتێك ناچێتە نێویەوە لە جووتبوون، بەڵکوو مەنی لێ دەردەچێ ئەگەر ئاوی بێتەوە، هەندێ جار جووت دەبێ لە دامێنەوە بەبێ ئاو هاتنەوە، هیچ شتێکیش لە مەنی لێیەوە دەرناچێ، وە بەیەکگەیشتنی هەردوو ئەندامی نێرینە و مێینە ڕۆژوو دەشکێنێ و کەفارەتیش واجب دەکات، ئەو کەسەی جووت دەبێ هیچ شتێك ناچێتە نێویەوە هیچ شتێکیشی لێوە دەرناچێ، ئەگەر جووتبووەکە ئاوی نەیەتەوە، وە پێغەمبەر ﷺ زانیاری داوە ئەو کەسەی بەئەنقەست خۆی دەڕشێنێتەوە ڕۆژووەکەی دەشکێ،

نوێژخوێنان و زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی خۆڕشاندنەوە بەئەنقەست ڕۆژوو دەشکێنێت، ئەگەر ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی نەشکێ جگە لەوەی دەچێتە نێو گیانیەوە ئەوە جووتبوون و خۆڕشاندنەوە ڕۆژووی ڕۆژووەوان ناشکێنێ، هەندێ لەو نەفامانە شتی سەرسوڕهێنەری هێناوە لەم بابەتەدا، پێی وا بووە پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرموویەتی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا، چونکە ئەو دووانە غەیبەتیان کردووە، ئەگەر پێی بوترێ: ئایا غەیبەتکردن ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشکێنێ؟ بێگومان پێی وایە ڕۆژووی ڕۆژووەوان ناشکێنێ، جا پێی دەوترێ: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە لات بێ و بفەرموێ: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا، چونکە ئەو دووانە غەیبەتیان دەکرد، تۆیش پێت وایە غەیبەتکردن ڕۆژوو ناشکێنێ، ئایا کەسێك کە بڕوای بە خوا هەبێت قسەی لەم جۆرە دەکات، پێی وا بێ پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە ئەو دووانەی کە غەیبەت دەکەن ڕۆژووەکەیان شکاوە، ئەویش بڵێ: بەڵکوو هەردووکیان بەڕۆژوون و ڕۆژووەکەیان نەشکاوە، پێچەوانەی پێغەمبەر ﷺ بکات کە خوا ﷻ پێویستی کردووە لەسەر بەندەکان گوێڕایەڵی بکەن و شوێنی بکەون، وە پەیمانی هیدایەتی داوە لەسەر شوێنکەوتنی، هەڕەشەیشی لەوانە کردووە کە پێچەوانەی دەبن، ئیمانیشی ڕەت کردۆتەوە لەو کەسەی لە نەفس و دەروونیدا بێتاقەتییەك دروست دەبێ لە ئاستی حوکم و بڕیاری، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: نەخێر وا نییە کە خۆیان بەباوەڕدار نیشان دەدەن سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکییەك لە نێوانیاندا. خوا ﷻ کەسی سەرپشك نەکردووە لەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دادوەرییان کردووە، خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾، واتە: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار نییە کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری هەر کارێکیان دا کە سەرپشك بن لە کارەکەیاندا. هەر کەسیش ئەم فەرموودەی کردووە بە بەڵگە پێچەوانەی پێغەمبەری ﷺ کردووە بەبێ گومان و بەبێ هیچ لەیەکدانەوەیەك بۆ ئەو فەرموودەی کە باسی کردووە، کە پێی وایە پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات و ئەوەیشی کەڵەشاخی بۆ دەکرێ فەرموویەتی ڕۆژووەکەیان شکا




**لەبەر غەیبەتکردنیان، پاشان خۆی پێی وایە غەیبەتکردن ڕۆژوو ناشکێنێ، بەڕاستی پێچەوانەی پێغەمبەری ﷺ کردووە بەبێ هیچ گومان و لەیەکدانەوەیەك.**

**١٩٦٧-** وَقَدْ رُوِيَ عَنِ الْمُعْتَمِرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: رَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ، وَالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، ثنا الْمُعْتَمِرُ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ وَالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ: إِنَّمَا هُوَ مِنْ قَوْلِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، لَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أُدْرِجَ فِي الْخَبَرِ لَعَلَّ الْمُعْتَمِرَ حَدَّثَ بِهَذَا حِفْظًا فَأَدْرَجَ هَذِهِ الْكَلِمَةَ فِي خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ، أَوْ قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: وَرَخَّصَ فِي الْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ، فَلَمْ يُضْبَطْ عَنْهُ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ، فَأُدْرِجَ هَذَا الْقَوْلُ فِي الْخَبَرِ[١].

**واتە: بێگومان ڕیوایەتی کردووە لە موعتەمیری کوڕی سولەیمان لە حومەید لە ئەبولموتەوەکیل لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بەوەی ڕۆژووەوان ماچی (هاوسەرەکانی) بکات، وە کەڵەشاخکردنی ڕۆژووەوان، یەعقوبی کوڕی ئیبراهیمی دەوڕەقی بۆی باس کردین، موعتەمیر بۆی باس کردین، وە ئەم دەستەواژەیە (وَالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ) وتەی ئەبو سەعیدی خودرییە نەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، تێهەڵکێشی فەرموودەکەی کراوە، پێدەچێت موعتەمیر بەلەبەر باسی کردبێت، ئەم وشەیەی خستبێتە نێو فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ، یان وتبێتی: ئەبو سەعید وتی: مۆڵەتیشی دا بە کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان، لێیەوە ڕێك نەخرابێت: ئەبو سەعید وتی، ئەم وتەیە تێهەڵکێشی فەرموودەکە کرابێت.**

**١٩٦٨-** حَدَّثَنَا بِهَذَا الْخَبَرِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، وَبِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ، قَالَا: ثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ حُمَيْدًا يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِي، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ يَذْكُرْ مَزِيدًا عَلَى هَذَا، قُلْتُ لِلصَّنْعَانِيِّ: وَالْحِجَامَةُ؟ فَغَضِبَ، فَأَنْكَرَ أَنْ يَكُونَ فِي الْخَبَرِ ذِكْرُ الْحِجَامَةِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّهُ لَيْسَ فِي الْخَبَرِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ذِكْرُ الْحِجَامَةِ.

**واتە: ئەم فەرموودەیە موحەممەدی کوڕی عەبدولئەعلای صەنعانی و بیشری کوڕی موعاز بۆی باس کردین، وتیان: موعتەمیری کوڕی سولەیمان بۆی باس**

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) إسناده صحيح.




کردین وتی: گوێم لێ بوو حومەید لە ئەبولموتەوەکیلی ناجییەوە دەیگێڕایەوە لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بەوەی ڕۆژووەوان ماچی (هاوسەرەکانی) بکات.

ئەبو بەکر وتی: لەمە زیاتری باس نەکرد، بە صەنعانیم وت: ئەی کەڵەشاخ؟ توڕە بوو، ئینکاری کرد لە فەرموودەکە باسی کەڵەشاخ هاتبێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ باسی کەڵەشاخ نەهاتووە.

**١٩٦٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: رُخِّصَ لِلصَّائِمِ فِي الْحِجَامَةِ وَالْقُبْلَةِ. فَهَذَا الْخَبَرُ رُخِّصَ لِلصَّائِمِ فِي الْحِجَامَةِ وَالْقُبْلَةِ، دَالٌّ عَلَى أَنَّهُ لَيْسَ فِيهِ ذِكْرُ النَّبِيِّ ﷺ[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: مۆڵەت دراوە بە ڕۆژووەوان بە کەڵەشاخکردن و ماچکردنی (هاوسەرەکانی). ئەم فەرموودەیە مۆڵەت دراوە بە ڕۆژووەوان بە کەڵەشاخکردن و ماچکردنی (هاوسەرەکانی) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گوتمان چونکە باسی پێغەمبەری ﷺ تێدا نییە.

**١٩٧٠-** عَنْ أَبِي يَحْيَى حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ؛ وَالضَّحَّاكُ بْنُ عُثْمَانَ؛ عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِي، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي الْحِجَامَةِ: إِنَّمَا كَانُوا يَكْرَهُونَ، قَالَ: أَوْ قَالَ: يَخَافُونَ الضَّعْفَ[٢].

واتە: ئەبو یەحیا دەگێڕێتەوە، حومەیدی تەویل و زەحاکی کوڕی عوسمان بۆیان باس کردین لە باوکی موتەوەکیلی ناجی لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەربارەی کەڵەشاخ وتی: بێگومان ئەوان پێیان باش نەبوو، وتی: یان وتی: دەترسان لە لاوازبوون.

**١٩٧١-** عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِي، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا كَرِهْتُ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ مَخَافَةَ الضَّعْفِ[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَخَبَرُ قَتَادَةَ، وَخَبَرُ أَبِي يَحْيَى، عَنْ حُمَيْدٍ، وَالضَّحَّاكِ بْنِ عُثْمَانَ دَالَّانِ عَلَى أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ لَمْ يَحْكِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الرُّخْصَةَ فِي الْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَرْوِيَ أَبُو سَعِيدٍ

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) إسناده صحيح.

أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ فِي الْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ، وَيَقُولَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ ذَلِكَ مَخَافَةَ الضَّعْفِ، إِذْ مَا قَدْ أَبَاحَهُ ﷺ إِبَاحَةً مُطْلَقًا لَا اسْتِثْنَاءَ وَلَا شَرِيطَةَ فَمُبَاحٌ لِجَمِيعِ الْخَلْقِ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُقَالَ: أَبَاحَ النَّبِيُّ ﷺ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ، وَهُوَ مَكْرُوهٌ مَخَافَةَ الضَّعْفِ، وَلَمْ يَسْتَثْنِ النَّبِيُّ ﷺ فِي إِبَاحَتِهَا مَنْ يَأْمَنُ الضَّعْفَ دُونَ مَنْ يَخَافُهُ، فَإِنْ صَحَّ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ فِي الْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ، كَانَ مُؤَدَّى هَذَا الْقَوْلِ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ قَالَ: كُرِهَ لِلصَّائِمِ مَا رَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ لَهُ فِيهَا، وَغَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُتَأَوَّلَ هَذَا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَرْوُوا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ رُخْصَةً فِي الشَّيْءِ وَيَكْرَهُونَهُ، وقد روي أيضا عن عبد الرحمن بن زيد بن أسلم عن أبيه عن عطاء بن يسار عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ يُفَطِّرْنَ الصَّائِمَ: الْحِجَامَةُ، وَالْقَيْءُ، وَالْحُلُمُ».

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەبو موتەوەکیلی ناجی لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﵁ دەڵێ: بۆیە کەڵەشاخم پێ باش نییە لەبەر مەترسی لاوازبوون.**

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی قەتادە و فەرموودەکەی یەحیا لە حومەید و زەحاکی کوڕی عوسمان بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەبو سەعید لە پێغەمبەرەوە ﷺ مۆڵەتدانی بە کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان نەگێڕاوەتەوە، چونکە دروست نییە ئەبو سەعید بگێڕێتەوە بڵێ: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بە کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان، وە بڵێ: ئەوان کەڵەشاخیان پێ باش نەبوو لەبەر لاوازبوون، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ دابێت ئەوە بەڕەهایی ڕێگەی پێ داوە بەبێ جیاکردنەوە و مەرج، ڕێگەی پێ دراوە بە هەموو خەڵك، دروست نییە بوترێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان، بەڵام کەڕاهەتی هەیە لەبەر لاوازبوون، وە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگەپێدان بە کەڵەشاخ جیای نەکردۆتەوە کێ مەترسی لاوازبوونی لێ ناکرێ و کێیش مەترسی لێ دەکرێت، جا ئەگەر ئەوەی لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە هاتووە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بە کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان، ئەوە نێوەڕۆکی ئەم قسەیە بەوشێوە دەبێت ئەبو سەعید وتی: بەباش دانەنراوە بۆ ڕۆژووەوان کەڵەشاخ بکات، لە کاتێدا پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێ داوە، دروست نییە ئەمە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەك بدرێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت بکەن مۆڵەت بە شتێك بدات بەڵام ئەوان پێیان باش نەبێت، هەروەها گێردراوەتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە لە عەتائی کوڕی یەسار لە ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت ڕۆژوو دەشکێنن: کەڵەشاخ و خۆڕشاندنەوە و ڕەحەتبوون لە خەودا.

**١٩٧٢-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الْمُغِيرَةِ أَبُو سَلَمَةَ الْمَخْزُومِيُّ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ عَبْد الرَّحْمَن بْنِ زَيْد بْنِ أَسْلَم، وَحَدَّثَنَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، ثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، ثَنَا عَبْد الرَّحْمَنِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا الْإِسْنَادُ غَلَطٌ لَيْسَ فِيهِ عَطَاءُ بْنُ يَسَارٍ، وَلَا أَبُو سَعِيدٍ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدٍ لَيْسَ هُوَ مِمَّنْ يَحْتَجُّ أَهْلُ التَّثْبِيتِ بِحَدِيثِهِ لِسُوءِ حِفْظِهِ لِلْأَسَانِيدِ وَهُوَ رَجُلٌ صِنَاعَتُهُ الْعِبَادَةُ وَالتَّقَشُّفُ وَالْمَوْعِظَةُ وَالزُّهْدِ لَيْسَ مِنْ أَحْلَاسِ الْحَدِيثِ الَّذِي يَحْفَظُ الْأَسَانِيدَ.

**واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم سەنەدە (حَدَّثَنَاهُ يَحْيَى بْنُ الْمُغِيرَةِ أَبُو سَلَمَةَ الْمَخْزُومِيُّ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ عَبْد الرَّحْمَن بْنِ زَيْد بْنِ أَسْلَم، وَحَدَّثَنَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، ثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، ثَنَا عَبْد الرَّحْمَنِ) هەڵەیە، عەتائی کوڕی یەسار و ئەبو سەعیدی تێدا نییە، وە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدیش لەوکەسانە نییە کە فەرموودەناسەکان فەرموودەی لێ وەربگرن لەبەر خراپی لەبەرکردنی، ئەو پیاوە پیشەی پەرستش و ئامۆژگاری بووە لە سوارچاکانی فەرموودەناسان نەبووە، ئەوانەی سەندەکان لەبەر دەکەن.**

**١٩٧٣-** وروى هذا الخبر سفيان بن سعيد الثوري وهو ممن لا يدانيه في الحفظ في زمانه كثير أحد عَن زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ صَاحِبٍ لَهُ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يُفْطِرُ مَنْ قَاءَ، وَلَا مَنِ احْتَلَمَ، وَلَا مَنِ احْتَجَمَ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَوْ كَانَ هَذَا الْخَبَرُ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ لَبَاحَ الثَّوْرِيُّ، بِذِكْرِهِمَا وَلَمْ يَسْكُتْ عَنِ اسْمَيْهِمَا يَقُولُ: عَنْ صَاحِبٍ لَهُ عَنْ رَجُلٍ وَإِنَّمَا يُقَالُ فِي الْأَخْبَارِ: عَنْ صَاحِبٍ لَهُ وَعَنْ رَجُلٍ إِذَا كَانَ غَيْرَ مَشْهُورٍ.

**واتە: وە ئەم فەرموودەیە سوفیانی کوڕی سەعیدی سەوری گێڕاویەتەوە، کە یەکێکە لەوانەی لە سەردەمی خۆیدا کەم کەس بوو شان بدات لە شانی، لە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە هاوەڵێکیەوە، لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس خۆی ڕشاندەوە یان لە خەودا ڕەحەت بوو، یان کەڵەشاخی کرد ڕۆژووی ناشکێ.**

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر ئەم فەرموودەیە لە عەتائی کوڕی یەسار لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە بووایە ئەوە سەوری باسی دەکرد و بێدەنگ نەدەبوو لە ناوهێنانیان، دەڵێ: لە هاوەڵێکی لە پیاوێکەوە، لە کاتێکدا لە فەرموودەکان دەوترێ: لە هاوەڵێکی لە پیاوێکەوە، ئەگەر بەناوبانگ نەبێت.

**١٩٧٤-** عَنْ مَعمر وسُفيان عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ رَجُلٍ ﵁، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

**واتە: مەعمەر و سوفیان دەگێڕنەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەم، لە پیاوێك ﵁، لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی.**

**١٩٧٥-** عَنْ سُفيان عَن زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِنَا، عَنْ رَجُلٍ ﵁ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُفْطِرُ مَنْ قَاءَ، وَلَا مَنِ احْتَلَمَ، وَلَا مَنِ احْتَجَمَ»[٢].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، پیاوێك لە هاوەڵانمان بۆی باس کردم، لە پیاوێك ﵁ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس خۆی ڕشاندەوە یان لە خەودا ڕەحەت بوو، یان کەڵەشاخی کرد ڕۆژووی ناشکێ.**

**١٩٧٦-** عَنْ بن أَبِي سَبرة عَن زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عن عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ ﵁ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[٣].

**واتە: ئیبنو ئەبو سەبرە دەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی ئەسەلەم لە عەتائی کوڕی یەسار، لە پیاوێك ﵁ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەکوو فەرموودەکەی پێشوو.**

**١٩٧٧-** عَنْ هِشَامِ بنِ سَعد حَدَّثنا زَيدِ بْنِ أَسْلَم عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[٤].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

(٤) إسناده ضعيف.

واتە: هیشامی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، زەیدی کوڕی ئەسلەم بۆی باس کردین لە عەتائی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی.

**١٩٧٨-** عَنْ هِشَامٍ عَنْ زَيدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ لَا يُفَطِّرْنَ الصَّائِمَ: الِاحْتِلَامُ، وَالْقَيْءُ، وَالْحِجَامَةُ». سَمِعْتُ مُحَمَّد بْنِ يَحيَى يَقُولُ هَذَا الخَبَر غَيْر مَحْفُوظٍ عَن أَبِي سَعِيد وَلَا عَن عَطَاء بْن يَسَار وَالمَحْفُوظ عِنْدَنَا حَدِيث سُفْيَان وَمَعْمَر[١].

واتە: هیشام دەگێڕێتەوە، لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، عەتائی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن ڕۆژووی ڕۆژووەوان ناشکێنێ: ڕەحەتبوون لە خەودا، ڕشانەوە، کەڵەشاخ. گوێم لە موحەممەدی کوڕی یەحیا بوو دەیوت: ئەم فەرموودەیە پارێزراو نییە لە ئەبو سەعید و لە عەتائی کوڕی یەسار، بەڵکوو ئەوەی پارێزراوە لای ئێمە فەرموودەکەی سوفیان و مەعمەڕە (فەرموودەی ژمارە ١٩٧٤).

**١٩٧٩-** عَنْ مُحَمَّد بْنِ عَبْدِ الله الأَنْصَارِي عَن أَبِي المتوكّلِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: لَا بَأْسَ بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای ئەنصاڕی دەگێڕێتەوە لە باوکی موتەوەکیلەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: کەڵەشاخ هیچ گرفتێکی نییە بۆ ڕۆژووەوان.

**١٩٨٠-** عَن حُميد عن أبي المتوكل عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ لَا يَرَى بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا[٣].

واتە: حومەید دەگێڕێتەوە لە باوکی موتەوەکیلەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پێی وا بوو کەڵەشاخ هیچ گرفتێکی نییە بۆ ڕۆژووەوان.

**١٩٨١-** عَنْ خالدِ الحذاء عن أبي المتوكل عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: لَا بَأْسَ بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ[٤].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح موقوفا.

(٣) صحيح موقوفا.

(٤) صحيح موقوفا.

واتە: خالیدی حەزاء دەگێڕێتەوە لە باوکی موتەوەکیلەوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: کەڵەشاخ هیچ گرفێکی نییە بۆ ڕۆژووەوان.

**١٩٨٢-** عَنْ سُليمان الناجِي عن أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ لَيْسَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. وَلَا أَظُنُّ مَعْمَرًا لَفِظَهُ[١].

واتە: سولەیمانی ناجی دەگێڕێتەوە لە باوکی موتەوەکیلەوە، ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەیهێناوە. گومانیش ناکەم مەعمەر وتبێتی (ئەمەش قسە لەسەر سەنەدی فەرموودە دەکات).

**١٩٨٣-** عَنْ أبي قلابة، عن أبي أسماء الرحبي عن ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِثَمَانَ عَشَرَ مَضَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَرَّ بِرَجُلٍ يَحْتَجِمُ فَقَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ[٢].

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئەسمائی ڕەحەبییەوە، سەوبان ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم هەژدە شەو تێپەڕ بووبوو لە مانگی ڕەمەزان، تێپەڕی بەلای پیاوێکدا کەڵەشاخی دەکرد، فەرمووی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا.

**١٩٨٤-** عَنْ الحسنِ عَن ثَوْبَانَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»[٣].

واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخبۆکراو ڕۆژووەکەیان شکا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السَّعُوطَ، وَمَا يَصِلُ إِلَى الْأُنُوفِ مِنَ الْمَنْخَرَيْنِ يُفْطِرُ الصَّائِمَ

**١٩٨٥-** خَبَرُ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَإِذَا اسْتَنْشَقْتَ فَبَالِغْ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا».[٤]

---

(١) صحيح موقوفا.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر شتێك وەكو چارەسەر بخرێتە نێو هەردوو كونی لووتەوە ڕۆژوو دەشكێنێت

واتە: لەو بارەوە فەرموودەی عاصمی كوڕی لەقیت هاتووە لە باوكیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وە ئەگەر ئاوت وەردایە دەمت بەچاكی ئاو وەربدە جگە لەو كاتەی كە بەڕۆژووی.

## بَابُ ذِكْرِ تَعْلِيقِ الْمُفْطِرِينَ قَبْلَ وَقْتِ الْإِفْطَارِ بِعَرَاقِيبِهِمْ، وَتَعْذِيبِهِمْ فِي الْآخِرَةِ بِفِطْرِهِمْ قَبْلَ تَحِلَّةِ صَوْمِهِمْ

**١٩٨٦-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أَتَانِي رَجُلَانِ، فَأَخَذَا بِضَبْعَيَّ، فَأَتَيَا بِي جَبَلًا وَعْرًا، فَقَالَا: اصْعَدْ، فَقُلْتُ: إِنِّي لَا أُطِيقُهُ، فَقَالَا: إِنَّا سَنُسَهِّلُهُ لَكَ، فَصَعِدْتُ حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي سَوَاءِ الْجَبَلِ إِذَا بِأَصْوَاتٍ شَدِيدَةٍ»، قُلْتُ: مَا هَذِهِ الْأَصْوَاتُ؟ قَالُوا: هَذَا عُوَاءُ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ انْطُلِقَ بِي، فَإِذَا أَنَا بِقَوْمٍ مُعَلَّقِينَ بِعَرَاقِيبِهِمْ، مُشَقَّقَةٍ أَشْدَاقُهُمْ، تَسِيلُ أَشْدَاقُهُمْ دَمًا قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يُفْطِرُونَ قَبْلَ تَحِلَّةِ صَوْمِهِمْ، فَقَالَ: خَابَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى فَقَالَ سُلَيْمَانُ: مَا أَدْرِي أَسَمِعَهُ أَبُو أُمَامَةَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَمْ شَيْءٌ مِنْ رَأْيِهِ؟ ثُمَّ انْطَلَقَ، فَإِذَا بِقَوْمٍ أَشَدَّ شَيْءٍ انْتِفَاخًا وَأَنْتَنِهِ رِيحًا، وَأَسْوَئِهِ مَنْظَرًا، فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ فَقَالَ: هَؤُلَاءِ قَتْلَى الْكُفَّارِ، ثُمَّ انْطَلَقَ بِي، فَإِذَا بِقَوْمٍ أَشَدَّ شَيْءٍ انْتِفَاخًا، وَأَنْتَنِهِ رِيحًا، كَأَنَّ رِيحَهُمُ الْمَرَاحِيضُ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الزَّانُونَ وَالزَّوَانِي، ثُمَّ انْطَلَقَ بِي، فَإِذَا أَنَا بِنِسَاءٍ تَنْهَشُ ثُدِيَّهُنَّ الْحَيَّاتُ، قُلْتُ: مَا بَالُ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ يَمْنَعْنَ أَوْلَادَهُنَّ أَلْبَانَهُنَّ، ثُمَّ انْطَلَقَ بِي، فَإِذَا أَنَا بِالْغِلْمَانِ يَلْعَبُونَ بَيْنَ نَهْرَيْنِ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ ذَرَارِي الْمُؤْمِنِينَ، ثُمَّ شَرَفَ شَرَفًا، فَإِذَا أَنَا بِنَفَرٍ ثَلَاثَةٍ يَشْرَبُونَ مِنْ خَمْرٍ لَهُمْ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ جَعْفَرٌ، وَزِيدٌ، وَابْنُ رَوَاحَةَ، ثُمَّ شَرَفَنِي شَرَفًا آخَرَ، فَإِذَا أَنَا بِنَفَرٍ ثَلَاثَةٍ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَذَا إِبْرَاهِيمُ، وَمُوسَى، وَعِيسَى، وَهُمْ يَنْظُرُونَ[١].

---

(١) صحيح.

## باسی ئەوانەی پێشوەخت ڕۆژوو دەشکێنن هەڵدەواسرێن بە قولەپێیاندا، وە لە ڕۆژی دوایی سزا ئەدرێن بەهۆی ئەوەی پێشوەختی خۆی ڕۆژوویان شکاندووە

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە کاتێکدا من خەوتبووم لەپڕ دوو پیاو هاتن بۆ لام باڵمیان گرت و بردمیان بۆ سەر کێوێکی سەخت، وتیان: سەر کەوە، وتم: من ناتوانم، وتیان: بۆتی ئاسان دەکەین، سەرکەوتم تا گەیشتمە سەر کێوەکە، لەناکاو گوێم لە دەنگەدەنگی توند بوو، وتم: ئەو دەنگانە چین؟ وتی: ئەوانە دەنگی دۆزەخییەکانە، پاشان بردمیان گەیشتم بە خەڵکێك بە قولەپێیان هەڵواسرابوون، شەویلگەکانیان لەتلەت بووبوو خوێنی لێ دەچۆڕا، فەرمووی: وتم: ئەوانە کێن؟ وترا: ئەوانە ئەو کەسانەن کە پێش کاتی شکاندنی ڕۆژوو ڕۆژووەکانیان دەشکێنن، وتی: جوولەکە و گاورەکان زەرەرمەند و سەرشۆڕ بوون، سولەیمان وتی: نازانم ئایا ئەبو ئومامە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوویەتی یان بۆچوونی خۆی بوو؟ پاشان بردمی، تا گەیشتم بە خەڵکێك زۆر ئاوسا بوون و بۆنیان گەنی بوو، دیمەنیشیان زۆر ناشرین بوو، وتم: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە کوژراوانی بێباوەڕانە، پاشان بردمی، تا گەیشتم بە خەڵکێك زۆر ئاوسا بوون و بۆنیان گەنی بوو، بۆنیان هەر وەکوو بۆنی سەرئاوەکان وا بوو، وتم: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە پیاوان و ئافرەتانی زیناکارن، پاشان بردمی، تا گەیشتم بە ئافرەتانێك مارەکان دەیاندا بە مەمکیانەوە، وتم: ئەوانە چیان کردووە؟ وتی: ئەوانە ئەو ئافرەتانەن کە شیر نادەن بە منداڵەکانیان، پاشان بردمی، تا گەیشتم بە چەند منداڵێك لە نێوان دوو ڕووباردا یارییان دەکرد، وتم: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە منداڵانی بڕوادارانن، پاشان بەرز کرامەوە بەبەرزکردنەوە، سێ کەسم بینی ئارەقیان دەخواردەوە (مەبەست پێی ئەو ئارەقەیە کە تایبەتە بە بەهەشتییەکان)، وتم: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە جەعفەر و زەید و ئیبنو ڕەواحەن، پاشان جارێکی دیکە بەرز کرامەوە، سێ کەسم بینی، وتم: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوە ئیبڕاهیم و موسا و عیسایە ئەوانیش تەماشایان دەکردم.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي إِفْطَارِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ مُتَعَمِّدًا مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ ابْنَ الْمُطَوِّسِ، وَلَا أَبَاهُ غَيْرَ أَنَّ حَبِيبَ ابْنَ أَبِي ثَابِتٍ قَدْ ذَكَرَ أَنَّهُ لَقِيَ أَبَا الْمُطَوِّسِ.

**١٩٨٧-** عَنْ حبيب بن أَبِي ثابت عن عمارة بن عمير عن بن المطوس عن أبيه أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ فِي غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَّصَهَا اللَّهُ لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صَوْمُ الدَّهْرِ»[١].

## باسی هەڕەشەکردن بە خواردنی ڕۆژێك لە مانگی ڕەمەزان بەئەنقەست بەبێ مۆڵەت، ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، چونکە من ئیبنو موتەویس و باوکی ناناسم، ئەوە نەبێت حەبیبی کوڕی ئەبو سابیت باسی کردووە ئەو گەیشتووە بە ئەبو موتەویس

واتە: حەبیبی کوڕی ئەبو سابیت دەگێڕێتەوە لە عەمارەی کوڕی عومەیر لە ئیبنو موتەویس لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژێك لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بخوات بەبێ مۆڵەتێك خوا مۆڵەتی پێ دابێت ئەوە بەڕۆژووبوونی هەموو ساڵەکە جێی (ڕۆژووە فەوتاوەکەی) پڕ ناکاتەوە.

**١٩٨٨-** عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ، وَزَادَ: قَالَ شُعْبَةُ: قَالَ حَبِيبٌ: فَلَقِيتُ أَبَا الْمُطَوِّسِ فَحَدَّثَنِي بِهِ[٢].

واتە: شوعبە بەهەمان شێوەی ئەم سەنەدە دەگێڕێتەوە وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، ئەوەی زیاد کردووە: شوعبە دەڵێ: حەبیب وتی: گەیشتم بە ئەبو موتەویس بۆی باس کردم.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْآكِلَ وَالشَّارِبَ نَاسِيًا لِصِيَامِهِ غَيْرُ مُفْطِرٍ بِالْأَكْلِ وَالشُّرْبِ

**١٩٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەر کەس لەبیری بچێت و بەزمانی بەڕۆژوو خواردن و خواردنەوە بخوات ڕۆژووەکەی ناشکێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بیری چوو بەزمانی بەڕۆژوو خواردن و خواردنەوەیەکی خوارد، با بەردەوام بێت لەسەر ڕۆژووەکەی، چونکە خوا ﷻ خواردن و خواردنەوەی پێ داوە.

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ الْقَضَاءِ وَالْكَفَّارَةِ عَنِ الْآكِلِ وَالشَّارِبِ فِي الصِّيَامِ إِذَا كَانَ نَاسِيًا لِصِيَامِهِ وَقْتَ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ

**١٩٩٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَفْطَرَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ نَاسِيًا، لَا قَضَاءَ عَلَيْهِ وَلَا كَفَّارَةَ»[٢].

## باسی ئەگەر کەسێك بەزمانی بەڕۆژووەوە بیری بچێت خواردن و خواردنەوە بخوات ئەوا کەفارەت و قەزاکردنەوەی لەسەر نییە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەهۆی لەبیرچوونەوە لە مانگی ڕەمەزاندا شتێکی خوارد ئەوە نە قەزاکردنەوەی لەسەرە نە کەفارەت.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ ذِكْرِ الْفِطْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ إِذَا حَسِبَ الصَّائِمُ أَنَّهَا قَدْ غَرَبَتْ

**١٩٩١-** عَنْ أَسْمَاءَ ﵂ قَالَتْ: أَفْطَرْنَا فِي رَمَضَانَ فِي يَوْمِ غَيْمٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ قَالَ: قُلْتُ لِهِشَامٍ، وقال أبو عمار فقيل لهشام: أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: بُدٌّ مِنْ ذَلِكَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَيْسَ فِي هَذَا الْخَبَرِ أَنَّهُمْ أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ، وَهَذَا مِنْ قَوْلِ هِشَامٍ: بُدٌّ مِنْ ذَلِكَ، لَا فِي الخَبَرِ، وَلَا يَبِينُ عِنْدِي أَنَّ عَلَيْهِمُ الْقَضَاءَ، فَإِذَا أَفْطَرُوا وَالشَّمْسُ عِنْدَهُمْ قَدْ غَرَبَتْ، ثُمَّ بَانَ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ غَرَبَتْ كَقَوْلِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: وَاللَّهِ مَا نَقْضِي مَا يُجَانِفُنَا مِنَ الْإِثْمِ.

## باسی ڕۆژووشکاندن پێش خۆرئاوابوون، ئەگەر ڕۆژووەوان وای زانی ئاوا بووە

واتە: ئەسماء ﵂ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژوومان شکاند لە ڕەمەزان لە ڕۆژێکدا کە هەور بوو، پاشان خۆر دەرکەوت، (ئەبو ئوسامە کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) وتی: بە هیشامم وت: ئەبو عەمماریش وتی: بە هیشام وترا: فەرمانیان پێ کرا بە قەزاکردنەوە؟ وتی: هەر دەبێ قەزا بکرێتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەدا شتێك نەهاتووە ئەوان فەرمانیان پێ کرابێت بە قەزاکردنەوە، ئەوە وتەی هیشامە: هەر دەبێ قەزا بکرێتەوە. نەك لە فەرموودەکە هاتبێت، منیش بۆم ڕوون نەبووەتەوە کە قەزایان لەسەر بێت، جا ئەگەر ڕۆژوویان شکاند و خۆر لای ئەوان ئاوا بوو، (بەهۆی هەور یان خۆڵبارین)، پاشان دەرکەوت ئاوا نەبووە وەکوو عومەری کوڕی خەتاب وتی: سوێند بە خوا قەزای ناکەینەوە هیچ گوناهێکمان لەسەر نییە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ الْمَنْهِيَّةِ عَنْهَا فِي الصَّوْمِ مِنْ غَيْرِ إِيجَابِ فِطْرٍ

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْجَهْلِ فِي الصِّيَامِ

**١٩٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ صَوْمُ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَرْفُثْ، وَلَا يَجْهَلْ، فَإِنْ جُهِلَ عَلَيْهِ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ».[٢]

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی ئەو وتە و ڕەفتارانەی قەدەغەیان لێ کراوە لە کاتی بەڕۆژووبوون بەبێ ئەوەی ڕۆژوویان پێ بشکێت

### باسی قەدەغەکردن لە قسەی پڕوپووچ و نابەجێ لە کاتی ڕۆژوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ هەر یەکێك لە ئێوە بەڕۆژوو بوو، با قسەی پڕوپووچ و نابەجێ و دەمەدەمێ نەکات، ئەگەر کەسێك نەفامی لە بەرانبەری کرد و قسەی پێ وت، با بڵێ: من بەڕۆژووم.

### بَابُ الزَّجْرِ عَنِ السِّبَابِ وَالِاقْتِتَالِ فِي الصِّيَامِ، وَإِنْ سُبَّ الصَّائِمُ أَوْ قُوتِلَ، وَإِعْلَامِ الصَّائِمِ مُقَاتِلَهُ وَسَابَّهُ أَنَّهُ صَائِمٌ لَعَلَّهُ يَنْزَجِرُ عَنْ قِتَالِهِ وَسِبَابِهِ إِذَا عَلِمَ أَنَّهُ لَا يَنْتَصِرُ مِنْهُ لِعِلَّةِ صَوْمِهِ

**١٩٩٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ، فَإِنْ شَاتَمَهُ أَوْ سَابَّهُ وَقَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ»[١].

### باسی قەدەغەکردن لە جنێودان و شەڕکردن لە کاتی بەڕۆژووبوون، ئەگەرچی جنێو درا بە ڕۆژووەوان یان شەڕی لەگەڵ کرا، وە ڕۆژووەوان ئاگاداری ئەو کەسە بکاتەوە کە شەڕی لەگەڵ دەکات و جنێوی پێ دەدات کە ئەو بەڕۆژووە، بەڵکوو واز بهێنێ لە شەڕ و جنێودان، ئەگەر زانی ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت لەبەر ڕۆژووەکەی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ هەر یەکێك لە ئێوە بەڕۆژوو بوو، با قسەی پڕوپووچ و دەمەدەمێ نەکات، ئەگەر کەسێك تانەی لێ دا یان جنێوی پێ دا و شەڕی لەگەڵی کرد با بڵێ: من بەڕۆژووم.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْجُلُوسِ إِذَا شُتِمَ الصَّائِمُ وَهُوَ قَائِمٌ، لِتَسْكِينِ الْغَضَبِ عَلَى الْمَشْتُومِ فَلَا يَنْتَصِرُ بِالْجَوَابِ

**١٩٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَا تُسَابَّ وَأَنْتَ صَائِمٌ، فَإِنْ سَابَّكَ أَحَدٌ فَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ، وَإِنْ كُنْتَ قَائِمًا فَاجْلِسْ»(١).

## باسی فەرمانکردن بە دانیشتن ئەگەر ڕۆژووەوان جنێوی پێ درا و بەپێوە بوو، بۆ ئەوەی توڕەیی جنێوپێدراو هێور بێتەوە لەوەی جنێوی پێ داوە، با خۆی سەر نەخات بە وەڵامدانەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جنێو مەدە لە کاتێکدا تۆ بەڕۆژووی، ئەگەر کەسێك جنێوی پێ دای بڵێ: من بەڕۆژووم، هەروەها ئەگەر تۆ بەپێوە بووی دابنیشە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ قَوْلِ الزُّورِ، وَالْعَمَلِ بِهِ، وَالْجَهْلِ فِي الصَّوْمِ، وَالتَّغْلِيظِ فِيهِ

**١٩٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ بِأَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ» هذا حديث بُندار. وَفِي حَدِيثِ ابْنِ الْمُبَارَكِ: وَالْعَمَلَ بِهِ وَالْجَهْلَ(٢).

## باسی قەدەغەکردن لە قسەی درۆ و پڕوپووچ و کردەوەپێکردنی و نەفامی و سەرپێچیکردن لە کاتی ڕۆژوودا، وە هەڕەشەکردن لێی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس واز نەهێنێ لە قسەی درۆ و پڕوپووچ و کردەوەپێکردنی، ئەوە خوا ﷻ هیچ پێویستییەکی بەوە نییە واز لە خواردن و خواردنەوەکەی بهێنێت، ئەمە فەرموودەی بوندارە. لە فەرموودەکەی ئینو موبارەك هاتووە: کردەوەپێکردنی و نەفامی و سەرپێچیکردن.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ اللَّغْوِ فِي الصِّيَامِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْإِمْسَاكَ عَنِ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ مِنْ تَمَامِ الصَّوْمِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ أَجْزَاءِ الْعَمَلِ ذِي الشُّعَبِ وَالْأَجْزَاءِ، عَلَى مَا بَيَّنْتُهُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ.

**١٩٩٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ، إِنَّمَا الصِّيَامُ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، فَإِنْ سَابَّكَ أَحَدٌ أَوْ جَهِلَ عَلَيْكَ فَلْتَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ، إِنِّي صَائِمٌ»[١].

**باسی قەدەغەکردن لە وتەی نابەجێ لە کاتی ڕۆژوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خۆگرتنەوە لە وتەی نابەجێ و پڕوپووچ نیشانەی تەواوی ڕۆژووەکەیە، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ناوی ناسراو بە (الْأَلِفِ وَاللَّامِ) هەندێ جار بەکار دێت بۆ لق و بەشەکانی ئەو کردارەی کە لق و بەشی زۆرە وەك چۆن لە کتێبی (الْإِيمَانِ) ڕوونم کردەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕۆژووگرتن تەنها لە خواردن و خواردنەوە نییە، بەڵکوو ڕۆژووگرتن لە قسەی پڕوپووچ و نابەجێیە، ئەگەر کەسێك جنێوی پێ دای، یان نەفامی کرد بەرانبەرت بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم.

## بَابُ نَفْيِ ثَوَابِ الصَّوْمِ عَنِ الْمُمْسِكِ عَنِ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ مَعَ ارْتِكَابِهِ مَا زُجِرَ عَنْهُ غَيْرَ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ

**١٩٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رُبَّ صَائِمٍ حَظُّهُ مِنْ صِيَامِهِ الْجُوعُ وَالْعَطَشُ، وَرُبَّ قَائِمٍ حَظُّهُ مِنْ قِيَامِهِ السَّهَرُ»[٢].

**باسی ڕەتکردنەوەی پاداشتی ڕۆژوو لەوکەسەی خۆی گرتووەتەوە لە خواردن و خواردنەوە لەگەڵ ئەوەدا ئەو کاروکردەوانە بکات قەدەغە و سەرکۆنەکراون جگە لە خواردن و خواردنەوە**

---

(١) في إسناده مقال.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێ ڕۆژووەوان هەیە لە ڕۆژووگرتنیدا تەنها برسێتی و تینوێتی بۆ دەمێنێتەوە، هەندێ شەونوێژکەریش هەیە لە شەونوێژکردنیدا تەنها شەونخوونی بۆ دەمێنێتەوە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ الْمُبَاحَةِ فِي الصِّيَامِ مِمَّا قَدِ اخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ فِي إِبَاحَتِهَا

## کۆباسی ئەو کردەوانەی ڕێگەیان پێ دراوە لە کاتی بەڕۆژووبوون، هەروەها ئەوانەشی ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە لە ڕێگەپێدانیان

### بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمُبَاشَرَةِ الَّتِي هِيَ دُونَ الْجِمَاعِ لِلصَّائِمِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الْوَاحِدِ قَدْ يَقَعُ عَلَى فِعْلَيْنِ، أَحَدُهُمَا مُبَاحٌ، وَالْآخَرُ مَحْظُورٌ، إِذِ اسْمُ الْمُبَاشَرَةِ قَدْ أَوْقَعَهُ اللَّهُ فِي نَصِّ كِتَابِهِ عَلَى الْجِمَاعِ، وَدَلَّ الْكِتَابُ عَلَى أَنَّ الْجِمَاعَ فِي الصَّوْمِ مَحْظُورٌ، قَالَ الْمُصْطَفَى ﷺ: إِنَّ الْجِمَاعَ يُفْطِرُ الصَّائِمَ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَدْ دَلَّ بِفِعْلِهِ عَلَى أَنَّ الْمُبَاشَرَةَ الَّتِي هِيَ دُونَ الْجِمَاعِ مُبَاحَةٌ فِي الصَّوْمِ غَيْرَ مَكْرُوهَةٍ

١٩٩٨- عَنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ إِلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ نَسْأَلُهَا عَنِ الْمُبَاشَرَةِ، فَاسْتَحْيَيْنَا قَالَ: قُلْتُ: جِئْنَا نَسْأَلُ حَاجَةً فَاسْتَحْيَيْنَا، فَقَالَتْ: مَا هِيَ؟ سَلَا عَمَّا بَدَا لَكُمَا قَالَ: قُلْنَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ؟ قَالَتْ: قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، وَلَكِنَّهُ كَانَ أَمْلَكَ لِإِرْبِهِ مِنْكُمْ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا خَاطَبَ اللَّهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ نَبِيَّهُ ﷺ وَأُمَّتَهُ بِلُغَةِ الْعَرَبِ أَوْسَعِ اللُّغَاتِ كُلِّهَا، الَّتِي لَا يُحِيطُ بِعِلْمِ جَمِيعِهَا أَحَدٌ غَيْرُ نَبِيٍّ، وَالْعَرَبُ فِي لُغَاتِهَا تُوقِعُ اسْمَ الْوَاحِدِ عَلَى شَيْئَيْنِ، وَعَلَى أَشْيَاءَ ذَوَاتِ عَدَدٍ، وَقَدْ يُسَمَّى الشَّيْءُ الْوَاحِدُ بِأَسْمَاءَ، وَقَدْ يَزْجُرُ اللَّهُ عَنِ الشَّيْءِ، وَيُبِيحُ شَيْئًا آخَرَ غَيْرَ الشَّيْءِ الْمَزْجُورِ عَنْهُ، وَوَقَعَ اسْمُ الْوَاحِدِ عَلَى الشَّيْئَيْنِ جَمِيعًا: عَلَى الْمُبَاحِ، وَعَلَى الْمَحْظُورِ، وَكَذَلِكَ قَدْ يُبِيحُ الشَّيْءَ الْمَزْجُورَ عَنْهُ، وَوَقَعَ اسْمُ الْوَاحِدِ عَلَيْهِمَا جَمِيعًا، فَيَكُونُ اسْمُ الْوَاحِدِ وَاقِعًا عَلَى الشَّيْئَيْنِ الْمُخْتَلِفَيْنِ، أَحَدُهُمَا مُبَاحٌ، وَالْآخَرُ مَحْظُورٌ، وَاسْمُهُمَا وَاحِدٌ، فَلَمْ يَفْهَمْ هَذَا مَنْ سَفِهَ لِسَانَ الْعَرَبِ، وَحَمَلَ الْمَعْنَى فِي ذَلِكَ عَلَى شَيْءٍ وَاحِدٍ يُوهِمُ أَنَّ الْأَمْرَيْنِ مُتَضَادَّانِ إِذْ أُبِيحَ فِعْلٌ مُسَمًّى بِاسْمٍ، وَحُظِرَ فِعْلٌ تَسَمَّى بِذَلِكَ الِاسْمِ سَوَاءً فَمَنْ كَانَ هَذَا مَبْلَغُهُ مِنَ الْعِلْمِ، لَمْ يَحِلَّ لَهُ تَعَاطِي الْفِقْهِ، وَلَا الْفُتْيَا، وَوَجَبَ عَلَيْهِ التَّعَلُّمُ، أَوِ السَّكْتُ، إِلَى أَنْ يُدْرِكَ مِنَ الْعِلْمِ

---

(١) صحيح.

مَا يَجُوزُ مَعَهُ الْفُتْيَا، وَتَعَاطِي الْعِلْمِ، وَمَنْ فَهِمَ هَذِهِ الصِّنَاعَةَ عَلِمَ أَنَّ مَا أُبِيحَ غَيْرُ مَا حُظِرَ، وَإِنْ كَانَ اسْمُ الْوَاحِدِ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْمُبَاحِ وَعَلَى الْمَحْظُورِ جَمِيعًا، فَمِنْ هَذَا الْجِنْسِ الَّذِي ذَكَرْتُ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ دَلَّ فِي كِتَابِهِ أَنَّ مُبَاشَرَةَ النِّسَاءِ فِي نَهَارِ الصَّوْمِ غَيْرُ جَائِزٍ كَقَوْلِهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾البقرة: ١٨٧، فَأَبَاحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مُبَاشَرَةَ النِّسَاءِ وَالْأَكْلَ وَالشُّرْبَ بِاللَّيْلِ، ثُمَّ أَمَرَنَا بِإِتْمَامِ الصِّيَامِ إِلَى اللَّيْلِ، عَلَى أَنَّ الْمُبَاشَرَةَ الْمُبَاحَةَ بِاللَّيْلِ الْمَقْرُونَةَ إِلَى الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ هِيَ الْجِمَاعُ الْمُفَطِّرُ لِلصَّائِمِ، وَأَبَاحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِفِعْلِ النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ الْمُبَاشَرَةَ الَّتِي هِيَ دُونَ الْجِمَاعِ فِي الصِّيَامِ، إِذْ كَانَ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَالْمُبَاشَرَةُ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ أَنَّهَا تُفَطِّرُ الصَّائِمَ هِيَ غَيْرُ الْمُبَاشَرَةِ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَاشِرُهَا فِي صِيَامِهِ، وَالْمُبَاشَرَةُ اسْمٌ وَاحِدٌ وَاقِعٌ عَلَى فِعْلَيْنِ: إِحْدَاهُمَا: مُبَاحَةٌ فِي نَهَارِ الصَّوْمِ، وَالْأُخْرَى: مَحْظُورَةٌ فِي نَهَارِ الصَّوْمِ، مُفَطِّرَةٌ لِلصَّائِمِ، وَمِنْ هَذَا الْجِنْسِ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ﴾الجمعة: ٩، فَأَمَرَ رَبُّنَا جَلَّ وَعَلَا بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَالَ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، إِيتُوهَا تَمْشُونَ وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَاسْمُ السَّعْيِ يَقَعُ عَلَى الْهَرْوَلَةِ، وَشِدَّةِ الْمَشْيِ، وَالْمُضِيِّ إِلَى الْمَوْضِعِ، فَالسَّعْيُ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُسْعَى إِلَى الْجُمُعَةِ، هُوَ الْمُضِيُّ إِلَيْهَا، وَالسَّعْيُ الَّذِي زَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهُ إِتْيَانَ الصَّلَاةِ هُوَ الْهَرْوَلَةُ وَسُرْعَةُ الْمَشْيِ، فَاسْمُ السَّعْيِ وَاقِعٌ عَلَى فِعْلَيْنِ: أَحَدُهُمَا مَأْمُورٌ، وَالْآخَرُ مَنْهِيٌّ عَنْهُ، وَسَأُبَيِّنُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى هَذَا الْجِنْسَ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ إِنْ وَفَّقَ اللَّهُ لِذَلِكَ.

## باسی ڕێگەپێدان بە ئەو دەستبازییەی (الْمُبَاشَرَة) لە خوار جووتبوونەوەیە بۆ ڕۆژووەوان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ناوێك بۆ دوو كردار بەكار دێت، یەكێكیان ڕێگەپێدراو بێت و ئەوی دیكەیان قەدەغەكراو بێت، لە كاتێكدا ناوی (الْمُبَاشَرَة) خوا لە كتێبەكەیدا هێناویەتی مەبەستی پێی جووتبوونە، قورئانیش باس لەوە دەكات جووتبوون لە كاتی ڕۆژوو قەدەغەكراوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جووتبوون ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشكێنێ. پێغەمبەریش ﷺ بەكردەوەی خۆی سەلماندوویەتی ئەو دەستبازییەی (الْمُبَاشَرَة) لە خوار جووتبوونەوەیە ڕێگەپێدراوە لە كاتی بەڕۆژووبوون كەڕاهەتی نییە

واتە: ئەسوەد دەڵێ: من و مەسڕوق ڕۆیشتین بۆ لای دایكی باوەڕداران ﷺ (عائیشە) پرسیاری لێ بكەین دەربارەی دەستبازی (الْمُبَاشَرَة)، بەڵام شەرمان كرد، وتی: وتم:




هاتووین پرسیاری شتێکت لێ بکەین بەڵام شەرم دەکەین، وتی: ئەو شتە چییە؟ پرسیار بکەن لەوەی بۆتان دروست بووە، وتی: وتمان: پێغەمبەر ﷺ کە بەڕۆژوو دەبوو دەستبازی دەکرد (وەکوو ماچکردن)، وتی: دەیکرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە ئێوە زیاتر جڵەوی نەفسی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: بۆیە خوا ﷻ بە زمانی عەرەب لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئوممەتەکەی دواوە، چونکە فراوانترینی زمانەکانە، هیچ کەس ناتوانێت بە زانست دەوری هەمووی بدات، جگە لە پێغەمبەر ﷺ نەبێت، جا عەرەب لە زمانی خۆیدا ناوێك بۆ دوو شت بەکار دەهێنێت، وە بۆ چەندین شتیش، هەندێ جار چەند ناوێك لە یە شت دەنێت، هەندێ جار خوا ﷻ (بە بەکارهێنانی یەك ناو) شتێك قەدەغە دەکات و شتێکی دیکەش ڕێگە پێ دەدات جگە لەو شتەی سەرزەنشتکراوە، تەنها ناوی (الْمُبَاشَرَةِ) بۆ دوو شت بەکار هێناوە: بۆ ڕێگەپێدان، بۆ قەدەغەکردن، بەهەمان شێوە هەندێ جار ڕێگە دەدا بەو شتەی سەرزەنشتکراوە، لە کاتێدا ئەو ناوە بۆ هەردووکیان پێکەوە بەکار دێت، ئەوکات یەك ناو بۆ دوو شتی جیاواز لە یەکدی بەکار دێت: یەکەمینیان ڕێگەپێدراوە و ئەوی دیکەشیان قەدەغەکراوە، ناوەکەیشیان هەر یەك ناوە، هەر کەس لە زمانی عەرەب نەزانێت لەمەش تێناگات، ماناکە بەسەر دانەیەکیاندا دەدات وا خەیاڵ دەکات ئەو دوو فەرمانە دژیەکن، ڕێگە دراوە بەشتێك بە یەك ناو، بەهەمان ناو قەدەغەکراوە لەو شتە، جا هەرکەس ئەوە ئەوپەڕی زانستی بێت حەڵاڵ نییە بۆی ڕۆبچێت لە فیقهدا و فتوا بدات، پێویستە لەسەری خۆی فێری زانست و زانیاری بکات، یان بێدەنگ بێت، تا ئەوەندە زانست فێر دەبێت بتوانێت لەگەڵیدا فتوا بدات و ڕۆبچێت لە زانست، جا هەر کەس تێگەیشت لەم پیشەیە ئەوە دەزانێ ئەوەی ڕێگە پێدراوە جگە لەوەیە کە قەدەغە کراوە، ئەگەرچی یەك ناو بەکار بێت بۆ ڕێگەپێدراو و بۆ قەدەغەکراو پێکەوە، جا لەم شێوازەی کە باسم کرد، خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا باسی کردووە جووتبوون (مُبَاشَرَةَ) لەگەڵ هاوسەرەکان لە ڕۆژی ڕەمەزان دروست نییە، وەك فەرموویەتی: ﴿فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾، خوا ﷻ ڕێگەی داوە بە جووتبوون (مُبَاشَرَةَ) و خواردن و خواردنەوە بە شەو، پاشان فەرمانی پێ کردووین ڕۆژووەکەمان تەواو بکەین تا شەو، لەسەر ئەوەی

(الْمُبَاشَرَةَ)ەی ڕێگە پێدراوە بە شەو كە گرێ دراوە بە خواردن و خواردنەوە، بریتییە لە جووتبوونی ئەو ڕۆژووەوانەی ڕۆژووەكەی شكاندووە، وە خوا ﷻ بە كردەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە (مُبَاشَرَةَ) كە لە جگە لە جووتبوونە لە كاتی بەڕۆژووبوون (وەك ماچكردن)، وە ئەو (مُبَاشَرَةَ)ەی كە خوا باسی كردووە ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشكێنێ جگە لەو (مُبَاشَرَةَ)ەیە كە پێغەمبەر ﷺ لە كاتی بەڕۆژووبوونی دەیكرد، جا (مُبَاشَرَةَ) یەك ناوە بۆ دوو كردەوە بەكار دێت: یەكەمینیان: ڕێگەی پێ دراوە بە ڕۆژ لە كاتی بەڕۆژبوون (وەك ماچكردن)، ئەوی دیكەیان: قەدەغە كراوە بە ڕۆژ لە كاتی بەڕۆژووبوون، ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشكێنێ، وە لەم شێوازە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ﴾، جا پەروەردگارمان ﷻ فەرمانی پێ كردووین بەپەلە (السَّعْيِ) بچین بۆ هەینی، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: كاتێ هاتن بۆ نوێژ پەلە مەكەن لە كاتی هاتنتاندا، بەڵكوو بەهێمنی و لەسەرخۆیی بچن بۆ نوێژ. جا ناوی (السَّعْيِ) بۆ ڕێكردنی بەپەلە بەكار دێت، وە ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنە، ئەو (السَّعْيِ)ەی خوا فەرمانی كردووە بەندە بەوشێوە بچێت بۆ هەینی، بریتییە لە ڕۆیشتن بۆی، ئەو (السَّعْيِ)ەیشی پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی كردووە ڕۆیشتنە بۆ نوێژ بەپەلە و تەكاندان، بێگومان وشەی (السَّعْيِ) بۆ دوو كردەوە بەكار هاتووە: یەكەمینیان: فەرمان پێ كراوە، ئەوی دیكەشیان قەدەغەی لێ كراوە، لە داهاتوودا بەویستی خوا ﷻ ئەم شێواز ڕوون دەكەمەوە لە كتێبی (معاني القرآن) ئەگەر خوا سەركەوتووم بكات بۆ ئەو مەبەستە.

## بَابُ تَمْثِيلِ النَّبِيِّ ﷺ قُبْلَةَ الصَّائِمِ بِالْمَضْمَضَةِ مِنْهُ بِالْمَاءِ

**١٩٩٩-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: هَشَشْتُ يَوْمًا، فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا عَظِيمًا، قَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرَأَيْتَ لَوْ تَمَضْمَضْتَ بِمَاءٍ وَأَنْتَ صَائِمٌ؟» قَالَ: فَقُلْتُ: لَا بَأْسَ بِذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ الرَّبِيعُ: «أَظُنُّهُ قَالَ: فَفِيمَ؟»[1].

---

(١) صحيح.

## باسی پێغەمبەر ﷺ ماچی ڕۆژووەوانی چواندووە بە ئاووەردانە دەم

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: ڕۆژێك ئارەزووم جولا، ماچی خێزانەکەم کرد و بەڕۆژوو بووم، دواتر هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەمڕۆ کارێکی گەورەم کرد، ماچی خێزانەکەم کرد و بەڕۆژوو بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێم بڵێ ئەگەر ئاو وەربدەیتە دەمت زیانی هەیە، وتی: وتم: کەواتە هیچ کێشەی تێدا نییە، ڕەبیع (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) وتی: پێم وایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە؟ واتە: زیانی ئەوتۆی نییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قُبْلَةِ الصَّائِمِ

**٢٠٠٠-** عَنْ سُفْيَان قَالَ: سَأَلْتُ عَبْد الرَّحْمَنِ بْنَ الْقَاسِمِ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ، عَنْ عَائِشَة ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ؟ فَسَكَتَ عَنِّي سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: نَعَمْ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە ماچکردنی ڕۆژووەوان

واتە: سوفیان دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم کرد ئایا گوێت لێ بووە باوکت باسی کردبێت، لە عائیشەوە ﵂، وتبێتی پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکرد و بەڕۆژوویش بوو؟ ساتێك لێم بێدەنگ بوو، دواتر وتی: بەڵێ.



## نــاوەڕۆک

## پەڕتووکی پێشنوێژیکردن ......................................٢٨٧

